کانونی یەکەم
2003
ســــاڵی پێنجەم

سەردەم
302
9

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی

- سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێک دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.
- تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.
- بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.
- هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.

خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

دەستەی نووسین
ڕێبین هەردی
شوان ئەحمەد
شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری: قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەری: تاڤگە فائق

ناونیشان
سلێمانی – فولکەی یەکگرتن
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
تەلەفۆن/ سەرنووسەر 1303473
دەزگای سەردەم 3129609

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە
Tel - Fax: 0044 7543129839
ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی
ژمارە (14665/615 و 14665/616) تاران

لە ڕێگەی ( e~mail )ەوە
info@sardam.info

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە

# ناووڕۆك

## • فیکر و فەلسەفە



## • ڕەخنە و لێکۆڵینەوە



## • گفتوگۆ



## • لە ئەدەبی گەلانەوە

• فایلی ژمارە



• وێستگەکانی سەردەم

- رۆمانی "دڵشاد"ی سەلیم بەرەکات لە کوورەیەکی سانسۆردا! - جیهان بەبێ حەمزاتۆف

- دواساتەکانی محەمەد شوکری - رۆمانووسی یۆنانی کازانتزاکی

- فردریش نیچە (بایۆگرافیایەکی فەلسەفی) - سمۆئیل بیکێت.. نوسەرێکی پڕ لە گومان

نرخی (8) هەشت دینارە

# تیرۆرکردن و ژیاندنەوەی فەلسەفە

محەمەد مزوز

لە عەرەبییەوە: هەڵكەوت عەبدوڵڵا

فەلسەفە بەهۆی سەرکوتکردنی سیاسییەوە نامرێت و بە نەبوونی سەرکوتکردنی سیاسیش ناژی، هەروەها بە نەبوونی سەرکوتکردنی سیاسی نامرێ و بە کاری ئەویش ناژی. واتە سەرکوتکردنی سیاسی نە فەلسەفە دەگوژێ و نە دەشیژێنێتەوە. ڕووداوەکانی مێژوو زیاتر لە بەڵگەیەك لە زیاتر لە سەردەمێك و زیاتر لەلایەنێکەوە سەبارەت بەوە دەدەنە دەستەوە.

مێژووی فیکری فەلسەفی لەناخی خۆیدا پەیوەندییەکی دیاریکراوی لەگەڵ گوتاری سیاسی هەڵدەگرێت، چونکە هەمیشە سیاسەت وەك زانستێکی پراکتیکی سەیرکراوە. زانستی شارستانی یان سیاسەتی شارستانی یەکێکە لە زانستە پراکتیکیەکان، لەکاتێکدا فەلسەفە سەر بە زانستە تیۆرییەکانە. ئەمەش مانای ئەوەیە، لە ڕوانگەی فەلسەفەوە، سیاسەت هەرگیز ناگاتە تەمەنی هەرزەکاری: سیاسەت شۆخەکچێکی پێنەگەیشتوە!

فەلسەفەو سیاسەت پێکەوە سەر بە شارستانیەتن و پێکەوە لە قەڵای ژیواردا لەدایکبوون، بەڵام لەدایکبوونیان هەمان سروشتی نییەو هاوکات نەبوە. لە ڕوی کاتەوە، لەدایکبوونی سیاسەت پێش لەدایکبوونی فەلسەفە دەکەوێت، لە ڕوی سروشتی لەدایکبوونەکەشەوە، سیاسەت وەك کچێکی پێش تەمەنی هەرزەکار هاتۆتە دنیاوە، کەچی فەلسەفە بە هەرزەکاری لەدایکبوە. لە ڕوانگەی فەیلەسوفەوە، سیاسەتمەدار (دەسەڵاتدار) نازدارەو ئامڕازەکانی ڕابواردنی بۆ دەستەبەرکراوە بۆ ئەوەی جڵەوی خەڵك بکات، بەڵام فەیلەسوف دانایە: پیرەپیاوێکی لەسەرخۆیە کە هێمنانە دەڕوانێتە ژیان.

هەرگیز فەلسەفە لە مێژووی تیۆریی دورودرێژدا داوای پاراستنی لە سیاسەت نەکردوە، بەپێچەوانەوە سیاسەتی شارستانی داوای پاراستنی تیۆریی لە فەلسەفە کردوە. سیاسەتی شارستانی هەمیشە پێویستی بە تیۆرێك یان تێڕوانینێك هەبوە،

بۆیە هانای بۆ گوتاری فەلسەفی بردوە. بەو جۆرە زانستی شارستانی چەکدارکراوە بە وێناکردنێکی گشتی سەبارەت بە بوون، ژیان، تاكو كۆمەڵ، ئەو زانستەش لەبەر ڕۆشنایی ئەو وێناکردنەدا کاریکردوە.

فیکر، جا سیاسی بێت یان فەلسەفی، وەك خۆی لەدایکدەبێت، مێژوەکەشی مانای گەشەکردنی نییە لە قۆناغەکانی خوارەوە بۆ قۆناغەکانی سەرەوە، بەڵکو مانای ئەوەیە، کاتێك فرمانەکەی کەمدەبێتەوەو ناوچەی بوونی تەسکدەبێتەوە، نوێی لێ دەکەوێتەوە یان سەرلەنوێ لەدایکدەبێتەوە. هایدگەر دەڵێت: "ئەوەی مەزن لەدایکدەبێت مەزنە"، ئەوەی سادەیە سادە لەدایکدەبێت. ئەگەر فیکر مەزن بوو و پاشتر فرمانەکەی کەمبوەوە، دەشێت سەرلەنوێ بەسادەیی لەدایکبێتەوە. ئەمە مانای ئەوەیە مێژووی فیکر دەشێ بە دژەئاڕاستە ڕێبکات، واتە لە سەرەوە بۆ خوارەوە، چونکە بزووتنەوە هەمیشە بەرەو پێشەوە ناڕوات، بەڵکو دەشێت بەرەو دواشەوە هەنگاوبنێت.

لەدایکبوونی فەلسەفە بەلای مێژووی فیکری مرۆڤایەتیەوە لەدایکبوونێکی مەزن بوو، چونکە بۆ یەکەمین جار گەورەترینی ئەو کێشانەی دەربڕی کە ئەقڵی مرۆڤایەتی تاوتوێیدەکردو ڕێگەی چارەنووسی مرۆڤی گرتبوو، ئەویش کێشەی بوونە. یۆنانیەکان دەرگای بوارێکی نوێی فیکریان لەبەردەم ئەقڵی مرۆڤایەتیدا کردەوەو هەنگاویان هەڵهێنا بەرەو لێکدانەوەی سەرهەڵدانو بنەچەی دنیا. ئەم لەدایکبوونە مەزنەی فیکری فەلسەفی لەوەدانییە کە بابەتێکی بەو قەبارە گەورەیەی تاوتوێکردوە، چونکە ئایینەکانی پێش یۆنان مەسەلەی بەهەمان قەبارەیان تاوتوێکردوە، بەڵکو بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ویستی پشتئەستوور بە کۆششی ئەقڵ وەڵامی پرسیارەکانی بوون بداتەوە، بەڵام ئایینو ئەفسانەکان ویستیان لێکدانەوەی غەیبی بخەنەڕوو و بوون گرێبدەنەوە بە هێزی غەیبییەوە، بەو جۆرەش مرۆڤو کرۆکی پرسیار لەناودەچن.

لەدایکبوونی مەزن فیکرێك بەو خەسڵەتە دێنێتە بوونەوەو ماوەیەك، کورت یان درێژ، لەسەر هەمان شت بەردەوامدەبێت، هەتا بیریارگەلی وەها سەرهەڵدەدەن کە بێزاردەبن لەو ناوچەی بوونەی لەدایکبوونی نوێ دۆزیویەتیەوەو فیکر دەگێڕنەوە بۆ ئاستی خوارەوەیو بڵندیی تیۆریی تەسکدەکەنەوە، بەو جۆرەش داخزان ڕوودەدات! سەبارەت بە مێژووی فەلسەفە ئەم داخزانە لەسەردەستی ئەفلاتون ڕوویدا، کاتێك ناوچەی بوونی تەسککردەوەو کردییە دوو کەرتەوە: دنیای هەستپێکراو و دنیای ماقووڵ، لەکاتێکدا بوون بەر لە ئەفلاتون ڕووبەرێکی ئەنتۆلۆژیی بێکۆتایی داگیردەکرد، ئەوەی داناکانی سروشت بە فیزیس *Physis* ناویاندەبرد. فیزیس بەکورتی بوەیە (موجود)، واتە هەرشتێك کە بێ گوێدانە سروشت یان چەشنەکەی بوە. مرۆڤ، فیکر، بەهاکان، خواوەندەکان، درەخت، ئاسمانو زەوی....تاد بوەنو سەر بە فیزیسن. دانا سەرەتاکانی یۆنان (واتە ئەوانەی پێش سوکراتو ئەفلاتۆن) بەم جۆرە پێناسەی فیزیس دەکەن: دەرکەوتنی بەردەوامە، ئاشکراکردنی شاراوەیەو دەرخستنی بوەیە.

فیکر بەڕوی ئەو بوونە هەمەلایەندا کرایەوە کە بەردەوام دەدۆزرێتەوەو دانای سروشتی دەستیکردە دۆزینەوەی سروشتەکانی بوونەوەرەکانو بنەچەی دنیا، بەڵام کاتێك ئەفلاتۆن هات بوون بوە دووکەرتەوە. هەمان شت لەگەڵ ئەرستۆش ڕوویدا، ئەویش بوونی دابەشکرد بۆ دنیای هەستپێکراو و دنیای گشتەکان. پاش ئەرستۆ داخزان هاتەئاراوەو

باڵی کێشا بەسەر هەموو لایەنەکانی ژیانی ڕۆشنبیریدا.

بەسەرهەڵدانی مەسیحیەت کەرتبوونی بوون بۆ دوو بەشی گەورە: دنیاو ڕۆژی قیامەت قووڵدەبێتەوە. دنیای هەستپێکراو دنیایەو دنیای ماقووڵیش ڕۆژی قیامەتە. دنیا لەناودەچێو نامێنێ، ڕۆژی قیامەت دەمێنێو بەردەوامە. لێرەدا ئەقڵ دەستبەرداری فرمانی لێکدانەوە دەبێت، ناوچەی بوون پاشەکشەدەکات بۆ سفر، فیزیس لەناودەچێو دۆزینەوەی شاراوە دەیبەستێ. زۆر بە کورتی: فەلسەفە دەمرێت.

سەرکوتکردن، جا سروشتو ڕادەی هەرچەندێك بێت، نابێتە هۆی تیرۆرکردنی فەلسەفە، چونکە فەلسەفە شەڕی خاوەن بەرژەوەندییە هەنوکەییەکان بەرپاناکاتو بایەخ نادات بە تاکەکەسو ململانێکانیان لەسەر پێگەکانی دەسەڵات. فەلسەفە ناخوازێ بگاتە دەسەڵات، حەزی لە گوتاربێژیی سیاسی نییەو عاشقی کورسی فەرمانڕەوایش نییە. بۆیە فەلسەفە نامۆیە بە سیاسەتو سیاسەتیش نامۆیە بەو.

ئەمە مانای ئەوەیە بواری فەلسەفە دەکەوێتە دەرەوەی بواری سیاسەت، واتە دوو بازنەی جیاوازن. ئەم جیاوازییەی نێوان دوو بوارەکە شێوەی مێژوویی هەمەلایەن دەپۆشێ: دەشێت بەشێوەی بوژاندنەوەی سیاسیو دەوڵەمەندیی ئابووری خۆی بخاتەڕوو و هەژاریی تیۆری لەسەر ئاستی فەلسەفی یاوەری بێت، دەشێت بەشێوەی بوژاندنەوەی سیاسیو ئابووری بێتو بەرهەمهێنانی تیۆریی فەلسەفی یاوەری بێت، بەڵام ئەو بەرهەمهێنانە دەربڕی ئاڕاستەی سیاسیی هاوتەریب نییە. مێژووی فیکری فەلسەفی زیاتر لە شایەتیەکمان سەبارەت بە شانسیاربوونی ئەم یان ئەو فەیلەسوف لای ئەم سوڵتانو ئەو فەرمانڕەوا بۆ دەخاتەڕوو، هاوکات باسی کارەساتی هەمان فەیلەسوفمان بۆ دەکات لە هەمان ماوەو لەسەر دەستی هەمان فەرمانڕەوا یاخود نەوەکانی. ئەوەی مرۆڤ لەو مێژوە هەڵیدەهێنجێ ئەوەیە کە فیکری فەلسەفی بریتی نییە لە مێژووی فەلسەفە، واتە ڕۆژگاری تیۆر ڕۆژگاری تاك نییەو ڕۆژگاری مێژووش ڕۆژگاری فیکر نییە.

سیاسەت لەسەر پرنسیپی سەروەری دادەمەزرێ، بەڵام فەلسەفە لەسەر پرنسیپی جیاوازیکردن. سەروەری جێگیرکردنی ئەوەیە کە هەیە، بەڵام جیاوازیکردن ڕەتکردنی جێگیربوونە. جیاوازیکردن سەرچڵییە بۆ ڕەتکردنی سەروەری، سەروەریش چەسپاندنی ئەو پرنسیپو بڕوایانەیە کە هەن. فەلسەفە جێگیربوون ڕەتدەکاتەوە، چونکە دەبێتە هۆی سستی ئینجا ڕاوەستانو دواییش مردن. بۆیە فەلسەفە هەمیشە نوێکردنەوە ڕادەگەیەنێو دروشمی ڕەتکردنی ئەوەی هەیە بەرزدەکاتەوە. ژیانی فەلسەفە لە ڕەتکردنی سەروەریدایە، کەچی ژیانی سیاسەت پشت بە جێگیرکردنی سەروەری دەبەستێت. مردنی فەلسەفە لە جێگیربوونیدایە، مردنی سیاسەتیش لە جیاوازیکردنیدایە.

ئەم هاوکێشەیە مانای پێکەوەنەژیانی دوو گوتارەکە نییە، بەڵکو مانای شتێکی تەواو جیاوازە، ئەویش ئەوەیە کە دوو بوارەکە جیاکارەن. مەبەستم ئەوەیە سیاسەت دەمرێت ئەگەر بیەوێ جێی فەلسەفە بگرێتەوە، فەلسەفەش دەمرێت ئەگەر بخوازێ بواری سیاسەت وەبەربهێنێ. کەواتە دوو گوتارەکە لەناو هەمان بواردا ناکۆك نین بەیەك، بەڵام جیاوازو جیاکارەن. لەبەر ئەم هۆیە پەیوەندیی نێوانیان پەیوەندیی هۆو ئەنجام نییەو هۆگەلی دوور

و ناڕاستەوخۆ هەن لەنێوان دوو بوارو دوو گوتارەکەدا. مەبەست ئەوەیە پەیوەندیی نێوانیان پەیوەندیی سەروەری لەگەڵ جیاوازیکردندا نییە، بەڵکو پەیوەندیی سەروەریی خۆگرە (موجب) لەگەڵ جیاوازیکردنی داڕن (سالب) لە بواری سیاسەتداو پەیوەندیی سەروەریی داڕنە لەگەڵ جیاوازیکردنی خۆگر لە بواری فەلسەفەدا.

کەواتە فەلسەفە هاوتای ژیانی سیاسی نییە، هەروەها مردنی سیاسەتیش هاوتای ژیانی فەلسەفی نییە. ئەوانە نیشتەجێی دوو بواری لێك دوور و لێك جیان، بۆیە ئەوەی لە بواری یەکێکیاندا ڕوودەدات مانای ئەوەنییە لە بواری ئەوی دیکەدا ڕوودەدات. پردی نێوان ئەو دوانە خەیاڵپڵاوانەیەو هەندێك جار لە پەیوەندیی نێوان فەرمانڕەواو فەیلەسووفدا دەردەکەوێت. ئەوە فەیلەسوفەکان بوون کە ئامۆژگاریان دەدایە فەرمانڕەواکان، ئەگەر بەهەڵەتێگەیشتنێك لەنێوان دوولایەنەکەدا ڕوویدابێ، ئەوا هەمیشە بۆتە هۆی سەرهەڵدانی تراژیدیای فەیلەسوف. ئەو پەیوەندییە پەیوەندیی نێوان فەلسەفەو سیاسەت، نێوان سەروەریو جیاوازیکردن نییە، بەڵکو پەیوەندیی نێوان دوو کەسەو هیچی تر، یەکێکیان پیاوی دەسەڵاتەو ئەویتریشیان پیاوی ئامۆژگاریکردن. مێژوو دواتر ئەوە دەردەخات کە ئەو پەیوەندییە خۆدگەرا نەبوە، بەڵکو لابەلا بوە، چونکە سیاسەتمەدار ئیمڕۆ گوێ لە فەیلەسوف ناگرێت، بەڵکو گوێ لە یاساناس دەگرێت.

چارەنووسی فەلسەفە بە پیتەکانی سیاسەت نانووسرێت، بەڵکو بە پیتە ڕووتەکانی فەلسەفە. ژیانی فەلسەفەش گرێدراوی لەئامێزگرتن یان ڕەتکردنەوەی تێزەکانی نییە لەلایەن فەرمانڕەواوە، بەڵکو خۆی مەرجی ژیانی خۆی دەخوڵقێنێ، ئەو خوڵقاندنەش زۆر بە سادەیی لە توانای کردنەوەی بەرەیەکی نوێ بۆ فیکری مرۆڤانەو تێکۆشان لە دەوروبەری ئەو بەرەیەدا بەدەردەکەوێت کە بوون و نەبوون لێك جیادەکاتەوە. مەزنی بیرکردنەوەی فەلسەفیانە لەوەوە سەرچاوەدەگرێت کە لە ئەوپەڕی سنووری ئەقڵی مرۆڤایەتیدا کاردەکات، ئەو شوێنەی زانستە گەردیلەکان ناتوانن تیایدا هەنگاوێك هەڵهێنن. فەلسەفە یارمەتی زانست نادات بەرەو پێشەوە بڕوات و ئاستەنگیش نییە لەبەردەمیدا، بەڵام بەدوای ئەو بوار و کیشوەرە ئەنتۆلۆژیانەدا دەگەڕێت کە هێشتا نەدۆزراونەتەوە. ئەم دۆزینەوەیە نهێنی بلیمەتی فەلسەفییە، چونکە ئەو مەرجی یەکەم و بڕیاردەری ژیان و بەردەوامیی فەلسەفە دابیندەکات. کاتێك ئەو کیشوەرو بوارانە لە ڕووی فەلسەفییەوە، واتە بوونەوە، ناسراودەبن، دەشێت زانستی نوێ سەرهەڵبدات بۆ بەکاربردنی "دنیای نوێ". دەشێت ئەم بوارە نوێیانە "خاوەنداریێتی تایبەتی"ی فەلسەفە بێت و قەڵایەکی ئەنتۆلۆژی بێت کە لەڕێگەیەوە سەرکردایەتی بوارە مەعریفییەکانی کولتوورێکی دیاریکراو بدەکرێت....

## سەرچاوە


مجلة "الوحدة"، المجلس القومي للثقافة العربية، رباط/ المملكة المغربية،
العدد 60 ايلول1989، ص(68ـ70).

# سەرەتاکانی فەلسەفەی مێژووی بۆرجوازیی

ماکس هۆرکهایمەر

لە عەرەبییەوە: سامان عەلی

## پێشەکی

ئەم کتێبە چەند لێکۆڵینەوەیەکی لەخۆ گرتووە کە نووسەر بە مەبەستی خۆڕۆشنبیرکردن نووسیوونی و خواستی ئەوەیان نییە کە لە شیکردنەوەی دەقەکاندا بە ئەنجامگەلێکی نوێ رابگەن. چونکە نووسەر بڕوای وایە هەنوکە لێکۆڵینەوەی مێژووش دەچێتە چوارچێوەی پەیوەندیگەلێکی مێژوویییەوە کە ڕەگوڕیشەکانی بەنێو قوڵتر لە ئێستادا رۆچوونەتە خوارێ. لەبەرئەوەی کە واشپێدەچێت چەند روانگەیەکی باو پێویست بێت بۆ تێگەیشتن لە هەلومەرجی ئێستای گیروگرفتەکانی فەلسەفەی مێژوو، هەربۆیە نووسەر پێی باش بوو — بە مەبەستی هەڵێنجانی بنەماگەلێك کە دروست شیاوی بەکارهێنان بن — بگەڕێتەوە تا لە نێو ئەو پێکهاتە ئایدیۆلۆجیانەدا کە لە قۆناغی سەرەتای بۆرجوازییەتدا بایەخ و گرنگی تایبەتی خۆیان هەیە، بە شوێنیاندا بگەڕێت.

وێڕای ئەوە دەکرێت بڵاوکردنەوەی ئەم کارە بەهاو نرخی خۆی هەبێت. تەنانەت ئەگەر ئەو ئایدیایانەش کە بناغەی بۆچوونی ئێمەن بۆ مێژوو بەپێی پێویست لەم کتێبەدا تێروتەسەل نەبن، چونکە لە بەرامبەر ئەوەداو، بەشێوەیەکی دیاریکراو بەپێی ئامانجە سەرەکییەکە، هێڵە پانەکانی گیروگرفتەکان بەپێی پەیوەندیان بە ئێستاوە پێشچاو خراون و تاوتوێکراون.

بەمجۆرە، شیکردنەوەی بۆچوونی سایکۆلۆجی بۆ مێژوو کە ئێمە لە کاتی قسەکردن لەسەر ماکیاڤیللی باسمان کردووە، تەنها بەشداری لە تێگەیشتن لە چەند تیۆریایەکی مێژوویی هاوچەرخ و کارتێکراو بە دەروونناسیدا ناکات، بەڵکو دەکرێت بەشداری لە پشکنینی چەندین مەسەلەی وابەستە بە ئەنترۆپۆلۆژیای فەلسەفیشدا بکات.

ئەو رەخنانەی کە بۆچوونەکەی ماکیاڤیللی وروژاندونی لە بنەڕەتدا وابەستەی چەمکی کۆمەڵگان، کە دەبینین لە تیۆرەی مافی سروشتیشدا لەلای هۆبز کە هێشتا ئایدیاکانی لە نێو ژمارەیەك تیۆریای یاسایی و سیاسی هاوچەرخدا شوێنی خۆیان هەیە، دەخرێتە بەر باس. تەنانەت سیستەمەکەی هۆبز ئاماژە بۆ گرفتی ئایدیۆلۆجیا وەك کارێکی دیاریکراو لە ململانەی کۆمەڵایەتیدا کە

هێشتا لە پێشەوەی مشتومڕە فەلسەفی و سۆسیۆلۆجییەکاندایە، دەکات.

ئایدیۆلۆجیا ڕواڵەتی سیستەمێکی "ڕاستەقینە" و بەرابەر و یەکسان بۆ بوون "الوجود" بەرهەمدێنێت، هەرچی یۆتۆپیایە بە پێچەوانەوە، خەونێکەو ئارەزووی دەکات و بەشێوەیەکی شاراوە داخڵ بە هەر حوکمێکی فەلسەفی لەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەبێت. پێویستە لەسەر ئەو بناغەیە لە ئایدیۆلۆجیا و یۆتۆپیا تێبگەین کە هەڵوێستگەلی گروپگەلێکی کۆمەڵایەتین، بەڵام دەبێت بۆ ڕاگەیشتن بەم تێگەیشتنە، سەرلەبەری واقیعی کۆمەڵایەتی بە هەند وەربگیرێت.

ئەم بیرۆکەیە کە وابەستەی پاشکۆیەتی پێداویستی مەیدانە ڕۆشنبیرییەکانە بۆ پەرەسەندنی مرۆڤایەتی، لە "زانستی نوێ"دا لەلای فیکۆ بابەتی سەرەکییە، ئەو بڕگەیەشی کە بە شێوازێکی لێهاتووانە داڕێژاوە ئەوەیە کە لە دوو توێیدا شیکردنەوەیەك بۆ میتۆلۆجیا هەیە و پێی وایە میتۆلۆجیا ڕەنگدانەوەیەکی پەیوەندییە سیاسییەکانە. ئەمڕۆکە میتۆلۆجیا تەنها لەبەرئەوە نەبووەتە جێی بایەخی فەلسەفە کە شێوەیەکە لە شێوە ئایدیۆلۆجییەکانی هۆشیاری، بەڵکو هەروەها لەبەرئەوەی توخمێکە لەو گرفتەدا کە گەوهەری بیرکردنەوەی سەرەتایی دەیخاتە بەر باس.

لایەنی هاوبەشی ئەو گرفتە مێژوویی فەلسەفیانەی کە لێرەدا لێیانکۆڵراوەتەوە، تەنها لە واتا و ئاماژەی ئێستایاندا نییە، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە لە دووتوێی ئەو شێوە سەرەتاییەدا کە تیایدا دەبینرێت، بنج و بناوانی خۆی لە هەمان بارودۆخی مێژووییدا دەبینێتەوە کە ئەمەیە: ئەم گیروگرفتانە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ وابەستەی پێویستی و ئارەزوو و پێداویستی و لێکدژییە دیاریکراوەکانی نێو ئەو کۆمەڵگایەن. هەربۆیە لێرەدا وەکی گیروگرفتگەلێك لە فەلسەفەی مێژووی بۆرجوازییەتدا دەستنیشان دەکرێن.

ماکس هۆرکهایمەر

فرانکفۆرت – لەسەر ڕوباری ماین،

مانگی یەنایەر – کانونی دووەمی 1930.

سەبارەت سەرنج و تێبینییەکان: بەو گوێرەیەی کە لە سەرەتادا دەربارەی ئامانجی ئەم کارە ئاماژەمان پێدا، سەرنجەکانمان بۆ چەند سەرنجێکی پێویست کورت کردۆتەوە: بەم پێیە خوێنەر هیچ ئاماژەیەکی بیبلۆگرافیانە بۆ کارە مێژوویی فەلسەفییەکانی ئەو نووسەرانە بەدی ناکات، دەکرێت ئەو زانیاریانە لەو کتێبە بەردەستانەدا کە بۆ زانستە سیاسی و فەلسەفییەکان تەرخان کراون، دەستبخرێن. هەروەها ئێمە بۆچوونی ئەو نووسەرانەمان لە دەقە ئەسڵییەکانەوە وەرنەگرتووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە بنەڕەتدا کارەکەمان لە ساناترین چاپە ئەڵمانییەکانەوە کە لەبەردەستدان، دەست پێکردووە.

## 1-ماکیاڤیللی و بۆچوونی سایکۆلۆجیانەی مێژوو

لە چاخی ڕێنیسانسدا بناغەی زانستە سروشتی و فیزیکییە هاوچەرخەکان داندرا. ئەم زانستانە ئارەزووی ئەوە دەکەن لە ڕێگای ئەنجامدانی تاقیکردنەوە بە ڕێگایەکی میتۆدیی ڕێکوپێك، بە دواییەکداهاتن "اطراد"ێك داخڵ بە ڕەوتی سروشت بکەن، زانینی ئەم بەدواییەکداهاتنانەش، بەشێوەیەکی ئیرادەگەرانە ڕێگا بە ڕوودانی هەندێك ئەنجام دەدەن یاخود ڕێ لە ڕوودانیان دەگرن. بە دەربڕینێکی تر، تا ئەوپەڕی

سنور لە کایەی کۆنترۆڵکردنی سروشت فراوان دەکەن. لە کاتێکدا تاقە ئامانجی رەفتاری فیکری لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بریتی بوو لە زانینی مانا و ئامانجی دونیا و ژیان، بەم پێیە تاڕادەیەك هەموو تەقەللاکانی خۆی بۆ لێکدانەوەی سروش و دەسەڵاتە کڵێساییەکان تەرخانکردبوو، پێشەنگەکانی رێنیسانس دەستیانکردە پرسیارکردن نەك دەربارەی ئەو ئامانجە باڵایەی کە دەخوازرێت لە نەریتی بەجێماو دەربهێنرێت، بەڵکو سەبارەت هۆکارەکانی ئەو رووداوانەی کە لە دونیادا روودەدەن، ئەو هۆکارانەی کە پێویستە بەهۆی سەرنجی هەستییەوە بسەلمێنرێن.

کەواتە بیرۆکەی وابەستەی بەدواییەکدا هاتنی ئەوەی کە لە ئاقار و رەوتی ژیاندا هەیە، دڵنیاییەکی تایبەتە بە زانستی نوێ، تێبینییە هاوشێوەکانی ئەوەش کە دەڵێت هەر تەن "جسم"ێك لە حاڵەتی کەوتنەخوارەوەی ئازاددا خاوەنی خێراییەکی دیاریکراوە، یاخود کە دەڵێت هەر ئاوێتەکردنێکی نێوان دوو مادە مادەیەکی نوێی لێ دێتە بەرهەم کە خەسڵەتی جیاواز لە توخمەکانی خۆی هەیە، یاخود ئەوەی کە دەڵێت خواردنی جۆرێك لە دەرمان هەندێك لە پەتاکان لەناودەبات، ئەمانە سەرنجگەلێکن تەنها ئەو کاتە بەلای کۆمەڵگاوە بەهاو نرخ پەیدا دەکەن ئەگەر ئەو رووداوانەی کە سەرنجیاندراوە لە داهاتوودا بێ هیچ گۆڕانێك دووبارە ببنەوە، بە دەربڕینێکی تر: ئەگەر رێسای کەوتنە خوارەوەی ئازاد هەروەکو خۆی بمێنێتەوە، ئاوێتەکردنی دوو مادەکەش هەموو جارێك هەمان ئەنجام بدات بەدەستەوەو ئەو دەرمانەی کە بۆ حاڵەتگەلێکی تری هەمان دەرد دەستنیشان کراوە، هەمان ئەنجامی هەبێت، دەکرێت ئەم لێکچوونەی نێوان رووداوەکانی ئایندەو رووداوەکانی رابوردوو بەهەر رێگایەك بێت، ئیدی چەندە رێگایەکی نارۆشنیش بێت، وێنا بکرێت، هەروەها دەکرێت جیاوازییە تایبەتەکانی هەر حاڵەتێکی دیاریکراو بە شێوەیەکی شێنەیی و لەسەرخۆ دەربهێنرێت و وەکو یەك ئاماژە بکرێت بۆ توانا و ئەگەری کارتێکردنە دژەکان یاخود شیاوێتی گۆڕانی مەرجەکان، چونکە بەهای یاساکانی سروشت کە بۆ زانستی نوێ، ئەو زانستەی کە لە چاخی رێنیسانسدا دامەزراوە، گرنگە، بەندە بە دووبارەبوونەوەی داهاتووی ئەو حاڵەتانەی کە پێویستە یاساکانی لەسەر دابمەزرێت: کەواتە بەندە بە ئەگەر و توانای جێبەجێکردنی ئەو یاسایانەوە[1]. ئەگەر و توانای یاسا سروشتییەکان، بەم پێیە کۆنترۆڵکردنی سروشت، وادێتە پێشچاو وەك ئەوەی لە ڕووی لۆژیکییەوە وابەستەی گریمانێکی پێشوەختە بێت سەبارەت ریزبەندی ئاقاری سروشت. بیرۆکەی بەدوای یەکداهاتن لە بناغەی دروستبوونی فیزیا و کیمیا و داخڵکردنی شێوازە ماتماتیکییەکان بەم زانستانەو، لە دەرکەوتنی ئەنترۆپۆلۆژیا و پزیشکیی زانستیدایە، بەڵام ئەم بیرۆکەی بناغەیە خۆی شیاوی ئەوە نییە لە رووی زانستییەوە بسەلمێنرێت، چونکە گریمانەیەکە بۆ ئایندە. پۆزەتیڤیزمی سەدەی نۆزدەیەم دەیویست ئەوە بچەسپێنێت کە مەسەلەکە زادەی ئەزمونە و بەمجۆرە دەیسەلماند: ئێمە نەك تەنها دەتوانین تێبینی دووبارەبوونەوەی ئەم چەشنە بەدوای یەکدا هاتنە لە هەر بوارێکدا بکەین، بەڵکو دەشتوانین، لە هەر خاڵێك لە زەمەندا، ئەوە بچەسپێنین کە پرۆسەی هەر پەرەسەندنێك هەمیشە و لە هەر شوێنێکدا بەر لەم ساتە بەشێوەیەکی دیاریکراو روویداوە و دواتریش هەر بە هەمان شێوە روودەدات: کەواتە ئێمە بە شێوازێکی دەرهێنان "استقرائی"ی، گریمانەی

بەدواییەکدا هاتنمان سەلماند[2]. لەم سەلماندنەدا ئاگاییمان لەوە نابێت کە خودی ئەم میتۆدە وێناکارییە تەنها ئەو کاتە میتۆدێکی یەکلاییکەرەوە دەبێت ئەگەر هەر لە سەرەتاوە گریمانی راستی و دروستی ئەو مەسەلەیە بکرێت کە دەخوازرێت بسەلمێنرێت. چونکە بەدوای یەکداهاتنی سروشت لە رابوردوودا پاساوی مەسەلەی بەدوای یەکداهاتنی لە داهاتوودا ناداتەوە تەنها لە حاڵەتی پێلێناندا نەبێت بەوەی کە: داهاتوو لەگەڵ رابوردوودا جوت دەبێت، بەڵام ئێمە بەم کارەمان، گریمانی چەسپاندنی ئەوەمان کردووە کە رێك لە ژێر پرسیاردایە. وێڕای ئەوە ناکرێت و ناشێت ئەم گریمانەیە لەسەر یاسایەك لە "یاسا سروشتی"ەکان، ئیدی هەرچییەك بێت، یاخود لەسەر هیچ نزیکبوونەوەیەکی لە جۆری ماتماتیکی، دابمەزرێت. ماتماتیك لە ئەگەرگەلێکی تیۆری دەکۆڵێتەوە، بەهەرحاڵ گریمانەی بەدوای یەکداهاتن بەندە بە جیهانی واقیعییەوە. وەك ئاشکراشە نائامادەیی ئەم گریمانەیە پێشوەختەیە لە باریدا بوو وا لە چەمکی ورد و دروستی سروشت بکات، چەمکی سروشت بەو جۆرەی کە لە سەردەمی نوێدا وێناکراوە، کە ئەستەم بێت، بە تایبەت لە زانستە میکانیکییەکاندا کە ماتماتیك بەکاردەبات. زانستی کۆمەڵگای بۆرجوازی لەوەتی دروستبووە و سەریهەڵداوە، هاوشانی پەرەسەندنی تەکنەلۆژیا و پیشەسازییە، زۆر ئەستەمە بتوانین تێبگەین ئەگەر باڵادەستی ئەم کۆمەڵگا (بۆرجوازی)ە بەسەر سروشتدا، بەهەند وەرنەگرین.

بەڵام ئەم کۆمەڵگایە تەنها پشت بە کۆنترۆڵکردنی سروشت بە مانا بەرتەسکەکەی و داهێنانی هۆکارگەلێکی نوێ بۆ بەرهەمهێنان و دروستکردنی ئامێرگەل بۆ گەیشتن بە ئاستێکی تەندروست، نابەستێت، بەڵکو هەروەها لەسەر بناغەی کۆنترۆڵکردنی هەندێك مرۆڤ لەلایەن هەندێکی ترەوە، دادەمەزرێت. کۆی ئەم هۆکارانە کە دەبنە مایەی ئەم کۆنترۆڵکردنە و ئەو ڕێ و شوێنانەش کە بۆ پاراستنی ئەم کۆنترۆڵە بەکاردەهێنرێن ئەو شتەیە کە ئێمە بە "سیاسەت"ی ناودەبەین، دیارترین خاسیەت و تایبەتمەندی ماکیاڤیللی ئەوەیە کە لە سپێدەی کۆمەڵگای نوێدا پێی لەمە نابوو: شیاوێتی و توانای بوونی زانستێك بۆ سیاسەت کە لە بنەماکانیدا لەگەڵ فیزیای نوێ و دەروونناسی نوێدا بگونجێت، هەروەها بە شێوازێکی ورد و دروست گوزارشتی لە هێڵە پانەکانی ئەم زانستە کردبوو، ئێمە لێرەدا باس لەوە ناکەین کە ماکیاڤیللی تا چی ئاست و ئەندازەیەك هەستی بەم هاوشێوەییە دەکرد، هەروەها لە بارەی ئەو فاکتەرانەش کە پاڵیان پێوەنا نووسین و کتێبی نووسەرە دێرینەکان یاخود زانایانی سەردەمەکەی خۆی بخوێنێتەوە، نادوێین، چونکە پرۆژەکەی ماکیاڤیللی پرۆژەیەکی ئاشکراو بێ گرێ و گۆڵە و بەمجۆرەیە: لە نێو کۆمەڵگای واقیعیدا خەڵکانێك هەن باڵادەستن بەسەر خەڵکانێکی ترداو، لە رێگای سەرنج و لێکۆڵینەوەی میتۆدیی رووداوەکانەوە زانین و زانیاری گەلێك دەستدەخەن کە توانای ئەوەیان پێدەدات جڵەوی دەسەڵات بگرنە دەست و بیپارێزن. ئەمە هەموو ماناکەیە و هیچی تر – هەڵبەت بە چاوپۆشیکردن لە نووسینەکانی لە بواری هونەردا – کە لە هەموو کتێبەکانیدا هەیە، نەك هەر بە تەنها لەم کتێبە سەرەکییەیدا: گوتارگەلێك دەربارەی دە کتێبی یەکەمی تیتۆس لیڤیۆس(*)، هەروەها نەك هەر لە کتێبە بەناوبانگەکەی میر(**) دا، کە دەتوانین بە بەشێکی سەربەخۆ لە کتێبە سەرەکییەکەی دابنێین،

بەڵكو هەروەها لەم كتێبە ناوازەیەشیدا: مێژووی فلۆرەنسا(***)(3).

زانا لە كاتی گەڕانیدا بە شوێن ڕەوت گەلێكدا كە لەگەڵ یاساكاندا بگونجێن، هەموو فاكتەكان بەشێوەیەكی گشتی، دەخاتە ژێر ركێفی راستەوخۆی خۆیەوە. بێ لە چەند مەسەلەیەك سەبارەت گەردونناسی و جیۆلۆجیا و چەند لقێكی تری زانستە سروشتییەكان، دەتوانێت بابەتگەلی سەرنج و تێبینییەكانی خۆی بە ئەندازەیەكی بێ سنور پێشكەش بكات. دەتوانێت بە هەنگاو هەڵگرتن لە ڕێسایەكیگشتییەوە، خۆی كارلێككردنەكان لە تاقیگەدا ئەنجام بدات و چەمك و تیۆریاكانیشی بەشێوەیەكی گشتی پشت بە ئەزموونە هەستییە تایبەتەكەی یاخود لایەنی كەم بە تاقیكردنەوەیەكی لە بنەڕەتەوە شیاوی دووبارەبوونەوە، دەبەستێت. فیزیا و كیمیاو هەروەها دەروونناسی و پزیشكیی بابەتگەلی سەرنجەكانی خۆیان لە نێو واقیعی ئێستادا بەدی دەكەن و هەریەكەیان هەرچی تاقیكردنەوەیەك كە دەیەوێت دەتوانێت بەشێوەیەكی ئازاد و لەسەر ئاستێكی بەرفراوان ئەنجامی بدات.. بە پێچەوانەی ئەمەوە دەبینین كەرەستەكانی زانستەكەی ماكیاڤیللی پێش هەرشتێك رابوردوو پێشكەشی دەكات و دەیدات. هەڵبەت جێی خۆیەتی باسی ئەوە بكەین كە ماكیاڤیللی، بەو پێیەی فەرمانبەرێكی بەرزی شاری فلۆرەنسا بوو كە یەكێك بوو لە هەرە دەوڵەتە پێشكەوتووەكانی ئەو سەردەم و ڕۆژگارە، توانیبووی هەم لە ناوخۆ و هەم لە دەرەوەی ئیتالیادا تێبینی رووداوگەلێكی سیاسی گرنگ بكات.

ئەو ماوەیەی كە تیایدا ماكیاڤیللی بەخت و پلە و پایەی خۆی لەدەستدا و ئەو قۆناغەی كە تیایدا كۆششی كرد بۆ دەستخستنی كاریگەرییەكی نوێ، بزاڤگەلێكی كۆمەڵایەتی گرنگ و چاكیان بە خۆیانەوە بینی. نووسراوو كتێبەكانی ئەوە دەردەخەن كە لە تێبینی كردنی سەردەمەكەی خۆیدا بیرتیژ بوو، بەڵام هەوڵ و تەقەللای سەرەكی ئاراستە بوو بەرەو دەرهێنانی مێژوو. رابوردوو، پتر لە ئێستا، ئەو سەرچاوەیەیە كە پێویستە جیهانی سیاسەت ئەو نموونانەی لێوەربگرێت كە توانای دیسپلینكردنی یاساكانی بەدوای یەكداهاتنی پێ دەبەخشن. وەختێك كە ماكیاڤیللی دانراوەكانی تیتۆس لیڤیۆس دەخوێنێتەوە بۆ ئاشنابوون بە مێژووی رۆمانی، لە دووتوێیاندا بە شوێن ئەو یاسا نەمرانەدا دەگەڕێت كە وابەستەن بە كۆنتڕۆڵكردنی خەڵكییەوە.

كەواتە، ناكرێت بنەمای رێك و ریزبەندی ئاراستەی شتەكان لە پرۆژەكەی ماكیاڤیللی جوێ بكرێتەوە. چونكە ئەگەر گروپە مرۆییە كۆمەڵبووەكان لە دەوڵەتگەلێك لە ئێستا و لە ئایندەدا، بە شێوازێكی جیاواز لەوەی كە لە رابوردوودا كردوویانە، هەڵسوكەوت بكەن و، ئەگەر خواست و ئارەزووەكانی مرۆڤ كە جڵەوی ئەم هەڵسوكەوتەیان بەدەستە، گۆڕانیان بەسەردا بهاتایە، بێگومان ئەو كاتە هەموو نووسینەكانی ماكیاڤیللی ئەو ئامانجەیان لەدەستدەدا كە مەبەستی دانەر بووەو، ئەو دەمە زانستەكەیشی بەلایەوە لە خەونێك زیاتر نەدەبوو. ئەم بۆچوونە پراگماتییەیە كە شێوەی دەرەوەی نووسین و كتێبەكانی ماكیاڤیللی پێشچاو دەخات. هەر كەسێكیش كتێبە سەرەكییەكەی "گوتارەكان" بخوێنێتەوە، ئەو راستییەی بۆ دەردەكەوێت. چونكە زۆرجار رووداوگەلێكی وەرگیراو لە تیتۆس لیڤیۆسەوە، وەك نەریتێكیش لە دوای پشكنینی نموونەگەلێكی

وەرگیراوی تر لە مێژووی كۆن یاخود نوێ، دەبێتە خاڵی دەستپێكردن بۆ هەر بەشێك كە لە كۆتاییەكەیدا تیۆرەیەكی گشتی لێدەردەهێنرێت. ماكیاڤیللی لە میردا یەك لە دوای یەك مەسەلەگەلێكی سیاسی پێشچاو دەخات و بەنیسبەت میرەوە بایەخ و گرنگییەكی تایبەت پەیدا دەكات و، لە بەشێكی بچوكدا كە بەشێوەیەكی گشتی ئەمیش هەر بە نموونە دەست پێدەكات، باس لە هەر گرفت و كێشەیەك دەكرێت. بەڵام مێژووی فلۆرەنسا تاقە نموونەیە: یادەوەریگەل و بابەتگەلێكی بەكەڵك كە دەشێت خزمەتی سیاسەتی داهاتوو بكات.

لە گوتارەكاندا شوناسی سروشتی مرۆڤ بەمجۆرە دادەڕێژرێت: ((هەمیشە مرۆڤەكان بە گوێرەی هەمان یاساگەل لەدایك دەبن، دەژین و دەمرن[4]. ئەوە تیۆرەی چەسپاویی سروشتی مرۆڤە كە هەموو كارەكانی ماكیاڤیللی دیاری دەكات. "هەركەسێك بەراورد لە نێوان ئێستا و رابوردوودا بكات دەبینێت هەمیشە و تا ئێستاش هەموو شارەكان و گشت میللەتان هەمان خواست و ئارەزوو دەیانبزوێنێت. بەمجۆرە، بەهۆی لێكۆڵینەوەیەكی ورد و لەسەرخۆ لە مێژوو، كاری پێشبینیكردنی ئەو رووداوو پێشهاتانەی كە لە كۆمارێك لە كۆمارەكاندا روودەدەن، ئاسان دەبێت، ئەو دەمە پێویستە ئەو هۆكارانە بەكار بهێنرێت كە پێشان دێرینەكان بەكاریان بردووە، یاخود لە حاڵەتی بەكارنەهێنانیاندا، پێویستە بەهەنگاو هەڵگرتن لە هاوشێوەیی رووداوەكانەوە، وێنای هۆكارگەلێكی دیكەی تازەونوێ بكرێت[5]".

دەكرێت لە شوێنێكی تری گوتارەكاندا ئەمە بخوێنینەوە: "دروست دانایان دەڵێن پێویستە بۆ پێشبینیكردنی داهاتوو راوێژ بە رابوردوو بكرێت، چونكی هەمیشە رووداوەكانی ئێستای جیهان نموونەی راست و دروستی خۆیان لە رابوردوودا دەبیننەوە. هەروەها لەبەرئەوەی ئەو رووداوانە لە لایەن خەڵكانێكەوە ئەنجامدراون كە ئەوسا و ئێستاش هەمان خواست و ئارەزوو جوڵاندونی و دەیانجوڵێنێت، كەواتە دەبێت بە زەرورەت هەمان ئەنجامیشیان هەبێت[6]." ماكیاڤیللی بڕوای وایە ئەو كەسانەی كە هۆكارەكانی بە نائاسایی دەزانن و نایانەوێت باوەڕ بە توانای چاوكردن لە رابوردوو لە رێگای گواستنەوەی بۆ داهاتوو، بهێنن، كەسانێكی نادان و كورتبینن: "وەك ئەوەی ئاسمان و خۆر و توخمەكان و مرۆڤەكان سیستەم و جوڵە و هێزیان گۆڕابێت و چیدی جیاوازبن لەو شێوەیەی كە لە كۆندا هەیانبووە[7]".

لێرەدا ئەم مەسەلەیە كە هەمیشە لێكۆڵیارانی ماكیاڤیللی بەخۆیەوە سەرقاڵكردووە، بەرباس دەخرێت: زانستی سیاسەت خزمەتی كێ دەكات؟ ئەو كەسە كێیە كە بە بڕوای ماكیاڤیللی، پێویستە بەسەر خەڵكیدا باڵادەست بێت؟ یاخود – لەگەڵ دابڕینی رەهەندێكی مێژوویی فەلسەفی زیاتر بەسەر پرسیارەكەدا – كام شێواز لە كۆنترۆڵكردن و چی شێوەیەك بۆ دەوڵەت لە روانگەی ماكیاڤیللیدا، دەركەوتووە كە باشترین شێوەیە لە مێژوودا؟ ئەم شێوەیە ئەگەر هەبێت، چییە و كامەیە؟

بە بڕوای ماكیاڤیللی بۆچوونگەلێكی ئێجگار جیاواز هەن كە پێدەچێت هەریەكەشیان بەڵگەی سەنگینی خۆیان هەبێت. ماكیاڤیللی لە كتێبی میردا كە پێشكەشی بە یەكێك لە دەسەڵاتدارانی بنەماڵەی "*Medicis*" كردووە، بانگەشە بۆ پادشاهێتی رەها لە توندترین شێوەكانیدا وەك تاقە هۆكارێك بۆیەكخستنی ئیتاڵیا، دەكات. بەڵام لە گوتارەكاندا بە پێچەوانەوە بڕوای وایە كە شێوەی كۆماری، بێ

هیچ دوودڵی و گومانێك باشترین شێوەیە بۆ دەوڵەت، چونكە تەنانەت گوزارشت لە هاوسۆزی و خواستگەلێكی دیموكراتی دەكات.

بەهەرحاڵ ماكیاڤیللی پێی وایە هیچ شێوەیەك لە شێوەكانی دەوڵەت ناتوانێت تاسەر بەردەوام بێت. لە رابوردوودا چەندین نموونەی جیاوازی حكومەت بە دوای یەكدا هاتن و چون، لە هەموو چاخ و سەردەمەكانیشدا هەروا دەبێت. خولێكی دیاریكراو هەیە كە بە رێكوپێكییەكی سروشتی دەڕوات بە رێگاوە. شێوەی یەكەمی حكومەت كە لە كۆكردنەوەی خەڵكانی پەرتەوازە دروست بووە، حكومەتی پادشاییە *Monarchie*: كە لە هەڵبژاردنی بەهێزتر و، پاشان ژیرتر و بەرابەرتر، لەدایك دەبێت.

هەر لەگەڵ دیاریكردنی دانانی میرەكان بەشێوەی میراتگری ئیدی دەسبەجێ پادشایەتی دەبێتە حكومەتێكی ستەمكار: سەرەنجام شۆڕش و ئاژاوە و دووبەرەكی لە دژی میرەكان لێدەكەوێتەوە. سەرەتا میللەت هانی پاشاگەردانی نادات، چونكە ئەوانەی كە قەڵەمڕەوییان زیاترە و دەستبلاوترن سنورێك بۆ ستەمكاری دادەنێن و رژێمێكی ئەریستۆكراتی دادەمەزرێنن. بەڵام رۆڵەكانیشیان هەر كەنەفت و بێ توانا دەبن لەوەی كە بۆ ماوەیەكی درێژخایان دەسەڵات لە دەستی خۆیاندا بپارێزن و بهێڵنەوە، چونكە ئەوان لە هەموو رۆژگار و سەردەمێكدا: "پەنایان دەبردە بەر تالان و بڕۆ و چاوچنۆكی و دەستدرێژی كردنە سەر ژنان و لە پێناوی تێركردنی حەز و ئارەزووەكانی خۆیاندا تەنانەت زەبر و زەنگیشیان بەكاردەهێنا. ئیدی لە پڕێكدا حكومەتی دەستەبژێریان دەكردە پادشایەتییەك كە كەمایەتییەك فەرمانڕەوایی دەكات"[8]. ئیدی بەمجۆرە دەكەوتن و دیموكراسییەت دادەمەزرێنرا. بەڵام هێندە نابات دیموكراسییەت بەلای "دۆخێك لە بەرەڵایی"دا لادەدات و دەكەوێتە نێو ئاژاوەگێڕییەوە، ئەو كاتە تەنها بەهۆی كەسێكی توند، دیكتاتۆر، پادشاوە میللەت لەو دۆخە رزگاری دەبێت و جارێكی تر خولەكە دەست پێدەكرێتەوە. هەڵبەت مەرج نییە لە نێو خودی دەوڵەت خۆیدا سەرتاپای ئەم زنجیرەیە رووبدات یاخود دووبارە ببێتەوە: "بەڵام ئەمە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت كە بەردەوامبوونی دەوڵەتان بەپێی پێویست درێژخایان نین تا بتوانن بەرلەوەی دابڕمێن چەند جارێك ملكەچی ئەم گۆڕانانە بن[9]".

دەوڵەتە بەهێزەكان دادەڕمێن یاخود ملكەچ بە دەسەڵاتی دەوڵەتانی هاوسێ دەبن، بەڵام ئەم رووداوانە پێچەوانەی خولی شێوەكانی دەسەڵات نین بەو جۆرەی كە ماكیاڤیللی كە لەمەدا ئیلهامی لە پۆلیب *Polybe** وەرگرتووە، باسی كردووە.

"گەورەترین كاریگەری باوی ئەو شۆڕشانەی كە ئیمپراتۆرییەتەكان رادەماڵن ئەو كاریگەرییەیانە كەوای لێدەكات لە ئارامی و سەقامگیرییەوە بچێت بۆ پاشاگەردانی و ئینجا لە دوایدا دەیگەڕێنێتەوە بۆ سەقامگیری. ئەو شتەی كە مرۆییە هەرگیز ئەوەی لە چارە نەنوسراوە كە لەگەڵ گەیشتن بە ئەوپەڕی پلەی كاملی كە لە توانادا بێت، ئیدی لە خاڵێكی چەسپاودا رابووەستێت، وەختێكیش كە بێ توانا دەبێت لە بڵندبوونی زیاتر، دەكەوێت، هەر لەبەر هەمان هۆكار كاتێك كە دەشكەوێتە ئەوپەڕی دۆخی پاشاگەردانییەوە و ئەوە دوا سنوری كەوتنی دەبێت، ئیدی بڵند دەبێت، بەمجۆرە هەرچی شتێك كە مرۆییە بەشێوەی بە دوای یەكترداهاتن لە چاكەوە بۆ خراپە و لە خراپەوە بۆ چاكە دەچێت. چاكەخوازی *Virtu* ئاسودەیی دروست دەكات و ئاسودەیش دەستبەتاڵی و بێكاری و بێكاریش پاشاگەردانی دروست دەكات و پاشاگەردانیش

دەبێتە مایەی وێرانکردنی دەوڵەتان، ئینجا پاش کەمێك، لە نێو رەحمی ئەم وێرانییەیدا ئارامی و سەقامگیرییە نوێیەکە سەرهەڵدەدات و ئەم سەقامگیرییەش چاکەخوازی دروست دەکات و لە چاکە خوازیشەوە سەروەری و خۆشگوزەرانی لەدایك دەبێت[10]". هەرچەندێکیش بتوانرێت باشترین شێوەی دەسەڵات، کە دەخوازرێت دروست بکرێت، بخوڵقێنرێت، بەڵام ئەمە رێگر نابێت لەبەردەم ئەوەدا کە رۆژێك لە رۆژان لەناوبچێت و بفەوتێت، چونکە هەموو شێوەیەك لە شێوەکانی دەسەڵات لە هەناوی خۆیدا تۆوی لەناوچوونی خۆی هەڵگرتووە. ماکیاڤیللی تاوتوێی لایەنی باش و خراپی هەرشێوەیەك لە شێوەکانی دەسەڵات دەکات و دواجاریش هیچ کامیانی بەبێ مەرج پەسەند نەکردووە. بەڵام لە راستیدا تەنها لە نێوان شێوەی کۆماری و پادشاییدا دۆش داماوەو لەبەر چەند هۆکارێکیش کە لە دوایدا لێیاندەدوێین، ئەرستۆکراتییەت رەتدەکاتەوە. وێڕای ئەوە ماکیاڤیللی دەڵێت: (کەواتە لەو شوێنەدا کە یەکسانی هەبوو یاخود کە یەکسانی هێنرایە کایەوە کۆماری دابمەزرێنن، بە پێچەوانەوە لەو شوێنەدا کە نابەرابەرییەکی زۆر هەبوو میرنشین دابمەزرێنن، دەنا کارەکەتان خراپ و کورتخایان دەبێت[11].)

بەم پێیە خودی ماکیاڤیللی خۆی ئەوە رادەگەیێنێت کە ئامۆژگارییەکانی ئاراستەی میرەکان و روبەروی کۆمارییەکان دەکات: بە جدییەتێکی چونیەك تاوتوێی هەریەك لە بەرژەوەندی میرەکان و ئەو رێ و شوێنانەی کە پێویستە نەیارانیان بۆ لەسەر دەسەڵات لابردنیان بیگرنەبەر، دەکات — زۆرجاریش ئەم تاوتوێکردنە لە دووتوێی هەمان بەش خۆیدا دێت. ماکیاڤیللی ئامۆژگاری حکومەتی پەیوەندیدار و هەروەها ئەوانەش کە پیلانی لە دژ دەگێڕن، دەکات. جا ئەگەر ئەو بەمجۆرە رەفتاری کردبێت، ئایا لەبەرئەوە بووە کە گەمەی هێزەکان تاقە شتە کە ئەو لە ژیانی کۆمەڵگادا بەلایەوە گرنگە؟ ئایا ماکیاڤیللی کەوتبووە ژێر کاریگەری کێشمەکێش لەسەر دەسەڵات بەو پێیەی گوزارشتێکی چڕ و پڕە لە ژیان و ئیدی کێشمەکێشە سیاسییەکانی رۆژگاری خۆی لەگەڵ خۆیاندا رایانماڵی و ئەویش بێگوێدانە هیچ ئەنجامێك دەستی کردە گەڕان بە دوای یاساکانیدا و، تاقە هاندەریشی لەم کارەیدا خواستی کەسیی خۆی بوو؟ هەندێك کەس لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی بوون "الوجود"ی نوێدا بەم چەشنە لە ماکیاڤیللی تێگەیشتن. پێدەچێت ئەو بانگەوازە پڕ جۆش و خرۆشانە بۆ سەربەخۆیی ئیتاڵیا کە دوا بەشی کتێبی میر لە خۆی گرتوون، وەك ئەوەی بەرایی بەو خۆشی و شادییە بدەن کە ئێمە گریمانی ئەوە دەکەین ماکیاڤیللی لەبەردەم نمایشکردنی هێزێکی گرنگ و زیندوودا نەك بە هاندەرێکی بەر هەست، هەستی پێکردووە. بەڵام ئەگەرچی ئەم چەشنە وێنانە تەواو چەوتیش نەبێت لە روانگەی دەروونناسییەوە، وەلێ سوکایەتی بە واتای بابەتیی فیکری ماکیاڤیللی دەکات.

سەرەڕای هەموو لێکدژییە دیار و ئاشکراکان، لەلای ماکیاڤیللی تەنها تاقە یەك پلیکانەی بەها لە ئارادا هەیە کە بەلای ئەو خۆیەوە سروشتی و بەڵگەنەویستەو لێی بەدگومان نییە و بێ هیچ دوودڵییەکیش گوزارشتی لێدەکات. ئەو لەبەرخاتری خودی خۆیان ئامۆژگاری پادشا و فەرمانڕەوا کۆمارییەکان ناکات، ئەوەی کە ئەو ویستیشی پێی رابگات هێز و مەزنی و جێگیرکردنی دەوڵەتی بۆرجوازی بوو لەسەر ئەو بناغانە. لە هەموو شیکردنەوەکاندا ئاکامگیرییەکی بەردەوام هەیە

دەچـێتە نێـو وردەکـاری رووداوە سیاسـییەکانی ئیتاڵیا لـە سـەردەمی ماکیاڤیللیدا وێڕای بەشداری خودی خۆی لە سیاسەتدا، کەچی سەرباری ئەوەش لەسـەر ئاسـتی تیـۆری تـەنها کـەمێك قسـە لـەبارەی گرنگترین ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەکەی کراوە. ئەم ئەنجامـە بـە وردی و دروسـتی گوزارشـت لێکـراوە، وابەسـتەیە بـە تێگەیشـتنی ئـەو بـۆ ئـەوەی کـە گەشـەکردنی کـۆ "المجموع" بەنـدە بە پەرەسـەندنی پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکان "Verkehr"، لابردنـی ئەو کەند و کۆسپانەی کە دەبنە رێگر لەبەردەم توانا بۆرجوازییـەکانی لەمـەڕ بازرگـانی و پیشەسـازی و ئازادی هاتوچۆی هێزە ئابورییەکان — بەهەرحاڵ ئەم چەشـنە پەرەسـەندنەی کۆمـەڵگا تـەنها بـەهۆی دەسـەڵاتی دەوڵـەتێکی بـەهێزەوە دەتوانرێـت دابـین بکرێـت. ماکیـاڤیللی ئـەم پەنـدەی تـەنها لـە کـاری دیپلۆماسـی و بەشـداری لـە شـەڕە ناوخۆییـەکانی فلۆرەنساوە وەرنەگرت، چونکە ئەو بڕوای وابوو لـە سـەرتاپای مێژوودا جەختکردنەوەگـەلی خـۆی هەیـە، بە تایبـەت لـە قۆنـاغی لوتکـەدا کـە رۆمـای کـۆن پێـی راگەیشت. لە ڕوانگەی ماکیاڤیللیدا تـەنها ئەو کاتە سیاسەت خانەدانترین رۆڵ دەبێت کە کەسی بیرمەند بیگێڕێـت، ئەگـەر بـە مانـا بۆرجوازیانەکـەی پەرەسـەندن، دەوڵـەت مـەرجی پەرەسـەندنی تـاك و کۆی میللەت بێت.

یـەکێك لـە چـەمکە دەستنیشـانکراوەکانی زانسـتەکەی ماکیـاڤیللی، ئـەم چـەمکەیە: Virtu. نووسـینێکی زۆر دەربـارەی واتـای ئـەم وشـەیە نووسراوە، بەڵام دروست، چونکی لەوەدا چارەسەری خاڵێکی ئیجگار گرنگی فیکری مێژوویی ماکیاڤیللی هەیـە. چـەمکی Virtu رۆڵێکـی یەکلاکـەرەوەی لـە مێـژووی فەلسـەفەدا گێـڕا. ئـەو گۆڕانکاریانـەی کـە بەسەر واتاکەیدا هاتوون پێشچاوخستنیان سەخت و دژوارە: چـونکە ئـەو مانایـەی کـە لـە چرکەسـاتێکی دیـاریکراودا وەریـدەگرێت پێویسـتە لـە دووتـوێی وابەستەبوونی بە کۆی ئەو پەیوەندیانەوە کە بوونی قۆناغی دەستنیشانکراو دیاری دەکەن، راڤەبکرێت. بەشـێوەیەکی گشـتی، دەکرێـت ناوەڕۆکەکـەی بـە باشترین شێوە دیاری بکرێت ئەگەر تەنها بەمەندە بەس بکەین: Virtus "vertu, virtu ، چاکەخوازی" لەو کایەیەدا کە ئەم چەمکەی تێدا بەکاردەهێنرێت، واتە کۆی ئەو تایبەتمەندییە ئێجگار ئارەزووکراوانە بەو پێیـەی تایبەتمەندیگـەلێکی لایـەق و شایسـتەن. بـۆ نموونـە ئـەو مرۆڤـەی کـە خـاوەنی چـاکەخوازی "Virtus"ە، مرۆڤێکـی "چـاکەخواز"ە، مرۆڤێکـە بـە پێی پێویست. بۆ نموونە کاتێك کە نەریتی سیاسی و سەربازی لای رۆمانەکان کاری خوارو ناپەسەند بۆ کۆیلـە بـەجێ دەهێڵێـت، ئـەمیش بـە ئەنـدازەی ئـەو شێوەیەی کە دواتر خاکێتی مەسیحی وەریدەگرێت، هەر "چاکەخوازی"ە. ئەم چەمکە لە لای ماکیاڤیللی، بە هەمان شێوەی چەمکە کلاسیکییەکە، ئاماژەیە بۆ خانەدانی و نەبەردی، بەڵام لە هەمان کاتیشدا مانای نـوێی کـارو لێهـاتوویی لـە قازانجـدا، لـەخۆگرتووە. ماکیاڤیللی تەنها لەبەرئەوە قینی لە "خانەدانەکان" نییـە چـونکە بەرهەڵسـتی چاکسـازییەکان دەکـەن و لەمپـەر دەهێننـە سـەر رێگـای دروسـتکردنی دەسـەڵاتگەلی ناوەنـدی و دەوڵەتگـەلی گـەورە و بـەم کارەشیان دەبنە کەندو کۆسپ لەبەردەم پێشکەوتنی بۆرجوازییەتدا بەگشتی، بەڵکو لەبەرئەوەی کە ئەوان بە مانا بۆرجوازیانەکەی وشەی کار، هیچ ئیش و کارێك ناکەن. "بۆ ئەوەی راڤەی ئەوەش بکەم کە مەبەستم لە خانەدان چییە" — وەك ماکیاڤیللی لە کتێبـی گوتارەکانـدا دەڵێـت — "دەڵێم هـەروەها بە هـەموو ئەوانـەش دەگوترێـت کـە بـێ ئـەوەی هـیچ ئیشـوکارێك بکـەن لەسـەر بەرهـەمی موڵـك و مـاڵی

خۆیان دەژین، هەروەها ئەوانەش کە نە جوتیاری و نە هیچ پیشەو کارێکی تر دەکەن، ئەم مرۆڤانە لە هەموو کۆمارەکان و لە سەرجەم دەوڵەتاندا مرۆڤگەلێکی مەترسیدارن، بەڵام پێویستە ئێمە لەوانە زیاتر بترسین کە وێڕای ئەو کەڵك و سود و دەستکەوتانەی کە ئاماژەمان پێدا، چەندین کۆشکیان هەیە و خزمەتکاری زەوییان هەیە گوێڕایەڵییان دەکەن(**)(12).

هەر کەسێك ئارەزووی دامەزراندنی کۆمار بکات تەنها ئەو کاتە دەتوانێت ئەم کارە بکات کە هەر لە سەرەتاوە دەستبکاتە ""لەناوبردنی خانەدانەکان(13). شێوەی چاکی دەوڵەت تەنها ئەو کاتە بە خاوەنی "چاکەخوازی" دەبێت ئەگەر ئەو مەرجانە، کە تیایدا هاوڵاتیان دەتوانن پەرە بە چاکەخوازییەکەیان بدەن، بەرجەستە بکات. پێویستە ئەو کەسانە، بێ هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك، کەسانێکی هۆشیار و بەهێزبن، بەم پێیە پێویستە لەسەریان لە چوارچێوەی پەیوەندییەکانی سەردەم و رۆژگاردا بە خاوەنی سیفەتگەلێك بن، کە سیفەتگەلی گەورە بەڵێندەر، یاخود بازرگان یاخود دەریاوان یاخود دراوگۆڕە. گەشەکردنی گشتی بەلای ماکیاڤیللییەوە بەندە بە گەشەکردنی ئەم پیشانەوە. دووربینی ئەو لەوەدا دەردەکەوێت کە دروست مەرجی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی لە چاخی رێنیسانسدا لەگەڵ سەرکەوتنی چینی بۆرجوازیدا بەرجەستەبوو. بە گەیشتنمان بەم خاڵە، دەتوانین لە پەیوەندی ماکیاڤیللی بە ماکیاڤیللیزمەوە تێبگەین، کە زۆرجار بە گومڕابوونی سیاسی لە رادەبەدەر و شێوە کارکردنێکی داماڵراو لە هەر رەفتارێکی "ئاکاریی" لێی تێگەیشتوون. ماکیاڤیللی داوا دەکات هەموو دوودڵیەك ملکەچی ئەمە بکرێت کە بەلایەوە وەك ئامانجی باڵا وایە: هێنانەکایەی دەوڵەتێکی بەهێز و پاراستنی بەشێوەیەکی بەردەوام ناوەندیانە وەك مەرجێك بۆ خۆشگوزەرانیی بۆرجوازی. دەشتوانین ناوەڕۆکی میر و گوتارەکان لەم فۆرمەدا کورت بکەینەوە: ئامانج پاساوی هۆکار دەداتەوە، لایەنی کەم لەگەڵ دیاریکردنی ئەوەدا کە ئەم ئامانجە بریتییە لە دامەزراندنی چاکترین جیهان کە لە تواناداا بێت. پێویستە ئایین و ئاکاریش ملکەچ بەم ئامانجە بکرێن کە باڵاترین ئامانجی کاری مرۆڤایەتییە و تەنها بە ناوی ئەم ئامانجەشەوە دەتوانرێت پەناببرێتە بەر درۆکردن و فریودان و نەگریسی و توندوتیژی و کوشتن.

لە راستیدا، هۆکارەکانی هەژمونکردن بەسەر خەڵکیدا، کە ماکیاڤیللی لە مێژوو کۆی کردبوونەوە، هەمیشە لە سیاسەتدا بەکاردەهێنران، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بە هیچ کلۆجێك بە ئامانجی ئەم ئامانجە باڵایە بەکارنەدەبران. وەختێك کە ماکیاڤیللی لە بەشی هەشتەمی بەناوبانگی میردا ئەوە ڕۆشن دەکاتەوە کە میر دەتوانێت پەیماننامەگەلێك هەڵبوەشێنێتەوە، بەڵام لەسەری پێویست نییە پەیمانی خۆی بباتە سەر و کاتێك دانەر ئەوە بەیاندەکات کە ئایین لە هەموو چاخ و سەردەمەکاندا بۆ پارێزگاریکردن لە ملکەچی چینە بندەستەکان بەکارهاتووە و کاتێك کە لەم ڕوانگەیەوە و بەشێوازێکی گاڵتەجاڕ ئامێز، بەراورد لە نێوان تایبەتمەندییەکانی ئایینی مەسیحی و ئایینی بتپەرستیدا دەکات، وەختێك تێبینی لەناوبردنی سەرلەبەری گروپگەلێکی مرۆیی وەك هۆکارێکی تری شیاو لە هەلومەرجگەلێکی دیاریکراودا دەکات، بە کورتی، وەختێك ئەوە بەیان دەکات کە پیرۆزترین پیرۆزەکان کتومت وەکی خراپترین تاوانەکان لە هەموو سەردەم و رۆژگارێکدا هۆکارگەلێك بوون بە دەست دەسەڵاتدارانەوە، بەم کارەی ڕێبازێکی

مێژوویی فەلسەفی ئێجگار پڕ مانای داڕشتووە. هەرچی ئەو هەڵە و چەوتییەشێتی کە لەگەڵ ڕێبازی مافی دەوڵەت "*Raison detat*"دا لە قۆناغی پاشتردا گەورەتر بوو، لەوەدایە کە ئەو هەم سەبارەت رابوردوو هەم سەبارەت داهاتووش، پاکانەی بۆ هۆکارگەلێکی باڵادەستی کردووە کە لە رۆژگارو وڵاتەکەی خۆیدا، مەرجگەلێکی پێویست "*Sine qua non*" بوون بۆ هاتنەسەرەوەی بۆرجوازییەت. دابڕینی بەهایەکی هەمیشەیی بەسەر شتێکدا کە لە راستییەکی کاتی بەولاوە هیچی تری نییە، خەوش و لەکەیەکی چلۆنایەتییە لە فەلسەفەی نوێی مێژوودا.

ئەو هۆکارانەی کە تا ئێستاکە بەشێوەیەکی غەریزیانە بەکارهێنراون، ماکیاڤیللی دەیەوێت لە داهاتوودا دەسەڵاتداران بە شێوازێکی هۆشیارانە بەکاری بهێنن. بەڵام لێرەدا ماکیاڤیللی مل بۆ لەزەتی ئەم دۆزینەوە ساویلکانە ئێجگار پەرەسەندووەی لای رێنیسانسگەراکان دەدات، گرنگترین بنەما لە بنەماکانی لە بواری جێبەجێکردنی ئەم هۆکارانەدا کە ئەمانەن: پەردەپۆشکردن، نهێنی و، فریوکاری، فەراموش دەکات. چونکە وەك ئاشکرایە ناتوانرێت ئایین وەك هۆکارێکی سیاسی بەکاربهێنرێت ئەگەر هەر لە سەرەتاوە بە راشکاوی بەو جۆرە پێشکەش بکرێت، تاوانەکانیش هیچ خزمەتێك بە دەسەڵاتداران ناکەن ئەگەر بە ئاشکرا ئەوە رابگەیەنرێت کە ئامرازگەلی پێداویستی ئەوانن. ئەگەرچی لێکچوونێکی بونیادگەرانە هەیە لە نێوان زانستی ماکیاڤیللی و زانستە سروشتی و فیزیکییەکاندا کە ئەمەی دوایشیان بناغەکانی هەر لە ماوەی چاخی رێنیسانسدا دانراوە، بەڵام وەختێك کار دێتە سەر جێبەجێکردن وا پێدەچێت ئەم زانستانە جیاوازییەکی قوڵیان لە نێواندا هەبێت. وەختێك کە جیهان، بێ پێچ و پەنا، ئەو یاسایانە دەخاتە ڕوو کە دۆزیونێتیێوە، هیچ لە توانای جێبەجێکردن سڵ ناکاتەوە بەڵام ئەو پەیوەندیانەی کە ماکیاڤیللی دروستی کردون تەنها ئەو دەمە دەتوانرێت چالاکانە بخرێنە کارو بەکاربهێنرێن ئەگەر وەك کارەسات و بەڵگەلێکی تەنها تایبەت بە رابوردوو پێشکەش بکرێن و بەردەوامبونیان لە واقیعی ئێستادا رەت بکرێتەوە. ئەوەی کە حەماسەتی فەیلەسوف و پیاوی دەوڵەت "بیکۆن"[***] و لە دوایشدا هیگڵی وروژاند — لەو بارەیەوە کە ماکیاڤیللی گوزارشت لەوە دەکات کە هەیە نەك کە پێویستە هەبێت، بە گوێرەی بۆچوونێکی شەخسیی یاخود بەپێی بۆچوونە باوەکان، هەبێت — پێچەوانەی ئامانجی ماکیاڤیللییە. کاتێك کە فریدریکی دووەم کتێبی "لە دژی ماکیاڤیللی" تەواو کرد، دەکرا گەورە فەیلەسوفێك ئەمەی پێ بڵێت: "جەنابی خاوەنشکۆ، پێم وابێت یەکەم وانە کە ماکیاڤیللی فێری قوتابییەکەی خۆی کرد ئەوە بوو کە بەرپەرچی کتێبەکەی بداتەوە[14]".

ئەگەر ماکیاڤیللی بەوپەڕی پەرۆشی و تامەزرۆییەوە مژدەی دەوڵەتی بەهێزی دابێت ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕی توند و بەهێزی ئەو بە توانای پێشکەوتنی فیکری و ئاکاری. پێشکەوتنی ژیوار و تەنانەت دروستبوونیشی، هەردووکیان بەگوێرەی بۆچوونی ماکیاڤیللی، لە رووی مادییەوە مەرجدارن. "خەڵکی تەنها بە ناچاری کاری چاکە دەکەن، بەڵام هەر کە سەرپشك دەکرێن و ئازادی هەڵبژاردنیان لە ئەنجامدانی خراپەکاریدا بەبێ سزادان دەستگیر دەبێت، دەسبەجێ ئاژاوەو پاشاگەردانی لە هەموو شوێن و جێگایەکدا بڵاودەکەنەوە. هەر ئەمەشە کارێکی وای کردووە کە بگوترێت هەژاری و نەداری خەڵکی زرنگ و ژیر دەکەن و یاساکانیش

خەڵکانێکی چاکەخواز دروست دەکەن"[15]. دواجار کۆی پەیوەندییەکانی بوون کە لەسەر بناغەی کار دامەزراون ناگەڕێنەوە بۆ بنەچەیەکی فیکری، بەڵکو زادەی پێداویستییەکی مادیین. خودی ئاکاریش لە نیاز و مەبەستە فیکرییە خۆڕسکەکانەوە سەرچاوە ناگرێت، هەروەها بە هیچ کلۆجێك لەسەر هیچ غەریزەیەکی ئاکاریش دانامەزرێت، بەڵکو زادەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە بە زەرورەت دیاریکراوەکانە. هەر کارێکیش کە لەگەڵ یاساکان و ئەو دابونەریتانەدا کە لە کۆمەڵگایەکی شارستانیدا پەیڕەو دەکرێن، بگونجێت، بە کارێکی ئاکاری دادەنرێت.

نە مرۆڤایەتی بە گشتی و نە تاکەکەس، بە خواست و ئارەزووی ڕۆحپاکی و ئەدەب و چاکە و دادپەروەری لەدایك دەبن و دێنە دونیاوە، ئەوەی کە هەیە پەیوەندییە سۆنگییە سروشتییەکانە کە ئەمەیە: لە هەر قۆناغێکدا، دروستبوونی ئاکارو ناوەڕۆکە تایبەتەکەی، بە پێویستییە گۆڕاوەکان لە میانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا دیاری دەکرێت. ئەوە بڕو ئەندازەی چاکەخوازییە ئەو ئاستە گشتییە دیاری دەکات کە ژیاری مرۆڤایەتی پێی ڕاگەیشتووە، بەڵام ئەمێستا و لەم بارەیەوە چاکەخوازی ئازادی بۆرجوازییە.

لە ڕوانگەی ماکیاڤیللیدا تا ئێستا پێشکەوتنی شارستانیەت بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە شاراوە بووە لە ململانێی نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکاندا. ئەم ململانێیانەش کە بینیونی لە بنەڕەتدا لە شێوەی شەڕگەلی ناوخۆییدا گوزەراون، لە ڕوانگەی ئەودا هیچ سیمایەکی زیانبەخشیان نییە، چونکە مەرجێکی گەوهەرین بۆ گەیشتن بە دونیایەکی باشتر. ئەو شێوەیەی ململانەی چینەکان کە لە نزیکەوە بینیویتی و تیایدا ژیاوە ئەوەیە کە وابەستەی کێبڕکێی خوێناوی نێوان خانەدان و بۆرجوازییەتە. "جارێکی دی جەختی لەسەر دەکەمەوە ئەو کەسانەی کە پرۆتیستۆی کێشمەکێشەکانی ئەنجومەنی پیران و میللەت دەکەن، لە ڕاستیدا سەرزەنشتی ئەوە دەکەن کە وەك بنەمایەك بۆ ئازادی تەماشا دەکرێت، ئەوانە پتر لەوەی ئەو ئەنجامە باشانە کە ئەو کێشمەکێشانە پێی ڕاگەیشتوون، کاری تێکردبن، کەوتونەتە ژێر کاریگەری ئەو هات و هاوارەی کە ئەو کێشمەکێشانە لە کۆڕە گشتییەکاندا دروستی دەکەن. لە هەموو کۆمارێکدا دوو پارت هەن کە ئەمانەن: پارتی گەورەکان و پارتی میللەت، یاسا بەجێیەکانی ئازادی تەنها بە ناکۆکی ئەم دوو پارتە لەدایك دەبن"[16]. ماکیاڤیللی لە پێشەکی مێژووی فلۆرەنسادا دەڵێت: "بە بڕوای من هیچ نموونەیەکی دیکە نییە وەك ئەم نموونەیە بە چاکترین شێوە هێزی دەوڵەتەکەمان بسەلمێنێت: ئەو نموونەیەی کە وابەستەی ناکۆکی و جیاوازییەکانمانە کە لە باریاندا بوو بە کەڵکی دەوڵەتێکی گەورەتر و بەهێزتر بێن، لە کاتێکدا کە هەمیشە فلۆرەنسا هێزگەلی نوێی لێوەردەگرێت"[17].

وا لە بەرهەڵستانیشی دەکات لەمەڕ ئەو هۆکارانەی کە لەلایەن زۆربەی خەڵکی ڕۆمانییەوە لەم ململانێیەدا بەکاردەهێنرێن، بەمجۆرە بدوێن و بڵێن: "بەڵام چی هۆکارگەلێکی سەیرو نامۆ! بیستنی هاواری میللەتی ڕاپەڕیو لە دژی ئەنجومەنی پیران و هاواری ئەنجومەنی پیران دژ بە میللەت، لەگەڵ دیتنی خەڵکی دەم بە هاوار لە شەقامەکاندا و داخستنی دوکانەکان و تەنانەت دەرچوون لە ڕۆما بە کۆمەڵ!"[18]. بەڵام هەروەها دەڵێت، ئەگەر ئەوانە "هەر بە خوێندنەوەیان شتگەلێکی سامناك بن"، بەڵام لە ژیانی دەوڵەتدا بە ناپێداویست تەماشا

ناکرێن. "کەمجار راپەڕینەکانی میللەتێك زیانبەخش دەبێت بۆ ئازادییەکەی. چونکە بە شێوەیەکی باو ئیلهامی ئەم ڕاپەڕینانەی لەو چەوساندنەوەیە کە دووچاری دەبێت یاخود ئەو چەوساندنەوەیە کە سڵی لێدەکاتەوە، بۆ دێت[19]". باشترین دامەزراوە لیبرالییەکان بەلای ئەوەوە ئەنجامێکی سروشتیی باوی ئەم چەشنە بزوتنەوانەن.

بەڵام ماکیاڤیللی بیر لە کێشمەکێشگەلی تر دەکاتەوە: ئەو کێشمە کێشەی کە لە نێوان خانەدانەکان و میردا هەیە بە تایبەت لە نێوان پۆپۆلۆ *popolo* واتە بۆرجوازییەت و زۆربەی میللەت: ئەو کرێکارانەی کە لە پیشە دەستیەکان "مانیڤاکتۆر" و بەندەر و دەریاوانیدا کاردەکەن، هەروەها هەژارە بێنەوا و بێکارەکان و ئەوانەی کە لە ماوەی چاخی رێنیسانسدا پاشاگەردانییان لە شارو گوندەکاندا دەنایەوە. ئەوە یەکەمین سەرەتاکانی پرۆلیتاریای نوێیە. "لە فلۆرەنسا خانەدانەکان یەکەمین خەڵکانێك بوون کە لە نێو خۆیاندا دابەشبوون و جیابوونەوە، ئینجا خانەدانەکان و میللەت و دواجار میللەت و خەڵکانی ناکەس و نادان "رعاع" دابەشبوون و جیابوونەوە: تەنانەت چەندین جار گروپی سەرکەوتوو دابەش بوو بەسەر دوو بەشی نوێدا و لە ئەنجامی ئەم دابەشبوونانەشدا چەندین رووداوی تیرۆر و دوورخستنەوە "نفی" و لەناوبردنی بنەماڵەکان روویاندا، رووداوگەلێك کە لە هیچ شارێك لەو شارانەدا کە مێژوو باسی کردون، روویاننەداوە[20]" ماکیاڤیللی لە مێژووی فلۆرەنسادا بە وردی باس لە جوڵانەوەیەك دەکات کرێکارانی رستن و چنین و چەند پیشەیەکی تر لە پێناو چاکسازی و زیادکردنی کرێدا ئەنجامیانداوە. یەکێك لەو کرێکارانە "کە لە هەموویان بوێرتر و هۆشیارترە" دەهێنێتە قسە و، لە گوتارەکەیدا دەڵێت: "پێم وابێ ئێمە بەرەو سەرکەوتنێکی بێ چەند و چون هەنگاوهەڵدەگرین، چونکە ئەو کەسانەی کە لە باریاندایە بەر بە پرۆژەکانی ئێمە بگرن دەوڵەمەندگەلی پەرتەوازەن: ئەو ناکۆکییەی کە لە نێوانیاندا هەیە سەرکەوتنمان بۆ مسۆگەر دەکات، هەرچی سەروەت و سامانەکانیشیانە هەرکە دەستمان بەسەرداگرت ئیدی زامنی پاراستنی سەرکەوتنمان بۆ دەکات. ئێوە بە گەورەیی پلە و پایەکانیان کە وەك چەکێك لە دژتان بەکاریاندەبەن، فریو مەخۆن. هەموو خەڵکی یەك بنەچە و بنج و بناوانیان هەیە و لە گەورەیدا چوونیەکن، چونکە سروشت لە هەمان نموونە دایڕشتوون. رووتبنەوە، ئەو دەمە هەموو چوونیەك دێینە پێشچاو، ئێوە جل و پۆشاکی ئەوان و با ئەوانیش پۆشاکی ئێمە لەبەر بکەن ئەو کاتە بێ هیچ دوودڵی و گومانێك ئێمە خانەدان و ئەوانیش میللەت دێنە پێشچاو، چونکە ئەوەی کە جیاوازی دروست دەکات چیدی نییە جگە لە دەوڵەمەندی و هەژاری. دروست من باری خەم دامدەگرێت وەختێك زۆرێك لە ئێوە دەبینم لە پای کردەوەکانیان سەرزەنشتی خۆیان دەکەن و بیر لە دەستبەرداربوون لە بەشداربوون لە هەوڵ و تەقەللای دیکە دەکەنەوە: بە دڵنیاییەوە، ئەگەر مەسەلەکە بەو جۆرە بێت، ئێوە ئەو مرۆڤانە نین کە من پێم وابوو، نابێت ئێوە لە پەشیمانی و برسێتی سڵ بکەنەوە، چونکە سەبارەت سەرکەوتووەکان، ئیدی رێگای سەرکەوتنیان هەرچۆنێك بێت، شتێك نییە ناوی برسێتی بێت. نابێت هەست بە هیچ سەرزەنشتێك بکەین چونکی هەر شوێن و جێگایەك، وەك لای خۆمان، ترس لە برسێتی و بەندیخانەی تیادا بێت، ناکرێت و ناشێت ترس لە دۆزەخی تیادا بێت. ئەگەر لە کار و کردەوەی مرۆڤەکان وردببنەوە دەبینن هەموو ئەو کەسانەی کە سەروەت و سامانی بێ

شومار یاخود دەسەڵاتی بەهێزیان دەستگیر بووە، تەنها بە هۆی هێز یاخود بە فێڵ و تەڵەکە بەو پلە و پایەیە راگەیشتوون، دواتر هەرچی شتێك کە بە فێڵ و زەبر و زەنگ زەوتیان کردووە، بە پەردەیەکی ئابڕومەند کە پەردەی قازانجی ساختەیە، پەردەپۆش دەکەن بۆ ئەوەی ڤێزەونیی سەرچاوەکەی بشارنەوە. هەرچی ئەو کەسانەیشە کە زاتی ئەوە ناکەن زیاد لە ڕادە بە وریایی یاخود بێئەندازە بە گەوجیی ئەم هۆکارانە بەکاربهێنن، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر نغرۆی نێو کۆیلەیێتی و هەژاری دەبن، چونکە هەمیشە خزمەتکارە ئەمەکدارەکان بە کۆیلەو، چاکەخوازەکانیش بەردەوام بە هەژار دەمێننەوە[21]".

کەواتە ماکیاڤیللی ئاشنای هەموو چەشنە کێشمەکێشە چینایەتییەکانی سەردەمەکەی خۆی بووە و باسی کردون. وێڕای ئەو قوربانیانە کە ئەم کێشمەکێشانە لە خۆیانی دەگرن بەلام بەلای ماکیاڤیللیەوە، بەو پێیەی کە ئەو چاودێری مێژووی گشت جیهانە، مەرجێکی پێداویستی پەرەسەندنی مرۆیین، چونکە مەرجەکانی ژیانی دەرەکی مرۆڤەکان هانی مرۆڤەکان دەدات بچنە گەرمەی ئەو ململانێ توندانەوە و بەشداری تیادا بکەن، جارێکی دیکەش زەرورەت وەك هۆیەك بۆ پێشکەوتن بەدیار دەکەوێتەوە. بەلام ئایا ئەم کارە مانای پرۆژەکەی ماکیاڤیللی ناخاتە ژێر پرسیارەوە؟ ئایا ئەم تیۆرە ماتەریالییە لەگەڵ ئەو بڕوایەیدا دێتەوە کە دەڵێت دەکرێت زانینی یاسا مێژووییەکان شتێك لە شتەکان چاك بکات؟ ئایا مرۆڤەکان بەشێوەیەکی گشتی، توانای ئەوەیان هەیە شێوە دەستێوەردانێکی هۆشیارانە دەست لە ئاقاری مێژوو وەربدەن؟ ماکیاڤیللی وەك نەریتێکی هەمیشەیی خۆی ئەم پرسیارە لە پێناو ئامانجێکی کردەییدا دەکات و لە میردا دەڵێت: "قەدەر چ دەستێکی لە کاروبارە مرۆییەکاندا هەیە؟[22]".

مەبەستیشی لە "قەدەر" هەر شتێکە کە بەند نەبێت بە ویستی مرۆڤەوە. "ئەز هەرگیز لەوە بێئاگانیم کە زۆرێك لە خەڵکی ئەوسا و ئێستایش بیریان لەوە کردۆتەوە و دەکەنەوە کە یەزدان و قەدەر شتەکانی ئەم دونیایە بە جۆرێك تەگبیر دەکەن کە هەموو زرنگی و ژیرییەکی مرۆیی ناتوانێت ئاراستەکەی بگۆڕێت یاخود ڕێکی بخات: بەم پێیە دەکرێت بگەینە ئەم ئەنجامگیرییە: بێسودە بەوپەڕی خۆماندووکردنەوە بایەخ و گرنگی بەوە بدرێت، هەموو ئەو شتەی کە ئەم کارە دەیخوازێت تەنها ملدان و وازهێنانە لە هەر شتێك تا بە گوێرەی قەدەر بڕوات بە ڕێگاوە" .. "من خودی خۆم لە پاش چەند جارێك بیرکردنەوەم لەو مەسەلەیە بەشێوەیەکی نێوەناتەواو گەیشتمە ئەم بۆچوونە. لەگەڵ ئەوەشدا نەمتوانی گریمانی ئەوە بکەم کە ئازادی هەڵبژاردن لە لای ئێمە بگۆڕێت بۆ هیچ، هەر بۆیە من پێم وایە ڕەنگە ئەوە ڕاست بێت کە قەدەر دەستی لە نیوەی کاروبارەکانماندا هەیە، بەلام تاڕادەیەك نیوەکەی تری بۆ دەسەڵاتی خۆمان بەجێدەهێڵێت. من ئەوە بە ڕوبارێکی توند بەراورد دەکەم وەختێك کە لافاو دەکات، دەشت و دەر دادەپۆشێت، دارو درەخت و خانووەکان هەڵدەکەنێت و خاك و خۆڵ لەگەڵ خۆیدا ڕادەماڵێت و دەیبات بۆ شوێن و جێگایەکی دیکە، هیچ شتێك ناتوانێت پێشی پێ بگرێت. وێڕای ئەوە، چەندێك بە جەور و ستەمیش بێت، خەڵکی لە دوای تەواوبوونی کارەساتەکە کەمتەرخەمی ناکەن لە گەڕان بە شوێن هۆکارگەلێکی لە نموونەی بەربەست و بەنداوەکان و.. هتد دا بۆ خۆلادان لە لافاوەکان، بە جۆرێك کە ئەگەر لافاوێکی دیکە رووبدا ئاوەکان لە چەم و جۆگادا کۆدەکرێتەوەو، ناتوانێت وەك جاری

جاران بە ئازادانە ورووژم ببات و زەرەر و زیانێکی زۆر بخاتەوە. مەسەلەکە بە نیسبەت قەدەریشەوە کە دەسەڵاتی لەو جێیەدا دەردەکەوێت و لەو جێیەدا دەستی خۆی دەوەشێنێت کە تیایدا هیچ بەرەنگارییەك لە ئارادا نییە و مەترسی خۆی بەرەو جێیەك دەبات کە دەزانێت هیچ بەربەستێکی ئامادە بۆ راگرتنی لە گۆڕێدا نییە، هەر هەمان شتە(23).

وەك ئاشکرایە پێویستە ئێمە هەمیشە فاکتەرە سروشتییەکان بە هەند وەربگرین، چونکە تەنانەت مێژووی تەکنەلۆژیا کە مرۆڤ بە هۆیەوە خۆی لەگەڵ سروشتدا بەراورد دەکات، خاوەنی لۆژیکێکی تایبەت بە خۆیەتی کە ئێمە ناتوانین دژو پێچەوانەی بین، هەروەها بە هیچ کلۆجێك ناتوانرێت هێزی سروشت بە شێوەیەکی بنەبڕ لەناوببرێت. بەڵام کۆنترۆڵکردنی تا ئاستێکی بەرفراوان هەر لە تواناادا دەبێت. ئەم مەسەلەیە تەنها بەسەر سروشتدا بە دیاریکراوی – بابەتی زانستە سروشتی و فیزیکییەکان – دا پراکتیزە نابێت، بەڵکو هەروەها بەسەر پرۆسەی پەرەسەندنیشدا کە لە سروشتی کۆمەڵایەتیدا روودەدات، پراکتیزە دەبێت. خولی ماکیاڤیللیانەی پەیوەست بە شێوەکانی حکومەتیش، لە رووی بنەماکەیەوە، یاسای زیوی "قانون قلز"ە(****). دەکرێت هەوڵی کورتکردنەوەی قۆناغە خراپەکان و درێژکردنەوەی قۆناغە باشەکان بدرێت، هەروەها دەکرێت لە رێگای ئاوێتەکردنی شێوەکانی دەسەڵاتەوە رەوشتێکی پتر بەردەوامتر بخولقێنرێت بەو شێوەیەی کە لەلای ماکیاڤیللی و پۆلیب *polybe* ی کۆنە ئیلهامبەخشی، لە کۆماری رۆمانیدا هەبوو کە بەمجۆرە بوو "کۆنلگەل، ئەنجومەنی پیران، پارێزەران "محامی" ی مافەکانی میللەت"، هەرچی هەوڵی ئاوەژوکردنی خولەکە و پێچەوانەکردنی بزوتنەوەی مێژووشە لە باریاندایە

کە بە بەڵاو نەهامەتی و زەرەر و زیان بگەڕێنەوە. ماکیاڤیللی نکوڵی لەمە دەکات: "بەختەوەرە ئەو کەسەی کە زۆر چاك دەزانێت چۆن چۆنی خۆی لەگەڵ سەردەم و رۆژگارەکەی خۆیدا بگونجێنێت و بەدبەختە ئەو کەسەی بە شێوەیەکی گونجاو رەفتاری لەگەڵدا ناکات(24)". لێرەدا تۆوی هیگلیزم لەمەڕ مرۆڤە مەزنەکان دەبینین: ئەوەی ئەم مرۆڤانە لە وەهمگەراکان "*phantasten*" جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە ئەمان بەشێوەیەك کە لەگەڵ سەردەمەکەیاندا بگونجێت، گوزارشت دەکەن و دەکارێن، لە کاتێکدا کەسی وەهمگەرا بە خەیاڵی خۆی باز بەسەر واقیعدا دەدات.

ماکیاڤیللی پەراوێزێك لە ئازادی بۆ چالاکی مرۆیی بەجێهێشتووە کە لە چوارچێوەکەیدا پێداگری ویست و ئیرادە دەتوانێت کار لە ئاقاری سروشت و کۆمەڵگا بکات. ئایا لەلای مرۆڤەکان شتێك هەیە شیاوی ئەوە نەبێت فاکتەرە سروشتییەکان ملکەچی بکەن، بەهرەیەك کە پێویستە بدرێتە پاڵ هێزێکی سەروو سروشتی، یاخود بگەڕێنرێتەوە بۆ رەها، یاخود بۆ بەخشندەیی یاخود هەڵبژاردنێکی ئازاد؟ بە پێچەوانەی تەوژمە پرۆتستانتییەکانەوە بیریاری سەردەمی رێنیسانس بە نەخێر وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوە. وەختێك کە ماکیاڤیللی بیر لە توانای بڕیاردانی ئازاد دەکاتەوە هیچ نیاز و نیەتێکی خراپی لە دژی ئاقاری سروشت نییە، خودی ئیرادەیش مەرجدارە بە فاکتەرگەلێکی سروشتی لە نموونەی غەریزە و خواست و ئارەزووە سروشتییەکان کە هیچ کەس بەرەنگاریانی پێناکرێت، رێك و راست وەکی کەوتنەخوارەوەی ئەو بەردە کە هێزی کێشکردن و قورسایی دەستنیشانی دەکەن. لەلای ماکیاڤیللی بیرۆکەی فەلسەفی وابەستە بە داخڵکردنی غەریزە

مرۆییەکان لە گەورە میکانیزمی سۆنگەییدا دەبینین، ئەگەرچی ئەم بیرۆکەیە دامەزرێنەر و پەرەپێدەریش نییە. مرۆڤ بەشێکە لە سروشت و بەهیچ ڕێگا و شێوازێك لە دەست یاساکانی قوتاری نابێت. تەنها سەبارەت بە توانای هەڵسوکەوتکردن لەسەر بناغەی بڕیارە کەسییەکانی خودی خۆی مرۆڤێکی ئازادە، ئازادی مانای ئازادبوون لە مەرجە سروشتییەکان ناگەێنێت. لە بەشەکەی تردا دەگەڕێینەوە سەر ئەم بابەتەو لە بارەیەوە دەدوێین.

سەردەمی ماکیاڤیللی بە سەرەتاکانی ستەمکاری و دەسەڵاتی رەها جیادەکرێتەوە و دەناسرێتەوە. گەورە پیاوگەلێکی دەوڵەت و میرگەلێك کە ئەوێ ڕۆژێ لەسەر کورسی دەسەڵات بوون پشتگیرییەکی تەواو پشتگیرییان لە ماکیاڤیللی کرد چونکە ئەو دەرکی بەوە کردبوو کە هەر بزوتنەوەیەکی مێژوویی بزوتنەوەیەکی سیاسییەو لەبەرئەوەی بۆ زامنکردنی زۆرترین بڵاوبوونەوەی چاکەخوازی کە لە توانادا بێت، مژدەی دەوڵەتی بەهێزی دابوو بەو پێیەی ئەم دەوڵەتە بالاترین دانایی سیاسی مرۆڤی کارایە لە مێژوودا. بەڵام هاوکات ئەو سەردەمە سەردەمی داڕوخانی کۆمارە ئیتاڵییەکان و، گەڕانەوەی کارگێڕی ئابوری و ئینجا کارگێڕی کەلتوری شانشینە ناوخۆییەکانیش بوو، ئەوە بوو لەم چوارچێوەیەدا کاری سەرەکی ماکیاڤیللی، واتە گوتارە کۆمارییەکان، هێدی هێدی شوێن و جێگای خۆی لە دەست دەدا و کتێبی میر پێشکەوت. ئەم کتێبە تاقە کتێبی خوێنراوەی ماکیاڤیللی بوو لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا، تەنانەت گەر بشخوێنرایەتەوە یەکڕاست رەتدەکرایەوە بەو پێیەی داکۆکییە لە ستەم و پێشێلی دادپەروەری و مرۆڤایەتی دەکات. ئیدی ماکیاڤیللی وەکی داکۆکیکارێك لە میر کە قینی لە خەڵکییە و هیچ یاسایەکی ئاکاریی ناناسێت و بە شمشێر و ژەهر فەرمانڕەوایی دەکات و بەڵێنی خۆی ناباتە سەر و دەزانێت ئایین ساختەیە بۆیە پارێزگاری لێدەکات، دەهاتە پێشچاو. ئەو خەوش و نەنگییەی کە تا ئەمڕۆکە رەخنە ئاراستەی ماکیاڤیللی دەکات بێدەربەستیی ئاکارییە. ماکیاڤیللی بەوە تاوانبار دەکرێت کە ئامۆژگاریگەلێکی نائاکاریی دەسەڵاتدارانی کردووە سەرباری ئەوەی نکوڵی لە هێزی ئاکاریی وەك فاکتەرێك بۆ قەڵەمڕەویی سیاسی، کردووە. لە راستیدا ماکیاڤیللی ڕۆڵی ئاکاری فەرامۆش نەکردووە، بەڵام ئەو پێی وایە پرسیارکردن لەو بارەیەوە کە داخۆ خوڕەوشتی ئەو کەسە باشە یان نا، یاخود ئایا هاوئاهەنگی لە نێوان رواڵەتە ئاکاری و بیروڕا کەسییەکەیدا هەیە یان نا، هەموو ئەمانە مەسەلەی پرسیارگەلێکی پوچ و بێ مانان. بیروڕا یاخود باوەڕ "الاعتقاد" "*Gesinnung*"، مادامەکی هیچ کاریگەرییەکی کۆمەڵایەتی نییە، مەسەلەیەکە لەلای هیگڵ بەو پێیەی کەنەفتییەکی تاکە کەسیی تایبەتە و لەلای نیچە بەو پێیەی بێمانابییەکە لە هەڵوێستێکی ناوەکی "ناوەوە گەرانە – جوانی"ی پەتییەوە سەرچاوەی گرتووە، خەمساردانە رەتدەکرێتەوە. هەرچی ماکیاڤیللییە کە بڕوای وایە دامەزراندنی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی باش بڵندترین ئامانجی بزوتنەوەی مێژووە، لەسەری پێویست نییە لە روانگەی ئاکاری خودییەوە حوکم لەسەر خوڕەوشتەکان بدات، بەڵکو تەنها لە روانگەی بایەخە سیاسییەکەیەوە حوکمی لەسەر دەدات.

لە راستیدا یەك هێڵی هاوبەش ماکیاڤیللی و رەخنەگرانی "ئاکارەکەی" کۆ دەکاتەوە کە ئەمەیە: هەردوولا زێدەڕۆیی لە نرخاندن و هەڵسەنگاندنی ڕۆڵی مێژوویی خوڕەوشتدا دەکەن. ماکیاڤیللی

لەگەڵ هەوادارانیدا كە ئەمانەن: ریشیلیۆ و فریدریكی گەورە، لەگەڵ نەیارانیدا كە ئەمانەن: دیدرۆ و فیختە، هەموویان لەسەر ئەم خاڵە كۆك و تەبان: ئەو ڕێگا و شێوازەی كە بە هۆیەوە كۆنترۆڵی خەڵكی دەكرێت، بە هیچی ترەوە بەند نییە تەنها خوڕەوشتی ئەو مرۆڤانە نەبێت كە لەسەرتەختی دەسەڵاتن: ئیدی چ ئەو ڕێگایانە دادپەروەر یاخود ستەمگەر، توند و دڵڕەق یان بە بەزەیی، دەمارگیر یاخود بەخشندەبن. دواجار هەموو شتێك بەلای خەڵكییەوە دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندێتییەكی كەسیی "بێگومان وابەستە بە چەندین مەرجی سروشتییەوە" كە ئەمەیە: خوڕەوشتی ئەو كەسەی كە فەرمانڕەوایی دەكات. فریدریك بڕوای وایە پادشاكان دەسەڵاتی چاكەكاری یاخود خراپەكاریان هەیە "بەمەرجێك كە بڕیاری ئەوە بدەن"، بۆ بەیانكردنی راستیی هەڵوێستەكەی خۆیشی، سەرباری بنەماڵەی نیرۆن و كالیگۆلا و تیبیری "یەكەم و دووەم و سێیەم"، ناوی ئیمپراتۆرگەلێكی رۆمانیی چاكەخواز ریز دەكات "ناوە پیرۆزەكانی تیتۆس و تراجان و بنەماڵەی ئەنتۆنان[25]". ئەگەر لە سەردەمی رۆشنگەریدا فەیلەسوفگەل و تەنانەت میرگەلێك هەبن پرۆتیستۆی بنەماو پرەنسیپەكانی ماكیاڤیللی بكەن، هۆكارەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی میرەكانی ئەو چاخە دواكەوتووە، لەبەر چەند هۆكارێكی ناكاو لە پادشاكانی سەردەمی رێنیسانس و رۆژگاری باروكی كە خاوەن خوڕەوشتێكی كێوی بوون، چاكتر و باشتر بوون. بە گوێرەی ئەم بۆچوونە سایكۆلۆجییەی مێژووش دروست ئەوە خواست و ئارەزووی مرۆڤەكانە كە ئاقاری شتەكان دیاری دەكات و بە دوای یەكداهاتنی ئارامی و پاشاگەردانی و خولی شێوەی حكومەتەكان راڤە دەكات. هێزە دەروونییە بنەڕەتییەكان لەسەر بناغەی بەردەوامبوونیان لە ڕووی گەوهەرییەوە بەو جۆرەی كە لە هەموو سەردەم و رۆژگارێكیشدا هەروابوون، وێناكراون، وەكی گشت هێزە سروشتییەكانی تر خەڵكی بە شێوەیەكی نامێژوویی لەم هێزانە تێگەیشتوون. پێدەچێ جیاوازی خوڕەوشتی پادشاكان وەك ئەوەی جیاوازی بێت لە پرۆسەی كۆكردنەوە و ئاوێتەكردنی خودی رەگەز و توخمە دەرونییەكان خۆیاندا، بەڵام سەرچاوەی ئەم جیاوازییەی دواتریان راڤەنەكراوە و هەر بە زادەی رێكەوت ماوەتەوە. پێویستە كێشمەكێشە واقعییەكانی مێژوو، هەروەها ئەو وێنا و بەرجەستانەی كە خەڵكی بۆ ئەم كێشمەكێشانەی دەكات لە بنەڕەتدا لە ڕوانگەی جیاوازی سروشتەكانیانەوە راڤەبكرێت. ئەم سروشت و خوڕەوشتانە بە پیر كارەتێكەرە دەرەكییەكانی جیهانی مرۆڤ و سەروو مرۆڤیشەوە دەچن. ئیدی بەمجۆرە میرێكی میهرەبان لە باریدایە بە گرتنەبەری رێوشوێنگەلێكی كۆمەڵایەتی وەڵامی بێنەوایی خەڵكەكەی بداتەوەو، زۆردارێكیش لە باریدایە بە زەبر و زەنگی ستەمكارانە وەڵامی بداتەوە.

فیزیك "زانستی سروشت" و سایكۆلۆجیا راڤەی سەرلەبەری مێژووی مرۆڤایەتی دەكەن.

ماكیاڤیلی لە یەكێك لە پەیامەكانی خۆیدا[26] دەنووسێت: "ئەز بیر لەوە دەكەمەوە وەك چۆن سروشت روخسارگەلێكی جیاوازی بەخشیوە بە خەڵكی، هاوكات ئەقڵ و ئایدیاگەلێكی جیاوازیشی پێ بەخشیون. بەم پێیە هەموو كەسێك بە گوێرەی ئەقڵ و ئایدیای خۆی رەفتار و هەڵسوكەوت دەكات". خەوش و نەنگی بۆچوونی ماكیاڤیللی بۆ مێژوو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی وا لەم شێوازە تایبەتمەندەی "بیركردنەوەو هەستكردن" دەكات وابەستەی فاكتەرگەلێكی سروشتی لە ڕووی

مێژووییەوە چەسپاوبێت بێ ڕەچاوکردنی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان. بە گوێرەی واتای زانستە نوێیەکەش تەنها ئەوەی کە لە رووی رێژەییەوە چەسپاوە شیاوی راڤەکردنە، لەبەرئەوەی گەردیلەکانیش بە توخمگەلێکی چەسپاو تەماشادەکرێن هەر بۆیە ئەم وا تەماشاکردنە دوایین هۆکار "وسیلە"ی راڤەکردنی فیزیکی پێکهێناوە، هەروەها خوڕەوشتەکانی مرۆڤیش لەلای ماکیاڤیللی دوایین بەڵگەیە کە لە رێگای راڤەکردنی ئاراستەی مێژوو دەدات، چونکە لە توخمگەلێکی دەروونیی چەسپاو لەدایك دەبێت کە ئەمانەن: غەریزەکان و ئەو خواست و ئارەزووانەی کە گۆڕانیان بەسەردا نایەت.

بەڵام ئەمە بۆچوونێکی دۆگمایە. ئەم بۆچوونە پێی وا نییە توخمە دەروونی و فیزیکی "خوڕەوشتی"ەکان کە دروستبوونی سروشتی مرۆیی دیاری دەکەن، بەشێکن لە واقیعی مێژوویی و لێی جیانابنەوە. ناکرێت ئەم توخمانە هەمیشە بە گەوهەرگەلێکی چەسپاو و بەرابەر لەگەڵ یەکتر تەماشابکرێن هەروەها ناشکرێت لافی ئەوە لێبدرێت کە هەمیشە دەتوانرێت دواجار وەك هۆکارگەلێك بۆ راڤەکردن بەکاربهێنرێن. وەك ئاشکرایە میرە رۆشنفکرەکانی سەدەی هەژدەیەم بە شێوازێکی پتر مرۆڤانەتر لە ئەلکسەندەر بۆرجیا یاخود لویسی چواردەیەم فەرمانڕەواییان کرد، بەڵام ئەگەر ئەوە راست بێت کە دەگوترێت پادشای ئینگلتەرا بە هاندەرێکی مرۆڤدۆستانە رێز لە خەڵکانی خۆی دەنێت، ئەو کاتە ئەوەش هەر دروستە کە بگوترێت ئەو بۆیە مرۆڤدۆست بوو چونکە خەڵکەکەی دەیانزانی چۆن چۆنی رێزی خۆیان بسەپێنن. خودی رێز خۆی ملکەچی مەرجە مێژووییەکانە. تەرازووی هێزە راستەقینە کردەییەکانی نێو دەوڵەت تەنها هەڵسوکەوتی گشتی حکومەتێك لە حکومەتەکان دەستنیشان ناکات بەڵکو روانگەکەیشی دیاری دەکات، هەروەها خودی تەرازوی هێزەکانیش لەسەر بناغەی کۆی ژیانی کۆمەڵایەتی دروست دەبێت. بۆرجوازییەت لە سەردەمی رێنیسانسدا پێویستی بە ستەمکارێکی پڕچەك و تەیار بە هەموو هۆکارەکانی دەسەڵات هەبوو بۆ لەناوبردنی هەموو ئەو کەند و کۆسپانەی کە لەمپەر بوون لەبەردەم پەرەسەندنی بازرگانییەکەیدا، هەرچی ئەو نموونە باڵایەشە کە بۆ ئەو دەشیا، هێڵە پانەکانی لەلایەن یەکەمین فەیلەسوفی مێژووەوە داندرا. بۆرجوازییەت لە سەدەی رۆشنگەریدا ئێجگار بەهێز بوو بوو، ئیدی ئەوەبوو ئەو چەشنە دەسەڵاتە کردەییەی دەستخست کە چیتر پێویستی بە بەرگە گرتنی جەورو ستەمی دەسەڵات دارێکی ستەمگەر نەما، یاخود تەنانەت پێویستی بە کۆشك و شانشینێکی ڕووت کە تێچوونی بێئەندازە زۆرە، نەما. تەنها بە هۆی ئەرکە گرنگ و زیندووەکەیشی بەلای کۆمەڵگاوە ئەوجا ئەو کارەی بۆ ئاسان بوو. چیدی دەسەڵاتی ستەمگەر "الحکم الاستبدادی" ئەرکی مێژوویی خۆی کە بریتی بوو لە لەناوبردنی دەرەبەگایەتی، جێبەجێ کردبوو، زەرورەتی ناوەندێتی دەوڵەتیشی دامەزراندبوو. میرێکی تاج لەسەرنراو بە سەرکەوتنەکان خۆی بە یەکەمین خزمەتکاری دەوڵەت دادەنێت، ئەمە زادەی، نەك هۆکاری، ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەیە کە ڕوویداوە. دەسەڵاتی ئەم چەشنە میرە لە سەردەمی رێنیسانسدا، لە باریدا بوو هەرزوو کۆتایی پێ بێت.

دەکراو دەشیا هەموو ئەمانە جێی رەزامەندی ماکیاڤیللی و هەوادارانی بۆچوونی سایکۆلۆجیانەی مێژوو بوونایە — بەڵام لەگەڵ دیاریکردن و

دەستنیشانكردنێكی یەكلاكەرەوە-دا، بە دڵنیاییەوە- دەكرێت ئەوان پێ لەوە بنێن- كە سەردەمەكان و بەم پێیە دەرفەتی سەركەوتنی چەشنە جۆربەجۆرەكانی خوڕەوشت گۆڕانیان بەسەردا دێت. بەڵام ئەوە ڕێ لەوە ناگرێت مرۆڤگەلێكی كتومت هاوشێوەی مرۆڤەكانی سەدەی هەژدەیەم لە ماوەی سەردەمی ڕێنیسانسدا هەبووبن، تاقە جیاوازیش، بە لەبەرچاوگرتنی مەرجەكانی سەردەم، لەوەدایە ئەو كەسانە نەیاندەتوانی دەست لە ڕووداوەكان وەربدەن و خۆیانی تێهەڵبقورتێنن. ماكیاڤیللی نووسیویەتی(27) و دەڵێت: "لەبەرئەوەی سەردەمەكان لە یەكدی جیاوازن و سیستەمی شتەكان گۆڕانیان بەسەردادێت، هەربۆیە ئەو كەسەی ڕەفتارەكانی لەگەڵ سەردەمەكەیدا بگونجێت دەتوانێت هەموو خۆزگە و ئاواتەكانی خۆی بەرجەستە بكات و كەسێكی بەختەوەر دەبێت، بە پێچەوانەوە ئەو كەسەی بە كار و كردەوەكانی لە سەردەم و لە سیستەمی شتەكان دادەبڕێت و جیادەبێتەوە كەسێكی بەدبەخت دەبێت." بەڵام تەنانەت ئەم دەستلێهەڵگرتن "تنازل"ەش فریای ئەو ڕێبازە كە بڕوای بە چەسپاویی خوڕەوشتی مرۆیی هەیە، ناكەوێت. هیچ فریدریك یاخود ڤۆڵتێرێك بە نهێنی لە سەردەمی ڕێنیسانسدا هەڵنەهاتووە. لە نێو خاوەن پیشەكانیشدا لە شاری سەدەكانی ناوەڕاستدا ڕوخساری نوێی بەڵێندەر و سەرۆكی یەكێتییە مۆنۆپۆلییەكان "تروستاتەكان" بەدی ناكەین: ئەو چەشنە كەسایەتییە لە باریدا نەبوو هیچ دەرفەتێك بۆ پەرەدان بە چالاكییەك كە بۆی بگونجێت، بدۆزێتەوە. ئەستەمیشە جەخت لەوە بكرێت كە ڕەنگە خاوەن پیشەكان گەیشتبنە هۆشیارییەكی هاوتای هۆشیاری كرێكارانی پیشەسازی ئەمڕۆكە ئەگەرچی لە شێوەی شاراوەشدا بێت. ئەو هاوشێوەییەی كە ئێمە دەتوانین باسی بكەین هەر لەوپەڕی نارۆشنیدا دەمێنێتەوە. چونكە سروشت و خوڕەوشتە دابڕاوەكان لە سەردەم، خوڕەوشتگەلێكی تەواو ناواقیعین، هەر كەسایەتییەكیش لە جۆری فریدریك یاخود ڤۆڵتێر وەختێك لە ناوەڕۆكی ژیانیان لە سەدەی هەژدەیەمدا دادەماڵرێن، ئەوەی كە دەمێنێتەوە تەنها تارماییە. هەروەها هیچ سیزاربۆرجیایەكیش لە پروسیا لە سەردەمی فریدریكدا بوونی نییە و ڕەنگە تەنها دابڕینی "سروشتی بۆرجیا" كە نەیزانی باش سەردەمەكەی خۆی هەڵبژێرێت، تەنها دابڕینی سروشتی ناوبراو بەسەر سەركێشێكی خانەدان و لابراو "مخلوع"دا كە بە لەسێدارەدان كۆتایی پێ هاتبێت، شێوازێك بێت لە شێوازەكانی گوزارشتكردن، بەڵام شێوازێكی پوچ و بێ مانایە. چونكە لەگەڵ پەیوەندی و وابەستەییە ڕاستەقینەكاندا تەنها دامەزراوە ڕاستەقینەكان و شێوەكانی حكومەت و یاساكان گۆڕانیان بەسەردا نایەت، بەڵكو هەروەها سروشتی مرۆڤایەتیش دەگۆڕێت. بناغەی هەموو پەیوەندییە مرۆڤایەتییەكان، واتە ئەو ڕێگایەی كە خەڵكی بە هۆیەوە هۆكارەكانی مانەوەی خۆیان دەستدەخەن، ملكەچی گۆڕانە، ئەم بزوتنەوەیە لە بنەچەی ئەو گۆڕانكاریانەدا هەیە كە لەم بوارە ڕۆحیانەدا: زانستەكان، هونەر، میتافیزیك و ئاییندا ڕوودەدات.

هەڵەیە جەخت لەوە بكرێت كە لەگەڵ گۆڕانی سەردەمدا سروشتی مرۆڤەكان هەروەكو خۆیان دەمێننەوە و ناگۆڕێن. ئیرادە و ویستی دەسەڵاتدارانیش لە فەرمانڕەوایی كردنی خەڵكیدا بەشێوەیەكی دادپەروەرانە یان بە پێچەوانەوە، بە زەبروزەنگ یاخود نەرم و نیانی، دەمارگیرانە یاخود بەخشندانە، بەند نییە بە سروشتی

دەسەڵاتدارانەوە. ڕێبازی نەمریی سروشتی مرۆیی کە بە بەردەوامی لە فەلسەفەی مێژووی سەردەمی نوێدا دووبارە دەبێتەوە، واتە ڕێبازی چەسپاویی غەریزە و خواست و ئارەزووەکان، ڕێبازێکی چەوتە. بە دیویێکی تردا ئەمە مانای جەختکردن نییە لەوەی ئەو مرۆڤانەی سەر بە سەردەم و ژیارگەلێکی جیاوازن لە ڕەگ و ڕیشەوە لە یەکدی جیاوازن، دواجار، ئەستەمە بتوانین بگەینە تێگەیشتنێکی گونجاو بۆ مرۆڤەکان لە سەردەمەکانی ڕابوردوودا. ئەو چەشنە نازانمخوازییە "*agnosticisme*" مێژووییە لە باریدایە ببێتە مایەی چاوپۆشیکردن لە هەر تێگەیشتنێك لە مێژوو. ڕێبازێکی سایکۆلۆجیش هاوشانێتی کە پێی وایە نێوەندگەلێکی مرۆڤایەتی و زیندەوەریی تایبەتمەند هەن، بە جیهانگەلێکی لێکجوداو دابڕاو لە یەکتر دادەنرێن و هیچ کامیان ناتوانن بەوەکەی تریان ڕابگەن. بەڵام دەکرێت ئەم ڕەخنەیە لەو گومانخوازییە مێژووییە لە ڕادەبەدەرە بگیرێت: مرۆڤێك کە لە ئاستێکی ژیاری زۆر سەرەتایتردا دەژی ناتوانێت وێنا یاخود پێشبینی ژیانێکی پێشکەوتوتر بکات تەنها بە ڕێگایەکی ریزپەڕ "استثنائي" نەبێت، بەڵام ئەقڵمان بە هۆی ئەو ئاستە باڵایەی ڕێکخستن و ریزبەندکردن کە هەیەتی، توانای ئەوەمان پێدەدات کە بەسەرکەوتویی لەو خەڵکە خاوەن بونیادەفیکرییە جیاوازانە بکۆڵینەوە وەك چۆن خۆمان لە نێو چینگەلێکی گرنگی دەروونماندا، بوونەوەری سەرەتایی دەهێڵینەوە و هەندێکجار کاردانەوەکانمان لە کاردانەوەکانی مرۆڤی سەدەکانی پێش پەرەسەندن دەچێت. بەڵگەیەکی تریش هەیە توانای تێگەیشتن لە خەڵکانی ژیارەکانی ترمان پێدەدات کە ئەمەیە: بەهۆی ڕەوشی ژیانی کەسیمان لە نیو کۆمەڵگادا، ژمارەیەکی دیاریکراو هزر و هەست و سۆز و ئامانج هەن کە لەلای ئەو خەڵکانەو لە لای ئێمەش یەك ناوەڕۆکی چونیەکیان هەیە. چونکە ئەو شێوە کۆمەڵایەتیانەی کە ئێمە ئاشنایان هەین، هەمیشە بە جۆرێك ڕێکخراون کە تەنها کەمێك لە خەڵکی دەتوانن بە خاوەنی کەلتوری ڕۆژ ببن لە کاتێکدا زۆربەی جەماوەر ناچارن بە چەپاندنی غەریزەکانیان درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن. تایبەتمەندییەکی ئەو شێوەیەی کۆمەڵگا کە تا ئێستاکەش مەرجە دەرەکییەکان دەیسەپێنن، بریتی بووە لە جیابوونەوەی نێوان کارگێڕی بەرهەمهێنان و کار، نێوان باڵادەستان و بندەستان. بۆ نموونە ویستی دادپەروەری، بە واتای بەرابەریی کۆمەڵایەتی — یاخود بە دەربڕینێکی دیکە، ویستی تێپەڕاندنی ئەو لێکدژی و جیاوازیانە — پێویستە لەسەری و لەمەشدا ناچارە ناوەڕۆکێك بۆ هەستی هاوبەش لە هەموو سەردەمەکاندا هەتا ئەمڕۆکە، دروست بکات. داخوازی دادپەروەریش، بەو پێیەی نەهێشتنی مافە تایبەت "امتیاز"ەکان و دامەزراندنی بەرابەرییە، لە نزمترین چینە بندەستەکانەوە هەنگاو هەڵدەنێت. لە بەرامبەر ئەوەشدا ئەم چەمکانەی باڵادەستەکان: لێهاتوویی، خانەدانی، بەهای کەسیی، گوزارشت لە ویست و ئیرادەی پاراستنی جیاوازی دەکەن. ئەم چەمکانە تەنها لەگەڵ ئەو بناغە کۆمەڵایەتیانەدا لەناودەچن کە بوونی مەرجدار دەکەن. بەڵام بە سانایی وا پێدەچێت سیماگەلێکی نەمری سروشتی مرۆڤایەتی بن لەسەر زەمینەی ئەو پەیوەندیانەی کە تا ئێستاکە باڵادەستن.

هەڵەی ماکیاڤیللی تەنها لە جەختکردنەوەیدا نییە لەوەی کە سروشتەکانی خەڵکانی کارا لە مێژوودا وەکو خۆیان هەر بە سروشتگەلێکی چونیەك دەمێننەوە، بەڵکو هەروەها بێئاگاشە لەو

پەیوەندییانەی كە لە نێوان مەرجە كۆمەڵایەتییەكاندا هەیە لەگەڵ پاراستنی هەندێ لە سیفەتە دەروونییەكان یاخود ئاڵوگۆڕكردنیان. جگە لە هیگڵ، تا ڕادەیەك هیچ فەیلەسوفێك لە سەردەمی نوێدا، لەو هەڵەیەی ماكیاڤیللی ڕزگاری نەبووە، ئەمڕۆكەش سایكۆلۆجیای ناخ و قوڵایی "علم النفس الاعماق" بەو جۆرە لە ژیانی دەروونی تاكەكان تێدەگات كە پەرەسەندنێكی مەرجدارە بە هەلومەرجە دەرەكییەكانەوە، چیدی ئێمە لەسەر بینینی گرنگترین فاكتەرە دەرەكییەكان لە خێزاندا ڕاهاتووین، بەڵام خێزان بەگوێرەی قۆناغی مێژوویی و هەڵوێستی كۆمەڵایەتی هەریەك لە تاكەكانی جیاواز دەبێت. چەند جۆرێك لە كاردانەوەی خەڵكی هەن كە تا ئێستاكە لە لایەنی ڕێژەییەوە چەسپاو بوون، ئەمە هیچ گومانێكی تێدا نییە، بەڵام ئەمڕۆكە لەسەر ئاستێكی بەرفراوان، توانای ڕاڤەكردنی زانستیانەی ئەو ڕێگایەی كە بەهۆیەوە سروشتەكان وابەستەی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان دەبن، ئەو پەیوەندییە كۆمەڵایەتیانەی كە كەسێكی دیاریكراوی تێدایە و لە چوارچێوەكەیدا پەرەدەسێنێت، توانایەكە هیچ كەمتر نییە. كەواتە ئەستەمە ئەنترۆپۆلۆژیایەكی فەلسەفی، واتە ڕێبازێك بۆ سروشتی تایبەتی مرۆڤ و ڕستێك سەلماندنی پایانی "اثباتات نهائیة" بۆ بیرۆكەی مرۆڤ دابمەزرێنرێت كە چەسپاو بێت و مێژوو گۆڕانی بەسەردا نەهێنابێت. لەبەرئەوەی كە هێشتا ئەو چەشنە هەوڵانە هەر لە ئاستی گەڕان و لێكۆڵینەوە و دەرەنجامگەلی ئەزمونیدان، بەبێ فەرامۆشكردنی سیما و سروشتی كاتی ئەم دەرەنجامانە، هەربۆیە چاكەی (ئەو تەقەللایانە) لە بەرزكردنەوەی پێگەی گیروگرفت و دەرەنجامەكاندایە بەرەو باڵاتر لە كایەی زانستی تایبەتمەند و بەشداریكردنە لە دۆزینەوەی ڕوانگەیەكدا بۆ گەڕان بە دوای پەیوەندییە ڕاستەقینەكاندا. وێڕای ئەوە، ئەو هەوڵانە هزرمان لە دیاریكردنی چەمكی مرۆڤ كە لە دووتوێی تیۆریا مێژوویی و كۆمەڵایەتییەكانماندا هەیە، نزیك دەكاتەوە. ئێمە تەنها لە چوارچێوەی بەڕواڵەتبوونەكەیدا دەتوانین قسە لەسەر گەوهەری مرۆڤ بكەین. قسەكردنی پایانیش لە بارەی گەوهەری شتی واقعییەوە، بە تایبەت لە لایەنی سیما و سروشتی پایانییەوە، پێچەوانەی ئەو خاسیەتە ئەگەری "احتمالی"ەیە كە پێویستە سیمای هەر پێشبینییەكی لەسەر ڕووداوگەلێكی ڕاستەقینە بونیادنراوبێت. ئێمە ئەمڕۆكە دەتوانین خۆمان لەو هەڵوێستە ئەنتۆلۆجییە بەدوور بگرین كە باوەڕی بە چەسپاویی دەروونی مرۆڤایەتی هەیە بێ ئەوەی كە لە بەرامبەردا دەستبەرداری بەكارهێنانی سایكۆلۆجیا بین وەك توخمێك بۆ ڕاڤەكردنی مێژوویی.

بەهەرحاڵ زۆربەی ڕەخنەگرانی ماكیاڤیللی، بە دوور لە پەلاماردانی بۆچوونە جێگیرەكەی بۆ مرۆڤ، پرۆتیستۆی ئەوە لەلای ماكیاڤیللی دەكەن كە بە "ڕێبازێكی سروشتی *Naturalisme*" ناودێری دەكەن. ئیدی ماكیاڤیللی لە پای ئەوە سەرزەنشت دەكرێت كە پێی وایە ڕووداوە مێژووییەكان پرۆسەگەلی پەرەسەندنێكی سروشتین و دەخوازێت هەموو ڕووداوەكان بە شێوازێكی سۆنگەیی ئاسۆكورت و لە ڕوانگەی پێداویستی مادی و تەگبیركردنە سروشتییەكانی لای خەڵكانی ئاوێتەبووی كێشمەكێشە سیاسییەكان، تێكبشكێنێت. بەڵام ئەوە بەڵگەیەكە پشكنین و لێكۆڵینەوە هەڵناگرێت. چونكە دروست كاتێك مەسەلەكە پەیوەندی بە پاشماوەی گەردونەوە هەبێت، هیچ كەس نكوڵی لەوە ناكات كە كاری

زانست راڤەکردنی هەر پرۆسەیەکی پەرەسەندنە کە لە گەردوندا روودەدات، راڤەکردنێتی بەو پێیەی ئەم پرۆسانە، بە گوێرەی یاساگەلێکی دیاریکراو، لە مەرجگەلێکەوە کە پێشتر زانراون، سەرچاوە دەگرن، بەهەرحاڵ ئەوەش هەر مەسەلەیەکە بەهانەی خۆی هەیە کە هەوڵی ئەوە بدرێت دیاردە مێژووییەکان لە چوارچێوەی ئاڵۆزی و گرێچنییە سۆنگەییەکەیانەوە لێیان بکۆڵرێتەوە. رەخنەکردنی سروشتگەرایی لە رووی دۆگماییەوە پێویستی بە شێوازێکی پێشینی *apriori* "پێش ئەزموونیی" جیاواز لە کاری زانستیدا هەیە، بە گوێرەی جوتبوونی لەسەر سروشت یاخود لەسەر مێژوو. دامەزراندنی رەخنەش لەسەر چەمکی سروشتگەرایی — لەگەڵ ئەم مانایەدا کە پێی دەدرێت — واتای رەخنەگرتن لە هەر لێکۆڵینەوەیەکی بە برشتی پەیوەندییە مێژووییەکان دەگەیێنێت. رەنگە سیمای بە رووالەت بێمەرجی کارەکانی خەڵکی بێ بیرکردنەوە بگۆڕدرێت بۆ واقیعێکی گەوهەری ئەمەش هەڵەیەکە تارادەیەکی زۆر وەك ئەو هەڵەیە وایە کە لە فەلسەفەکەی ماکیاڤیللیدا ئاماژەمان پێدا.

رەخنەی سروشتگەرایی کە ئاراستەی ماکیاڤیللی دەکرێت تەنها لە تاقە یەك حاڵەتدا راست و بەجێیە کە ئەمەیە: ئەگەر مەبەست لەوە بێت ماکیاڤیللی پەیوەندییە دیالەکتیکییەکانی نێوان سروشتی دەرەکی و سروشتی مرۆیی لە روانگەی ئیلهامی بۆ جۆرێك وێنا بۆ شتەکان، لە بنەڕەتدا گونجاو لەگەڵ سروشتی دەرەکیدا، کورتکردۆتەوە. دروست لەلای ماکیاڤیللی مرۆڤەکان وەك هەر رەگەزێکی تری زیندەوەران، بە رەگەزێك لە سروشتدا تەماشا دەکرێن. هەر تاکێکیش، ئیدی سەر بە هەرچ گروپێك بێت یاخود لە هەر سەردەمێکدا بژی، بە تاکێکی نموونەیی جۆری هاوچەشن دادەنرێت، وەك چۆن ئێمە هەمیشە دەتوانین هەنگێك یاخود مێرووولەیەك، یاخود تەنانەت گەردیلەیەك، بە نموونەیەك بۆ هەموو پاشماوەی تاکەکانی چەشن تەماشا بکەین. تەنانەت ئەگەر مەسەلەکە وابەستەی جیاوازییەکانی نێوان تاکەکانیش بێت، ئەوا — بە دیاریکراوی — تەنها جیاوازیگەلێکی سروشتییە و هیچی تر، رێك و راست وەك چۆن هەنگی کارەکەر جیاوازە لە نێرینەی هەنگ و وەك چۆن ئێمە ناتوانین کەسێکی لەڕولاواز و نەخۆش یاخود نائاسایی هەڵببژێرین و بە چەشنێکی تەندروستی جۆری دابنێین. لەم پەرەسەندنەدا خەڵکی وەك نموونەگەلی چەشنێکی بایۆلۆجی شیاوی ئەوەی بخرێنە بری یەکدی *interchangeables*، دەردەکەون و مادە ئۆرگانی و نائۆرگانییەکان کار لە تاکەکان دەکەن، ئیدی هەر تاکێك بە گوێرەی تایبەتمەندییە چلۆنایەتییەکانی خۆی وەڵام دەداتەوە و لە دوایشدا مێژوو لە کۆی کاردانەوە تاکەکەسییەکان دروست دەبێت. لێرەدا رێبازی سروشتی لەوەدا بەرجەستەیە وا لە هەموو چەشنە کاردانەوە مرۆڤایەتییەکان بکرێت لە چەمکی تاکێکی دابڕاو لە تاکەکانی چەشنی بایۆلۆجی بەرهەم بێت، بێ رەچاوکردنی ئەو ساتەوەختانەی کە تیایدا تاك لە روانگەی سروشتی دەرەکییەوە دەستنیشان نابێت، بەڵکو لە روانگەی ئەو کۆمەڵگایەوە کە پەرەدەسێنێ و ئەو یاسا کۆمەڵایەتیانەی کە تیایدا باڵادەستن، دەستنیشان دەبێت. کۆمەڵگا یاساگەلی تایبەتی خۆی هەیە، بەبێ لێکۆڵینەوە لەم یاسایانەش، ئەستەمە لە خەڵکی تێبگەین وەك چۆن ئەستەمە بەبێ تاکەکانی کۆمەڵ لە کۆمەڵ یاخود بەبێ سروشتی دەرەکی لە تاکەکان تێبگەین.

وەك لەلای ماکیاڤیللیش هەر وایە، هەمیشە بۆچوونی بایۆلۆجی پەتی بۆ مرۆڤ هاوڕێیە بە وێنایەکی سروشتگەرانە بۆ سروشت: لە بنەڕەتدا بەو جۆرەش لە سروشت تێدەگەین کە ئەمەیە: "ئەوەیە کە دەوری (...) دەدات". بەو پێیەی ئەوەیە کە مرۆڤ دەستنیشان دەکات، نەك بەو پێیەی سروشتێکی لەلایەن مرۆڤەوە دەستنیشان دەکرێت، دروستدەکرێت و دەگۆڕدرێت. ئەوەی کە ئێمە بە سروشتیشی ناودەبەین شێوە ملکەچبوونێکی دوو لایەنە "مزدوج" ملکەچی مرۆڤ دەبێت: لە یەکەم بوارداو، لەگەڵ پەرەسەندنی مرۆڤایەتیدا بەشێوەیەکی بەردەوام سروشت بەهۆی پێشکەوتنی ژیارەوە دەوروژێنرێت، لە بواری دووەمیشدا، خودی توخم و رەگەزە واتایی "مفهومی"ەکان، واتە ئەو توخمانەی کە ناوەڕۆکی واژەی "سروشت" پێشکەشی ئێمەی دەکات، لە هەر ساتەوەختێکدا بەو قۆناغە کە مرۆڤایەتی تێدایە دەستنیشان دەبێت. بە دەربڕینێکی تر، واتە بابەتی زانینی سروشت کتومت وەکی خودی ئەم زانینە خۆی مەرجداره. قەبوڵکردنی ساویلکانەی یاسا سروشتییەکان و چەمکی سروشت کە ئەو یاسایانە وەك خاڵێکی دەستپێکردنی رەها بۆ هەموو راڤەکان دەستنیشان دەکەن، دیسان هەر وابەستەیە بە وێنای رێبازی سروشتییەوە. ئەوەی کە سروشتە وابەستەیە بە ژیانی مرۆڤەکانەوە، کتومت بە وێنەی پێچەوانەکەی، واتە ژیانی مرۆڤەکان وابەستەیە بە سروشتەوە.

سەبارەت پەیوەندی تاك – کۆمەڵیش هەر بە هەمان شێوەیە، چونکە ئەستەمە بەبێ زانینی دیاریکردنەکانی چەمکی دووەم ناوەڕۆکی هەر کام لەم دوو چەمکە بزانرێت، خودی هەریەك لەم دیاریکردنانەش مێژووی تایبەتی خۆیان هەیە چونکە ملکەچی گۆڕانکاریگەلێك دەبن. شیاوی باسە هەندێك لە وردەکارییەکان لای ماکیاڤیللی نیگاری هێڵگەلێکی پان دەکێشن لە رێبازی سروشتی تێدەپەڕێنن و ئارەزووی داننان بە بوونی یاساگەلێکی کۆمەڵایەتی چلۆنایەتیدا دەکەن: ئەوەش بەشێوەیەکی نیوەناتەواو وابەستەیە بە تیۆریاکەی ئەو لەمەڕ بەدواییەکداهاتنی پێداویست "ضروري"ی شێوەکانی حکومەتەکان، لە شوێنگەلێك لەو بەشگەلانەدا کە تیایدا کێشمەکێشە چینایەتییەکان وەك فاکتەرێکی یەکلاکەرەوە لە پێناو پەرەسەندنی ژیاردا پێشکەش دەکات. هەڵبەت ماکیاڤیللی ئەم سەرنجگەلانەی لەمەڕ کۆ ئارەزووەکانی بزاوتی کۆمەڵایەتی بۆ ئەوە بەکارنەهێناوە تا بنەما بنەڕەتییەکانی خۆی دابمەزرێنێت، ئەوەی کە پێش هەر شتێکیش ئەو وێنای کردووە، تاکە کەسگەلێکی دابڕاو بووە و پێی وانەبوو پێویستی بە چەمکگەلێکی تر هەیە بۆ راڤەکردنی بزاوتی چینەکان و ژیانی سیاسی بەشێوەیەکی گشتی.

## پەراوێزەکان

1–ئەڵبەتە زانستی نوێ بەهایەك لە بەهاکان دەداتە پاڵ شێوەی یاساکانی سروشت، ئەو یاسایانەی کە پێدەچێت جێبەجێکردنیان لە داهاتوودا گرفت ئامێز بێت، بەڵام ئەم یاسایانە تەنها بەو ئەندازەیە بەهادارن کە رێگا بە دۆزینەوەی یاساگەلێکی تر بدەن کە ئەمانیش جێبەجێکردنیان سنوردار نەبێت. "ماکس هۆرکهایمەر".

2–جۆن ستیوارت میل، وەك "نموونەیەك بۆ سۆراخکاری" ئاماژە بۆ ئەم چەسپاندنە دەکات، تەماشای بەشی یەکەم لاپەڕە 336ی ئەم سەرچاوەیە بکە:

*John stuart Mill ‘system der deduktiven und induktiven logik, Braunschweig 1869*

*A system of logic ratiocinative and inductive, 3e ed., London 1851’.*

3-بەزمانی ئیتالّی:

*I tre libri de Discorsi sopra la prima deca di Tito Livio ‘1531’.,*

*II principe ‘1532’., Dell istorie fiorentine ‘1532’.*

بە زمانی فەرەنسی:

*Machiavel, Oeuvres completes, N.R.F ‘Bibliotheque de la pleide’, paris., 1964.*

*Machiavel, le prince et autres textes, U.G.E., Collection 10/18, paris, 1965.*

*4-N.R.F., P414.*

*5-N.R.F., P467.*

*6-N.R.F., P709.*

*7-N.R.F., P 378., 10/18, P 118.*

*8-N.R.F., P 385., 10/18, P 120.*

*9-N.R.F., P 386., 10/18 P 121.*

*10-N.R.F., P 1169., 10/18 P 112.*

*11-N.R.F., P 499., 10/18 P 158.*

*12-N.R.F., P 497., 10/18 P 156-157.*

*13-N.R.F., P 498., 10/18 P 157.*

*14-Diderot, Oeuvres completes, paris 1876, t.xvl, P. 33.*

*15-N.R.F., P 339., 10/18, P 123.*

*16-N.R.F., P 390., 10/18., P 124.*

*17-N.R.F., P 946., 10/18, P 105.*

*18-N.R.F., P 391., 10/18, P 125.*

*19-N.R.F., P 391., 10/18, P 125.*

*20-N.R.F., P 946., 10/18 P 105.*

*21-N.R.F., P 1088., 10/18, P 111.*

*22-N.R.F., P 365., 10/18, P 77.*

*23-Ibid.*

*24-N.R.F., Ibid., 10/18., P 78.*

*25-Frederic II, le Grand, Roi de prusse, Auti – Machiavel ou Essai de critique sur “le prince” de Machiavel. La Haye 1740. Preface.*

*26-Machiavel, Lehves, t. II. Galli marol 1955, P 327.*

*27-Ibid., P 327.*

*(*)Discorsi Sopra la prima oleca di tito livio “1531”.*

*(**)ll principe.*

*(***)Dellistorie Fiorentine “1532”.*

*پۆلیب (لە 200- بۆ 120 یاخود 125 پ.ن)“ مێژوونووسێكی یۆنانییە” یەكێك بووە لەو بارمتانەی كە دراون بە رۆما و نزیكەی شانزە ساڵ لەوێندەر ژیاوە. لە كارە مێژووییەكانیدا پشتی بە شیكردنەوەی میتۆدی و راڤەی سۆنگەیی رووداوەكان بەستووە. (و.4).

**مەبەست لە خزمەتكاری زەوی ئەو كەسەیە كە سەردارەكەی پارچەیەك زەوی پێ دەبەخشێت لە بەرامبەر ئەوەدا كە بەڵێنی لێ وەردەگرێت خزمەتی بكات.

***فرانسیس بیكۆن: راوێژكاری ئینگلتەرا لە سەردەمی جاكی یەكەم و فەیلەسوفێكە لە لەندەن لەدایك بووە (1626-1561).

****یاسای زیوی "*Loi dairain*": تیۆرەیەكی ئابورییە، بە پێی ئەم تیۆرەیە نابێت بە هیچ جۆرێك كرێی كرێكار لە نزمترین ئاستی پێویست تێپەڕبكات.

## سەرچاوە

بدايات فلسفة التأريخ البورجوازية

تأليف: ماكس هوركهايمر – ترجمة: محمد علي اليوسفي

دار التنوير للطباعة و النشر

الطبعة الأولى – 1981.

# ڕەوتێكی هزری

بەردەوام مێژووی فەلسەفە دەسەڵاتێك بووە لەناو فەلسەفەدا

-دۆلۆز-

**جیل دۆلۆز**

لەعەرەبییەوە: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل

جیل دۆلۆز–*Gilles Deleuze* فەلسەفەكارێكی فەرەنسییە لەپاڵ فۆكۆو دریداو هەندێكی ترەوە، گەورەترین فەلسەفەكاری دوای ئەوەی سارتەرن. دۆلۆز بەر لە چەند ساڵێك دوای ئەوەی نەخۆشی هیلاكی كرد، لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا لەپەنجەرەی شوققە پاریسییەكەی خۆیداو لە نهۆمی شەشەمەوە خۆی هەڵدایە خوارەوەو كۆتایی بە ژیانی خۆی هێنا. ئەو دەقەی لێرەدا وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی كوردی، لەلایەن "كازم جیهاد"ەوە لە فەرەنسییەوە كراوەتە عەرەبی و لە گۆڤاری (نزوی) بڵاوكراوەتەوە، خودی ئەم دەقە لەلایەن دۆلۆز خۆیەوە هەڵبژێردراوە بۆ ئەوەی وەربگێڕدرێتە سەر زمانی عەرەبی. ئەم دەقە خۆی لە ئەسڵدا ناوی نییە! وەرگێڕی عەرەبی خۆی ناوەكەی بۆ داناوە، ئێمەش هەر ئەو ناوەمان بۆی داناوەتەوە، بەڵام دەبێت ئاماژە بۆ ئەوەش بكەین كە ئەو دەقە بەشی یەكەمی كتێبی "وتووێژ–محاورات" پێكدێنێت كە دۆلۆز دایناوەو تێیدا كلێر بارنێ ڕۆڵی وتووێژكەر دەبینێت و دۆلۆز دەدوێنێت، ئەم كتێبە ساڵی (1977) بڵاوكراوەتە، بەڵام وەكو ئەوەی لێرە لەنێو ئەم دەقەشدا دیارە لەشێوەی وتار داڕێژراوەتەوەو تێیدا دۆلۆز باس لە لایەنە سەرەكییەكانی بیركردنەوەی خۆی و پێوەندی بە گتاری دەكات. لەم پێشەكییەشدا پێویستە زۆر سوپاسی "ئازاد سوبحی" هاوڕێم بكەم كە بە وەرگێڕانەكەی مندا چۆتەوەو بەراوردی كردوون و هەندێك تێبینی و سەرنجی گرنگی خستە ڕوو.

وەرگێڕی كوردی

زۆر زەحمەتە مرۆڤ بتوانێت لە چاوپێكەوتنێك یا دیدارێك یا وتوێژێكدا گوزارشت لە خودی خۆی

بکات. زۆربەی جارەکانیش، کاتێك پرسیارێکم ئاراستە دەکرێت، تەنانەت ئەگەر پێوەندی بە خودی خۆشمەوە هەبێت، شتێکم نییە تاوەکو بیڵێم. وەکو هەرشتێکی تریش، پرسیارەکان دروست دەکرێن. ئەگەر کەسانی تر ڕێگات پێنەدەن خۆت پرسیارەکانی خۆت لەو توخمانە دروست نەکەیت کە لە هەموو شوێنێکەوە دێن، لە هەر شتێکەوە دێن، ئەگەر ئەوان پرسیارەکانیان ئاراستە کردیتو خستیانە سەر شانت، ئەوە تۆ شتێکی وات نییە بۆئەوەی بیڵێیت.

هونەری دامەزراندنی پرسێك مەسەلەیەکی هەرە گرنگە، پێشتر پرسەکە دادەهێنرێتو گەشەی پێدەکرێت، بەرلەوەی چارەسەری بوونی هەبێت. ناشێت هیچ یەکێکیش لەمانە لەنێو وتوێژێك، یا دیالۆگێك، یا گفتوگۆیەکدا بێتە دی. تەنانەت بیرکردنەوەش، بەتەنیا، یا دوو بە دوو، یا بە کۆمەڵیش، بەتایبەتیش بۆ بیرکردنەوە بەس نییە.

ئیعتیرازەکانیش، هەر جارێك کە ئیعتیرازم لێدەگیرێت، زیاتر ئارەزووی ئەوەم لادروست دەبێت بڵێم: (باشە! باشە! بابچینە سەر شتێکی تر). ئیعتیرازەکانیش هەرگیز هیچ شتێکیان لەگەڵ خۆیاندا نەهێناوە. هەرهەمان شتیش ڕاستە کاتێك پرسیارێکی گشتگیرم ئاراستە دەکرێت. مەبەستەکە ئەوە نییە وەڵامی پرسیارەکان بدرێتەوە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە لە پرسیارەکان بێینە دەرەوە. زۆر کەسیش پێیان وایە ئێمە لەسایەی دووبارەکردنەوەی پرسیارەکانەوە، دەتوانین لەنێو پرسیارەکان بێینە دەرەوە (ئەی لەبارەی فەلسەفەوە؟ ئایا فەلسەفە مردووە؟ ئایا ڕووەو ئەوە دەچین لێی تێپەڕینو بیبەزێنین؟) بەڕاستی ئەوەش مەسەلەیەکی پڕوکێنەرە. واز لەوە ناهێنن کە بگەڕێنەوە بۆ پرسیارەکان بەهیوای ئەوەی لێی بێنە دەرەوە. کەچی هاتنە دەرەوە لە پرسیار، هەرگیز بەم شێوەیە نییە.

بزاڤ بەردەوام لەسەر شانی هزرڤان بەدی دێت، لەو چرکەساتەی چاوەکانی دەخاتە سەر شتەکانو ڕادەمێنێت. دەرچوون، ئەوە ڕووداوێکە پێشتر ڕوویداوە، ئەگینا هەرگیز لێی دەرناچین. بەگشتی پرسیارەکان لەبارەی ئایندە، یا ڕابردووە. ئایندەی ئافرەت، ئایندەی شۆڕش، ئایندەی فەلسەفە،.....تاد. ئا لەم کاتەدا، کاتێك ئێمە لەنێو بازنەیەکی بەتاڵدا دەخولێینەوە، لەنێو ئەم پرسیارانەدا دەسوڕێینەوە، هەندێك سەیرورەت هەن، لەپێش چاو نین، زۆر بەهێمنیو کڕی کاردەکەن. ئێمە زیاد لە پێویست بیر لە موفرەداتەکانی مێژووی دەکەینەوە، مێژووی تاکە کەسی یا مێژووی گشتی، بەلاّم سەیرورەتەکان، مەسەلەیەکی جوگرافین: ڕەوتن، ئاراستەن، چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوەن.

سەیرورەتێك هەیە–ئافرەتێك کە تێکەڵاوی ئافرەتان نابێت، بە ڕابردوو یا ئایندەیان، بەتەواویش پێویستە کە ئافرەتان بچنە نێو ئەم سەیرورەتەوە تاوەکو لە ڕابردوو و لە ئایندەیان دەربچن، لە مێژووی خۆیان دەربچن. سەیرورەتێکی–ڕادیکاڵیش[1] هەیە کە ئاوێتەی سەیرورەتی شۆڕش نابێت، بگرە ڕەنگە بە شۆڕشگێڕەکانیشدا تێپەڕ نەبێت. سەیرورەتێکی–فەلسەفەکاریش هەیە کە هیچ شتێك بەمێژووی فەلسەفەی نابەستێتەوە، بەو کەسانەدا تێپەڕ دەبێت کە مێژووی فەلسەفە ناتوانێت پۆلینیان بکات.

سەیرورەت هەرگیز تەقلید نییەو ڕەفتار کردنیش نییە لەسەر شێوەی ئەم یا ئەوەی تر، گوێڕایەڵی نییە بۆ هیچ نموونەیەك، ئەگەرچی نموونەی دادپەروەری یا حەقیقەتیش بێت. هیچ لایەنێك نییە لێیەوە دەست پێبکەین، هیچ

لایەنێکیش نییە پێی بگەین یا دەبێت بیگەینێ. دوو لایەن نییە کە بشێت بە یەکتریان بگۆڕینەوە. پرسیاری ئەوەی (ئەم، یا ئەو شتە، ئێستا چی لێهاتووە؟) پرسیارێکی تەواو گەمژانەیە، چونکە بەو ڕادەیەی کە کەسێك دەبێتە سەیرورەت، ئەوە ئەو سەیرورەتەی وەریدەگرێت بەو ڕادەیە دەگۆڕێت کە خودی خۆی تێیدا دەگۆڕێت. سەیرورەتەکان دیاردەی لاساییکەرەوە نین، لەخۆگرتنیش نین، بەڵکو دیاردەی پێکانێکی دوولایەنەو گەشەکردنێکی ناهاوسەنگن، هاوسەرێتییەکە لەنێوان دوو جیهانی جیاوازدا. بەردەوام هاوسەرێتییەکان بۆ سروشت بەخۆڕایی بوون، زەماوەند دژی زەواجە. هیچ ئامرازێکی دوالیزمی نییە: پرسیار–وەڵام، نێر–مێ، مرۆڤ–ئاژەڵ،....تاد. دەشێت دیالۆگێك ئەوە بێت: بە سادەیی وێنەکردنی سەیرورەت بێت. دەشێت لەمبارەیەوە مارمێلکەو زەردەواڵە نموونەیەکمان پێبدەن. مارمێلکە وا دەردەکەوێت وەکو ئەوەی خەریکی وێنەکردنی شێوەی زەردەواڵە بێت، بەڵام لە واقیعدا لەلای مارمێلکە سەیرورەتی–زەردەواڵە هەیە، لەلای زەردەواڵەش، سەیرورەتی–مارمێلکە، پێکانێکی دوولایەنە، مادام "ئەوەی" سەیرورەت دەبێت، هەریەکێکیان بەو ڕادەیە دەگۆڕێت کە "لە" سەیرورەتدا دەگۆڕێت. زەردەواڵە دەبێتە بەشێك لە ئامێری بەرهەمهێنانی مارمێلکە، لەکاتێکدا کە مارمێلکەش دەبێتە ئەندامێکی سێکسی زەردەواڵە. یەك سەیرورەت، یەك قەبارە لە سەیرورەت، یا وەکو ئەوەی (ریمی شۆڤان) گوزارشتی لێدەکات "گەشەکردنێکی نا هاوسەنگی دوو بوونەوەر کە هیچ جۆرە پێوەندیەکیان بەیەکەوە نییە". سەیرورەتی ئاژەڵ بۆ مرۆڤ هەیە کە بریتی نییە لەلاساییکردنەوەی سەگ یا پشیلە، مادام ئاژەڵو مرۆڤ تەنیا لەماوەی کۆچ کردندا[2] بەیەك دەگەن

هاوبەشە، بەڵام چوونیەك نین. شتەکە زیاتر لە چۆلەکەکانی مۆزارت دەچێت: لەنێو ئەوەیاندا، لەنێو مۆسیقای سەیرورەتی–باڵندەدا، گوایە لە سەیرورەتی – مۆسیقای باڵندە وەرگیراوە، چونکە ئەم دووانە هەرگیز یەك سەیرورەت پێکناهێنن، یەك کوتلە پێکناهێنن، گەشەکردنێکی نابەرانبەرە، هەرگیز گۆڕینەوەی تێدا نییە، بەڵکو وەکو ئەوەی یەکێك لە شرۆڤەکارانی مۆزارت دەڵێت:" ڕەوتێکە بێ میحوەر"، بەکورتی واتا دیالۆگ.

سەیرورەت ئەو شتانەیە کە زیاتر شاراوەن، ئەو کردارانەیە کە لەژیانێکدا نەبێت هەڵناگیرێن و لە شێوازدا نەبێت گوزارشتی لێناکرێت. هەروەکو شێوازەکانی ژیان، شێوازەکان تەلارو باڵاخانە نین. لەنێو شێوازدا، هەر شێوازێکدا ، گرنگ وشەو ڕستەو وێنەو ریتم نییە. لەنێو ژیاندا، حیکایەتو سەرەتاو ئەنجامەکان "گرنگ نین" چونکە بەردەوام دەشێت بە هی تر بگۆڕدرێتەوە. ئەگەر ئەم "وشەیە"تان پێخۆش نییە و پێتان گونجاو نییە، ها ئەوە وشەیەکی تر، وشەیەکی تر بخەنە شوێنی ئەم وشەیە. ئەگەر هەموو کەسێك ئەم کۆششە بکات، ئەوە دەکرێت هەموو لەیەکتر تێبگەنو چیتریش پاساوی پرسیارکردن یا پێشکەشکردنی ئیعتیرازات نامێنێت. هیچ وشەیەکی پاك بوونی نییە، هیچ مەجازێك بوونی نییە "هەموو مەجازەکان وشەی پیسو پۆخڵن، یا وشەی پیسو پۆخڵ پێکدەهێنن" بۆ ناونانی شتێك بەوردی تەنیا هەندێ وشە لەئارادان کە ورد نین، بۆیە با وشەی سوپەر دابهێنین بەمەرجێك زۆر ئاساییانە بەکاری بێنین، وا بەکاری بێنین کە زۆر ئاسایی بێت، تاکو ئەو جۆرەی ناوی دەنێت بەیەکسانی هەبێتو زۆریش بەربڵاوبێت. ئەمڕۆکە ئێمە شێوازی نوێمان هەیە بۆ خوێندنەوەو نووسین. تێیدایە خراپو پیسو ناشیرینە. بۆ

نموونـە، بۆچـوونێكی وا هەیـە كـە هەنـدێك كتێـب لـەپێناو ئـەو خوێندنەوەیـە نووسـراون كـە دەبـێ ڕۆژنامەنووسـێك لێیـان بكۆڵێتـەوە، بـەم شـێوەیەش پێویست ناكات وشەی بەتاڵ بخوێنرێتـەوە (دەبێت ئـەوە بخوێنرێتـەوە! زۆر سەرسـوڕهێنەرە! دەی: دەبینین چۆنە!). بەڵام خوێندنـەوە باشەكانی ئەمڕۆ بـریتین لـەوەی كـە بەشـێوەیەكی وا مامەڵـە لەگـەڵ كتێبێكدا بكـەین وەكـو ئـەوەی چۆن گـوێ دەدەینـە گۆرانیـەك، یـا چـۆن تەماشـای بەرنامەیـەكی تەلـەفزیۆنیو فیلمێكـی سـینەمایی دەكـەین، چـۆن گۆرانیەك وەردەگرین، ئاواش هـەر مامەڵەیـەك لەگـەڵ كتێبێكـدا پێویسـت بـەڕێز لێگرتنێكـی تایبـەتی دەكـات، پێویسـت بـە جـۆرێكی تـر لـە سـەرنجدان دەكات، كە لە سەردەمێكی ترەوە هاتووەو بەتـەواوی كتێب پرتستۆ دەكات. هەرگیز مەسـەلەی قورسـی یا تێگەیشتن نییە: چەمكەكان وەكو دەنگ وان، دەنگو وێنە، چـەمك بریتییـە لـە بریقەدانەوەیـەك كـە دەكرێ گونجاوبێـت بۆتـان یـا گونجـاو نـەبێت، لـە تێپەڕینـدا سەركەوتوو دەبێت یا سەركەوتوو نابێت. فەلسـەفەی لاولایـە[3] شـتێك نییـە مایـەی تێگەیشـتن بێـت یـا تەئویل بكرێت، گەرەكمە بڵێم شێواز چییە؟ بریتییـە لـە دیـالۆگی ئـەو كەسـانەی كـە زۆرجـار پێیـان دەگوترێـت "بـێ شـێوازن"، شـێواز بونیـادێكی دالی نییـە، سیسـتەمێكی بیرلێكـراوەو سروشـتێكی ڕەمەكیانـە نییـە، ڕستەیەكی مۆسیقی نییـە دووبارە ببێتـەوە.... شـێواز بریتییـە لـە ڕێكخسـتن، ڕێكخستنی وتەیە. شێواز بریتییە لـەوەی بگـەین بە تەتەڵـە كردنـی زمـان لـەنێو خـودی زمـانی خۆمانـدا، ئـەوەش كـارێكی زەحمەتـە، چـونكە دەبێـت پێداویستییەك هەبێت بۆ ئەم تەتەڵـە كردنـە، نـەوەكو مرۆڤ خۆی لە قسەكردنیدا ورتە ورتكەر بێت، بـەڵكو دەبێت خودی زمان خۆی ورتـە ورتكـەر بێت. وەكو ئەوە وابێت كەسێك لە زمانی خۆی نـامۆ بێـت. هێڵـی ڕاكـردن بكێشـێت، نموونـەی هـەرە گـەش لای مـن بریتییـە لـە: كافكـا، پیكیـت، گیراسـیم لۆكـاو گـۆدار. گیراسیم لۆكا لـەنێو شـاعیرە مەزنەكانـدا شـاعیرێكی گەورەیـە. ئـەو تەتەڵەیـەكی زۆر جـوانی داهێنـا، ئـەویش تەتەڵـەی تایبـەت بەخۆیـەتی. جارێكیـان شـیعرەكانی خـۆی لەبـەردەم جـەماوەرێكی دووسـەد كەسیدا پێشكەشكرد، لەگـەڵ ئەوەشدا ئـەوە ڕووداو بـوو، ڕووداوێـك كـە بـەناو دووسـەد گـوێگردا تێپـەڕ دەبێت، بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە سەر قوتابخانەیەك یا بزاڤێك. هەرگیز شتەكان بەم شێوەیە بەڕێوە ناچن كە حیسابیان بۆ دەكەین، بەو ڕێگایانەشدا تێناپەڕن كـە حیسابیان بۆدەكەین.

دەشێت ئیعتیراز لەوە بگرین كە ئێمە نموونـەی گونجـاو دەخەینـە ڕوو، كافكـا یەهودییـەكی چیكۆسـلۆڤاكییەو بـە ئـەلمانی دەینووسـی. پیكیـت پیـاوێكی ئێرلەندییـە بـە ئینگلیـزی و فەرەنسـی دەنووسێت، گیراسیم لۆكا بە بنەچە ڕۆمانییە، گۆدار سویسرییە. چیتر؟ ئەوە كێشـەی هـیچ یـەكێك لەمانـە نییـە. پێویسـتە لەسـەرمان دوو زمـان بـین، تەنانـەت لـەنێو خـودی یـەك زمانیشـدا: دەبێـت تەنانـەت لـەنێو خـودی زمـانی خۆشمانـدا زمـانی كەمایـەتی[4] بـە دەسـت بێـنین، دەبێـت زمـانی خۆمـان بەشـێوەیەكی كەمایەتییانـە بـەكاربێنین. پلـورالیزمی زمانـەوانی بەتـەنیا ئـەوە نییـە كـە دەسـت بەسـەر كۆمـەڵێك سیسـتەمدا بگـرین كـە هەریـەكێكیان لـەنێو خـودی خۆیدا گونجاوبێـت، بەڵكو، بەرلەهـەر شتێك بریتییـە لە هێڵی ڕاكردن یا ئەو فرەییەی كە دەست لە هـەموو سیسـتەمێك دەدات و گونجاویشـی پێدەبەخشـێت. نـەوەك وەكـو ئێرلەندییـەك یـا ڕۆمانییـەك لـەنێو زمانێكی تری غـەیرە زمـانی خۆمانـدا بدوێین، بـەڵكو بـە پێچـەوانەوە، ئەوەیـە كـە لـەنێو زمـانی خۆمانـدا

وەکو بێگانەیەك بدوێین. برۆسە دەڵێت:" کتێبە جوانەکان بەجۆرێك لە زمانی بێگانە نووسراون. لەژێر هەر وشەیەکدا، هەر یەکێك لە ئێمە ئەو مانایە یا بەلایەنی کەم ئەو وێنەیەی پێدەدات کە زۆربەی جارەکانیش مانایەکی هەڵەیان هەیە. بەڵام لەنێو کتێبی جواندا، هەموو ئەو هەڵانەی دەیکەین، هەر جوانن". ئەوە شێوازێکی باشی خوێندنەوەیە. هەموو هەڵەکان یا مانا دژەکان جوانن، بەمەرجێك تەئویل پێك نەهێنن، بەڵکو بایەخ بە بەکارهێنانی کتێب بدەن، درێژە بە بەکارهێنانی بدەین، لەنێو زمانەکەیدا زمانێك دەستەبەر بکەین. "کتێبە جوانەکان بە جۆرێك لە زمانی بێگانە نووسراون". ئەوەیە پێناسەی شێواز، ئەوەیە مەسەلەی سەیرورەت.

بەردەوام بیر لە ئایندەیەکی زۆرینەیی دەکاتەوە "ئەوکاتەی گەورە دەبێت، ئەوکاتەی حوکم دەگرمە دەست...." لەکاتێکدا کێشەکە لەنێو سەیرورەتی–زۆرینەییدایە: ناتوانین نمایش بکەین، ناتوانین لاسایی منداڵ، یا شێت، ئافرەت، ئاژەڵ، یا نامۆیەك بکەینەوە، بەڵکو دەبین بەهەموو ئەوانە، تاوەکو هێزی نوێ یا چەکی نوێ دابهێنین. هەمان مەسەلەش لەبارەی ژیانەوە هەر ڕاستە. لەنێو ژیاندا جۆرێك لە خلەفان هەیە، لە داڕزانی تەندروستی، لە بونیادێکی شێوێندراوو ناهاوسەنگ، لە تەتەڵە کردنێکی زیندەدارانە کە سیحری کەسێکە. سیحر سەرچاوەی ژیانە وەکو چۆن شێواز سەرچاوەی نووسینە. ژیان مێژووی تۆ نییە، (حەکایەتی خۆت)، ئەوانەی هیچ سیحرێکیان نییە ژیانیشیان نییە، وەکو مردوو وان. بەڵام سیحر خودی هەموو کەسەکە نییە. بریتییە لەوەی کە دەشێت وەکو پێکهاتەیەك لە کەسەکاندا دەسگیری بکەین، ئەو دەرفەتە دەگمەنانەی لە ئەنجامی ئەم پێکهاتانەوە هاتوونەتە بوون. فرێدانێکی سەرکەوتووانەی زارە، چونکە ئەوەندەی پێویستە جەخت دەکاتەوە سەر ڕێکەوت لەبری ئەوەی بیبڕێت، یا مۆرکێکی گریمانەیی پێبدات، یا بیبڕێتەوە. ئالێرەوە لەمیانی هەر پێکهاتەیەکی لاوازو پووچەوە جەخت لە شۆڕشێك دەکرێت بەسەر ژیاندا، بەهێزو لاساریەکی زۆرەوەو بەردەوامیەك لەنێو وجوددا کە بێ وێنەیە. شتێکی سەیرە بڕوانیتە گەورە هزرڤانان کە ژیانێکی شەخسی پووچیان هەیە، تەندروستییەکی نائارام، لە کاتێکدا ژیان بۆ ئاستی توانایەکی ڕەها یا پڕ لە عافییەت بەرز دەکەنەوە. ئەوانە کەسێك نین، بەڵکو ئەوانە پێکهاتەی تایبەت بەخۆیانن. سیحرو شێواز دوو وشەی خراپن، بۆیە دەبێت بگۆڕدرێن و موفرەدەی تر بدۆزرێنەوە. دواتر ئەوکاتەی سیحر هێزێکی ناکەسایەتیانە دەبەخشێتە ژیان کە هێزێکە لە تاکەکانەوە تێپەڕدەکات و دەیانبەزێنێت، شێوازیش مەبەستێکی زەمینەیی–برانی دەبەخشێتە نووسین کە دەبێتە هۆی ئەوەی لە نووسین زیاد بێت. ئەوانەش هەمان شتن: نە نووسین لەنێو خۆیدا مەبەستێکی هەیە، نە ژیانیش شتێکی کەسایەتیانەیە، تاکە مەبەستی نووسین لەژیاندایە، ئەوەش لەسایەی ئەو پێکهاتانەی کە لێیەوە وەریدەگرێت و کێشی دەکات، بەپێچەوانەی عوساب (*nervose*) کە تێیدا ژیان دەسبەرداری ئەوە نابێت کە خۆی بە شێوێندراوی و مردوویی و بێزلێکراوە بدۆزێتەوە، نووسینیش دەسبەرداری ئەوە نابێت کە خودی نووسین بکاتە مەبەست. نیچە، بەپێچەوانەی هەر مرۆڤێکی عوسابی، تەندروستی خراپ بوو، بەڵام بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش زیندەدار بوو، نووسیویەتی دەڵێت: "هەندێکجار وا دەردەکەوێت کە هونەرمەند، بەتایبەتیش فەلسەفەکار، تەنیا ڕێکەوتێکە لە سەردەمەکەی خۆیدا.... سروشت کە

هیچ هەنگاو ناهاوێژێت، لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەم کەسەدا تاکە هەنگاوی خۆی دەهاوێژێت، ئەوەش هەنگاوێکی دڵخۆشکەرو بەختەوەرانەیە، چونکە لێرەدا وا هەست دەکات بۆ یەکەمجار گەیشتۆتە مەبەستەکەی خۆی، لەوێدا وازی لەگەڵ ژیانو سەیرورەت دەکات، کاتێك بەرەو گرەوێکی گەورە پاڵنراوە. ئەم دۆزینەوەیە وای لێدەکات ڕۆشن ببێتەوەو ماندووبوونی ئێوارەش لەڕوویدا دەربکەوێت، ئەو شتەی کە مرۆڤ ناوی دەنێت سیحر".

کاتێك کار دەکەین، لە دابڕانێکی ڕەهادایِن. ناشێت قوتابخانەیەك پێکبهێنین، بگرە ناشێت بەشێك لە قوتابخانەیەکیش پێکبهێنین. هیچ کارێك نییە، تەنیا کاری ڕەشو نهێنی نەبێت. دابڕانێکە زۆر بە توونـدی پڕ بووە، پڕ نەبووە لە خەون و سروش وەرگرتنو پڕۆژە، بەڵکو پڕبووە لە دیدار. ڕەنگە دیدارێك هاوسەرێتییەك یا سەیرورەتێك پێکبهێنێت. لەنێو قووڵایی ئەم دابڕانەدا دەتوانین هەموو جۆرە دیدارێك بەدیبێنین. کەسانێکی وا دەبینین "هەندێکجار نایانناسینو هەرگیز نەمانبینیون"، بەڵام جگە لەوانە بزاڤو هزرو شتی جۆراو جۆریش بەدی دەکەین. هەموو ئەو شتانە نازناوێکی ناسراویان هەیە، بەڵام نازناوی ناسراو بەتەنیا کەسێك یا کارەکتەرێك دیاری ناکات، بەڵکو لەنێو واقیعدا خواریو خێچی دیاری دەکات، شتێك لەنێوان دووانـدا ڕوودەدات یا تێپەڕ دەبێت، وەکو ئەوەی لەژێر کاریگەری جیاوازییەکی یەدەگیدابێت: "جێکەوتی کۆمبتۆن"[5]. هەمان شتیش لەبارەی سەیرورەتەوە دەڵێین: هیچ لایەك نابێتە لایەکی تر، بەڵکو هەریەکەیان لەڕێگای سەیرورەتێکی هاوبەشەوە دەگەن بەیەکتری، لەکاتێکدا ئەم سەیرورەتە لەنێوان هەردوولایەندا هاوبەش نییە،

مادام هەر لایەنێك هیچ پێوەندی بەلایەکەی ترەوە نییە، ئەوە ئەم سەیرورەتە دەکەوێتە نێوان هەردوولا، خاوەنی ڕووگەی تایبەتی خۆیەتی، کوتلەیەك لە سەیرورەت، گەشەکردنێکی ناهاوسەنگ. ئەوە پێکانی دوو لایەنەیە—قنص مزدوج، زەردەواڵەو مارمێلکە: بۆئەوەی هیچ شتێك نەبێتە لایەنێك، یا ببێتە ئەویترو لە ئاڵوگۆڕ و ئاوێتەبووندابن، بگرە ئەوە شتێکە لەنێوان هەردوولادایە، لە دەرەوەی هەردوولاشدایەو بەرەو ڕووگەیەکی تر دەڕوات. بە شتێك بگەین، مانای ئەوەیە شتێك بدۆزینەوە، بپێکین، بدزین؟ بەڵام ئەوە شتێکە لەنێوان هەردوولادایە، هەموو شتێك بەرووبوومی خۆئامادەکردنێکی دوورودرێژە. دزی کردن دژی کردەی خۆخستنە جێگاو کۆپیکردنو لاساییکردنەوەو تەقلیدە. پێکان بەردەوام پێکانێکی دووانەیە، دزین دزییەکی دووانەیە، ئەوەش شتێکی ئاڵوگۆڕکراو دروست ناکات، بەڵکو کوتلەیەکی ناچوونیەك، گەشەکردنێکی ناهاوسەنگ، زەماوەند، بەردەوام "لەدەرەوە"و بەردەوام "لەنێوان" دروست دەکات، ئەوکاتەش دیالۆگ دێتە دی.

" بەڵێ من هزر دزم
تکاتان لێدەکەم من ڕۆح دز نیم
بونیادم ناو جارێکی تریش بونیادم نا
ئەوەی کە لەچاوەڕوانیدایە،
چونکە لێوار دەریاکان وێنەی کۆشکی زۆر دەکێشن
ئەوانەی بەر لە سەردەمی من کراونەتەوە
وشەیەك، ئاوازێك، هێڵێك، حەکایەتێك
کلیل لەنێو بادا بۆ ئەوەی لەبیر ڕابکەم
بۆ ئەوەی بیرۆکە داخراوەکانم ببەمە شوێنێكو
بیانشارمەوە.
سەرقاڵ نیم بەوەی دانیشمو ڕابمێنم
کات لە گریمانە بەسەر ببەم

بیر لەبیرۆکەی وا بکەمەوە کە لە بیردان
بەخەونی وا کە هێشتا نەبینراوە
یا بە بیرۆکەی وا کە هێشتا نەنووسراوە
یا بە وشەی نوێ کە لەگەڵ قافیەدا بگونجێت...
من گوێ بەم ڕێسا تازانە نادەم
مادام نەبڕاوەو نەبەزێنراوە
منیش بەوشتانەوە هاوار دەکەم کە لەنێو سەرمدا
گۆرانی دەڵێن
دەزانم کە ئێمە، من و هەموو ئەوانەی وەکو منن،
ئەوانەی ئەم ڕێسایانە دادەنێین،
ئەگەر منداڵانی سبەی
پێویستیان بەم ڕێسایانەی ئەمڕۆ هەیە،
کەواتە مادام جیهان هیچ نییە تەنیا دادگایەك نەبێت
ئەوە ئەی دادوەران هەمووتان کۆببنەوە.
بەڵێ،
بەڵام من لە ئێوە باشتر تۆمەتباران دەناسم
لەکاتێکدا کە ئێوە سەرقاڵی ئەوەن بەدوایان بکەون
ئێمە سەرقاڵی شتە بچووکەکان دەبین،
هۆڵی دادگاییکردن پاك دەکەینەوە
گەسك دەدەین و گەسك دەدەین.
گوێ دەگرین و گوێ دەگرین.
بە یەکتری دەڵێین:
وریا بن
دەی وریا بن
نۆرەی ئێوە هەرگیز دواناکەوێت.

گەورەیی و شاکاری و سادەیی ئەم هۆنراوەیەی بۆب دیلان لەوەدایە کە هەموو شتێك دەڵێت. وەکو مامۆستایەکی زانکۆ حەزدەکەم، چۆن دیلان گۆرانییەك دادەنێت، وەکو بەرهەمهێنەرێکی سەرنجراکێش زیاتر لەوەی نووسەر بێت، منیش بتوانم وانەیەکی لەم شێوەیە پێشکەش بکەم. با شتەکەش لای من وەکو ئەوەی لای ئەو دەستپێبکات، لەناکاو، لەگەڵ ماسکەکەی کە ماسکی لیبۆکە، لەگەڵ هونەرێك بۆ هەموو وردەکارییەکی بەرنامەدار، ئەگەرچی خۆبەخۆیە، بەڵام دژی ئەوەیە شێوەیەکی تر وەربگرێت، لە هەمان کاتیشدا دژی مامۆستا و دژی نموونەیە. سازدانێکی زۆر دووردرێژ، بەڵام بێ میتۆدو بێ ڕێساو بێ وەسفە. زەماوەندگەلێکی بێ ژن و مێردن. خاوەنی کیسەیەك بم هەر شتێکم بینی بیخەمە ناویەوە، بەمەرجێك منیش، دۆزینەوە، بینینەوە، دزین، لەبری ڕێکخستن، یا دانپێدانان یا بڕیاردان، بخەمە نێو کیسەیەکەوە. لەبەرئەوەی دانپێدانان دژکارە لەگەڵ دیدار. بەردەوام بڕیاردان وەکو پیشەی زۆرکەس دەمێنێتەوە، ئەوەش پیشەیەکی باش نییە، بەڵام ئەوە شێوەیەکە لە بەکارهێنان کە خەڵکانێکی زۆر نووسینی پێ بەکاردێنن. گەسك لێدەر بین باشترە لەوەی دادوەر بین، هەرچەندەی لە ژیانماندا هەڵە بکەین، ئەوەندە وانەیەش دەبەخشین. هیچ کەسێك وەکو ستالینیستەکان نییە لە بەخشینی وانەی ناستالینی و ڕاگەیاندنی ڕێسای نوێدا. بنەچەیەکی تەواو لە دادوەران هەیە، مێژووی هزریش ئاوێتەی مێژووی دادگا بووە، ئەو بانگەشەی ئەوە دەکات کە سەر بە دادگای عەقڵی پەتی و بڕوای پەتییە.... بۆیە خەڵك ئەوەندە بە ئاسانی بەناوی کەسانی ترو لەبری ئەوانیش قسە دەکەن، تا ئەو ڕادەیەی پرسیاریان خۆش دەوێت و بەم ڕادەیەش بەشێوەیەکی زۆرچاك دەیخەینە ڕوو و وەڵامی دەدەنەوە. هەندێك کەسیش هەن داوا دەکەن حوکمیان بەسەردا بدرێت، لەبەر هیچ نا، تەنیا لەبەرئەوەی دانیان پێدابنرێت کە تاوانبارن. لەنێو دادگادا بانگەشەی ملکەچی و پێڕەوکردن دەکات، تەنانەت ئەگەر ئەم کارە بۆ هەندێك پرنسیپیش بێت کە داهێنراون یا بۆ باڵا

بوویێك بێت كە گوایە دەمانەوێت پەردەی لەسەر دابماڵین، یا بۆ هەستێك بێت كە ڕەتی دەكەینەوە. دادپەروەری‌و هێزی پێكان-لە بڕیاردان و دەستنیشانكردندا-دوو بیرۆكەی ئاست نزمن. دەبێت لە دژی ئەوانەدا بەهەمان شێوە داڕشتنی گۆدار كار بكەین: هیچ وێنەیەك ڕاست نییە، بەڵكو تەنیا وێنەیە، هەمان شتیش لەنێو فەلسەفەدا وەكو چۆن لەنێو فیلم‌و گۆرانیدا هەیە، هیچ بیرۆكەیەك نییە ڕاست بێت، بەڵكو تەنیا بیرۆكەیە‌و هیچی تر، ئەوەیە دیدار، ئەوە سەیرورەتە، دزین. زەماوەند، "لەنێوان" ئەم دابڕانانەدا.

كاتێك گودار[6] دەڵێت:" دەمەوێت ببم بە نووسینگەی بەرهەمهێنان". بێگومان مەبەستی ئەوە نییە:" دەمەوێت فیلمەكانی خۆم بەرهەم بێنم، یا دەمەوێت خۆم كتێبەكانی خۆم بەچاپ بگەیەنم". بەڵكو مەبەستی بەرهەمهێنانی هزرە، چونكە ئێمە لەم شوێنەدا، وەكو گروپێكی شەڕخواز، تەواو بەتەنیاین. ئێستا هیچ كەسێك وەكو نووسەر نەماوەتەوە، بەڵكو بوونەتە نوسینگەی بەرهەمهێنان، هیچ كاتێكیش ئەوەندەی ئێستا پڕ لەخەڵك نەبووە، واتا ببێتە گروپ، دەستەو تاقم‌و كۆمەڵە: گروپەكان لەنێو توندترین مەترسیدا دەژین. ئێمە دەتوانین دادگاو قوتابخانەو خێزان‌و زەواج نۆژەن بكەینەوە، بەلاّم وەكو پرنسیپێكی سەرەتایی، ئەوەی كە لەنێو گروپدا باشە، ئەوەیە كە هەر كەسێك كاتێك بەدوای مەسەلە تایبەتیەكانی خۆیەوەیەتی، لەوكاتەدا لەگەڵ ئەوانی تریش بەیەك دەگات. هەریەكەو بەدوای ئەسلابی خۆیەوەیەتی، سەیرورەتێك وێنە دەكێشرێت‌و بارستاییەك دەست بە بزاڤ دەكات كە بەتەنیا هی یەك كەس نییە، بەڵكو لەنێوان هەموو خەڵكدایە، وەكو ئەو بەلەمەی منداڵە بچووكەكان دروستی دەكەن‌و دەیخەنە ناو ئاو، خەڵكی تریش لێیانی دەدزن. باشە دەبێت گۆدارو میلفیل لەنێو وتووێژە تەلەفزیۆنییەكاندا چیان كردبێت "شەش دووشەممە"، ئەگەر بەپیتترین بەكارهێنانی دابڕان و تەنیاییان نەبێت و وەكو شێوازێكیش بەكارنەهێنرابن بۆ بەیەكگەیشتن، یا بۆئەوەی هێڵێك یا بارستاییەك بەنێوان دووكەسدا تێپەڕ بێت‌و هەموو دیاردەكانی پێكانی دووانەیی بەرهەم نەهێنرێت و ئاشكراكردنی ئەوەی كە "واو"ی عەتف كۆبوونەوەو هاوسێیەتی پێكناهێنێت، بەڵكو گەشەكردن‌و تەتەڵە پێكدێنێت، جێكەوتی هێڵێكی شكاو بەردەوام لە حیدانەوە دەست پێدەكات، جۆرێك لە هێڵی ڕاكردنێكی كاراو داهێنەرانە؟ و...

نابێت بەدوای ئەوەدا بگەڕێین كە ئایا بیرۆكەیەك ڕاستە یا هەڵەیە. دەبێت لە شوێنێكی تردا بەدوای بیرۆكەیەكی تری جیاوازدا بگەڕێین، شتێك بەنێوان هەردووكیاندا تێپەڕ بێت. بەهەرحاڵ، ئێمە بەتەنیا ناتوانین ئەم بیرۆكەیە بدۆزینەوە، بەڵكو پێویستیمان بەڕێكەوت هەیە، یا كەسێك پێمانی ببەخشێت. پێویست نییە مرۆڤ زانا بێت، ئەو كایە یا كایەیەكی تر شارەزابێت، بەڵكو دەبێت لەنێو كایەی زۆر جیاوازدا، فێری ئەو كایە یا كایەیەكی تر بێت. ئەوەش لە بڕین (كات-ئاپ، *Cut-up*) باشترە[7]. یا بەشێوەیەكی تر كاری (*Pick-me-up*) ئینعاشە، كاری (پیك-ئاپ، *Pick-up*). ئەوەش لەنێو فەرهەنگەكاندا بریتییە لە: پێكان، دەرفەت بەفیڕۆنەدان، دەستكردن بە كارێكی بزۆز، وەرگرتنی شەپۆل: دواتریش ئەم وشەیە مانایەكی نەرجسیانەی تێدایە. تا ئێستاش (بڕین-*Burroughs*) بەلایەنی كەم میتۆدێكی گریمانەیی پێكدێنێت، بەلاّم هێشتا نەیتوانیوە هەموو جارێك پێشنیار یا دەرفەتێكی دەگمەن لە ئاوێتەكردنی دژكارەكان پێكبهێنێت. بۆ نموونە، من هەوڵدەدەم

ئەوە ڕوون بکەمەوە کە خەڵك و شتەکان لە چەندین هێڵی فرەجیاواز پێکهاتوون و خۆیشیان نازانن کە ئەوان سەر بە چ هێڵێکن، ئەوەش نازانن چۆن ئەم هێڵە دابڕێژن کە سەرقاڵی وێنەکردنین. بە کورتی لەنێو خەڵکدا جوگرافیایەکی تەواو هەیە، لەگەڵ هێڵی توونددو پتەو، هەندێك هێڵی نەرمو هێڵی ڕاکردن و....تاد. بە جان– لاییری هاوڕێم دەگەم کە لەبارەی شتێکی ترەوە مەسەلەکەم بۆ ڕاڤە دەکات، تەرازووی ڕەخنە بریتییە لە هێڵێك لەنێوان دوو جۆر لە کردار، لە روخساردا سادەن، زۆر بە وردی، ئەو هێڵەیە کە ئابووریناسان دەتوانن لەهەر شوێنێك بیانەوێت تێی بپەڕێنن، بەم شێوەیەش هەرگیز نازانن بە کوێدا تێی بپەڕێنن. ئەوە بەیەکگەیشتنە، بەلاّم لەگەڵ کێ؟ لەگەڵ جان لاییر، لەگەڵ کایەیەك، بیرۆکەیەك، وشەیەك، بزەیەك؟ لەگەڵ کەسێکی وەکو فانی–*Fanny*. وازم لە کاری لەم شێوەیە نەهێناوە. بەردەوام ئەو بیرۆکانە بە "سەراوژێری" دەستگیریان کردووم، لە شوێنێکی تری تەواو دوورەوە دێت، بەجۆرێك وەکو هێمای دەرچوو لە دوو فانۆس بەیەك دەگەین.

ئایا لەنێو کارەکەیدا شیعری لۆرنس بەدی دەکەین لەبارەی کیسەڵ؟ هیچ شتێکم لەبارەی کیسەڵ نەدەزانی، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوە هەموو شتێك لەبارەی سەیرورەتی ئاژەلاّن دەگۆڕێت، لەوەشدا کەس دڵنیا نییە لەوەی هەر ئاژەڵێك توانای ئەوەی هەبێت بەرەو ئەم سەیرورەتە کێش بکرێت. ڕەنگە کیسەڵ بێت؟ یا زەرافە؟ ئەوەتا لۆرنس دەڵێت:" ئەگەر من زەرافە بم، ئەو ئینگلیزانەی لەسەریشم دەنووسن، سەگێکی باش پەروەردە کراوبن، ئەوە بەهیچ شێوەیەك شتێکی باش نییە، ئاژەلاّن زۆر جیاوازن. دەڵێن ئێمە تۆمان خۆش دەوێت؟ بڕوام پێبکەن، ئێوە منتان خۆش ناوێت، بەڵکو هەر بە غەریزە ڕقتان لەو ئاژەڵەیە کە منم".

دوژمنەکانمان سەگن، بەلاّم بەوردی دیداری ئەو بوونەوەرە چییە کە خۆشمان دەوێت؟ دیداری کەسێکە؟ یا ئاژەڵێکە دێت بۆ ئەوەی لەناوەوەماندا جێنشین بێت؟ یا بیرۆکەیەکەو دێت دەستمان بەسەردادەگرێت؟ چەند بزاڤێك پاڵمان پێوە دەنێت؟ چەند دەنگێك دەمانبڕێت؟ باشە چۆن شتەکان لەیەکتری جیا دەکەینەوە؟ دەتوانم قسە لەبارەی فۆکۆ بکەم، بڵێم ئەم شتە یا ئەو شتەی پێگوتم، زۆر بەوردی ئەوە بگێڕمەوە کە چۆن دەیبینم، بەلاّم ئەوە شتێك نییە شایانی باس بێت، مادام نەمزانی چۆن بەڕاستی دەتوانم دیداری ئەم کۆمەڵە دەنگە پاڵنەرو بزاڤە یەکلاکەرەوەکانو ئەو بیرۆکانە بکەم کە هەموویان لە داری وشكو ئاگر پێکهاتوون، ئەو سەرنجدانە زێدە ڕۆیەو ئینفیلاقی لەناکاوو ئەو پێکەنینەی کە هەست دەکەیت (ترسناکە) لەهەمان ئەو چرکەیەدا کە تێیدا هەست بە سۆزەکەی دەکەیت، ئەم کۆمەڵەیە کە ئاوێتەبوونێکی دەگمەنەو ناسراوە بە میشێل فۆکۆ. پیاوێکی بێ سەرچاوە، وەکو ئەوەی فرانسوا ئیواڵدا دەڵێت:" ئەوە جوانترین پیاهەڵدانە... جان–لاییر، تاکە هاوڕێیەکە هەرگیز جێیم نەهێشتووە و هەرگیز ئەویش جێینەهێشتم...". جیرۆم[9]. ئەو خەیاڵەی بەپێوە دەڕوات، کە لە بزاڤدایە، لە هەموو لایەکەوە ژیان دەیبڕێت، ئەوەی کە بەخشندەییو خۆشەویستی لەیەك سەروچاوەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەویش یونس–ە. لەنێو هەریەکێك لە ئێمەدا شتێك هەیە لە شێوەی زوهد کە لەلایەکیەوە دژی خۆمان ئاراستە کراوەتەوە. ئێمە بیابانین، بەلاّم بیابانی پڕ لە هۆزی جێنشین بوو، پڕ لە دڕندەو مەمالیك لە زوهر، ئێمەش کاتی خۆمان لە ڕێکخستنی ئەم هۆزانە

بەسەر دەبەین، بەشێوەیەكی جیاواز ڕێكیان بخەین، هەندێكیان بسڕینەوەو هەندێكیشیان وا لێبكەین گەشە بكەن. هەموو ئەم گەلانەش، ئەم هەموو خەڵكە، ڕێگر نین لەبەردەم بیاباندا كە خودی ئەو زوهدی ئێمەیە، بەڵكو بگرە بەپێچەوانەوە، ئامادەی دەكاتو پێیدا تێپەڕدەبێتو بەسەریدا دەڕوات. لەنێو گتاری دا، بەردەوام تیشكێكی وەحشیانە هەبوو، لەلایەكیەوە دژی خۆی ئاراستە كراوەتەوە. بیابان، ئەزموون بەسەرخوددا، تاكە شوناسی ئێمەیە، تاكە شانسی ئێمەیە بۆ هەموو ئەو پێكهاتەو ئاوێتانەی لەناوەوەماندا جێنشینن. ئەو كات دەگوترێت: ئێوە مامۆستا نین، بەڵام لەم حاڵەتەدا زیاتر بێزارن. چەندە حەزمان دەكرد شتێكی تر بووینایە.

من لەسەر دەستی دوو فەلسەفەكار پێگەیشتم كە زۆر ڕێزم دەگرتن و پێیان سەرسام بووم. (ئەلكییەو هیپۆلیت *Hyppolite–Alquie*). دواتریش هەموو شتەكان تێكچوون. ئەلكییە خاوەنی دوو دەستی سپیو درێژو تەتەڵە كردنێك بوو كە نەمان دەزانی ئایا ئەوە لە منداڵییەوە هاتووە یا بەپێچەوانەوە، یا ئەو لێرەدا شێوەزارێكی لەدایكبووانە دەشارێتەوە كە خۆی دەخستە بەر خزمەتی دوالیزمە دیكارت-ییەكان. ئەوەی تریشیان، دەموچاوێكی بەهێزی هەبوو، بەڵام بە هەندێك سیمای ناتەواوەوە، بە مشتەكانی بڕگە هیگل-ییەكانی واژوو دەكردوو وشەكانی ئاڵۆزو ئاوێتەی یەكتری دەكرد. لەگەڵ ئازادكردنی پاریس-دا، خۆمان بینییەوە بە سەرسوڕماویەوە لەنێو مێژووی فەلسەفەدا دامابووین. زۆر بە سادەیی دەچووینە نێو فەلسەفەی هیگڵ و هۆسرڵ و هایدگەر، وەكو گوجیلە سەگی تازە فێربوو پاڵمان بەیەكتریەوە دەنا، زۆر لە سەدەناوەندییەكان خراپتر بوو. لەبەخت باشی ئێمەدا سارتەر هەبوو. بۆ ئێمە سارتەر بریتی بوو لە دەرەوە، بەڕاستی یەكپارچەبوو لە گۆرانی باگڕاوندی-ئەوەندەش گرنگ نەبوو لامان لە تێڕوانینی مێژوویی ئایندەدا ئەوە بزانین كە پێوەندییەكانی لەگەڵ هایدگەر چۆن بووە. لەنێو هەموو گریمانەكانی سۆربۆندا، ئەو تاكە شت بوو كە هێزی ئەوەی پێدەداین بەرگری سەرلەنوێ گەڕانەوەی شتەكان بۆ دۆخی خۆیان بگرینەوە. سارتەریش وازی لەوە نەهێنا كە ئەوە نەبێت، نموونەو میتۆد نەبوو، بەڵكو هەوایەكی پاكو بێگەرد بوو، تەنانەت ئەگەر لە چایخانەی (فلۆر) یشەوە هاتبێت، ڕۆشنبیرێك كە بەتەنیا بارودۆخی ڕۆشنبیر دەگۆڕێت. گەمژەییە گەر پرسیاری ئەوە بكەین ئایا سارتەر سەرەتا یا كۆتایی شتێكە؟ وەكو هەموو شتەكانی تریش، وەكو مرۆڤە داهێنەرەكان، ئەو لە نێوەندا گەشە دەكات. كەچی من ئەوكاتە هەرگیز هەستم بەوە نەكرد كە بەرەو لای وجودییەت كێش ببم، بەرەو لای فینۆمینۆلۆژیاش نەچووم، بەڕاستی نازانم بۆ، بەڵام ئەوانە هەمووی پێدەچێت لەوكاتەدا كە ئێمە هاتین، لە ئەستۆی مێژوودا بووە، زۆریو فرەیی میتۆدو لاساییكردنەوەو ڕاڤەكردنو تەئویلكردن، ئەم حاڵەتە تەنیا لەلای سارتەر بوونی نەبوو.

كەواتە، دوای ئازادكردن، بەبێ ئەوەی بە خۆشمان بزانین، بە هەنجەتی ئەوەی كەچاومان لەئاست ئایندەی هزر دەكاتەوە، ئەو هزرەی كە زۆر كۆنە، مێژووی فەلسەفە هات دەستی بەسەرداگرتینو كۆنترۆڵی كردین. پێم وانییە پرسی هایدگەر ئەوە بێت: ئایا بەجۆرێك لە جۆرەكان نازی بووە-ئەوە شتێكی زۆر سادەو ئاشكرایە، زۆر سادەیە-بەڵكو پرسی ڕاستەقینەی ئەو ئەوەیە: ڕۆڵی هایدگەر لەم سەردەمە تازەیەی مێژووی فەلسەفەدا چیبووە؟

هزرو بیرکردنەوە شتێکە کەس بە جدی هەڵیناگرێت تەنیا ئەو کەسانە نەبێت کە بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە هزرڤان‌و بیریارو فەلسەفەکاری پسپۆڕن. بەڵام ئەوەش ڕێگا لەوە ناگرێت کە هزر ئامرازی دەسەڵاتگەرایی تایبەت بەخۆی هەبێت، ئەوەش کاتێک بەخەڵک دەڵێت: مادام لەپێناوی ئێوەدا بیردەکەمەوە و پێوەرو ڕێساو بنەماتان پێدەدەم، وێنەیەکتان پێدەدەم کە دەتوانن گوێی لێبگرن بۆیە بەجدی وەرم مەگرن، بەتایبەتیش کە ئێوە دەڵێن: ئەوە کاری ئێمە نییە، ئەوەش هیچ بایەخێکی نییە، ئەوە پرسی فەلسەفەکاران‌و تیۆرە پەتییەکانی خۆیانە.

بەردەوام مێژووی فەلسەفە دەسەڵاتێک بووە لەنێو فەلسەفەدا، بگرە تەنانەت لەنێو هزریشدا. ڕۆڵێکی سەرکوتکەرانەی گێڕاوە: چۆن دەتانەوێت بیربکەنەوە بەبێ ئەوەی ئەفلاتون و دیکارت و کانت و هایدگەر بخوێننەوە؟ بەبێ ئەوەی ئەم یا ئەو کتێبەیان لەبارەوە بخوێننەوە؟ قوتابخانەیەکی تۆقێنەر بۆ ئاهەنگسازی شت هەڵبەستنی پسپۆڕەکانی هزر، بەڵام ئەوانەش پاڵدەنێت بۆ ملکەچی کردن کە لەدەرەوەدان، تەنانەت بەهێزیش بۆ ئەو پسپۆڕی و تایبەتمەندییەی کە ڕقیان لێیەتی. وێنەیەک بۆ هزر، کە ناوی فەلسەفەیە، بەشێوەیەکی مێژووییانە دامەزراوەو بەڕاستیش ڕێگرە لەبەردەم بیرکردنەوەدا. پێوەندی فەلسەفە بە دەوڵەتەوە تەنیا ئەوە نییە کە زۆربەی فەلسەفەکاران تا ڕابردوویێکی نزیکیش (مامۆستای عمومی) بوون–ئەگەرچی ئەم حەقیقەتە لەهەر یەک لە فەرەنساو ئەڵمانیادا مانایەکی جیاوازی هەیە. ئەو پێوەندییە لە دوورەوە دێت، لەبەرئەوەی هزر بەشێوەیەکی زۆر پەتییانە وێنەی فەلسەفییانەی خۆی لە دەوڵەتەوە وەردەگرێت بەو سیفەتەی کە ناوەوەیەکی جوانی جەوهەری یا خودییە. بەڕاشکاوانەتر بڵێین، دەوڵەتێکی ڕۆحانی ئافرێدە دەکات، دەوڵەتێکی ڕەها، هەرگیز نابێتە خەون مادام بە کردارەکیانە لەنێو هزردا کار دەکات. ئالێرەوەیە کە هەندێک چەقی وەکو: گەردوونگەرایی‌و میتۆدو پرسیارو وەڵام‌و بڕیاردان و دانپێدانان یا تەمییزکردن و هزرە ڕاستەکان، بەردەوام هزری ڕاست بوون. هەر ئالێرەشەوەیە بایەخی هەندێک بابەتی وەکو کۆماری هزرەکان‌و لێکۆڵینەوە لە تێگەیشتن و دادگاییکردنی عەقڵ و مافی پەتییانەی هزر لەگەڵ وەزیرە ناوخۆییەکان‌و فەرمانبەرەکانی هزری پەتی. فەلسەفە دەستی تێوەردراوەو بڕدراوە مادام پڕۆژەی پێکهێنانی زمانی ڕەسمی دەوڵەتێکی پەتییە. بەم شێوەیەش پراکسیسی هزر لەگەڵ مەبەستە کردەییەکان‌و دەلالەتە بالادەستەکانی دەوڵەتدا کۆک‌و تەبا دەبێت، وەکو چۆن لەگەڵ ئیلزاماتەکانی سیستەمی بونیادو بالادەستەدا کۆک دەبێت. نیچە هەموو شتێکی لەمبارەیەوە لەنێو کتێبی (شوبنهاوەر وەکو پەروەردەکارێک) دا گوتووە.

ئەوەی کە خۆی بە پلیشاوەو تۆمەتبار دۆزیوەتەوە، گوایە بێزارکارە، هەموو ئەو شتانەن کە سەر بە هزری بێ وێنەن، وەکو دەوارنشینی‌و ئامێری جەنگ‌و سەیرورەت‌و ئەو زەماوەندانەی کە دژە سروشتن‌و پێکان‌و دزین‌و ئەوانەی لەنێوان دوو جیهاندا جێنشینن "بۆ نمونە جیهانی ئاژەڵ‌و جیهانی مرۆڤ"و زمانە کەمایەتییەکان‌و تەتەڵەی نێو زمان‌و.... تاد.

بە دڵنیاییەوە دەشێت کایەو بواری تریش هەبێت جگە لە فەلسەفەو مێژووەکەی ئەم ڕۆڵەی سەرکوت کردنی هزر بگێڕن. تەنانەت لە ڕۆژگارێکی وەکو ئەمڕۆدا، دەتوانین بڵێین مێژووی فەلسەفە ئیفلاسی کردووەو "دەوڵەتیش پێویستی بەوە

نەماوە لەلایەن فەلسەفەوە پشتگیری لێبكرێت‌و پشت ڕاست بكرێتەوە"، ئێستا هەندێك ڕكابەریتر شوێنگەی ئەویان داگیر كردووە. ئەپستمۆلۆژیا ئالأی لە فەلسەفەی مێژوو وەرگرت، ماركسیزمیش حوكمێكی بەسەر مێژوودا دا، بگرە تەنانەت دادگایەك بۆ گەل دادەنێت كە زۆر لەوانەی پێشووتریش مایەی نیگەرانییە، دەروونشیكاریش زیاترو زیاتر بایەخ بە فرمانی هزر دەدات‌و بەبێ حەقانەش زەواج لەگەڵ زمانەوەریدا دەكات. ئەم ئامێرو ئامرازە نوێیانە خۆیان لەنێو خودی هزردا بوونەتەوە بە دەسەلأت، ماركس و فرۆید و سۆسێریش سەركوتكەرێكی سێ سەر بوون، زمانێكی مەزنی بالأدەست: تەئویل و گۆڕین‌و گوزارشت یا وتەزا، ئەوانە فۆرمی تازەی هزرە ڕاستەكانن. تەنانەت ئاماژە سێنتاكسییەكەی چۆمسكی-ش بەر لە هەموو شتێك، ئاماژەیەكی دەسەلأتدارانەیە.

زمانەوەری لەم چركەساتانەدا سەركەوت كە تێیدا ڕاگەیاندن وەكو دەسەلأتێك لە گەشەكردندابوو و خەریكی سەپاندنی وێنەی خۆی بوو لەبارەی زمان‌و هزر، گوایە هاوشێوەن‌و خەریكی گەیاندنی ڕێنماییەكانی خۆی بوو و دووبارەبوونەوەكانی ڕێكدەخست. پرسیاركردن لەبارەی ئەوەی كە ئایا فەلسەفە مردووە هیچ مانایەكی نییە، ئەوە لە كاتێكدا هەندێك كایەو بواری تر فرمانەكەی ئەو جێبەجێ دەكەن. ئێمە بەهیچ مافێك بانگەشەی شێت بوون ناكەین، لەبەرئەوەی خودی شێت بوون بەیەكەوە بە دەروونشیكاری و زمانەوەری تێپەڕدەبێت، ئەوەندە زۆر لەلایەن هزری ڕاست‌و كولتووری پتەو یا مێژوویەكی بێ سەیرورەت بەزێندراوە، ئەوەندە خاوەنی سیمایەكی لیپۆكانەیەو مامۆستاو سەركردە بچووكەكانیشی هەر بەم شێوەیەن.

كەواتە، من بە مێژووی فەلسەفە دەستم پێكرد، ئەوكاتەی هێشتا خۆی دەسەپاند. شێوازێكیشم نەدۆزیبۆوە تاوەكو بۆخۆم لێی دەربازبم‌و بێمە دەرەوە. بەرگەی دیكارت‌و دوالیزمی كۆجیتۆم نەدەگرت، بەرگەی هیگڵ‌و سێیانەكەی و كارە نێگەتیڤەكەیم نەدەگرت. بۆیە خۆم دۆزیەوە ئەو فەلسەفەكارانەم خۆش دەوێت كەوا دیاربوو ڕۆچووبوونە نێو مێژووی فەلسەفە. كەچی لەلایەكی ترەوە، یا لە هەموو لایەنەكانەوە لێی دەرباز دەبوون: لۆكریس، سپینۆزا، هیوم، نیچە، برگسۆن. گومان لەوەدا نییە هیچ مێژوویێكی فەلسەفە نییە كە بەشێك لەبارەی ئەزموونگەرایی پێشكەش نەكات: لەنێو ئەم بەشەشدا لۆك و بێركلی شوێنگەی دیاری خۆیان هەیە. بەلأم لەولاشەوە، لەلای هیوم شتێكی زۆر سەرنجڕاكێش و سەیر هەیە كە سەرتاپای ئەزمونگەرایی دەگۆڕێت‌و هێزێكی نوێی پێدەبەخشێت، مەراسێك و تیۆرێك لەبارەی پێوەندییەكان، لەنێو (واو) ی عەتفدا، ڕاستە هەموو ئەوانە لەلای هەریەك لە رسل و وایتهێددا بەردەوام دەبێت، بەلأم لەئاست پۆلینكردنە مەزنەكاندا هەروەكو شتێكی وشك‌و پەراوێز دەمێنێتەوە، تەنانەت لەو كاتەشدا كە دەبێتە سروش بەخشی لۆژیك و ئەپستمۆلۆژیایەكی نوێش.

ئەوەش ڕاستە كە برگسۆن لەسەر شێوازی فەرەنسیدا ڕۆچووبووە نێو مێژووی فەلسەفە، لەگەڵ ئەوەشدا شتێكی تێدایە ئەستەمە تێیی بگەین، شێوەیەك كە لەسایەیەوە هەژانێكە، هاوپەیمانێتی هەموو دژكار و نەیارەكانە و شوێنی كینەیەكی زۆرە، ئەوەش بەو رادەیەی كە لەنێو تیۆری فرە سەیرورەتی‌و فرە بەیەكەوە گونجاوو مومارەسەیی

دایە، ئەوەندە لەنێو بابەتی دەیمومەتدا نییە. ئەی سپینۆزا؟ ئایا هەر وا سانایە لەنێو پاشماوەی دیکارتیدا ئەم شوێنە گەورەیەی پێ ببەخشین؟ تەنیا لەبەرئەوەی لەهەموو لایەکەوە ئەم شوێنە پڕدەکاتەوەو هیچ مردوویێکی زیندووی ئاواش نییە وەکو ئەو بەم هەموو هێزەوە گۆڕەکەی خۆی هەڵبداتەوەو بەم ڕوونیو ئاشکراییەش بڵێت: من لەئێوە نیم؟ سپیۆزا ئەو کەسەیە کە بەپێی پێوەرەکانی مێژووی فەلسەفە زۆر بە جدییانە کارم لەسەر کردووە، هەر ئەویش بوو لە کەسانی تر زیاتر هەستی ئەوەی پێ بەخشیم کە هەر چەندەی مرۆڤ بێت بیخوێنێتەوە هەست دەکات بایەك لەدواوە دێتو دوورت دەخاتەوە، بە گێسکێکی سیحریەوە وات لێدەکات وەکو ئاژەڵێك سواری نووسینەکان بیت. ئێمە هێشتا دەستمان بەوە نەکردووە لە سپینۆزا تێبگەین–من لە کەسانی تریش زیاتر. هەموو ئەو هزرڤانانە تەندروستیان تەواو نییە، بەڵام بەشێوەیەك ژیان دەبڕن کە نابەزێنرێت. کار ناکەن تەنیا بەهێزێکی پۆزەتیڤو تەوکیدی نەبێت. جۆرێك لە پەرستنی ژیانیان لەلادا هەیە (خەون بەوە دەبینم یا داشتێك بۆ ئەکادیمیای زانستە ئەخلاقییەکان بنووسم، تا ئەوە پیشان بدەم کە کتێبەکەی لوکریس نابێت مۆری تاعونی پێوەبنرێت و بەم شێوەیە ناوبنرێت، ئەو کارە هەڵبەستراوەش لەلایەن ئەو مەسیحییانەوە شێوێنراوە کە گەرەکیانە ئەوە بسەلمێنن گوایە هزرڤانێکی خراپەکار لە کۆتاییدا دەبێت خۆی لەنێو ئابلووقەو ترسدا ببینێتەوە). ئەو هزرڤانانە پێوەندییەکی ئەوتۆیان بەیەکەوە نییە، تەنیا نیچەو سپینۆزا نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا پێوەندیان بەیەکەوە هەیە. وەکو ئەوەی شتێك بەخێراییو درەوشانەوەی جیا جیا بەنێوانیاندا تێپەڕبێت، ئەوە شتێك نییە لەنێو هەندێکیان، یا هەندێکی تریاندا بێت، بەڵکو لەنێو بۆشاییو پانتاییەکدایە کە بەڕاستی ئێستا بەشێك لە مێژوو پێکناهێنێت، ئەوەش دیالۆگی نێوان مردووەکان نییە، بەڵکو لەنێوان هەسارەکاندایە، لەنێوان ئەستێرەی زۆر جیاواز، سەیرورەتە جیاوازەکانیان کوتلەیەکی جووڵاو پێکدەهێنن کە دەبێت بپێکرێت، فڕینی ئاڵوگۆڕکراو، ساڵی ڕووناکی. دوای ئەوە، من قەرزەکانی خۆمم دابۆوە: نیچەو سپیۆزا لێم خۆشبوون، بۆیە زیاتر کتێبی تایبەت بەخۆمم دادەنا، پێم وایە ئەوەی کە لەلای من گرنگ بوو وەسفکردنی ئەم شێوە مراسەی هزر بوو، یا لەلای نووسەرێك یا بۆ خودی خۆی کاتێك ئەم وێنە کلاسیکییە دژکار دەبێتەوە کە فەلسەفە ئاوەژووی کردۆتەوەو لەنێو هزردا بونیادی ناوە تاوەکو ملکەچی بکاتو ڕێگای کارکردنی لێبگرێت. من نامەوێت ئەم ڕوونکردنەوانە بگێڕمەوە، چونکە پێشتر هەوڵمداوە هەموو ئەو شتانە لەنێو نامەیەکدا بۆ هاوڕێم میشێك کریسول باس بکەم، ئەو کەسەی کە شتی زۆرباشو زۆر خراپی لەبارەی منەوە نووسیوە.

جگە لە دیداری من و فیلیکس گتاری، شتی تری زۆر هەیە. فیلیکس پێشتر خاوەنی ڕابردوویێکی دوورو درێژبوو لەکاری سیاسیو دەروونشیکاریدا. ئەو خاوەنی (ئامادەکردنێکی فەلسەفییانە) نەبوو، بەڵام خاوەنی سەیرورەتی فەلسەفەکارو زۆر سەیرورەتی تر بوو. هیچ کاتێك نەدەوەستا. کەسانێکی کەم هەن هەستێکی مەزنیان بە بزاڤکردن لە هەموو چرکەیەکدا پێدەدام، جووڵەی بەردەوام، پۆخڵی نا، بەڵکو بزاڤکردنێکی تەواو لەسایەی جووڵەیەکەوە کە پێی هەڵدەستا، وشەیەکی دەگوت، لەرینەوەی دەنگی وەکو مشکالێك کە هەموو جارێك تەولیفێکی نوێ وەردەگرێت، ئەو بەردەوام هەر

فیلیکس بوو، بەلاّم نازناوەکەی ناوی شتێك بوو کە تێیدا ڕووی دەدا نەوەکو خودێك بێت.

فیلیکس پیاوی گروپ بوو، دەستەو هۆز، لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی تەنیایە، بیابانێکە پڕە لەم جیاوازیانە، بەهەموو هاوڕێو هەموو سەیرورەتەکانییەوە. زۆر کەس بە دووان و پێکەوە کاریان کردوە، لە هەردوو برا غونکۆرەوە تاوەکو دەگاتە ئیرکمان-شاتریانو لوریل و هاردی. بەلاّم لێرەدا هیچ بنەماو شێوازێکی گشتی بوونی نییە. من لە کتێبەکانی ڕابردوومدا هەوڵمداوە وەسفی مراسێکی دیاریکراو بکەم بۆ هزر: بەلاّم ئەوکاتە هێشتا وەسفەکەی بەم شێوەیە مانای پراکسیك کردنی هزری نەداوە. (وەکو ئەوەی بەس نەبێت کە هاواربکەین "بژی فرەیی" تاوەکو بیبڕینو بیبەزێنین، بەڵکو دەبێت فرەیی بڕینو بیبەزێنین. ئەوەش بەس نەبێت کە بڵێین "بڕوخێت جۆرەکان" بەڵکو دەبێت بە کردەییانە بنووسین تاوەکو هیچ "جۆرێك" نەمێنێت،...تاد).

هەموو ئەوەش لەگەڵ فیلیکس دا مومکین دەبێت، ئەگەرچی هەندێکجار سەرتیخ دەچین. ئێمە تەنیا دوو کەس بووین، ئەوەی لامان گرنگ بوو کارکردن نەبوو پێکەوە، بەڵکو ئەو ڕووداوە سەیرە بوو کە بریتییە لە نووسین لەنێوان دوو کەسدا. وای لێهات یەکێك وازی لەوە دەهێنا ببێتە "نووسەر"، ئەوەی لەنێوان ئەم دووانەشدا هەبوو دەگوازرایەوە بۆ نێو کەسانی تر کە جیاوازبوون لە یەکتری. بیابانەکە گەشەی دەکردو زیاتر دەبوو، بەلاّم هێدی هێدی پڕتر دەبوو. ئەوە هیچ پێوەندی بە قوتابخانەو بە کردەی بەزەینکردنەوە نەبوو، بەو ڕادەیەی پێوەندی بە چاوپێکەوتنو دیدارەوە هەبوو. هەموو ئەم چیرۆکانە، چیرۆکی سەیرورەتو زەواجی دژە سروشتو گەشەکردنی ناهاوسەنگ و ئیزدیواجیەتی زمانو دزینی هزر بوو.

من لەگەڵ فیلیکسدا ژیاوم، دزیم لە فیلیکس کردووە، هیوادارم ئەویش لەبەرانبەر مندا هەمان کاری کردبێت. دەزانی چۆن کاردەکەین؟ بۆیە ئەوە دووبارە دەکەمەوە چونکە لای من گرنگە، ئێمە پێکەوە کار ناکەین، بەڵکو لەنێوان دووکەسدا کاردەکەین.

لە بارودۆخێکی لەم شێوەیەدا، کاتێك ئەم جۆرە لە فرەییبوونی هەیە، مەسەلەکە دەبێتە جۆرێك لەسیاسەت، سیاسەتێکی "وردبینانە" وەکو ئەوەی فیلیکس-یش دەڵێت: بەرلەوەی کەینوونە هەبێت سیاسەت هەبووە. ئێمە پێکەوە کار ناکەین، بەڵکو دانووستاندن دەکەین.

هەرگیز لەسەر هەمان ریتم نەبووین، بەڵکو بەردەوام لە ئینزیاحدا بووین: ئەوەی فیلیکس پێی دەگووتم، من دوای شەش مانگ ئینجا تێی دەگەیشتمو دەمتوانی بەکاری بێنم: ئەوەی منیش بە ئەوم دەگوت، ڕأستەوخۆ تێدەگەیشت و خێراتربوو لەوەی کە بۆ من پێویستە، دواتریش ئا ئەوەتا دەگەیشتە شوێنێکی تر. هەندێکجار بەیەکەوە کارمان لەسەر هەمان چەمك دەکرد، دواتر تێبینی ئەوەمان دەکرد کە بە یەك شێوەو وەکو یەك دەسگیرمان نەکردووە: بۆ نموونە بەم جۆرە "جەستەی داماڵراو لە ئەندامەکانی"، یا نموونەیەکی تر: فیلیکس کاری لەسەر کونە ڕەشەکان دەکرد[10]. ئەم چەمکە گەردووونناسییە سەرنجی ڕاکێشابوو. ئەوە کونەڕەشەکانە دەتانپێکێتو ڕێگاتان پێنادات بێنە دەرەوە. چۆن دەکرێت لە کونە ڕەشەکان بێنە دەرەوە؟ چۆن دەکرێت لەو غۆری کونێکی ڕەشەوە دەست بە پەخش بکەین؟ فیلیکس ئەم پرسیارانەی دەکرد.

من کارم لەسەر دیوارێکی سپی دەکرد: دیواری سپی چییە؟ شاشە چییە؟ چۆن دەکرێت دیوار بلاّوبکرێتەوەو ڕێگا بە هێڵی ڕاکردن بدرێت بۆئەوەی تێپەڕێت؟ ئێمە ئەم دوو چەمکەمان بەیەکەوە

کۆنەکردەوە، بەڵکو تێبینی ئەوەمان کرد کە هەریەکێك لەم چەمکانە هەر لەخۆیانەوە بەرەو یەکتری دەچن، بەڵام بە دیاریکراوی بۆ بەرهەمهێنانی شتێك کە لەنێو هیچ کامێکیاندا نەبوو. لەبەرئەوەی بونی کونی ڕەش لەسەر دیواری سپی، زۆر بەوردی بریتییە لە دەمووچاو، دەمووچاوێکی خڕی ڕوومەت سپی‌و دوو چاوی ڕەش، ئەوە هێشتا بە دەمووچاو ناچێت، بەڵکو ئەو ئامێرە دەبەستێت کە دەمووچاوێك بەرهەم دێنێت. کەچی مەسەلەکە سەرلەنوێ بەشێوەیەکی سیاسیانە سەرهەڵدەداتەوە، ئەو کۆمەڵگاو شارستانیەتانە کامەن کە پێویستیان بە هەڵکردنی ئەم ئامێرە هەیە؟ واتا تاوەکو بەرهەم بێنێت، واتا هەموو جەستە زیاتر بەڕەمز بکات، بەهاوکاری دەمووچاوەوە سەریش بەڕەمز بکات، بەڵام بۆ چ مەبەستێك؟ دەمووچاوی خۆشەویستێك، یا دەمووچاوی سەرۆك، ئاراستەکردنی ئیجتیراحی دەمووچاوی جەستەی فیزیاییانەی سیاسی بکەین، ئەم شتانە ڕاستەوخۆ لەخۆیانەوە ڕوونادەن، ئا ئەوەتا فرەیی، بەلایەنی کەم، خاوەنی سیێ ڕەهەندە، گەردوونی‌و ئیستاتیکی و سیاسی. ئێمە هەرگیز مەجاز بەکارناهێنین، ئێمە ناڵێین: "وەکو" کونی ڕەش لەنێو گەردووندا، یا "وەکو" تابلۆیەکی سپی لەنێو وێنەدا، بەڵکو موفرەداتی گوێزەرەوە بەکاردێنین، واتا لەنێو کایەی خۆیدا هەڵکێشراوە بۆئەوەی سەرلەنوێ شوێنگەی چەمکێکی "دەموچاو"و "دەمووچاوی" وەکو فرمانێکی کۆمەڵایەتی بکاتەوە. بگرە لەوەش خراپتر، تاکەکان بۆ نێو کونە ڕەشەکان پاڵنراون‌و لەسەر دیوارێکی سپی چەقێنراون.

ئەوەیە ئەگەر مرۆڤ شوناسی دیاریکراو بێت، ئەرشیفکراو بێت، ناسراو بێت، ڕێکخەرێکی ناوەندییە وەکو کونێکی ڕەش کاردەکات و دیوارێکی سپی بێ چوارچێوە دەماڵێت و گەسك دەدات. ئێمە بەشێوەیەکی حەرفیانە دەدوێین. گەردوونناسانیش بیر لەوە دەکەنەوە کە بە کردارەکیانە دەشێت لەنێو پاشماوەی هەسارەکاندا، کونی ڕەشی هەمەجۆر بەیەکەوە لەنێو تاکە کونێکی زۆر مەزندا کۆببنەوە...دیوارێکی سپی-کونێکی ڕەش. بەڕای من ئەوە نموونەیەکی نموونەییە بۆ شێوازی ڕێکخستنی کاری نێوانمان، نە هاوسێیەتی‌و نە بەیەکەوە دانیشتن، بەڵکو هێڵێکی شکاوە بەنێوان دووندا ڕەتدەبێت، زۆربوونێکی ئەختەبووتانی.

ئەوە شێوازی "گرتن" یا "پێکان" "پیك-ئاپ" بوو. نەخێر، وشەی "شێواز" وشەیەکی خراپە، بەڵام "پیك-ئاپ" مادام کارە، ئەوە وشەیەکە دامهێناوە، من لەوە دەترسم کە وازییەکی زێدەڕۆیانە بێت لەسەر وشە. "پیك- ئاپ" تەتەڵەیە. هیچ بەهایەکی نییە، تەنیا بە دژکاری نەبێت لەگەڵ "بڕین" "کات-ئاپ" "بورو" نە بڕین و نە گلوازە و نە هەڵدانەوە، بەڵکو هەڕەشەیەك بەپێی ڕەهەندی گەشەسەندوو بە "لایك-ئاپ" یا دزینی دووانە یا گەشەکردنێکی ناهاوسەنگی نێوان دووکەس ئەنجام نادرێت، بەڵکو لەنێو هزری وا کە هەریەکەیان بەنێو ئەویتردا کۆچ دەکات بەپێی هێڵێك یا کۆمەڵێك هێڵی وا کە لەنێو یەکەمیان یا دووەمیاندا نییەو "بارستا"ییەك لەگەڵ خۆیدا دەبات. نامەوێ بیر لە شتەکانی ڕابردوو بکەمەوە. ئێمە، من‌و فیلیکس ئێستا وا خەریکی تەواوکردنی کتێبێکی گەورەین، خەریکە تەواو دەبێت[11]، دوای ئەوە دەبینین، کاری تر دەکەین، کەواتە دەمەوێت قسە لەبارەی ئەو شتانە بکەم کە ئێستا پێی هەڵدەستین، هەموو ئەو بیرۆکانە لەلای فیلیکس-ەوە هاتوون، لەلایەنی فیلیکس-ەوە" کونی ڕەش، سیاسەتی وردبینی، کۆچکردن، ئامێری ئەپستراکت....تاد" ئەوە چرکەیە، ئێستا یا هەتا هەتایە بۆ براکسیس کردنی شێواز: من‌و تۆ دەتوانین لە بارستاییەکی تر یا لەلایەنێکی تر لەگەڵ

بیرۆكەكانی تۆدا بەكاری بێنین، بەشێوەیەك شتێك بەرهەم بێنێت كە هی كەسمان نەبێت، بەڵكو لەنێوان "2، 3، 4....تاد" بێت، چیتر شتێك نەماوە لەشێوەی "كەسێك كەسێكی تر ڕاڤە دەكات"، "ئیمزای فلاّن كەس". یا "دۆڵۆز قسە لەبارەی دۆڵۆزەوە دەكات"، "ئیمزای ئەنجامدەری دیدارەكە".....تاد. بەڵكو دۆڵۆز قسە لەبارەی گتاری دەكات، "ئیمزای تۆ". بەم شێوەیە دیالۆگ دەبێتە كارێكی ڕاستەقینە لەلایەنی "فلاّنەوە" دەبێت ئاراستەكان زیاتر بكەین، لەپێناو لایەكاندا هەموو بازنەیەك بشكێنین.

## پەراوێزەكان

1- بەدرێژایی ئەم وتارە گوزارشتی "سەیرورەت-رادیكاڵی" "سەیرورەت-باڵندە" تاد. وەكو موفرەدەیەكی لێكدراو دەخوێندرێتەوەو نابێت بگۆڕدرێت بۆ "سەیرورەتی رادیكاڵی" یا "سەیرورەتی باڵندە"، بەڵكو دەبێت بڕوانینە وازی شوێنگە گۆڕینەوە، واتا كەسی مەبەست بگۆڕین بۆ ئامانجی مەبەست.

2- لەبارەی كۆچ و كۆچكردن و كۆچبەریو ئەو چەمكانەی پێیەوە پەیوەستن، دەتوانین بگەڕێینەوە سەر وتارێكی تر كە لەلایەن عومە مهێبل نووسراوە لەژێر ناوی" فەلسەفە كۆچبەرییە"و لە گۆڤاری سەردەم بلاّوكراوەتەوە.

3- فەلسەفەی لاولا واتا فەلسەفەی میللی، لە "پۆپ-*POP*" هاتووە كە كورتكراوەی"*Populaire*"ە.

4- زمانی كەمایەتی، مەبەست لێرەدا كەمایەتی دیموگرافیو ئەتنیو جوگرافیو...تاد نییە، بەڵكو مەبەست هەموو زمانێكە كە لە پەراوێزدا سەرهەڵدەدات، بۆیە دەشێت زمانی تاكەكەسێك یا گروپێك بێت. لێرەدا وشەكە هێزێكی مەجازییانەی هەیە، چونكە دۆڵۆزو گتاری لە كتێبێكی تریاندا لەبارەی كافكا بەناوی "ئەدەبی بچووك -*Rature mineure litt*"، بەمانای ئەدەبی كەمینە-كەمایەتی، دژی ئەدەبی گەورە، یا دامەزراو، پێگەیشتوو، كە ڕووەو نووسینێكی پێوەرگەرایی یا یاسایی دەڕوات.

5- جێكەوتی كۆملان، مەبەست فیزیاناسی ئەمریكی "كۆملاتۆن"ە، بەلاّم مەبەست لە " جێكەتی كللان" فیزیاناسی ئینگلیزی "تۆمسۆن كللان"ە. لە هەردوو حاڵەتیشدا دۆلۆز ئاماژە بۆ توانای ئینزیاح دەكات لەنێو ئاراستە یا حاڵەتێكی دیاریكراودا.

6- گۆدار، جان لۆك گۆدار سینەماكارو دەرهێنەرێكی گەورەی فەرەنسییە.

7- "كات-ئاپ" یا بڕین، جۆرێكە لە كۆلاژكردنی ئەدەبی-زۆرتر نووسەری ئەمریكی ولیام پیتنگنز بەكاری هێناوە، مەسەلەكەش ئەوە بوو كە هەندێك ڕستەی لەنێو گۆڤارو ڕۆژنامەكاندا هەڵدەبژاردو بەیەكەوەی كۆدەكردەوەو دەبەستەوە، دۆلۆز خۆی تەكنیكی"لایك-ئاپ"ی پێ باشترە، كە لەنێو وتارەكەدا شڕۆڤە كراوە.

8- فانی-*Fanny* خێزانی دۆڵۆز بوەو نمایشكارێكی جلوبەرگی فەرەنسی بووەو هەندێك دەقی لورانسی لە زمانی ئینگلیزییەوە كردۆتە فەرەنسی، دۆڵۆز جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە ئەم خانمە سروش بەخشی زۆر لە هزرو بیرۆكەكانی بووە.

9- مەبەست جیرۆم لندن-ە كە خاوەنی دەزگای چاپ و پەخشی (مینوی-نیوەی شەو)ی فەرەنسییە كە كاری كۆمەڵێك نووسەری لەسەر ئەركی خۆیدا بلاّوكردۆتەوە بەرلەوەی بناسرێن، وەكو پیكیت و ناتالی سارۆت و كلۆد سیمۆن.

10- لێرەدا دیارە دۆڵۆز دەیەوێت زاراوەی "كونی ڕەش" كە گەردوونناسەكان بەكاری دێنن، تەوزیف بكات.

11- مەبەستی لەم كتێبە"هەزار گردۆڵكە"یە كە لە ساڵی (1980) نووسراوە، دوای ئەوەش هەر دیسان لەگەڵ گتاری كتێبێكی تری هاوبەشیان نووسیوە بەناوی"فەلسەفە چییە؟".

# فردریش نیچە

(1900-1844)

عەبدولسەلام حەیدەر

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

هـیچ یـەك لـە فەیلەسـوفانی ئەڵـەمان هێنـدەی "فـردریش نیچـە" توشـی بـەدحاڵیبوون و خـراپ بەکارهێنان نەهاتوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فیکری هـیچ یـەکێك لـەوان هێنـدەی فیکـری ئـەو گەشـەی نەسـەند و کاریگـەریان لەسـەر فیکـر و فەلسـەفەی سـەدەی بیسـتەم بەجێنەهێشـت.. رەنگە هێنـدەی لە بارەی "نیچە"وە نوسرا بێت، لە بارەی هیچ یەك لە فەیلەسوفانی دیکەی ئەڵمانەوە نەنوسرابێت.

لەوکاتەوەی *Lou Salome* هاوڕێی ساڵی 1894 کتێبێکی دەربارەی نوسی، کتێب گەلێکی بێ ئەژمار سەبارەت بە ژیان و فەلسەفەی ئەو بڵاوکراوەتەوە، رەنگە لـەم رووەوە دیارترینیـان لێکۆڵینەوەکـەی "جۆرج سمیل" بێت کە ساڵی 1907 بە ناوی (نیچە و شـۆپنهاوەر)ەوە، بڵاویکـردەوە. هـەروەها دوو کتێبەکەی "کارڵ یاسبەرز" (نیچە) 1935، (نیچە و مەسیحیەت) 1946. دواجار نابێت لێکۆڵینەوەکانی "مارتن هایدگەر"یشمان لە یاد بچێت، بە تایبەت کتێبە قەوارە گەورەکەی (نیچە) 1961. ئەو کتێبە تەواوی ئەو لێکچەرانەی لەخۆگرتبوو کە "هایدگەر" لـە نێـوان سـاڵانی (1936-1943) لـە زانکـۆی فرایبۆرگ دەربارەی "نیچە" وتبویەوە.

هەرچـەندە "نیچـە" بـۆ ماوەیـەکیش چـیە لـە ناوەندی رۆشنبیری ئەڵمانی غایب نەبووە، بەڵام لە سـاڵی 1995 گرنگـی زیـاتر و زۆرتـری پێـدەدرێت، چونکە لەو کاتەوە ئەڵەمانەکان لە خۆئامادەکردنـدان بۆ ئاهـەنگ گێـران بە بۆنـەی تێپـەڕبوونی سـەدەیەك بەسـەر مردنـی ئـەودا. کۆتـایی مـانگی ئـابی 2000، یادی سەد ساڵەی مردنی "نیچە" بوو.

بـەم بۆنەیەشـەوە چـەند چـاپێکی تـەواوی بەرهەمەکانی بڵاوکرایەوە، رەنگە گرنگترینیان ئەوە بێت کە بەسەرپەرشتی "جۆن فایگڵ" چاپکراوە و تـەواوی ئـەو دەستنوسـانەی تێدایـە کـە "نیچـە" لـە تەمەنی شەش ساڵیەوە نوسیویەتی. لەگەڵ ئەمەشدا چـەندین لێکۆڵینـەوە و وەرگێڕانـی بەرهەمـەکانی

دیكەی كەوتنە بەردەستی خوێنەران و بەشێكی ئەو لێكۆڵینەوانەش بایەخیان بەو وێنەیەی "نیچە" داوە كە خاوەنی ئیرادەیەكی پۆڵاین و وردبینیەكی زۆر بووە و لە هەوڵی دروستكردنی گۆڕانێكی ریشەیی و بنەڕەتیدا بووە.

بەشێكی دیكەی ئەو نوسینانەی لەسەر ئەو نوسراون، باسیان لە قۆناغەكانی ژیانی و گەشەكردنی فیكری ئەو كردووە، هەروەها ئەو ئێش و ئازارە فیكری و جەستەییان نیشانداوە كە پێیانەوە گرفتار بووە.

دواجار "نیچە" سەلماندی كە فەلسەفەكەی تا ئێستاش فەلسەفەیەكی كارایە و ئامادەگی خۆی هەیە، بە جۆرێك توانا و كاریگەرێتی ئەو لەسەر دروستبونی نوێگەری خۆرئاوا و قۆناغی دوای ئەویشدا ناكرێت لەبەرچاو نەگیرێت.

* * *

"فردریش نیچە" لە 15ی تشرینی یەكەمی سالّی 1844 لە گوندێكی بچوك كە پێی دەڵێن *Rocken* و دەكەوێتە ولایەتی سەكسۆنیا لە خۆرهەلاّتی ولاّتی ئەڵمانیا، لە خێزانێكی ئیمانداری پرۆتستانت مەزهەب هاتۆتە دنیاوە. باوكی "نیچە" لە تەمەنی 36 سالّیدا دەمرێت و دوای ئەو و لە كۆتایی تەموزی سالّی 1849 خانەوادەكەی روودەكەنە شاری *Naumburg*، چونكە داپیرەی (دایكی باوكی) لەوێ دەژیا. لەو شارە خرایە بەر خوێندن و فێری نوسین و خوێندنەوە بوو. لەو ماوەیەدا توانای ئەوەی هەبوو نمونە بەو حیكمەتانەی ناو تەورات بهێنێتەوە، ئەمەش وایلێكرد ژنە لە خواترسەكانی خانەوادەكەی بە چاوی رێزەوە سەیری بكەن و بە قەشە بچكۆلەكە بانگی بكەن..

بەهۆی زیرەكی و بلیمەتی خۆیەوە لە قوتابخانەی *Pforta* (كە دەكەوتە نزیك شاری *Naumburg*) وەرگیرا. ئەمەش قوتابخانەیەكی ناوخۆیی بوو، ناوبانگیشی بەو پەیڕەوپرۆگرامە توندوتۆڵە رۆیشتبوو كە دژایەتی هەموو شتێكی نوێ دەكات و بە تەنها گرنگی بە رۆحی كۆن و رابردوو دەدات.. سەرەڕای ئەو شێوە ژیانە میلیتاریەی ناو قوتابخانەی *Pforta*، بەلاّم "نیچە" دەستی دایە نوسینی چەند پارچە شیعر و مۆسیقایەك و لەو سەروەختەشدا بە "هۆڵدەرلین"ی شاعیری ئەڵمانی سەرسام بوو.

سالّی 1864 دەچێتە زانكۆی (بۆن) بۆ خوێندنی تیۆلۆژیا، بەلاّم زوو وازی لە خوێندنی ئەم بوارە هێناو سالّی 1865 چووە زانكۆی لایبزیگ تا خۆی بۆ خوێندنی فیلۆلۆژیا تەرخان بكات. ئەگەرچی دەستبەرداری خوێندنی تیۆلۆژیا بوو، بەلاّم دواتریش بەسەر تەواوی بەرهەمەكانیەوە تارمایی تیۆلۆژیا دەبینرێت، تەنانەت دەبێتە ئەو دەستە نادیارەی لە پشتەوە "نیچە" دەجوڵێنێت.

گرنگترین شتێك بۆ ئەو لە لایبزیگ ئاشنابوون بوو بە "شۆپنهاوەر" و كتێبەكەی (جیهان وەكو ئیرادە و وێناكردن)، ئەم كتێبە بۆ ئەو شۆكێكی فیكری و چركەساتێكی گۆڕانكاری سەرەكی و چارەنوسساز بوو.

كاتێك لە تشرینی یەكەمی 1867 بانگهێشتی سەربازیكرا لە سوپای پروسیای ئەڵمانیدا، لەو كاتەدا وێنەی "شۆپنهاوەر"ی لەسەر مێزەكەی دانابوو. هەرچی جارێكیش ئازارێكی توش بهاتایە بە توانجەوە هاواری دەكرد و دەیووت: (دەخیلتم شۆپنهاوەر فریام كەوە!). "نیچە" زۆر لە ریزی سوپادا نەمایەوە، چونكە دوای ئەوەی لەسەر پشتی

ئەسپ دەکەوێتە خوارەوە، سنگی دەشکێت و بەو هۆیەوە کۆتایی بە راژەکەی دێت.

لە سەرەتای ساڵی خوێندنی 1868 گەڕایەوە لایبزیگ و لە تشرینی دووەمی ئەو ساڵدا لە ماڵی خۆرهەڵاتناسی ئەڵمانی "هیرمان برۆکهاوس"، چاوی بە "ریچارد ڤاگنەر" کەوت (برۆکهاوس مێردی خوشکی ڤاگنەر بوو). لەو دیدارەیاندا "نیچە" و "ڤاگنەر" حاڵی بوون لەوەی هەردووکیان وەك یەك سەرسامن بە "شۆپنهاوەر" و فەلسەفەکەی.

لێکۆڵیاران راهاتوون بەوەی ژیانی فیکری "نیچە" بەسەر سێ قۆناغی تایبەتیدا بەش بکەن:

–قۆناغی یەکەم لە ساڵی 1869 تا ساڵی 1876 دەخایەنێت. لەسەرەتای ئەم قۆناغەدا و بە یارمەتی "فردریش ریچڵ"ی مامۆستای، بوو بە مامۆستای فیلۆلۆژیا لە زانکۆی بازلی سویسرا (شایەنی باسە لەو کاتەدا نیچە هێشتا بڕوانامەی دکتۆرای وەرنەگرتبوو). لەوێوە هاوڕێیەتی ناجێگیری لەگەڵ "ریچارد ڤاگنەر"دا دەستی پێکرد کە ئەو کات لە شاری *Tribschen* (شارێکی نزیك لە بازل بوو) دەژیا. ئەو کات "نیچە" زۆر سەرسام بوو بە مۆسیقای "ڤاگنەر" بە تایبەتی ئۆپێرای *Tristan and Isoide*.

لە ئابی 1870 مۆڵەتی لە زانکۆ وەرگرت و وەك خۆبەخشێك چووە ریزی سوپای ئەڵمانیا کە ئەو کات لەگەڵ فەرەنسا لەشەڕدا بوو. دوای شکستی فەرەنسا لەو جەنگەدا "نیچە" بە کۆمەڵێك نەخۆشی درێژخایەنی نوێوە گەڕایەوە ئەڵەمانیا و تا مردنیش لە دەست ئەو دەردانە قوتاری نەبوو. لە سەرەتای ساڵی 1872 یەکەمین کتێبی خۆی لە ژێر سەردێڕی (گورانی تراژیدیا)دا بڵاوکردەوە. لەم کتێبەدا هەوڵی داوە تا خۆی لە "شۆپنهاوەر" رزگار بکات، چونکە ئەو تیۆریایەی پێ قبوڵ نییە کە "شۆپنهاوەر" لەسەر تراژیدیای یۆنانی هەیەتی، لە بەرامبەردا "نیچە" تیۆریایەکی تازە دێنێتە ئارا بۆ تێگەیشتن لە تەواوی ترادسیۆنی یۆنانی.. دەکرێت تەواوی ترادسیۆنی یۆنانیش لە هەردوو زاراوەی (*Dionysos, Apollo*) کورت بکەینەوە.

*Apollo* خواوەندی خەیاڵ و هونەر و دڵنیاییە.

*Dionysos* خواوەندی مەی و کامەرانی و چێژ و پیت و فەڕە.

"نیچە" پێی وایە یۆنانی کۆن یەکەمین کەسانێك بوون چارەسەری تراژیدیایان بەوە کردووە کە شکۆیان بە ژیان دۆستی بەخشیوە، ژیان دۆستیەك کە پایەکانی بریتین لە زیندەگی و چێژبینین، ئەمەشیان لە وتەزای (ئاکاری دیۆنیسیۆسی)دا کورتکردبووەوە. هەروەها پێی وایە شێواندن و پایانی تراژیدیای یۆنانی، هاوکاتە لەگەڵ هاتنە ئاراو دەرکەوتنی هەریەك لە لۆژیکی "سوکرات" و شانۆنامەکانی "یۆرببیدس".

بەو پێیەشی کە "یۆرببیدس" لە ژێر کاریگەری "سوکرات"دا بووە، ئەوا "نیچە" هەموو بەرپرسیارێتیەکە دەخاتە ئەستۆی "سوکرات". ئەوەتا دەڵێت: (لۆژیك و ئەقڵانیەتی سوکرات بوونە مایەی لەناوچونی تراژیدیای یۆنانی تەقلیدی کە پشتی بە ململانێی نێوان خواکان و مرۆڤ بەستبوو). بێگومان هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە بە فەلسەفەی یۆنانی بەر لە "سوکرات" سەرسام بوو.

وەکو "شۆپنهاوەر" پێی وابوو "ڤاگنەر" تەعبیر لە بلیمەتی هونەر دەکات، بۆیە خۆزگەی دەخواست و پێشبینیشی دەکرد کە تراژیدیای یۆنانی لەسەر دەستی "ڤاگنەر" ببوژێتەوە. لەبەرئەمەش بوو کتێبی (گورانی تراژیدیا)، "ڤاگنەر"ی سەرسام کردو تەنانەت وەها وەسفی کرد کە جوانترین کتێبێکە خوێندبێتیەوە. ڕادەی

سەرسامی بەم کتێبە، وای لێکرد هیچ یەك لە هاوڕێکانی بێ بەش نەکات و سەرو دانەیان بۆ بنێرێت.

بەڵام لە "ڤاگنەر" بترازێت کتێبەکە ئەو دەنگدانەوەیەی نەبوو کە "نیچە" لە هاوپیشەکانی و لە "ریچل"ی مامۆستای چاوەڕێی دەکرد، چونکە هەموو ئەوانە وەکو خاتوو "بریجت لاهان" دەڵێت: (بڕوایان بە سوکرات هەبوو نەك بە دیونیسیوس و ژیانیشیان وەکو ئیرادەیەك بۆ گەمەکردن و چێژ وەرگرتن سەیر نەدەکرد).

هێندەی نەبرد دوای لە چاپدانی (گورانی تراژیدیا) و لە نیسانی 1872 "ڤاگنەر" و "کۆزیما"ی هاوسەری چون بۆ *Bayreuth*، ئەمەش "نیچە"ی توڕە کرد و لای وابوو ئەو "ڤاگنەر"ە رادیکالییەی پێشوو لە لایەن پاشای پاڤاریاوە کەوی کراوە و ئەمەش سەرەتای تێکچونی پەیوەندی نێوانیان بوو. تا کۆتایی ئەم قۆناغەش "نیچە" هەر گرنگی بە کلتور و ناوە دیارەکانی سەردەمی خۆی دەدا و چوار وتاری رەخنەیی ئاگرینی نوسی و لە کتێبی (بیروڕاگەلێکی ناوەخت) کۆیکردنەوە. لەم کتێبەدا سەرسامی خۆی بە زۆر لە ناودارانی بواری فیکر و هونەری بەر لە خۆی نیشان دەدات، لەوانەش "شۆپنهاوەر" و "ڤاگنەر".. یەکەمین وتاری لەم زنجیرە وتارە لە ساڵی 1873 نوسی و دەربارەی نوسەری ناسراوی ئەڵەمانیای ئەو وەختە "دایڤد فردریش شتراوس" بوو، ئەویش بە بۆنەی بڵاوبوونەوەی کتێبی (بڕوای کۆن و نوێ)ی "شتراوس"ەوە بوو.. لەو وتارەدا "نیچە" زۆر بە توندی هێرش دەکاتە سەری و نوسەرەکەی وەك نمونەیەکی بەد و خراپ بۆ فێرخوازە کۆنسێرڤاتیڤ و سونەتیەکان نیشان دەدات.

دووەم و سێیەم وتاری لە ساڵی 1874 بڵاوکردەوە و دووەمیان دەربارەی (سود و زیانەکانی مێژوو بوو)، تیایدا باس لەو دەستەواژەیە دەکات کە دەڵێت: (لای هیگڵ و هارڵمان فیکری مێژوویی لە پێش مەسەلەکانی ترەوەیە). سێیەمین وتاری بە ناوی (شۆپنهاوەر وەك مامۆستا) بوو. ساڵی 1876 دواین وتاری لە ژێر سەردێڕی (ریچارد ڤاگنەر لە بایرۆت)دا نوسی.. ئەم وتارە کۆتایی بە پەیوەندی نێوان خۆی و "ڤاگنەر" هێنا، چونکە ئەو پێی وا بوو ئەو وتارە هەوڵێکی چەپەڵە لە لایەن "نیچە"وە تا بسەلمێنێ کە ئەو مۆسیقیەکی فێڵباز و درۆزنە و خەڵکی لە خشتە دەبات.

زۆر جاران ئەوانەی بە "نیچە" و "ڤاگنەر"ەوە خەریکن لە هۆکاری تێکچونی پەیوەندیەکانی نێوانیان دەپرسن، لەمبارەشەوە لێکۆڵینەوەی نوێ لە ئەڵەمانیادا هەیە کە باس لە سەرەتای ئەو پەیوەندیە و هەڵکشانی دەکات.. باس لەوەش دەکات چۆن دواتر "نیچە" دەست بە پرۆسەی (کوشتنی باوك) دەکات. ئەم کارەش هەنگاوێکە بۆ خۆڕزگارکردن لە دەست دەسەڵاتی ئایکۆنەکانی سەردەمەکەی و بۆ ئەوەیە تا ئایکۆنەی تایبەتی خۆی دروست بکات، یاخود هەوڵێك بووە بۆ ئەوەی خۆی لە رێگەی وەلاوەنانی ئەوانی ترەوە بسەلمێنێ. دوای ئەوەی نەخۆشی سەروچاوی زۆری بۆ دێنن، لە مانگی تشرینی یەکەمی 1876 ناچار دەبێت مۆڵەتی نەخۆشی بۆ ماوەی ساڵێك وەرگرێت. لەو ماوەیەدا سەردانی ئیتاڵیا دەکات و ماوەیەك لە شاری ناپۆلی دەژی، هاوکات سەردانی بۆجی و گڕکانی فیزۆف و دوورگەی کابری دەکات.

لە ناپۆلی دکتۆر وریای دەکاتەوە و پێی دەڵێت: (یان دەبێت واز لەو عەزابە فیکریە بهێنی کە تیایدا دەژی یان ئەوەتا ئەقڵت لە دەست دەدەیت). لەوە

بەدواوە تێگەیشت كە هەرگیز چاك نابێتەوە و هەمان چارەنوسی باوكی دەبێت.

–قۆناغی دووەم لە ساڵی 1877 دەست پێدەكات و لە ساڵی 1882 كۆتایی دێت.. لەم ماوەیەدا سنوری نێوان ژیان و فیكری كاڵ دەبێتەوە و بە شێوەیەكی چاكتر لە خۆی نزیك دەبێتەوە، لە رێی نزیكبوونەوەشی لە خۆیەوە لە قۆناغی بڕوا بوون بە ئایدیالەكانەوە پێ دەنێتە قۆناغی بڕواهێنان بە مرۆڤ و مەسەلە ئینسانیەكان.. ژمارەیەك لە كتێبە بەناوبانگەكانی لەم قۆناغەدا بڵاوكردەوە. ساڵی 1878 بەرگی یەكەمی كتێبی (مرۆڤانە زێدە مرۆڤانە *Menshliches/ Allzum enschliches* –)ی بڵاوكردەوە، دواتر لە ساڵی 1879 بەرگی دووەمی بڵاوكردەوە و ئەم دێڕەشی بۆ ناونیشانی كتێبەكە زیادكرد (كتێبێك بۆ رۆحە ئازادەكان) و پێشكەشیشی كرد بە "ڤۆڵتێر"، بەو پێیەی یەكێكە لە مەزنترین ئەو كەسانەی لە پێناو ئازادكردنی ئەقڵی ئینساندا رەنجیداوە، پێشكەشكردنەكەش بە بۆنەی لە دنیا دەرچوونیەوە بوو لە 30ی مایسی 1878.

هەمان ساڵ (واتە ساڵی 1879) نەخۆشیەكانی گەیشتە ئاستێك توانای ئەوەی لێ بڕی بخوێنێتەوە یان لەسەر وانە وتنەوەی زانكۆ بەردەوام بێت، بۆیە لە تەمەنی سی و پێنج ساڵیدا دەستی لەكار كێشایەوە و بە موچەیەكی كەم كە لەلایەن زانكۆوە بۆی بڕابووەوە دەیگوزەراند. دوای ئەوەی دەستی لەكار كێشایەوە خوی بەوەوەگرت كە وەرزی زستان لە شارەكانی باشوری ئەوروپا بەرێتەسەر، بەتایبەتی لەهەردوو شاری (نیس و جەنەوا).. لە وەرزی هاوینیشدا دەچووە كوێرە لادێیەك لە قەدپاڵی چیاكانی ئەلپ لە باشوری سویسرا، ئەو گوندەش پێی دەڵێن *Sils-Maria*. لەوێدا ژورێكی پەڕپوتی بەكرێ گرتبوو (ئەمێستا ئەو جێگایە كراوە بە مۆزەخانە!).

جوانترین كتێبێك كە باس لە مانەوەی دەكات لەم گوندە شاخاوییەدا، كتێبەكەی "پاول ڕابە"یە (هاتوچۆكانی نیچە لە *Sils-Maria*) 1994. ئەو ساڵانەی لەو گوندەدا بەسەریبرد بەرنامەیەكی زۆر قورسی بۆ خۆی دانابوو، ئەمەش وایكرد بەرهەم گەلێكی بێشومار بنوسێت..

بەیانیان زوو سەعات 5 لە خەو هەڵدەستا بە نوسینەوە خەریك دەبوو، دوای ئەوە دەستی دەكرد بە رێڕۆیشتن و سەركەوتن بەسەر ئەو شاخ و داخانەدا كە دەوری گوندەكەیان دابوو. وەختێكی زۆری بە پێ دەبڕی و زۆربەشی بە ژێر باراندا بوو. ئێوارانیش نانێكی سوكی دەخوارد و پاشان لێی دەنووست.. كە رۆژیش دەبووەوە لەسەر هەمان ریتمی پێشوو بەردەوام دەبوو، بێئەوەی بزانێت ماندوو بوون چییە.

ساڵی 1885 كتێبی (كۆچەر و سێبەرەكەی) بە چاپ گەیاند. لە تەموزی 1881 كتێبی (سپێدە)ی بڵاوكردەوە و تیایدا بیرو بۆچونی زۆر بوێرانە دەربارەی حوكمە ئەخلاقییەكان خستبووە ڕوو.. لە ئابی 1882 كتێبە ترسناكەكەی (زانستی شاد)ی بە چاپ گەیاند.

"نیچە" لە رێكخستنی كتێبەكانی و هەڵبژاردنی ناونیشانەكانیاندا زۆر ورد و بە دیقەت بوو.. لەم قۆناغەش بە دواوە ئەستەمە تێكستەكانی كورت بكرێتەوەو چاكتر وایە سەراپایان وەك تێكستێكی تا سەر ئێسقان مرۆڤدۆستانە بخوێنرێتەوە، كە ڕەنگدانەوەی ژیان و ئازار و گەشەی فیكری بێ سنوری خۆیەتی. گرنگترین شتێكیش كتێبەكانی ئەم قۆناغەی لە قۆناغی پێشوتر جیابكاتەوە، ئەوەیە كە سەرجەمی

نوسینەکانی ناوی گەڕانەوەیە بۆ لای خۆی و دابڕانێکی یەکجاریشە لەگەڵ رابردووی تەقلیدی و ئایدیالستیدا. هەڵوێستی "نیچە" لە نوسینی ئەم قۆناغەیدا هەڵوێستی فەیلەسوفێکی رەشبینی بەدگومانە کە ئێش و ئازارە نەبڕاوەکانی ناچاری دەکەن پەی بە حەقیقەت بەرێ یاخود شاهید حاڵێك بێت لەسەر بوون و ئامادەگی حەقیقەت.

لەم قۆناغەدا کاری ئەو بەگژاچونەوەی بەهاو داب و نەریتی سەدەی نۆزدەهەم و سەدەکانی پێشوترە.. هەر بۆیە بە تێبینیە پرژاوو تازەکانیەوە و لە رێی زمانەوە، پێ دەنێتە بازنەی ئەو مشتومڕەی لە دژی مۆراڵی تەقلیدی دەستی پێکردووە.. بۆ نموونە ئەو پێی وایە حەقیقەت بونی نییە و ئەوەی هەیە تەنها لێکدانەوەو شرۆڤەکردنە. زمانیش بۆ خۆی راستیەکان دەشارێتەوە، لە کاتێکدا مرۆڤ پێی وایە لە رێی زمانەوە پەی بە حەقیقەت بردووە، بەڵام بێ ئاگایە لەوەی ئەوەی ئەو کردوویەتی، تەنها دروستکردنی جیهانێکی هاوشێوەیە بە تەنیشت جیهانی واقیعەوە.

ئەوەی لای "نیچە" بە حەقیقەت دادەنرێت، بریتییە لە رستێك زیادەڕۆیی مەجازی و لێکدانەوەی زمانەوانی کە میللەتێك دوای زۆر بەکارهێنانی، گەشتۆتە ئەو قەناعەتەی ئەمە راستی حاشا هەڵنەگرە و وەکو بەڵگە نەویستێك سەیری دەکات. ئەو حەقیقەتانەی وەرمانگرتوەو بۆمان ماوەتەوە، تەنها وەهم و خەیاڵپلاوی ئەبستراکتن و لە رێی ئیرادە و هوشیاریەکی رەخنەیشەوە دەتوانین خۆمانی لێ قوتار بکەین.

هەروەها پێی وایە ئەخلاق رێژەییەو حوکمە ئەخلاقیەکانیش حەقیقەتی رەها نین و بۆ هەموو ئان و زەمانێك دەست نادەن.. بۆ نمونە حوکمی ئەخلاقی لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دی گۆڕانی بەسەردا دێت و تەنانەت لەیەك سەردەمیشدا بە پێی جیاوازی شوێن و کلتور دەگۆڕێت. لێرەوە ئەو لە (سپێدە)دا داوادەکات بۆ ئەوەی سەر لە نوێ بە حوکمە ئەخلاقیەکاندا بچینەوە، ئەویش لە رێی گێڕانەوەیان بۆ سەرچاوە و رەگوڕیشەی سەرەکیان. گەر بێتو ئێمە دەست بە خوێندنەوەی مێژووی هەر ئەخلاقێك بکەین، دەبینین کە سەرەتا بە دەستبەرداربوونی ئەخلاقی کۆن دەستی پێکردووە و دوای ئەوەش خەڵکی بۆ ماوەیەکی زۆر وەکو چاولێکەری پەیڕەویان کردووە، ئەمەش وایکردووە تا ببێتە بەهاو ئاکارێکی تازە. ئاشنابون و پەیبردن بە هۆکارە مێژویی و دەرونیەکانی دروستبونی ئاکارێك، بەرەو ئەوەمان دەبات کە پێودانگی بەها تەقلیدیەکان ئافەرۆز بکەین.

"نیچە" پێی وایە خواستی سەرکەوتن و بردنەوە ئەو هۆکارە نادیارەیە کە لە پشت هەموو رەفتارێکی ئەخلاقی یاخود ئاینییەوەیە، تەنانەت یەکسانیخوازیش بە مەبەستی پاراستن و مسۆگەرکردنی داهاتوی خودەو دواجار خۆشویستنی ئەوی دیش جگەلە خۆشویستنی خود شتێکی تر نییە.

هاوکات "نیچە" هەڵوێستێکی دوژمنکارانەی لە مەسیحیەت هەیە، ئەویش لەبەر هۆکارگەلێکی وەك ئەوەی ئەگەرچی مەسیحیەت دەست بەرداری هەندێك ترادسیۆنی وەسەنی یۆنانی و هەندێك بەهای میتافیزیکی نەبووە، بەڵام دەستی لە شێواندنی سروشتی مرۆڤایەتیدا هەبووە. لەوانە شێواندنی بەهای سەروەری (سەروەر بەشێوەیەکی خۆڕسکانە خواستی کۆشش و بەدەستهێنانی هێزی هەیە و خەسڵەتی سەرەکیشی بریتییە لە خود ئەڤینی و چێژ بینین لە ژیان)، بەڵام مەسیحیەت هات و ئەم بەهایانەی بە بەها گەلێکی وەك (دان بە خۆدا

گرتن و زەلیلی و خۆبەدەستەوەدان) گۆڕی کە بەهای کۆیلەن. بۆیە ئەو پێی وایە رزگاربون لە دەسەڵاتی مەسیحیەت، یەکەمین هەنگاوە بۆ گەیشتن بە قۆناغی (ئـــەقڵی ئـــازاد و بـــوێر). دژایـــەتیکردنی ئـــایینی مەسیحیەت لەلایەن "نیچە"وە لە کتێبی (زانستی شاد)دا گەیشتە ئەوپەڕی، بەتایبەت لەوەسفکردنی ئەو سۆپەرمانەی سۆراخی خواوەند ناکات و لە دوای ناگەڕێت.

–سێهەمین قۆناغ کە لە ساڵی 1882 وە تا ساڵی 1888 دەخایەنێت، دەکەوێتە گەڕان و هاتوچۆکردنێکی بەردەوام لە نێوان شارەکانی سویسرا و فەرەنسا و ئیتاڵیاداو زۆر بە شاری تۆرینۆ سەرسام دەبێت، کە بوو بە دوا مەنزڵی لەو سەفەرانەیدا. گرنگترین روداوی ئەم قۆناغەی، پەیوەندی بەستنی بوو لەگەڵ خانمێکی خەڵکی روسیا بە ناوی "لۆسالۆمی" و لە سەروەختی چونی بۆ شاری رۆما لە مانگی نیسانی 1882دا چاوی پێی کەوت و یەکتریان ناسی. ئەم خانمە دواجار دەبێتە یەکێك لە ناودارترین ئافرەتەکانی سەردەمی خۆی.

پەیوەندی "نیچە" بە ئافرەتەوە، بابەتێکە بیروبۆچونی ناکۆك و ناچونیەکی لەسەرە، بەڵام بە گشتی دەتوانین بڵێین پەیوەندیەکی ناهەموار و دوژمنکارانە بووە. ئەویش لەبەر هۆکارگەلێك، لەوانە: پەیوەندی قوڵ و پتەوی لەگەڵ ئافرەتانی بنەماڵەکەیدا و پاشان توشبونی بە نەخۆشی (سیفلیس)، بەهۆی ئامشۆکردنی یەك لەو ماڵانەی لە شفرۆشی تیادا دەکرا، ئەمەش لەو سەردەمەدا بوو کە دەیخوێند. هەروەها لە گرنگترین ڕوداو بەسەرهاتەکانی ئەم قۆناغە: مردنی "ڤاگنەر" بوو. "نیچە" بە مردنی گەلێك غەمبار بوو، کاتێك هەواڵەکەی پێدەگات بۆ یەکێك لە هاوڕێکانی دەنوسێت و دەڵێت: (ڤاگنەر کامڵترین پیاوێك بوو لە ژیانمدا بینیبێتم). ئەگەرچی لەم قۆناغەدا نەخۆشی زۆری بۆ هێناو باری تەندروستی زیاتر تێکچوو، بەڵام لێشاوێك بەرهەمی نوسی و ئەو کارانەش وایانکرد ناوی بە نەمری بمێنێتەوە و نێوبانگێك بۆ خۆی بچڕێت. لە ماوەی نێوان ساڵانی 1883 و 1885 گرنگترین و بەناوبانگترین کتێبی خۆی (زەرادەشت وەهای وت) بڵاوکردەوە. لەسەر بەرگی یەکەمی ئەو کتێبەی نوسی بوو: (ئەمە کتێبێکە بۆ هەموان و بۆ تەنها کەسێك نییە).

لە چەندین نامەشیدا بە (ئینجیلی پێنجەم) ناوی بردبوو. لەم کتێبەیدا لە روی شێواز و قوڵی فکریەوە، "نیچە" گەیشتبووە لوتکە. ساڵی 1886 کتێبی (لە دو دیوی چاکە و خراپە)وەی بە چاپ گەیاندو وەکو سەرەتایەك بۆ فەلسەفەی ئایندەی لەقەڵەمدا. ساڵی 1887 دەستی کرد بەسەرلەنوێ چاپکردنەوەی بەرهەمەکانی پێشوی، هەروەها کتێبە بەناوبانگەکەی (ژینالۆژیای مۆراڵ)ی بەچاپ گەیاند.

دواهەمین کتێبی ئەم قۆناغەی (ئیرادەی هێز) بوو، بەڵام لە پاش مردنی خۆی و بەسەرپەرشتی "پیتەر گاست"ی قوتابی و "ئەلیزابیس"ی خوشکی کە مێژوویەکی درێژی لە دژایەتیکردنی جولەکەدا هەیە بڵاو بووەوە. "ئەلیزابیس" بووە مایەی شێواندنی ئەم کتێبەی کە زۆرێك پێیان وایە یەکێك بووە لە هۆکارەکانی تەشەنەسەندن و بەهێزبوونی نازیستەکان.

لەم قۆناغەدا "نیچە" پێی وایە ئەرکی مەزنی لە پێش دەمدایە و دەبێت خۆی بۆ بە ئەنجام گەیاندنیان سازبدات، ئەم ئەرکانەش وەکو خۆی مەزەندەی دەکردن لە قوڵایی ناخیەوە دەهاتن نەك لە سەرچاوەیەکی دەرەکیەوە، جێبەجێکردنی ئەم

ئەركانەش وزەو توانایەكی بێشومار و سەركێشیەكی بەردەوامی دەوێت.

گەورەترین ئەركیش هەڵسەنگاندن و بژاركردنی بەهاكانە، ئەویش بە خۆقوتاركردن لەو ئایكۆنانەی مرۆڤ بە درێژایی مێژوو لە بوارەكانی ئایین و هونەر و سیاسەتدا دروستی كردون. ئەو بە پێویستی دەزانی مرۆڤ لە دەسەڵاتی ئەو ئایكۆنانە رزگار بكات، بۆ گەیشتن بە ساتە وەختی عەدەمیەت و پاشان دەستپێكردنەوەی سەرەتایەكی نوێ.

ئەم پرۆسەیەش لە ڕێی ئەو دید و بۆچونە نیچەویە تازانەوە دەبێت كە فانتازیای خۆی خوڵقاندویەتی و بریتییە لە سێ گۆڕانكاری مەزنی رۆح. لە سەرەتادا رۆح (وشترێكی ملكەچ و پشودرێژە) و لە ژێر باری بەهاو ترادیسیۆنی كۆن و ڕزیودا بڕستی لەبەر بڕاوە. دوای ئەوە دەبێت بە (شێر) و دەنگ هەڵدەبڕێت و دەڵێت: (من دەمەوێت!)، بۆ ئەوەی بكەوێتە راماڵینی ئەژدیهای بەهاو ترادسیۆنی كۆن و بە خۆشی دەڵێت! (لە سەرت پێویستە!). ئێمە بۆ ئەوەی ئیرادەی ئازاد و سەربەخۆمان هەبێت و بتوانین بڵێین (نا)، ئەوا پێویستیمان بەوە هەیە كە رۆحی شێرمان هەبێت. دواجار رۆح لە (شێر)ەوە دەبێت بە (منداڵ)و دەبێتە خاوەنی رۆحی (مرۆڤی باڵا) و ئەمەش سەرەتا و دەسپێكێكی نوێیە، هەر بۆیە جڵەو بۆ خەیاڵی شل دەكات و دەكەوێتە ناوگەمەی ئەفراندن و داهێنانەوە.

هەر لەم قۆناغەدا "نیچە" كە بە جەستە دەردەدار بوو، پێی وا بوو تێرمی (ئیرادەی هێز) دەتوانێت باشترین گوزارشت لە فەلسەفەكەی بكات و ئەم تێرمەش لەلای خۆیەوە پشت بە هەردوو زاراوەی مرۆڤی باڵا – *Ubermensch* و گەڕانەوەی هەمیشەیی – *Ewige wiederkehr* دەبەستێت. لێرەوە پرسیاری سەرەكی لەلای ئەو بوو بەوەی: چۆن چۆنی دەكرێت (مرۆڤی باڵا) یان (كلتوری باڵا) دروست بكەین؟

لە كتێبی (زەرادەشت وەهای وت) كەوتە تاوتوێكردنی تێرمی (ئیرادەی هێز)، هەرچی زاراوەی (مرۆڤی باڵا)یشە بۆ یەكەمین جار لەو دەستنوسانەیدا بەكاری هێنابوو كە لە تەمەنی حەڤدەساڵیدا نوسیبونی.

لەو تەمەنەوە "نیچە"ی لاو جیاوازی لە نێوان دوو جۆر مرۆڤدا كردووە: مرۆڤی ئاسایی و مرۆڤی مەزن و باڵا و خانەدان.. مرۆڤی ئاسایی خەمی گەورەی ئەوەیە ژیانێكی زۆر بژی، تەنانەت گەر ئەو ژیانەش بێ مانا و بێ مەبەستیش بێت، بەڵام مرۆڤی مەزن مرۆڤی باڵا رۆح و خانەدان بە دوای ژیانی نەمریدا وێڵە، ئەگەرچی كورت و كەم خایەنیش بێت.. هەر كەسێك بگەڕێتەوە سەر دەستنوسەكانی لەو ماوەی لە زانكۆی (بازل) بووە، دەبینێت كە ئەو لە ژێر كاریگەری فەلسەفەی خۆرهەڵاتدا بووە.

یەكێك لە گرنگترین خەسڵەتەكانی (مرۆڤی باڵا) ئەوەیە كە توانای بەرجەستەكردنی ئایدیای (گەڕانەوەی هەمیشەیی) هەیە.. (گەڕانەوەی هەمیشەیی) ئایدیای سەرەكیە لە (زەرادەشت وەهای وت) و پێشتریش لە كتێبی (زانستی شاد)دا، وەكو گرنگترین ئایدیایەك كە ئەو كات تەعبیری لە فەلسەفەكەی دەكرد، هێنابویە بەرباس. ئایدیای (گەڕانەوەی هەمیشەیی) بەشێوەیەكی كتوپڕ و لە كاتی سەردانی هاوینەی بەردەوامی بۆ (سیلزمایار) بە مێشكیدا هات. رۆژێكی هاوینی ساڵی 1881 و سەروەختێك لە كەنار دەریاچەی *Silvaplana* پیاسەی دەكرد، لە ناكاو ئەو بیرۆكەیەی بۆ دێت و

دەسکێشـەکانی دادەکـەنێ و قەڵـەم و ڕۆژمێرەکـەی دەردێنـێ و تۆماری دەکات. لـەم قۆناغـەدا دەیـەوێت بەشـێوەیەکی زانسـتی (گەڕانـەوەی هەمیشـەیی) بسەلمێنێ، لێرەوە هەوڵیدا ئەمە بە ئایدیای (مرۆڤـی باڵا)ەوە گـرێ بـدات. (مرۆڤـی بـاڵا) ئـیرادەی شـێری هەیە و بەهای کۆن تێکوپێك دەدات و دەگاتـە دۆخـی عەدەمیەت. لە هەمانکاتیشـدا ڕۆحـی منداڵی هەیـە و لـە گەڕانـەوەی بەردەوامدایـە، بـۆ ئـەوەی سـەرلەنوێ دەست پێبکاتەوە. لە داڕشتنەوەی چەمکی (ئـیرادەی هێز)دا، "نیچە" کەوتبووە ژێر کاریگـەری فەلسـەفەی هەریەك لـە "سـپینۆزا و شـۆپنهاوەر و چارلزدارون". ئەم سێ بیریارە پێ لەسەر گرنگی و فەزیلەتی ئیرادە دادەگرن، بە تایبەتی "دارون" کـە پێـی وایـە تـەواوی شـێوازەکانی ژیـان یـەك مەبەسـت و ئامانجیـان هەیـە ئەویش (ئیرادەی مانەوەیە). لەم پاشـخانەوە "نیچـە" داخـڵ بـە ئایـدیای عەدەمیـەت – *Nihilismus* (واتـە پوچی و بێ بەهایی هەموو بەهایەك) دەبێت.

ئـەو پێـی وایـە ترادسـیۆنی یۆنـانی/ مەسـیحی، بەردەوام لەناوخۆیدا ئەم عەدەمیەتـەی شـاردۆتەوە و ئـەو یەکـەمین کەسـە کـە پـەردەی لەسـەر هـەڵماڵیوە و ئاشـکرای کـردووە و تـەواوبوون و گەیشـتن بـە دوا قۆناغی خۆی ڕاگەیاندووە.

هــەروەها بــاس لــەوە دەکــات کــە لاواز و گرنگنــەکان گومــان لــەم کــارەی دەکــەن، بــەڵام هێزدارەکــان (مرۆڤــی بــاڵا) پێیــان وایــە ئەمــە سەرەتایەکی نوێیە بۆ هێنانە ئارای سستمێکی نوێ و ئاکـارێکی تـازە، لـە بـری ئـەو شـتە کۆنانـەی بەسەرچـون و شـلۆق بـوون و پـیرۆزی خۆیـان دۆڕانـدووە. لێـرەوە "نیچـە" دەچـێتە قۆنـاغی پێشـبینی کردنـەوە و ئاماژە بـۆ ئـەوە دەکات کە لە ئاینـدەدا چاکە و خراپـە بـە پێـی پرانسیپی سود و بەرژەوەنـدی دیـاری دەکـرێن، ئەمـەش بـە مەبەسـتی خۆپاراسـتن لـە زەرەرو زیـان بـە دەسـتخسـتنی هێـز و دەسـەڵات. ئـەم بـیرو بۆچونانەشـی بەشـێوەیەکی دیالۆگ ئامێز داڕشتووە و دەڵێت:

–خێر و چاکە چییە؟

–هـەموو ئـەو شـتانەیە کـە هێـز و توانامـان دەمەزەردەکات بۆ کارکردن و کرانەوە.

–ئەی شەڕ و خراپە چییە؟

–هـەموو ئـەو شـتانەیە کـە لـە سسـتی و لاوازیەوە دێن.

–ئەی بەختەوەری چییە؟

–هەستکردنە بەوەی هێـز و دەسـەڵاتمان گەشـە دەکات و لە زیادبوووندایە..

بێگومان ئامانجی مرۆڤ بەختەوەری نییە، بەڵکو دەسـەڵاتی زیـاتر و زۆرتـرە. ئاشـتی نییـە، بـەڵکو جەنگ و شەڕ و شۆڕە. خەسڵەتی نەرم و نیانی نییە، بـەڵکو لێهـاتوی و شـارەزاییە. بـەمجۆرە دەتـوانین پـرۆژەی فیکـری "نیچـە" لـەوەدا کورتبکەینـەوە کـە: (مرۆڤایـەتی بەکاریگـەری –ئـیرادەی هێـز– و لـە چوارچـێوەی –گەڕانـەوەی هەمیشـەییدا– دەسـوڕێتەوە، لـە مـاوەی ئـەم سوڕانەوانەشـیدا بـە چەند قۆناغێکدا دەڕوات: یەکەمیان، تەواوی خەڵك و خـوا بـڕوا بـە ترادسیۆن و ئـایین دەهێـنن، بەڵام هـەر زوو لـە نـاو ئـاپۆرەی خەڵکیـدا (مرۆڤـی بـاڵا) سـەر دەردەکـات و قەڵـەمبازێك بـە مرۆڤایـەتی دەدات، تـا دەیگەیەنێتە دوامەنزڵ و ئەم قەڵەمبازانەش خـۆی لـە (جـاڕدانی مـەرگی یـەزدان) و پاشـان لـە قۆنـاغی (نیهلیـزم) و ڕاگەیانـدنی گەنـدەڵبونی بـەها تەقلیدیەکان و هەوڵدان بۆ دروستکردنی بەهای نـوێ بەیاندەکات)!.

لــە کۆتــایی ئــەم قۆناغــەدا 1888، چــەند دەستنوسـێکی تـازە دەنوسـێت: (کێشـەی ڤاگنـەر، ئاوابونی بتەکان، نیچە دژی ڤاگنەر، ئەنتی مەسیح و

*Eccehomo*). زۆربەی كتێبە فەلسەفیەكانی رەنگ و بۆی تیۆلۆژیان هەیە. رەخنە توندەكانی لە ئینجیل، نوسینەكانی "سپینۆزا"مان بە بیر دێنێتەوە و بەڵگەی ئەوەیە كە "نیچە" لە نزیكەوە ئاگاداری ئینجیل بووە. هەرچەندە لە پێشەكی كتێبی (*Eccehomo*)دا دەڵێت: (ئەم كتێبەم بۆیە بڵاوكردەوە تا لە دوایدا ستایش نەكرێم)، بەڵام دەتوانین بڵێین ئەم كتێبەی لەسەروەختی بورانەوە و لە هۆش خۆچوندا نوسی و باشترین گوزارشت لەو هەستە زۆرەی دەكات بەوەی چ كەسێكی گەورە و مەزنە. نەسكەكانی ئەم كتێبەی ناونیشانی تەنز ئامێزی هەیە، وەك: (من بۆچی هێندە زیرەك و دانام؟) و (بۆچی من ئەم كتێبە قەشەنگانە دەنوسم؟).

"نیچە" پێی وا بوو پێشوەخت هاتۆتە دنیاوە و كاتی ئەو نەهاتووە. هەر لەم كتێبەدا پێشبینی زۆر لەو ڕوداوانە دەكات كە لە پاش خۆی ڕوو دەدەن. بۆ نمونە پێشبینی دەكات جیهان شەڕ و شۆڕێك بەخۆوە دەبینێ كە پێشتر ڕووینەداوە و سەرچاوەی ئەمەش دەگێڕێتەوە بۆ ململانێی ئایدیۆلۆژی لە ئەوروپادا.

گرنگترین شتێك لەم كتێبەدا قسەی لێ كردبێت، ئەوەیە كە فەلسەفە (وەكو خۆی تێی گەیشتبوو ئەزمونی كردبوو، بریتیە لە ژیانی ئازاد لە نێو بەستەڵەك و چیا سەركەشەكاندا، بریتییە لە پرسیار و مەعریفەی ئازاد و پێكۆڵكردنی حەقیقەتی رەسەن، ئەو حەقیقەتەی لە ژێر لێكدانەوە و تەفسیری ناكۆتادا بزر بووە!).

لە 3ی كانونی دووەمی 1889 لەسەر یەكێك لە شەقامەكانی شاری تۆرینۆی ئیتاڵیادا، بە بێهۆشی دەكەوێتە سەر زەوی و لە ڕۆژی هەشتی ئەو مانگەدا هاوڕێی بە ئەمەك و دۆستی دێرینی لە زانكۆی (بازل) "فرانز ئۆڤربیك"ی مێژوونوس، دەیباتە نەخۆشخانەیەك لە (بازل) و دەردەكەوێت كە توشی ئیفلیجی زەینی بووە. دایكی زوو بە دەنگیەوە دێت و دەیگەیەنێتە (*Jena*) و دەخرێتە ژێر چاودێری وردی پزیشكیەوە. ڕۆژی 13ی مایسی 1890 دایكی دەیهێنێتەوە بۆ ناومبۆرگ. لەوە بەدواوە باری تەندروستی ڕووە و خراپتر دەچوو. لە ساڵی 1892 نەیدەتوانی میوانەكانی بناسێتەوە و لە 1894 توانای قسەكردنی نەما.

"نیچە" دوای ئەوەی لە نیسانی 1897 بەهۆی نەخۆشیەوە دایكی مرد، كەوتە ژێر چاودێری "ئەلیزابیس"ی خوشكییەوە لە (ڤایمار) و لەوێ مایەوە تا وەختی لە دنیا دەرچونی، لە پاشنیوەڕۆی ڕۆژی 25ی ئابی 1900 و لە زادگای خۆی بە خاك سپێردرا!

بە درێژایی سەدەی بیستەم، "نیچە" كاریگەری لەسەر زۆرێك بیریار و سیاسەتمەداری ئەڵەمانیا و دەرەوەی ئەو وڵاتە هەبووە، ئەوەتا "ماكس ڤیبەر" لە ساڵی 1920 دەنوسێت: (ئەو دنیایەی ئەمڕۆ تیایدا دەژین، زۆر بە قوڵی لەژێر كاریگەری ماركس و نیچەدایە). لەلایەكی ترەوە "ماكس هۆكهایمەر" پێی وا بوو: (نیچە زۆر لە ماركس مەزنتر و قوڵترە!).

كاریگەری و شوێندەستیشی لە بواری ئەدەبدا و بە بەرهەمی هەریەك لە "ریلكە و كراوس و مۆزیل و هانیرش مان و تۆماس مان و هێرمان هێسە و ئەندرێ ژید و جۆتفرید بن و نەجیب مەحفوز و.. هتد) دیارە. "جۆتفرید بن" پێی وایە: (لە مارتن لۆتەرەوە، نیچە گەورەترین بلیمەتی وڵاتی ئەڵمانیایە!)، واتە بەلای (*Benn*) وە "نیچە" لە پێش "گۆتە"شەوەیە. "تۆماس مان"یش یەكێكە لەوانەی لەسەردەمی گەنجێتیەوە، كارەكتەر و بەرهەمەكانی "نیچە" سەرسام بووە و ئەمەش زیاتر

لە رۆمانی (دکتۆر فاوست) و لێکچەرەکانیدا دەردەکەوێت. بەلای "تۆماس مان"ەوە، "نیچە" (قارەمانە چاونەترسەکەی جیهانی فیکرە و بیرو بۆچونەکانیشی پڕی بلیمەتییە). "تۆماس مان" ساڵی 1947 ئەم قسانەی لە لێکچەرێکدا دەربارەی "نیچە" کرد.

هەروەها لە بواری دەروونناسیشدا کاریگەریی ئەو لە باسکردن نایەت، ئەوەتا فەیلەسوفی هاوچەرخی ئەڵەمانی "پیتەر سۆڵتەردایك" دەڵێت: (فرۆید خۆی لەوە دەپاراست باسی نیچە بکات و ماوەیەکی زۆریش دەیویست بیشارێتەوە کە ئەو زۆرێك لە تێرم و بۆچونەکانی خۆی لە نیچە وەرگرتووە)، بڕوانە: (*Focus* 34 /2000). سەبارەت بە کاریگەری فەلسەفیشی، دەتوانین شوێن دەستی بیر و بۆچونی ئەو بەسەر نوسینی هەریەك لە: "کارل یاسبەرز و مارتن هایدگەر و پۆل ڕیکۆر" وە دیاریبکەین. هاوکات کاریگەری قوڵیشی لەسەر بیریارانی وەك: "میشیل فۆکۆ و ژاك دێریدا و ژیل دیلۆز و پیتەر سوڵتەر دایك و جیانی ڤاتیمۆ" هەبوو. وەك "یۆهانس ساڵتز فیدیل" دەڵێت: (بیر و بۆچونەکانی نیچە بوونە مانیڤێستی پۆست مۆدێرنە)، بڕوانە: (*Der Spiegel* 34 /2000). بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە جاڕدانی مەرگی یەزدان لای ئەو، ڕاگەیاندنی مەرگی مرۆڤ و مەرگی نوسەر و مەرگی یاخود کۆتایی مێژووی بە دوای خۆیدا هێنا!! سەرەڕای ئەمانە، بەڵام زۆرجار لە لایەن چەپی ئەڵەمانی یاخود ئەوروپییەوە، بەوە تاوانبار دەکرێت کە ئەو لە پشت نازیزم و ئەوماڵوێرانیانەوەیە کە لەسەردەمانی ئەواندا ڕویاندا.

ئەوەی زۆر بەتوندی داکۆکی لەم بۆچونە دەکات، "جۆرج لۆکاچ"ە ئەمەشی لە کتێبی (گۆڕانی چارەنوسسان)دا باسکردووە کە لە ساڵی 1947 نوسیویەتی. "لۆکاچ" لەو کتێبەیدا داوای ئایدیۆلۆژیایەکی ئەڵەمانی نوێ دەکات. ساڵی 1966 لە بەشێکی کتێبە قەوارە گەورەکەیدا (وێرانبونی ئەقڵ) بە ناونیشانی (لە نیچەوە بۆ هتلەر)، "لۆکاچ" ئەو تۆمەتە دووبارە دەکاتەوە. دواین کتێبیش لەم بارەیەوە نوسرابێت کتێبێکی "ستیڤان ئەشهیم"ە کە لە سەرەتایئەمساڵدا (2001) و لە ژێر سەردێڕی (نیچە و ئەڵەمان)دا بڵاویکردۆتەوە. ئەم کتێبە بەشێوەیەکی دیکۆمێنتی تاوتوێی تیۆریاکەی "لۆکاچ" و کەسانی هاوڕای ئەو دەکات، لەمەڕ کاریگەری "نیچە" لەسەر ڕای گشتی گەلی ئەڵەمانیا بەر لە مردنی تا کۆتایی رایخی سێهەم.

"ئەشهیم" لە کتێبی (نیچە و ئەڵەمان) دا تەواوی سەرەڕۆییەکانی سەدەی بیستەم دەخاتە ئەستۆی "نیچە"، ئەویش بەهۆی کاریگەری زۆر و زەوەندی لەسەر ئاقارە سیاسی و کلتوری و کۆمەڵایەتیە جۆراو جۆرەکان.. بۆ نمونە کاریگەری لەسەر نازیست و مارکسیست و رەگەزپەرستەکان و هەروەها گروپە ئانارشیستەکان. بەڵام ئەم جۆرە کتێبانەو هەروەها کتێبی (نیچە و نازیزم)ی "برنارد تاوریك" 1989 و تەنانەت ئەو وێنە بەناوبانگەشی ساڵی 1931 "هتلەر" نیشاندەدات لە مۆزەخانەی ڤایمار و لەبەردەم پەیکەری "نیچە"دا وەستاوە و لێی دەڕوانێت، کورتکردنەوەی "نیچە" یەو تاونبارکردنیەتی بە تاونێك کە ئەو لێی بێبەرییە. زۆرێك لەو کاتیگۆریانەی پێی تاوانبار دەکرێت بە تایبەت لە (ئیرادەی هێز)دا، خاڵی هاوبەشی سەرجەم نوسەرانی سەردەمی خۆی بوو. هەندێك لەو شتانەی رەخنەی پێ ئاڕاستەی "نیچە" دەکرێت، ئەوەیە کە ئەو بڕوای بە یەکسانی نەبووە و ستایشی هێزی کردووە و ئەمەش وایکردووە لەگەڵ

"هتلــەر"دا بخرێنــە یــەك ریــزەوە یــاخود کتێبــی (ئیرادەی هێـز) بـە کتێبـی *Mein Kampf* "هتلـەر"وە گرێبدرێت.

بـەڵام وەکـو فەیلەسـوفی هاوچـەرخی ئەڵـەمانی "تـۆگن هـات" باسـی دەکـات: (ڕون نیـە کـە هتلـەر نیچـەی خوێندبێتـەوە.. هەرچـەندە تێڕوانینیـان بـۆ نـەبوونی یەکسـانی لـە نێـوان ئینسـانەکاندا وەکـو یەکـە، بـەڵام خـاڵی جیـاوازی زۆریـش لـە نێوانیانـدا هەیــە. بــۆ نمونــە خــاڵی دەســپێك لــە فەلســەفەی هەریەکەیانــدا جیــاوازە. هتلــەر سیاســەتمەدار و ســـەرکردەیەکی چــالاکبوو، لەگەڵیشــیدا خــاوەنی فەلســـەفەیەکی ســـادە و ڕوکـــەش بـــوو کـــە لـــە دژایــەتیکردنی جولەکــە و تــەواوی گــەلانی دنیــاوە سەرچـاوەی گرتبـوو، بـەڵام نیچـە بیریـارێکی تیـۆری بـوو، خـاوەن فەلسـەفەیەکی قوڵ و ئاڵۆز بـوو. خـاڵی دەسپێکیش لای ئەو ئەوە بوو کە مرۆڤ لـە سـەرەتای بوونەوە بەسەر دوو دەسـتەدا دابـەش دەبن: سـەردار و کۆیلە. جیاوازیەکی دیکەی نێوانیان ئەوەیە، نیچە دژی ناسـیۆنالیزمی ئەڵـەمانی بـووە و لـەم ڕووەوە قسەو باسی زۆر توندی دژی ئەڵەمانەکان هەیە).

## سەرچاوە


گۆڤاری (أخبار الأدب)، ژمارە (423)، بەرواری (18/8/2001).

# تەنگژەی بیری ئیسلامی لە سەردەمی جیهانگیریدا

## چەند تێبینییەکی سەرەتایی

د. ئەحمەد ئەلبەغدادی

لە عەرەبییەوە: ڕۆشنا ئەحمەد

### سەرەتا

پێش ئەوەی بیرمەندی ئەمریکی (ساموئیل هنتنگتۆن) گوتە بەناوبانگەکەی دەربارەی (بەریەککەوتنی شارستانیەکان – صدام الحضارات) بخاتە روو کە بە یەکێك لە تێزە بەناوبانگەکان دانرا لە سەردەمی پاش جەنگی سارد و کەوتنی دیواری بەرلین (1989–1990)، ئسوڵییەکان لە هەردوو جیهانی عەرەبی و ئیسلامی رایانگەیاندبوو: ئیسلام بە تاکە نەیارێکی بەهێز لە گۆڕەپانی جیهاندا دادەنرێت و – پاش کەوتنی کۆمۆنیزم – دەتوانێت رووبەڕووی خۆرئاوا بوەستێتەوە[1].

گومانی تێدا نییە کە بزوتنەوە ئسوڵییە ئیسلامییەکان – بە ئاگاییەوە یان لە نائاگاییەوە – لە خستنەرووی خۆیدا" وەك لایەنێکی نەیاری بیری خۆرئاوا و شارستانیەتی خۆرئاوایی، سەرکەوتوو بوو، ئەویش لە ڕێگەی هەڵوێستە توندڕەوەکانیەوە – کە لە بۆچوونی خۆیدا – لەسەر ئایین دامەزراوە، بەرامبەر ئەو مەسەلانەی کە خۆرئاوا بە بالاترین ئەولەویاتی خۆی لە خۆرهەلاتدا دایدەنێت، وەکو: بارودۆخی ئافرەت، مافەکانی مرۆڤ، ئازادییەکانی بیر، مەدەنیەت و دیموکراتیەت، لەگەڵ سەرنجدانێکی تایبەت لە مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ، چونکە بزوتنەوەکانی ئسوڵی ئیسلامی، بە هەموو بیروبۆچوونە جۆراوجۆرەکانیانەوە، بەرامبەر راگەیاندنی جیهانی بۆ مافەکانی مرۆڤ – بەشێوەیەکی گشتی – هێشتا هەڵوێستی رەتکردنەوەیان وەرگرتووە، بەتایبەتی ئەوەی بە یەکسانی و ئازادی دەربڕینەوە بەستراوە.

دیارە ئەوەی لە جیهانی ئیسلامیدا – بەشێوەیەکی گشتی – و لە جیهانی عەرەبیدا کە

زۆربەیان موسڵمانن – بەشێوەیەکی تایبەتی – ڕوودەدات، وەك" چەپاندنی ئازادییەکانی بیر، بەتایبەتی ئازادی ڕادەربڕین، پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ، هەروەك لە ڕاپۆرتە دەوری و ساڵانەییەکانی تیمە جیهانییە گرنگەکاندا دەردەکەوێت، وەك: (*Human Rights watch*) و (*Inter. Amnesty*)، هەروەها تایبەتمەندیی جیهانی عەرەبی لە تەسکی ئازادی ڕاو بۆچووندا، چ ئەوەی لە دادگایی کردنی ڕۆشنبیرەکان و بەندکردنیان و سزادانی جەستەییاندا دەردەکەوێت، یاخود لە پەنابردنیان بۆ بەکافر لەقەڵەمدانیان و هاندانی گێرەشێوێنەکان لەسەر بیرمەند و ڕۆشنبیران و ئازادییەکان، هەموو ئەمانە وادەکات خۆرئاوا، پاشان ڕوانگەی شارستانیەتی خۆرئاوایی، ئیسلام لە پێگەی تۆقاندندا – تیرۆردا – دابنێن و دواتر لەسەر ئاستی شارستانییەوە پێویستە لێی بترسین، بەو پێیەی ئیسلام ئایینێکە دان بە فرەبیریدا نانێت، ڕێگە بە ئازادی دەربڕین نادات و دان بە مافەکانی مرۆڤدا نانێت، بە دیموکراسیش ڕازی نابێت، ئەمەش بەگوێرەی تێگەیشتنی (چەمکی) خۆرئاوایی لە ئیسلام، کە بۆتە تێگەیشتنێکی (چەمکێکی) جیهانی.

سەدەی جیهانگیری، بە هەبوونی ئینتەرنێت و ڕۆشنبیری میللی ئەمریکییەوە، کە دەسەڵاتی خۆی بەسەر سامانی میللەتاندا دەکێشێت، هەروەها لاوازیی حکومەت و ڕێکخراوە سیاسییەکان کە لە زیادبووندایە، لەگەڵ مانەوەی حوکمە چەوسێنەرەکان، هەموو ئەمانە مەسەلەی جیهانگیری ڕۆشنبیرییان خستەڕوو، لەسەر حسابی ڕۆشنبیرییە نیشتیمانییەکان، یان ئەوەی هەندێك پێی دەڵێن: (بەئەمریکایی کردنی ڕۆشنبیری). ئەم جیهانگیری ڕۆشنبیرییە لەلای هەندێك، وەك (د. عەبدولئیلاه بەلقەزین) بە ئەوە لە قەڵەمی دەدەن کە: (کردەی ئەتك کردنی ڕۆشنبیری و دوژمنایەتی کردنێکی هێماییە لەگەڵ هەموو ڕۆشنبیرییەکاندا)[2].

تەنگژەی بیری ئیسلامی لە سەردەمی جیهانگیریدا – کە ئەوە بابەتی تۆژینەوەکەیە – خۆی لە بێتوانایی بیری ئیسلامی هاوچەرخدا لە ڕووبەڕوو بوونەوەی سەردەمی جیهانگیریدا دەنوێنێت – ئەمەش گریمانەی توێژینەوەکەیە – کە لە واقیعدا درێژبوونەوەی بیری کۆنی ئیسلامییە، لە پێشکەش کردنی ئەو هەوڵ و تەقەللایانەی کە لەگەڵ چەمکە نوێیەکانی ئەم سەردەمە دەیسەپێنێت، دەگونجێت، لە مەسەلەکانی دیموکراتی و یەکسانی و مافەکانی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی و لە ئازادی بیروبۆچوون بە شێوەیەکی تایبەتی. ئەو پرسیارەی لێرەدا خۆی دەخاتە ڕوو: ئایا بیری ئیسلامی هاوچەرخ خاوەنی توانای فیکرییە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی چەمکەکانی سەردەمی جیهانگیری[3]؟ ئەو ئاماژەیە دووبارە دەکەینەوە: ئەوەی لەم نووسراوەدایە تەنیا چەند تێبینییەکی سەرەتایین.

## جەوهەری تەنگژەکە : زمانی ئایینی بڵندخواز

گوتاری ئسوڵی – لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوانی دیکەدا – زمانێکی ئاینی بڵندخوازی تەواو گشتگیر بەکاردەهێنێت، بە بەراورد لەگەڵ ئایینەکانی دیکەدا. بەو مانایەی ئەو (ڕاستە) و (باشترینە)، لەبەرئەوە چەمکی ئایین لای موسوڵمانەکان بە گشتی و لای ئسوڵییەکان بەتایبەتی، ناوەرۆکێکی تەواو ئایینی پەتی لەخۆ گرتووە، دوور لە چەمکی سوسیۆلۆژی بۆ ئایینەکان، بەو پێیەی کۆمەڵێکی جۆراوجۆر جیاوازی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانن[4]. یان بە دەربڕینێکی دیکە، ئەمڕۆ چەمکی ئایین لای موسڵمانەکان ئەو

رەهەندە شارستانیە دیارەی لەخۆ نەگرتووە کە لە سەردەمی عەباسیەکاندا پێی ناسرابوو، ئەگەر تەنگژەی کۆمەڵگەی عەرەبی هاوچەرخ مۆرکێکی کۆمەڵایەتی، سیاسی و فیکری هەبێت، ئەوا هەژمونی گوتاری ئایینی ئسوڵی بە شێوە جیاوازەکانیەوە، لەسەر چارەنووس و مەسەلەکانی کۆمەڵگەی عەرەبی، بەسەریەکدا کەڵەکە بوون و سروشت و گەڕانەوەکانی ئەم تەنگژەیەیان ئاڵۆز کردوە[5]. (د. شەرابی) ئەم تەنگژەیەی دەستنیشان کردوە، کاتێك دەڵێت:

(ئازار و ئەشکەنجەکانمان لە چل – پەنجا ساڵی رابردوودا، نەزۆکی ئایدیۆلۆژییە دۆگماکان و بێ توانایی حیزبەکان و سەرۆکە شۆڕشگێڕەکانی لە ڕوودانی گۆڕانێکی پێویستدا خستەڕوو، ئەوەش وای لێکردین – وەك ئەمڕۆ – بەرەو رابردوو رابکەین، بۆ ئەوەی لە ئێستا دەربازبین و پەنا بۆ غەیبانیەتی ئایین بەرین، بۆ ئەوەی لە باری ئێستا و ئازارەکانی رزگار بین. گاڵتەکردن بە بیر، ئێمەی گەیاندە لێژبوونەوە بەرەو گێرەشێوێنی سەرتاپایی، لە توانستی بیرکردنەوەو تێڕوانین دووری خستینەوەو جەنجاڵی باڵی بەسەر هەموو پراکسیس کردنە کۆمەڵایەتیەکانماندا کێشاوە. ئێستاش لە هوشیاری راستەوخۆ زیاتر چیدیکە نازانین، بووین بە بەندکراوەکانی هەنووکە و کاردانەوەی ئۆتۆماتیکی. ئەو خود هوشیارییەمان لەدەستدا، کە هەموو میللەت و کۆمەڵگەکان لە ڕووبەڕوو بوونەوەی واقیعەکانیان و لە پاراستنی مانەوەی خۆیاندا پێویستیان پێیەتی[6]).

بەهۆی خەسڵەتی بڵندگەری نێو گوتاری ئایینی ئیسلامییەوە، شتێکی سروشتی بوو زمانێکی غەیبی بڵاوبێتەوە، کە لەسەر نەزانراوێکی ئەودیوەوە و نامۆبوون لە واقیع بنیاد نراوە، لە ڕێگەی دروشمێکەوە کە لە ناوەڕۆکێکی مەعریفی راستەقینە بێبەرییە، ئەویش ئەو دروشمەیە کە بە (ئیسلام بریتییە لە چارەسەر) ناسراوە، وەك ئامرازێکی ئایینی لە بەدیهێنانی مەبەستە سیاسییەکان بەکارهێنراوە، کە هیچ پەیوەندییەکی بە ئایینەوە – وەك واقیعێك تیایدا بژی – نییە. کۆمەڵگەی عەرەبی بە سەرۆکایەتی بزوتنەوەی ئایینی بەرەو ئەشکەوتی رابردوو چووە تاوەکو بەدوای داهاتوودا بگەڕێت. موسڵمانەکان بەشێوەیەك لە ئێستادا دەژین، دەڵێیت ماوەیەکە و تێدەپەڕێت، بە جیدی بە ئێستاوە پابەند نابن، هەروەك ژنە نووسەر (فاتمە ئەلمەرنیسی) دەڵێت.

بەکارهێنانی زمانی بڵندگەری پاڵی بە موسڵمانەوە نا بۆ رابردوو بکشێتەوە، وەك نموونەیەك بەرجەستەی بکات کە پێویستە لە داهاتوودا لەسەری بێت، بەبێ هیچ بایەخدانێك بە پێدراوەکانی واقیع و گۆڕانی بارودۆخ، ئەمەش بووە هۆی زنجیرەیەك لە پاشەکشەی نێگەتیڤ بەرامبەر مەسەلەکانی ئێستا، وەك" دیموکراتی و فرەیی سیاسی و ئازادییەکان و مەسەلەی ئافرەت و مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ. لەبەرئەوەش کە دەبوو زمانی بڵندگەری بەکارهاتوو زمانێکی ناواقیعی بەکاربهێنێت، زمانێك کە مامەڵە لەگەڵ گشت و ڕەهادا دەکات، بە (هەموو) شتێك نەبێت بە چیدیکە رازی نەبێت، هەموو شتێك لە –ئەویدیکە–وە رەتبکاتەوە. هەر بۆیە ئەوە زمانێکی داپڵۆسێنەری چەوسێنەرە، لە کارلێککردن و گفتوگۆ دەترسێت و لە هەموو ڕووبەڕوو بوونەوەیەك لەگەڵ –ئەویدیکە–دا خۆی لەپشت بیری کەلتووری ئایینی – کە بەسەر خۆیدا داخراوە – دەشارێتەوە[7].

بەهۆی زمانی گوتاری بڵندخوازییەوە، مرۆڤی موسڵمان لە تەنگژەی گفتوگۆکردن لەگەڵ –

ئەویدیکە-دا دەژی، لەبەرئەوەی ئەویدیکە ڕەتدەکاتەوە، ئیدی موسڵمانێکی ئازادیخواز یان عەلمانی بێت، یاخود موسڵمان نەبێت، چونکە وا خۆی دەخاتە ڕوو کە کەسێکی ئایدیالی بڵندخوازە و تەواو و سەرکەوتووە، ئەمەش وایکردوە بیری ئیسلامی - لە ڕێگەی پراکسیس کردنەکانی بزوتنەوە ئسوڵییە ئیسلامییەکانەوە - لە نێرگسییەتێکدا بژی کە لە زێدەڕۆییدا نوغرۆ بووە، لە کاتێکدا کۆمەڵگەی عەرەبی - بەشێوەیەکی گشتی - ئەو لایەنە جوگرافییەیە کە بزوتنەوە ئایینییەکان تیایدا دەژین و لەسەری دەژین، پێویستی بە زمانی گفتوگۆکردنە. یان وەکو (هیشام شەرابی) دەڵێت: (پێویستی بە ئەقڵانی بوونی شارستانی و عەلمانی بوونی کۆمەڵگەیە).

بەهۆی ئەو زمانەوە، بزوتنەوە ئسوڵییەکان زمانی گفتوگۆکردنیان لەگەڵ ڕۆشنبیرییەکانی دیکەدا لەدەستداوە، چونکە هێشتا پشت بە زمانی فەقیهە مردووەکان دەبەستێت، لە دابەشکردنی جیهان بۆ دوو ماڵ (دار): ماڵی ئیسلام و ماڵی کوفر لەسەر ئاستی فیکری، بگرە کەسی ئەوتۆش هەیە کە وایدادەنێت" ئەو موسڵمانانەی جێبەجێ کردنی شەریعەت ڕەتدەکەنەوە و بانگەشە بۆ دەوڵەتی دەستووری و دیموکراتی دەکەن، لەو کافرانەن کە ئایین پێویستی کردوە لەگەڵیاندا بجەنگن، پێش شەڕکردن لەگەڵ ماڵی کافرەکاندا[8]. لەبەرئەوە زمانی گوتاری ئسوڵی بەرەو گۆشەگیری ڕەوتدەگرێت و بە خودگەرایی دەنازێت و هەوڵ نادات لەگەڵ ئەویدیکەدا گفتوگۆ بکات، تاوەکو بۆ مامەڵە کردنی مرۆیی زەمینەیەکی هاوبەش بدۆزێتەوە. لە کاتێکدا جیهان بۆ زمانێکی گفتوگۆکردنی هاوبەش هەوڵ دەدات، هەروەها لە کاتێکدا جیهانی خۆرئاوایی لەگەڵ مەسەلە جیاوازەکاندا مامەڵە دەکات" لە ڕێگەی ڕازی بوون بە ئەویدیکە - لە ڕووی پرەنسیپەوە - و بانگەشە بۆ چەندین گفتوگۆکردن دەکات، وەك گفتوگۆی ئایینەکان و گفتوگۆی شارستانییەکان، ئێستاش بانگەشە بۆ (گفتوگۆی ڕۆشنبیرییەکان) لە گۆڕێدایە، کە هەندێك وەك وەڵامێکی کردەیی لەسەر گوتەی (بەریەککەوتنی شارستانییەکان) داویانەتەوە. دەبینین بزوتنەوەی ئسوڵی لە ڕووی پرەنسیپەوە گفتوگۆکردن ڕەتدەکاتەوە.

باڵادەستی زمانی بڵندگەرایی و تەواو لە گوتاری ئسوڵیدا، بەرەو بێتوانایی مامەڵەکردن لەگەڵ واقیع و خستنەڕووی چارەسەری گرفتەکانی بردوون، کە ئەوەش لە خۆیدا بۆتە هۆی نەبوونی توانای دەستپێکردن و ڕووبەڕووبوونەوە. بۆ باربۆ کردنی ئەم بێ تواناییەش" ووشەکانی (بەکافر دانان) و حەڵاڵ و حەرام هاتنە ئارا، داخستن بە دوای داخستن زیاتر بوو، لە کاتێکدا خۆرئاوا بە تێزە فیکرییەکانی دەربارەی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییەکان و کردنەوەی شارستانی پێش دەکەوێت.

زمانی فەقیهەکان کە لە ڕووی مێژووییەوە لە ناوچوون گۆڕدراوە بۆ ئەو حوکمە تەواوانەی مشتومڕ هەڵناگرێت، وەك ئەو فەتوایانەی بە ناموسڵمانەکانەوە بەندە و نەبوونی مافی ئافرەت لە وەرگرتنی هەندێك لەو پۆستانەی بۆ پیاوان بڕاونەتەوە، دەیانکاتە بنەڕەتێك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ نەیارەکان. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەم حوکمانە مۆرکێکی بەگژداچوونی شارستانی وەربگرێت، بە هۆی ئەو بڕواکردنە هەڵەیە کە (پێشینە) هیچی بۆ (دوایینە) جێنەهێشتووە، چونکە ئەو لەو باشترە. پێویست وابوو تەنگژەی داهێنانی فیکری لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بتەقێتەوە، چونکە

بزوتنەوەی ئسولی هەڵوێستێکی زێدەڕۆیی بەرامبەر هەموو ئەوانە وەرگرتووە کە لە گۆمی مەنگی عەرەبیدا هەولی (داهێنان) دەدەن. ئسولییەکان بەجۆرێك هەموو کردەیەکی فیکری لێکدەدەنەوە، کە پیسکردنی پیرۆزیی فیکرە، هەر لەو وێناکردنی خواوەندییەوە تا دەگاتە مێژووی ئەسحابەکان[9]. گوتاری ئسولی بڵندخواز سەلماندی کە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی واقیعی شارستانیدا بێ توانایە، بەهۆی سووربوونی لەسەر حەسانەتی گشتگیری حوکمی فەقیهەکان، کە لە سەردەمی دەسەڵاتی عەباسییەکاندا دەرکەوت، کاریگەری ئەم حوکمانە تاوەکو سەردەمی نوێ درێژبۆتەوە، بێجگە لە گرتنەخۆی تەواوی گوتەکانی (ئیبن تیمیە) لە مەسەلەی بەکافر دانانی ئەو کۆمەڵگەیەی بەتەواوی جێبەجێکردنی حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامی ڕاناگەیەنێت، هەروەها چەندین گوتەی دیکەی لەو جۆرە" لە دەرکەوتنی کتێبەکانی (سەید قطب) و کتێبەکانی فەرزی نائامادە (الفریضة الغائبة) و هەموو ئەو کتێبانەی کۆمەڵگە بە کافر دادەنێن. هەڵبەت ئەو کتێبە تایبەتانەی کە دیموکراتی خۆرئاوایی و مەسەلەی دەستووری بە کافر لەقەڵەم دەدەن، باشترین بەڵگەی بۆچوونەکەمانە.

ئەو پرسیارەی لەم بوارەدا خۆی دەسەپێنێت، ئەوەیە: ئایا دەکرێت گوتاری ئایینی ئسولی داواکانی سەردەمی جیهانگیری و خستنەڕووەکانی بهێنێتە دی؟ یان بە دەربڕینێکی دیکە: ئایا گوتاری ئسولی هاوچەرخ خاوەنی تێزە ڕۆشنبیرییە پێویستەکانە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خەسڵەتی ڕۆشنبیری جیهانگیری، یاخود ئەم گوتارە بە ناچاری بێت یان هەڵبژاردن تیۆری بەریەککەوتنی شارستانییەکانی پێ باشترە؟

## مەسەلە نوێیەکان.. بۆچوونە کۆنەکان

ئەگەر بە گوتەکەی (ڕۆلاند ڕۆبەرتسۆن) ڕازی بووین، لەوەدا کە جیهانگیری مانای ئەوە دەبەخشێت" جیهان زیاتر و زیاتر دەبێتە (تاك جێگا *A single place*)، ئەوا بێگومان مەسەلەی جیهانگیری مەرج و بۆچوونەکانی خۆی لە مەسەلەی ئایینیدا دەسەپێنێت. ئەگەر مەسەلەی ئایینیش لە خۆرئاوادا بەئاسانی و بە تەماهی کردن لەگەڵ مەسەلەکانی سەردەم لە بەعەلمانیکردن و نوێگەری و تەنانەت مەسەلەکانی پاش نوێگەریش بناسرێت، بەهۆی ڕازی بوونی کڵێسە بە ئەم تەوژم و تێزانە و بەبێ ئەوەی بە کافر و بێباوەڕ لە قەڵەمیان بدات، ئەوا بارودۆخەکە بە لایەن تەوژمی ئسولییەوە، کە چەمکە ئایینیەکانی تایبەت بەخۆی بەکاردەهێنێت، کارێکی هەروا سادەو ئاسان نییە.

تێزی سەرەکی جیهانگیری لە یەکەم جێگەدا گریمانەی ئەوە دەکات" میللەتان و کۆمەڵگەکان و ڕۆشنبیرییەکان و شارستانیەتەکان ناتوانن لە یەکدی دووربکەونەوە و پاشان گۆشەگیر نابن[10]. بەهۆی سروشتی گوندی گەردوونی لە کۆمەڵگەی زانیارییەکانی جیهاندا، هیچ کۆمەڵگەیەك، بە هەموو بەهاو ڕۆشنبیری و شارستانیەتەکەیەوە ناتوانێت لە چنگی ئەو جیهانگیرییە دەرباز بێت، کە (ئەلجابری) پێی دەڵێت (درندە)[11]. هەندێکی دیکەش لەو بڕوایەدان" ئەوەی لە توانایدا نییە هەڵبکات (خۆی بگونجێنێت)، وەك داینەسۆرەکان لەناو دەچێت، چونکە ڕۆشنبیری جیهانی[12] خۆی دەسەپێنێت.

### 1/مەسەلەکانی مافەکانی مرۆڤ:

لەگەڵ ئەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان هەر لە ساڵی (1948)ەوە جاڕنامەی جیهانی بۆ مافەکانی

مرۆڤ-ی راگەیاندووە، بەڵام هێشتا ئەم مەسەلەیە لەلایەن سستەمە سیاسییە عەرەبییەکانەوە تاوەکو ئەمڕۆ بایەخی پێویستی پێنەدراوە، ئەویش بەو پێیەی چەندین خاڵی ئەم جاڕنامەیەیان پێ باش نییە، بێ لەیادکردنی ئەوەی کە لەم چەند ساڵانەی دواییدا چاکبوونێکی ڕێژەیی کەوتە هەڵوێستی ئەم وولاتانەوە. ئەگەرچی بارودۆخەکە لەم بارودۆخەی ئێستا باشتر دەبوو، ئەگەر باڵادەستی تەوژمی ئسوڵی نەبووایە، کە مەسەلەکەی بۆ خاڵی سفر گەڕاندەوە، بەهۆی ڕەتکردنەوەی جاڕنامەی جیهانی بۆ مافەکانی مرۆڤ، لەبەر هۆکاری ئایینی، دواتر راو بۆچوونی فەقیهە کۆنەکان هاتنە ئارا دەربارەی جیاکردنەوە لە نێوان خاوەن باوەڕ و بێباوەڕدا و لە نێوان موسڵمان و ناموسڵماندا و لە نێوان پیاو و ئافرەتدا، وەك پێوەرێك بۆ مەسەلەکانی مافەکانی مرۆڤ. نموونەش لەسەر ئەمە زۆرە"

ئەوەی ڕێبەری ئیخوان ئەلموسلمین لە میسر رایگەیاند دەربارەی وەرنەگرتن و نەشیاوی مەسیحییەکان بۆ پۆستی سەرۆکایەتی سوپا، پاشان پۆزش هێنانەوە بۆ ئەم راگەیاندنە. لە (کوەیت) لە هەموو سەری ساڵێکی میلادیدا، فەتواکان دەربارەی نەگونجانی هاوبەشی کردنی مەسیحییەکان لە جەژنەکانیان بەرز دەبنەوە، تەنانەت لەسەر تەوقەکردن و پیرۆزبایی لێکردنیان! لە (سعودیە)ش هەڵوێستی ئایینی بەرامبەر (تیمە گومڕاکان — الفرق الضالة) کە سەر بە سونییەکان و ئەهلی جەماعەت نین، هێشتا وەك خۆی جێگیرە، مافە مرۆڤایەتییەکانیان هەروەك ئەوانەی زۆرینەیان شیعەن و لە ناوچەی خۆرهەڵاتدان پێشێل دەکرێت. هەرچی مەسەلەکانی بەکافر لەقەڵەمدانی رۆشنبیر و نووسەرانە، ئەوا لەوە زیاترە کە بیژمێرین، تەنانەت لەو وڵاتەشدا کە بە کراوەیی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری دەناسرێت، وەك میسر، ئەوەی سەبارەت بە رۆمانی (ئاهەنگی گژوگیای دەریایی) رۆماننووس (حەیدەر حەیدەر) روویدا، یان ئەوەی لە ئەردەن روویدا و لە کوێتدا روویدا تەنها چەند نموونەیەکن.

ڕەنگە ئازادی ڕا دەربڕین، لە هەموو ئازادییەکانی دیکە زیاتر بە ناوی ئایینەوە دەستی بەسەردا گیرابێت، بە جۆرێك جیهانی عەرەبی دیاردەی دادگاکانی پشکنینی رۆشنبیران و نووسەرانی هێناوەتە ئاراوە، وەکو لە حاڵەتی (د. سەید ئەلقمنی) لە میسردا روویدا، لەسەر کتێبەکەی (خودای زەمان) و مامۆستا (خەلیل عەبدولکەریم) لە کتێبەکەی (شدو الربابة في احوال الصحابة)، هەروەها (لەیلا عوسمان) و (د. عالیە شعێب) لە کوێت. زێدەڕۆیی لەوەدا نییە ئەگەر بووترێت" وڵاتە عەرەبییەکان بەشێوەیەکی گشتی و بە هۆی تیرۆری کۆمەڵە ئسوڵییەکانەوە، ئازادی ڕا دەربرین تیایاندا پاشەکشەیەکی روون بەخۆوە دەبینێت، دەزگا ئایینیە رەسمییەکانیش رۆڵی چاودێرییەکی گەشەسەندوو دەبینن، هەڕەشە لە بیرو رۆشنبیری دەکەن، ئەمەش حاڵی دەزگای (ئەزهەر) و وەزارەتەکانی ئەوقافە کە رایانگەیاند: خۆیان سەرپەرشتی داهێنانی فیکری دەکەن. ئیدی لە دارمانی مافەکانی مرۆڤ گەڕێ لەو وڵاتانەدا کە بانگەشە بۆ جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی دەکەن، وەك سعودیە و ئەفغانستان و پاکستان و سودان.

لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین" مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نییە، چ لە کۆمەڵگە عەرەبییەکاندا، یان لای کۆمەڵە ئسوڵییەکان، بگرە تێبینی هەبوونی پەیوەندیەکی پێچەوانەش دەکرێت لە نێوان گەشەی داواکردنی جێبەجێ کردنی شەریعەت و پاشەکشەی مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ،

بە تایبەتی کاتێك بزوتنەوە ئسوڵییەکان ئەم مەسەلەیە ناخەنە ئەولەویاتی باسەکانیان. لە بەرامبەریشدا بایەخی تاکی خۆرئاوایی لە بواری مافەکانی مرۆڤ و ئاژەڵ و ژینگەدا پەرەیسەندوە، بەچەشنێك گرنگی بە سەرلەنوێ پێداچوونەوە بە مانای (تاك) و (مرۆڤ) دەدات وەك چەمکە مرۆییەکان، بێجگە لە پێداچوونەوەیان بە سەرجەم چەمکەکانی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییەکانی. بزوتنەوە ئسوڵییەکان نەیانتوانی تێزەکانی بیری ئیسلامی لەم بوارەدا پەرەپێبدەن، سەرەڕای ئەوەش کە بەردەوام و نالۆژیکییانە بەرز دەفڕن و دەڵێن: ئیسلام لەم بوارەدا پێش هەمووان دێت[13].

تەوژمە ئسوڵییەکان لە سەردەمی جیهانگیریدا، لە لایەکەوە ناچارن واز لە گوتارە بڵندخوازە توندەکەیان لە مەسەلەکانی مافەکانی مرۆڤ بهێنن و ، لە لایەکی دیکەوە ناچارن چەمکی نوێ لەم بوارەدا پێشکەش بکەن، چەمکێك کە لە کلتوری ئایینی و ئەزموونی مرۆڤایەتی لە مێژووی ماڵی ئیسلامەوە (دار الاسلام) وەرگیرابێت، با هەر لە گوتەکانی خوداوە دەست پێبکەین، وەك: (لا إكراه في الدين) کە ئازادی باوەڕ و ئازادی ئایین بە شێوەیەکی رەها دادەمەزرێنێت، یان (وجعلناكم شعوباً و قبائل لتعارفوا، إن أكرمكم عند الله أتقاكم) کە بنەمای برایانی مرۆیی بەبێ جیاوازی کردن لە ئاین و رەنگ و رەگەز دادەمەزرێنێت. هەروەها (فمن شاء فليؤمن و من شاء فليكفر) ئازادی ڕا دەربڕین دادەمەزرێنێت، یاخود لە نێو ئەزموونی پێغەمبەرەوە و لە پەیوەندییە جیاوازەکانی لەگەڵ هەموو لایەنە پیاو خراپ و بێباوەڕان و عەرەبە نەزانەکان (قەرەج – کۆچەر) و ناموسڵمانەکاندا دەبینین، – بەشێوەیەکی گشتی – لە گونجاویی مامەڵەکردنەکانی لەگەڵ فارسدا، هەروەك هاوپەیمانانی موسڵمان، ئەمانە چەندین بەڵگەن بۆ لایەنی کۆمەڵایەتی ئایینی ئیسلام کە لە دەمارگیرییەوە دوورە. لەبەرئەوە موسڵمانەکان بە گشتی و لایەنگرانی تەوژمی ئسوڵی بەتایبەتی، پێویستیان بە پێداچوونەوە هەیە بە سروشتی مێژویی دەقی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر. بەڵام بەنیسبەت حوکمەکانی فەقیهەکانەوە، ئەوا دەبێت جەربەزە بن و واز لەو حوکمانە بهێنن، چونکە ئەو دۆخە مێژووییە بوونی نەما کە تیایدا ئەم حوکمانە پەیدا بوو.

لەبەرئەوە دەبێت تەوژمی ئسوڵی واز لە هەڵێنجان و بەسیاسەت کردنی ئایین بهێنێت، رەهەندی سۆسیۆلۆژی ئایینی ئیسلامی دیاری بکات، تاوەکو بتوانێت مامەڵە لەگەڵ ئەو چەمکە نوێیانەدا بکات، کە جیهانگیری دەیخاتە دەکات.

## 2/ مەسەلەی ئافرەت:

لەگەڵ ئەوەی پەرەسەندنێکی گەورە لە ئاستی کۆمەڵایەتی ئافرەتدا روویداوە، کەچی دیدی تەوژمی ئسوڵی بۆ ئافرەت، بەو پێیەی ئامرازێکە بۆ چێژ و خزمەتی ناوماڵ، هێشتا لە زۆربەی کۆمەڵگە عەرەبییەکاندا، بەشێوەیەکی فراوان لایەنگیری دەکرێت، هەروەها بە نیسبەت مافە سیاسییەکانەوە، لە هەندێك وڵاتی ئیسلامیدا، تەوژمی ئسوڵی بەرامبەر ئافرەت و رۆڵی لە کۆمەڵدا، هێشتا پشت بە لێکدانەوەو راو حوکمی (فەقیهەکان) دەبەستێت، ئەمەش لەگەڵ چەمکەکانی جیهانگیریدا ناکۆکە، کە هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە جیاوازی کردن لە نێوان دوو رەگەزەکە هەیە، خستویەتیە لاوە، بە پێی مرۆڤایەتی مرۆڤ، ئیدی نێر بێت یان مێ بێت.

بەهۆی پەستانی تەوژمی ئسوڵی و فاکتەری ئاینییەوە، ئافرەت لە وڵاتانی کەنداودا – بۆ نموونە – هێشتا لە مافە سیاسییەکان و وەرگرتنی

پۆستی وەزارەت و دادوەری بێبەشن، چونکە فەقیهەکان بڕیاریانداوە: ئافرەت مافی دەسەڵات و بەڕێوەبردنی نییە[14].

نموونە لەسەر ڕەتکردنەوەی جیهانگیری و چەمکەکانی لەلایەن تەوژمی ئسوڵییەوە ئەوەیە کە لە فەتوایەکدا هاتووە دەربارەی شەرعیەتی بەکارهێنانی ئەو سەتەلایتانەی کەناڵە ئاسمانیەکانی عەرەبی و بیانی وەردەگرێت. شێخ صالح بن عسیمین لەم بارەیەوە لە گوتاری دووەمی ڕۆژی هەیینی (1417/3/25 کۆچی) فتوای داوە: "ئەو کەسەی مرد و لە دوای خۆی لە ماڵەکەیدا سەتەلایت یان وەك پێی دەڵێن (دوش)ی بەجێهێشت، ئەوا خیانەتی لە نەتەوەکەی کردووە و بەهەشتی لێ حەرام کراوە"[15]. لە (کوێت)یشدا تەوژمی ئایینی لە پەرلەماندا هەوڵ دەدات یاسایەك دەربکات بۆ چاودێری کردنی ئینتەرنێت.

## مێژوویەتی دەقی قورئانی

بیری ئیسلامی ڕووبەڕووی تەنگژەیەکی فیکری دەبێتەوە، کە بە دەقی ئاینییەوە بەستراوە، بەتایبەتی دەقی قورئانی. توێژینەوە ئاینییە هاوچەرخەکان جەربەزەتر دەبن لە توێژینەوەی دەقی قورئانیدا. واقیعی دۆخەکەش بەڕوونی ئاماژە بۆ هەبوونی دیاردەی (تێپەڕاندنی واقیع) لە دەقی قورئانیدا دەکات، کە بە حوکمەکانی یاسادانانەوە (تشريعية) بەندە، بە جۆرێك باسکردن لە شەریعەتی ئیسلامی وەك واقعێکی کردەیی لێهاتووە، جگە لە لایەنی پەرستنکارییەکەی. دەوڵەتە ئیسلامییەکان بەبێ جیاوازی هەموو یاسا دانانێك لە خۆرئاواوە وەردەگرن، یاخود بۆ خۆرئاوای دەگەڕێنەوە، ئەویش ئەوەیە کە پێی دەڵێن (مەدەنی)، بێجگە لە یاسای سزادان کە لە سعودیە و ئێران لە سنوورێکی تەسکدا جێبەجێ دەکرێت، دانانی یاسا ئاینییەکانی دیکە، کە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا هاتوون، لە کۆمەڵگەی عەرەبی هاوچەرخدا کارناکات، هەروەها هەموو تۆژینەوە قورئانییەکان هێشتا پشت بە ڕابردوو دەبەستن، زۆر بە دەگمەنیش تۆژینەوەیەك دەردەکەوێت کە شتێکی نوێ بڵێت، بە تایبەتی ئەوەی بەو تۆژینەوە قورئانییانەوە بەندە کە بابەتی مێژوویەتی دەقی قورئانی دەخەنە ڕوو، تاوەکو ئەم دەقە بە چاوی — دیدی هاوچەرخانەوە بخوێنرێتەوە. ئێمە لەمڕۆدا بەداخەوە بێجگە لە هەوڵەکانی بیرمەندی دوورخراوە (نەسر حامد ئەبوزەید) و هەروەها (مەحەمەد شەحرور) زیاتر چیدیکە نابینین. ئەگەرچی هەبوونی ئەمجۆرە کتێبانە و بڵاوبوونەوەیان لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا — کە تۆژینەوەکانی ئەم دوو بیرمەندە چەندین جار لە چاپ دراونەتەوە — بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە ئەم ڕاوبۆچوونە بەرەو ڕەگ و بنج داکوتان دەچێت.

داننان بە مێژوویەتی دەقی قورئانی، ڕازیبوونی گشتی بە ئەنجامدانی ئەمجۆرە تۆژینەوانەی قورئان بۆ پێداچوونەوە بە مێژوویەتی دەقی قورئانی و پاشان تێگەیشتنی نوێ لێی، لەبەر تیشکی توێژینەوە نوێیەکان، پێویستی بە ئەوەیە بیری ئیسلامی — بۆ خۆ لادان لە هەر تەنگژەیەکی دەروونی و فیکری — جیاکاری بکات لە نێوان دەقی قورئان وەك دەقێکی پیرۆز کە پێویستە ڕێزی بگیرێت، چونکە ملیۆنەها کەس بەو دەقە خواپەرستی دەکات و لە نێوان دەقی قورئانی وەك مادەیەکی توێژینەوە کە ملکەچی مەرجەکانی تۆژینەوەی زانستی بێت. پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك ئەوە بزانێت کە سەردەمی جیهانگیری بواری داوە بە دیالۆگ و وتووێژ لەسەر ئەم بابەتانە، دوور لە توانای کۆمەڵە ئسوڵییەکان، تاوەکو زیان بە

ئەو کەسە نەگەیەنن کە ئەو کارە بەئەنجام دەگەیەنن، ئەویش لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە. باشترینە نموونەش ئەوەیە کە لە سایتی ئینتەرنێت: (www.theatlantic.com) هاتووە و چەند ڕاپۆرتێکی (تۆبی لیستەر)ی بڵاوکردۆتەوە، بەناونیشانی (قورئان چییە؟ What is the koran?) لە کانونی دووەمی 1999، ئەمە سایتێکە تا ئێستاش کاردەکات.

(لیستەر) کورتەی کاری تۆژەری ئەڵمانی (Gerd R. Puin) دەخاتە ڕوو، کە هەر لە ساڵی 1981ەوە دەستی بە تۆژینەوەی ئەو قورئانە کردوە کە لە (صنعاء) ساڵی 1972 دۆزراوەتەوە. تۆژەرەکە لە سەرەتای هەشتاکاندا لەبەرترس نەیتوانی هیچ شتێك لەو بارەیەوە بڵاوبکاتەوە، بەڵام بەهۆی ئینتەرنێتەوە دەستیکرد بە بڵاوکردنەوەی هەندێك لە ڕاوبۆچوونەکانی دەربارەی ئەو قورئانە.

گومانی تێدا نییە بڵاوبوونەوەی ئەمجۆرە تۆژینەوانە چەندین پرسیار دەربارەی ڕەسەنێتی دەقی قورئانی لە ڕووی مێژووییەوە دەوروژێنێت، سەرلەنوێ لاپەڕەکانی هەردوو سەدەی یەکەم و دووەمی کۆچی ڕێکدەخاتەوە، لەبەر تیشکی ژمارەی زیاتری ئەو بەڵگەنامانەی تایبەتن بەو سەردەمە، دواتر سەرلەنوێ دەقە قورئانییەکان لێکدەداتەوە. هیچ ڕێگەی دەرچوون نییە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەمجۆرە تۆژینەوە جیدییانە، لە پێشکەش کردنی ئەوەی لە ڕووی زانستییەوە دژایەتی دەکات، بەو مانایەی (ڕووبەڕوو بوونەوەی) زانستی ناتوانێت پشت بە کتێبەکانی لێکدانەوەی باو (تەقلیدی) ببەستێت، بەڵکو پێویستە تۆژینەوەیەکی ئارکیۆلۆژیی لە پاشماوەکانی مێژوو بێت وەك سیرامیکە کۆنەکان و دەسنوسەکان و چەندین شتی دیکەش. کۆمەڵە ئسوڵییەکان لە توانایاندا نابێت پشت بە شێوازی توندڕەوی و کوشتن و تیرۆر ببەستن، چونکە ئەوانە ئامرازگەلێکن کە ماوەیەکە گوتارەکەی لەدەستداوە، بۆیە پێویستە وەڵامێکی زانستی ئەو تۆژینەوانە بداتەوە.

جیهانگیری بەگژاچوونێکی فیکری بەسەر بیری ئیسلامیدا دەسەپێنێت، کە ناکرێت فەرامۆش بکرێت یان باز بەسەریدا بدرێت، هەروەك لە ڕابردوودا ڕوویداوە، لە جیهانی ئاسمانی کراوەدا هەموو کەسێك بەبێ ماندوو بوون یان کۆت و بەند دەیگاتێ، تەنگژەی بیری ئیسلامیش دەگاتە ترۆپکی، چونکە ئەو ئامرازە زانستییانەی بەدەست بزوتنەوە ئسوڵییەکانەوە بوون لە بواری تۆژینەوە قورئانییەکاندا، ئێستا نین. لە کاتێکدا تۆژینەوە ئارکیۆلۆژییەکان بەشێوەیەکی زیادبوو پشتگیری لە پێویستی تێگەیشتنی (چەمکی) مێژوویەتی دەقی قورئان دەکات، پاشان لێکدانەوەی سەرلەنوێی قورئان.

جیهانگیری ئەو چارۆکە وەهمییەی ڕماند کە بیری ئایینی دەربارەی دەقی قورئانی دایمەزراند بوو، لە ڕێگە چارۆکەیەکی پتەوترەوە لەسەر جێگەی ئینتەرنێت، واتە تۆڕە ئەلکترۆنییەکانی زانیارییەکان(16). ئەو کاتەش بیری ئسوڵی چی دەکات؟ هیچ شتێك لەبەردەمیدا نییە، جگە لە پێداچوونەوەی بە چەمکەکانیدا و پێشکەشکردنی ڕوانگەیەکی ڕۆشنبیری نوێ، کە پشت بە ئامرازەکانی تۆژینەوەی چالاك ببەستێت، ئەمەش لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی هەڵتەکاندنی بناغەکانی بیرکردنەوەی غەیبی دەربارەی دەقی قورئانی، تاوەکو بۆ زەمینەی ئەقڵانییەت بگەڕێتەوە، کە ماوەیەکی درێژە لە گۆڕەپانی فیکری لە جیهانی عەرەبیدا بزرکراوە. بە ئایدیۆلۆجی کردنی ئایین و کارکردن وەك چاوگەیەکی کاریگەر و بریقەدار لە ئێستادا، بیرۆکەی ململانێ لەگەڵ ئەویدیکەی

بێباوەڕدا – لە سەردەمی جیهانگیریدا – لە بیری ئایینی دادەماڵرێت، بۆ ئەوەی ئەم فیکرە سەرلەنوێ ببێتە مادەیەك کە شایانی وتوویژ و گفتوگۆکردن بێت، بەڵام ئەم کارە بەبێ تێپەڕبوون بە تەنگژەی خنکێنەری بزوتنەوە ئسوڵییەکان روونادات، کە هەوڵ دەدات ئەو حکومەتانەی بەسەریەوە باڵادەستن، چاودێری بەسەر ئینتەرنێتدا بسەپێنن، بێگومان ئەو هەوڵەش سەرنەکەوتووە، یاخود هەمان چەك بەکاربهێنرێتەوە، لە هێڵەکانی تۆڕی ئەلکترۆنی بۆ پەخش کردنی نامەکانی ئۆپۆزسیۆن. ئەگەرچی هەر چوونە نێو رووبەڕوو بوونەوەی فیکرییەوە، بۆ خۆی بەڵگەیەکی ڕوونە بۆ شکستهێنانی بزوتنەوەی ئسوڵی.

ئەمجۆرە تەنگژەیە رێگە بە بزوتنەوە ئسوڵییەکان نادات خۆیانی لێ لابدەن، تەنیا بە وازهێنان نەبێ لە بەسیاسیکردنی ئایدیۆلۆژیانەی ئاین، واتە رووبەڕوو بوونەوەی فیکر بە فیکر، نەوەك ئێستا بە توندوتیژی و تۆقاندنی فیکری. ئەگەر ئەو کارەش نەکرێت، بزوتنەوە ئسوڵییەکان رووبەڕووی تەنگژەیەکی توونددتری فیکری دەبنەوە. گرفتەکە ئەوەیە" بزوتنەوە ئسوڵییەکان هیچ ئاماژەیەك نادەن بۆ هەبوونی ئارەزووی خۆیان – نەك توانا – بۆ وازهێنان لە بەسیاسیکردنی ئایین، بەڵکو ئەم کۆمەڵانە زیاتر سوور دەبن لەسەر پەستان خستنە سەر حکومەتەکان بۆ سەپاندنی چاودێری لەسەر ئینتەرنێت، ئەم کارەش مەسەلەیەکە کە لە ماوەی چەند ساڵی داهاتوودا، مەحاڵ دەبێت.

## ئامادەیی سایکۆلۆجی بۆ بەریەککەوتن.. بێتوانایی لە گفتوگۆدا

دەرکەوتی سەرەکی لە تەنگژەی بیری ئیسلامی هاوچەرخدا، لەوەدا کورت دەبێتەوە کە بزوتنەوە ئسوڵییەکان ئامادەیی سایکۆلۆجییان هەیە بۆ بەریەککەوتنی فیکری و ئەوەی بەهۆیەوە لە پراکسیس کردنی کاری تیرۆری پەیدا دەبێت و بێتوانایی لە گفتوگۆکردن لەگەڵ (ئەویدیکە)دا، ئیدی موسڵمان بێت (نێر یان مێ) یاخود موسڵمان نەبێت. لە هەمان کاتدا ئەو بزوتنەوە ئسوڵییانە خاوەنی ئامێرە مادیی و فیکرییەکان نین بۆ رووبەڕوو بوونەوەی جیهانگیری کە مەسەلەی رووبەڕوو بوونەوەی بۆتە شتێکی حەتمی، بە تایبەتی لەگەڵ شێوە ئەمریکییەکەی، واتە ئەم بزوتنەوانە لە رەتکردنەوەی ئایدیۆلۆجی نزیکتر دەکاتەوە.

لەلایەکی دیکەوە، بزوتنەوە ئاینییە ئسوڵییەکان ناتوانن دوور لە جیهان کاربکەن، سەرەڕای ئەوەش کە توانایان نییە بە تەنیا گفتوگۆ بکەن، بەهۆی زمانە ئاینییە رەها و بڵندخوازەکەیانەوە وەك ئێستا لە ئارادایە. گرفتەکە ئەوەیە بزوتنەوەی ئسوڵی بەو زمانە بەرز دەفڕێت. ئەم کارەش بۆتە هۆی هەبوونی لایەنێکی لێکچوو لای خۆرئاوا، کە گفتوگۆ لەگەڵ ئەم بزوتنەوەیەدا رەتدەکاتەوە، بە ئەم لایەنەش دەڵێن: (قوتابخانەی دوورخستنەوەگەری) کە خۆرهەڵاتناسی ناسراو" برنارد لویس و مارتن ئیندیك و سامۆئیل هنتنگتۆن نوێنەرایەتی دەکەن، ئەم قوتابخانەیە پێشنیاری ئەوە دەکات: ئیسلام دوور بخرێتەوە (بەو پێیەی بزوتنەوەی ئسولی نوێنەری ئیسلامە)، ئەگەرچی قوتابخانەیەکی دیکە هەیە" (قوتابخانەی نزیك خستنەوەگەری) کە جۆن ئیسبۆزیتۆ و جیمس بیسکاتۆری(17) نوێنەرایەتی دەکەن، ئەم قوتابخانەیەش بانگەشە بۆ: لێکحاڵیبوون لەگەڵ دیاردەی ئیسلامی و شەڕنەکردن لەگەڵیاندا دەکات.

لە بەڵگەنەویستەکانی سەردەمی جیهانگیری:گەشەسەندنی بالادەستی رۆشنبیری خۆرئاواییە، لەسەر حسابی رۆشنبیرییە ئایینی و ناوخۆیی و نەتەوەییەکان. ئەوەش رۆشنبیرییە کە خاوەنی (زانیارییەکان) و هەموو ئامێرە پێویستیەکانی سیاسی و ئابووری و رۆشنبیری و تەکنیکییە، بۆ سەپاندنی پێدراو و چەمکەکانی جیهانگیری. لەبەرئەوە شتێکی لۆژیکی دەبێت کە رۆشنبیریی خۆرئاوایی رێگە نەدات بە ئەو رۆشنبیرییانەی دژ بە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییەکان و گفتوگۆی رۆشنبیرین و بالادەستی خۆیان لە رێگەی ئامێرە تیرۆرییەکانەوە پراکسیس دەکەن. گرانە ئێستا لەو باوەڕەدا بین" کە بزوتنەوە ئسوڵییە پەرگیرەکان واز لەو بیرە پەڕگیرە دەهێنن کە لە حوکمی فەقیهەکانەوە درێژ بوونەتەوەو ئێستا رۆڵی خۆیان لە ژیانی کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا، بە کاریگەرییەکی زۆرەوە پراکسیس دەکەن. وەك دەردەکەوێت هیچ چارەسەرێك بۆ ئەم گرفتە نییە، بێجگە لە دەست تێوەردانی حکومیی رێکخراو و بەهێز بۆ قرتاندنی نینۆکی بزوتنەوە ئسوڵییەکان. حکومەتە عەرەبییە موسڵمانەکان کە ناتوانن لە سەردەمی جیهانگیری گۆشەگیر بن (دابڕێن) بۆ ئەم چارەسەرە ناچار دەبن.

بێتوانایی دەروونی لە دامەزراندنی زمانی گفتوگۆکردنی لەگەڵ ئامادەبوونی دەروونییدا بۆ بەریەککەوتنی فیکری و مادی، بزوتنەوە ئسوڵییەکان زیاتر گۆشەگیر دەکات، ئەوەش بوار بۆ هێزە میانڕەوەکان دەڕەخسێنێت رۆڵی خۆیان لە بوژاندنەوەی سەردەمی رابوون – رێنیسانس – سەرلەنوێ بەدەست بێننەوە. بەو مانایەی کۆمەڵگە عەرەبییەکان پێویستیان بە نوێکردنەوەی رۆڵی شارستانیەتە بۆ کلتوری عەرەبی – ئیسلامی، بەجۆرێك لەگەڵ پێدراو و پێداویستیەکانی سەردەمی جیهانگیریدا بگونجێت. بەشێوەیەك کۆمەڵگە لەم پرۆسەیەدا بەشداری بکات، لەسەر هەردوو ئاستی حکومی – رەسمی – و میللی.

لە سەردەمی جیهانگیریدا، کە جیهان بۆ یەك گوندی گەردوونی دەگۆڕێت، بوار بۆ هەڵبژاردن نامێنێتەوە، بەڵکو تەنیا یەك رێگە هەیە بۆ چوونە پاڵ ئەم سەردەمە، یاخود گۆشەگیری و بەتەنیا مانەوە. لەم گوندە گەردوونییەشدا" ئایین بۆ رێکخراوێکی فیکری دەگۆڕێت کە بە تاکگەرایی و گشتگیری و زمانی بڵندخوازی نامێنێتەوە، بەڵکو شتێکی گرانە ئایین بە تاکە سەرچاوەیەکی بڵندخوازی وێنا بکرێت و چاوگەکانی دیکەش فەرامۆش بکرێن. بێگومان ئەم بارودۆخە هەڕەشە لە دانانی یاسایی (تشریع) ئایین دەکات، ئەو (تشریع)ەی ئێستا لە گۆڕێدایە، بە تایبەتی ئەوەی بە ئازادیە فیکری و مەدەنی و دیموکراتی و مافەکانی ئافرەتەوە بەندە، جگە لەو هەڵوێستەی بەرامبەر رۆشنبیرییەکانی دیکەش هەیە.

گومان لەوەدا نییە سەرچاوەی (مەرجعیەتی) ئایینی هاوچەرخ، کە لەسەر حوکمەکانی فەقیهەکان و دیدی تەسك و توندڕەو بۆ مەسەلە جیاوازەکان دامەزراوە، لە سەردەمی جیهانگیریدا ئەو تەوژمەی خۆی لەدەست دەدات، نەك تەنیا لەبەرئەوەی زمانەکەی سوودبەخش نییە، بەڵکو لەبەرئەوەی بووە بە کۆتێك لەبەردەم بەگژداچوونەکانی سەردەمی جیهانگیری. چونکە ئایین لە خودی خۆیدا لە ژێر سایەی هەژموونی بزوتنەوە ئسوڵییەکان، بە گرفتێك دادەنرێت، بە هۆی هەژموونی تاکلایی (الأحادیة)، لە سەدەیەکدا کە دان بە تاکلایی نانێت.

## کۆتایی

تەنگژەی بیری ئیسلامی هاوچەرخ لە جەوهەردا یەك تەنگژەیە، لە ئاراستەکانیدا فرە لایەنە، جەوهەرەکەی لە هەبوونی زمانێکی ئایینی رەهای سەرتاپایی یەکلایی بڵندگەرایی و زێدەڕۆیدا خۆی دەنوێنێت، لە سەردەمێکی نوێدا کە دانانی زمانی ئایینی بە تاکە سەرچاوەیەك رەتدەکاتەوە، مانای ئەمەش نکوڵی کردنی ئایین لە ژیاندا نییە، هێندەی مانای کۆتایی هاتنی رۆڵی ئاینە لە دانانی یاسا (تشریع)ی مەدەنی و ژیانی کۆمەڵگەی مەدەنی بەستنەوەی بە رەهەندی کەسێتی مرۆڤەوە. کۆمەڵی موسڵمان رووبەڕووی ئەم بارودۆخە سەختە دەبێتەوە. سەردەمی جیهانگیری داوا لە کۆمەڵگەی موسڵمان و لە بزوتنەوە ئسوڵییەکان ناکات واز لە ئایین بهێنن، ئەوە کارێکی مەحاڵە، بەڵام داوا دەکات و لە قۆناغەکانی داهاتوودا ئەوە دەسەپێنێت کە زمانی ئایینی زمانێکی رۆشنبیری بێت و شایانی ئەوەبێت/ توانای هەبێت مامەڵە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بکات. ئەمەش بۆ خۆی پێویستی بە وازهێنان هەیە لە زۆربەی راوبۆچوون و ئەو حوکمە فیقهیانەی کە ئێستا هەن، بەڵکو پێویستی بە بنیادنانی زمانێکی نوێ و خستنەڕووی حوکمە ئاینییە نوێیەکان هەیە، کە بە کۆشش و بەشداری کردنی هەمووان لە راو گفتوگۆ کردن لە نێوان هەمووواندا بەرهەم دێت، چونکە نابێت ئایین لەلایەن فەقیهەکانەوە قۆرخ بکرێت.

لەبەرئەوە، هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی تەنگژەکە، پێویستی بە رۆحێکی نوێ و تێگەیشتنێکی نوێ لە ئایین هەیە. هەبوونی ئەو فتوایانەش کە ئێستا لە ئەشکەوتی رابردوودا بڵاوبوونەتەوە – هەروەك (مەحمود ئەمین ئەلعالم) لەو بڕوایەدایە، لە سەردەمی جیهانگیریدا و بەبڕوای زۆر کەس سەدەی بیست و یەك سەدەی ئافرەت دەبێت، بەرگەی ئەو بڕوا ئاینییە ناگرێت کە لەو بڕوایەدایە" کاری ئافرەت کارێکی ناشایستەیە، دەنگی ئافرەت و رووی ئافرەت (عەورەتە) و ئەرکە بنەڕەتییەکەی ئافرەتیش ئامادەکردنی خواردن و خواردنەوەیە، بگرە بە بۆچوونی ناوبراو بڕوایەکە دژ بە سەردەمی جیهانگیرییە.

لەبەرئەوە، سەردەمی جیهانگیری پێویستی بە دەربازبوونی مرۆڤی موسڵمانە لە ئەو حاڵەتە دوولایەنە (إزدواجیة) کە تیایدا دەژی، بە هۆی کاریگەری بیری ئاینییەوە، بە شێوەیەك کە مامەڵە لەگەڵ هەموو بارێکی ژیاندا بەشێوەیەکی دوولایەنە دەکات، وەك ئاشکرایە.

زۆر بە کورتی" سەردەمی جیهانگیری پێویستی بە رۆحێکی نوێیە، پێویستە ئێمە وەك موسڵمان ئەو رۆحە نوێیەمان هەبێت، تاوەکو بتوانین مامەڵە لەگەڵ ئامێرەکانی ئەم سەردەمەدا بکەین

## پەراوێزەکان

1–بڕوانە راگەیاندنی ئەمینداری گشتی ئەنجومەنی باڵا بۆ کاروباری ئیسلامی، مامۆستا محەمەد ئیبراهیم ئەلفەیومی، لە (رای گشتی) – کوەیت – 1998/1/25، کاتێك ووتی: "خۆرئاوا لە بەئاگاهاتنی ئیسلامی دەترسێت، تاوەکو لە هەڵمەتی (خشینی – زحف) ئیسلامی نەتاسێت" بێگومان ئەمجۆرە راگەیاندنانە لە ساڵی 1998دا پەیدانەبوون، بەڵکو وێناکردنە ساویلکە و جێگیرەکان لەوەدا کە: ئیسلام جێگرەوەی هاوچەرخی کۆمۆنیزمە لە سەردەمی جیهانگیریدا، پێش ئەم راگەیاندنانە کەوتوون.

2–القبس – کوەیت – 1998/1/3.

3-بڕوانە د. محەمەد عابد ئەلجابری: مەسەلەكانی بیری هاوچەرخ، مركز دراسات الوحدة العربية، لاپەڕە 90-91.

4-Peter Beyer, Religion and Globalization, P.S.

5-هیشام شەرابی: رەخنەی ژیاریی لە كۆمەڵگەی عەرەبی، لاپەڕە 27.

6-هەمان سەرچاوە، لاپەڕە 9.

7-هەمان سەرچاوە، لاپەڕە 9.

8-ئەوەیە كە لە كتێبەكانی (سەید قطب)دا هاتووە، بەتایبەتی لە كتێبەكەیدا (جیهانەكان بەڕێوەن). وە ئەدەبیاتی بزوتنەوەی ئیسلامی پڕە لە لاوازكردن و بریندار‌كردن دەربارەی بیرۆكەی نەزانینی كۆمەڵگەی موسڵمانی هاوچەرخ و بیرۆكەی حاكمێتی.

9-نموونەكان لەوە زۆرترن لە بژمێردرێن، سەرەتا لە حاڵەتی (نەسر حامد ئەبو زەید) و كوشتنی (فەرەج فودە) و تاوەكو دەگاتە دەستدرێژی كردنە سەر (نەجیب مەحفوظ) و دادگایی كردنەكانی رۆشنبیران و بەندكردنیان. بڕوانە (ئەلمنصف بن عەبدولجەلیل): "بۆ بەرگری كردن لە مافی پاشینە". تۆژینەوەیەكە لە كۆنگرەی (موسڵمان لە مێژوودا) بڵاوكراوەتەوە. الدار البيضاء – 1999. لاپەڕە 51-72.

10-peter Beyer, ibid, P.S.

11-بڕوانە: ئەلجابری، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە 153.

12-بڕوانە رای نووسەری ئەڵمانی (جیهارد) لە (القبس)دا، كوەیت: 1997/12/7.

13-بڕوانە خستنەرووە باوەكەی – تەقلیدییەكەی (محەمەد عمارە) دەربارەی مافەكانی مرۆڤ لە ئیسلامدا، كە لە (المجلس الوطني للثقافة و الفنون و الآداب – الكويت) دەرچووە. هەروەها (راشد ئەلغنوشی): ئازادییە گشتییەكان لە دەوڵەتە ئیسلامییەكاندا، كە لە (مركز دراسات الوحدة العربية) دەرچووە و تیایدا سادەكارییەكی هەژارانەی بۆ ئەقڵانییەت و لۆژیك كردوە، بۆ بابەتی ئازادی باوەڕ، لاپەڕە 44-46.

14-كوەیت خراپترین نموونەیە لەم بابەتەدا، بەو پێیەی هەر لە ساڵی 1963 وە وڵاتێكی دەستورییە، ئافرەت تیایدا هێشتا لە مافە سیاسییەكانی بێبەشە، بەهۆی پەستانی تەوژمی ئسوڵییەوە، كە توانیویەتی هێزەكانی بە راوبۆچوونە ئاینیەكان پڕ چەك بكات بۆ خستنی پرۆژەی یاسای مافی سیاسی ئافرەت لە پەرلەماندا ساڵی 1999.

15-زنجیرەی (الهدى و النور) ژمارە -5-، دابەشكردنی كۆپی ئەم فتوایانەش لە مزگەوتەكانی كوەیتدا بە ئەنجام گەیەنرا، (الطابعة) 1/28 – 1998/2/10 – كوەیت. شایانی باسە كۆمەڵی پێشینەیی – السلفية – كوەیتییەكانیان بانگهێشت كرد بۆ گۆڕینی (سەتەلایت)ەكان بە یەخچاڵ یان جل شۆر – غسالة – لەسەر حسابی (خەرجی) ئەم كۆمەڵەیە، ئەویش دوای ئامادەكردنی (سەتەلایت)ەكە بۆ ئەنجومەنی پێشینەیی و وردوخاشكردنی لەبەردەم هەمواندا.

16-بڕوانە (ئەلفرێد فالارلۆ)، نووسین لەسەر كتێبی (سەدەی بیست و یەك دەبێتە سەدەیەكی ئەمریكی) القبس، كوەیت: 1998/1/23.

17-بڕوانە خستنەڕووی كورتی راپۆرتێكی (مایكل سالا) كە لە (*The World Quarterly*) بڵاوی كردۆتەوە، دەربارەی ئایندەی پەیوەندی ئیسلام بە سیاسەتی دەرەكی و بزوتنەوە ئیسلامییەكانەوە، كە لە گۆڤاری (المجتمع) – كوەیت و لە 1998/1/27 بڵاوبۆتەوە.

## سەرچاوە

گۆڤاری (النهج) – ژمارە (29) – زستانی 2002 – لاپەڕە (6-19).

# دەوڵەت – نەتەوە ناکامەکان و ئاسایشی نێودەوڵەتی

له عەرەبییەوە: دلاوەر عەبدوڵڵا

## دەستپێك

دەوڵەت – نەتەوەکان بە هۆی لاوازیان لە دەستەبەرکردنی بەهای سیاسی پۆزەتیڤانە بۆ دانیشتوانەکانیان دوچاری شکست دەبن. حکومەتەکان شەرعیەتی خۆیان لەدەستدەدەن و، دەوڵەت– نەتەوەکان زۆرینەی ڕوو لە زیادبوونی هاولاتیانەوە وەك ناشەرعی خۆی دەنوێنێت. لە ئێستادا دەتوانرێت تەنها ژمارەیەکی کەمی ئەو(191) دەوڵەت–نەتەوانەی جیهان بە شکست خواردوو یان هەڵوەشاو، کە دواین قۆناغی تێکشکانە، دابنرێت، بەڵام چەندی وڵاتانی دی لاواز بەشێوەیەکی جدی ئامادەن بۆ تێکشکان. لێرەوە کە دەوڵەتە ناکامەکان زەمینەو پەناگەیەکی باشن بۆ گەمەو بازی نارەسمی و جەنگ سالارەکان و تیرۆریستان، ناسینی فاکتەرەکانی تێکشکاندنی دەوڵەت– نەتەوەکان لە نێو جەنگی دژە تیرۆریزمدا گرنگیەکی سەرەکی هەیە. سەرئەنجام بەهێزکردنی دەوڵەت– نەتەوە لاوازەکان لە جیهاندا، کە زۆردەبن بۆتە پێداویستیەکی گرنگ.

## پێناسەی دەوڵەتی شکست خواردو

دەوڵەتە تێکشکاوەکان پڕن لە ململانێ، دەرگیری، مەترسی، گروپی جەنگخوازو مەیدانی کێشمەکێشی تاڵن. لە زۆربەی دەوڵەتە تێکشکاوەکاندا هێزە دەوڵەتیەکان دووچاری جەنگ دژ بە شۆڕشێکی چەکداریی بوون، کە لە ژێر سایەی یەك یان چەند ڕابەرێکدا ئالای دژبە زۆرداریيان بەرزکردۆتەوە. لە دەوڵەتێکی تێکشکاودا هەندێکجار دەسەڵاتدارە ڕەسمیەکان ڕووبەڕووی چەند شۆڕشێك، جۆرەها نائارامی ناوخۆیی، ئاستی جۆراوجۆری نارەزایی گروپە لۆکاڵەکان و نەیاران دەبنەوە، کە دەوڵەت و گروپەکانی هەناوی دەبنە ئامانج. ئەو جیاکەرەوەیەی دەوڵەتێکی تێکشکاو دیاریدەکات زەبری ڕەهای توندوتیژی نییە، بەڵکو

تایبەتمەندییەکە وەك پایەداری توندوتیژی(وەك ئەنگولا، برۆندی، سودان) کە بە سەنترالّی بوونی ئەو توندوتیژییە دژ بە دەوڵەت یان ڕژێمی دەسەلاّتدارو جیابوونی داخوازییە سیاسییەکان یان جیوگرافییەکان بۆ بەشداریکردنی دەسەلاّت یان بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی، کە پیادەکردنی ئەو جۆرە توندوتیژییە ئاڕاستە دەکات یان بەڵگەداتاشینی بۆ دەکات. کاتێك کە توندوتیژی کتومت بۆ جەنگێکی ناوخۆ بگۆڕێت ئاستی گوزەران بە جۆرێکی بەرچاو دوچاری ئافات دەبێت. داتەپینی ژێرخانی ژیانی ڕۆژانەو بەرچاوتەنگی دەسەلاّتداران، لەبیرکردنی ئەو بەرپرسیارێتیەی لە هەمبەر خەڵکی و دەوروبەر هەیانە دەبێتە سایەیەکی ڕەش و بەسەر دەوڵەت-نەتەوەدا دادەکشێت.

جەنگە ناوخۆیەکان کە تایبەتمەندییەکی دەوڵەتی تێکشکاوە بە جۆرێکی ئاسایی دوژمنایەتی نەژادی، مەزهەبی، زمانیی یان جیاوازی دی لەنێوان گروپە لۆکاڵەکاندا دەچێنێت. ترس لە (ئەوی دی) کە دەبێتە سەرەتای هەموو ئەو پێکدادانە نەتەوەییانە مومکینە ببێتە داینەمۆو بزوێنەری زیاتری دەرگیری نێوان گروپە دەسەلاّتدارەکان و پاشکۆ بێبەشەکان. پارێزەکاری و سوودبردنیش زیاتر دوژمنایەتی قووڵ دەکاتەوە، بە تایبەتی لە کاتێکدا کە دۆزینەوەی سەرچاوەی نوێو زۆرجار گفتوگۆکردن دەربارەی سامان لە جۆری دەبۆی پەترۆڵ یان کانزای ئەڵماس گەشە بەم بەرچاوتەنگیە دەدات. لە هەموو دەوڵەت-نەتەوە تێکشکاوەکاندا ناهەماهەنگی لە نێوان گروپە لۆکاڵەکاندا بوونی هەیە. دەربارەی ئەم واقیعەش کە زۆر لە دەوڵەت-نەتەوە لاوازەکان لەناوخۆیاندا داراو نەداریان هەیەو، هەندێك لە دەوڵەتە نوێترەکان پێکهاتەیەك لە ناچوونیەکی بەربەستە نەتەوەیی، مەزهەبی، زمانیەکان ئەمانە بەیەکێك لە فاکتەرەکانی تێکشکان دادەنرێت، بەلاّم بە فاکتەری بنەڕەتی دانانرێت. بە واتایەکی دی لە بنەڕەتدا تێکشکان بەهۆی لاوازی لە ئەفراندنی نەتەوە لە ناخی گروپی نەتەوە نەژاد جیاوازەکان، یان بەهۆی زۆرداری گروپی زۆرینە بەسەر کەمینەدا پێکنایەت، هەرچەند کە دڕندەیی لەو جۆرەش بە شێوەیەکی ئاسایی فاکتەری سەرەکیە بەرەو تێکشکاندن.

دەوڵەتە تێکشکاوەکان بە پێچەوانەی دەوڵەتە بەهێزەکانەوە توانای کۆنترۆڵکردنی سنورەکانیان نییە. کۆنترۆڵی هەندێك لە بەشەکانی قەڵەمڕەوەکەیان لەدەستدەدەن. پیادەکردنی دەسەلاّتی ڕەسمی ئاساییانە بە پایتەخت یان چەند ناوچەیەکی تایبەتەوە سنوردار دەبێت. لە ڕاستیدا یەکێك لە پێودانگەکانی هەڵسەنگاندنی هاوکێشەی تێکشکانی دەوڵەتێکی خاوەن جیوگرافیایەکی فراوان پێڕاگەیشتنی دەسەلاّتی دەوڵەتی سەنتەرە بەسەر ناوچە گوندییەکان، ڕێگاوبانەکان و دەریاکان، کە تاچەند ڕاستەقینەیە؟ بەڕاستی کێ بەسەر وڵات و بەتایبەتی ناوچە دوورە دەستەکاندا فەرمانڕەوایە؟ لە زۆر ڕووەوە دەوڵەتە تێکشکاوەکان هاوڵاتیانی دەکاتە قوربانی ململانێ نەتەوەییەکان، یان ململانێی دی نێوان گروپەکان، یان نائارامیەکانی ڕژێم. بەهەمان شێوەی کە لە (زایر) لە خولی سەردەمی (مۆبۆتۆسیسەکۆ)، یان لە ئەفغانستان لە سەردەمی حکومەتی تالیبانەکاندا بینیمان گروپی دەسەلاّتدار چەندە زیاتر زۆرداری لە هاوڵاتیان بکات، ئەوەندە لەلایان وەك زۆردار دەردەکەون. ئازاریان دەدەن و تەنها پارێزگاری لە دەستەبژێرێکی کەم دەکەن. یان وەك زایر، ئەنگولا، سیرالیۆنی سەردەمی (سیاکائیستونس)، یان لە سودان لە سەردەمی دەسەلاّتی (حسن الترابی)ی

پـێش سـاڵی (2001)ی حکومـەتی باوکسـالاری وەسـتاو لەسـەر پاراسـتنی دەشـتەبژێر، کـە لـە هاوڵاتیانی ئاساییەوە سەرچاوەکانی دابین دەکات. بـەو جـۆرەی ئـەم شـێوە زۆرداریانـە لەلایـەن دەسـەڵاتدارانەوە بـە ڕەوا دادەنرێـت، دەبێتـە هـۆی سەرهەڵدانی کاردانەوەی پێچەوانەی گروپەکان، یان شۆڕشێکی نوێ سەرهەڵبدات و، دەوڵەتی لاوازیش بەرەو هەڵدێری تێکشکان لێژدەبێتەوە.

لـە دیاردەکـانی دی دەوڵـەتی تێکشـکاو پەرەسـەندنی توندوتیـژی تاوانکارانەیـە. هەرچـەند توانـای دەوڵـەت زیـاتر لاوازبێـت و بـەرەو تێکشـکان هـەنگاو بنێـت، بـەهۆی زۆرداریکردنـی لـە هاوڵاتیـان دەبێتـە تـاوان پیشـە، بێیاسـایی گشـتی ئاشـکراتر دەبێـت. دارودەسـتەکان و گروپـە تاوانکارەکـان کۆنترۆڵی شەقامەکانی شاردەکەن. قاچاخچێتی چەك و مادەسـڕکەرەکان بڵاودەبنـەوە. هێـزی پۆلیسـی ئاسایی دوچاری ئیفلیج بوون دەبێت. ئاشوب هەموو شوێنێك دەتەنێت. ئاساییە کە لە هەلومەرجێکی لەو جۆرەدا هاوڵاتیان بۆ پاراستنی گیانی خۆیان پەنا بۆ جـەنگ سالارو کەسە بەدەسەڵاتەکانی دی ببـەن، کە دەم لە یەکێتی نەتەوەیی و خێڵەکیەوە دەدەن. تا لەو کاتـەدا کـە دەوڵـەت لـە حاڵـەتی هەڵوەشـاندنەوەدایە بتوانن نوێنەری هێزبن.

هەرچی کەمتری لانی کەمی بەها سیاسیەکان:

دەوڵـەت نەتـەوەکان بـۆ دابینکردنـی بـەها سیاسـیەکان بـۆ هاوڵاتیـان لـە جـۆری ئاسـایش، پەروەردە، خزمەتگوزاری تەندروستی، هەلی ئابوری، پاراسـتنی ژینگـە، پێویسـتی بـە دامەزرانـدنی چوارچێوەیەکی ئاسایی هەیە بۆ بەرقەرارکردنی نەزم و سیسـتمێکی دادوەری بـۆ پیـادەکردنی‌و، زامنکردنـی دامـەزراوەی سـەرەکی ژێرخـان وەك ڕێگاوبـان و ئاسـانکاری پەیوەنـدیگرتن. دەوڵەتـە تێکشکاوەکان ئەم ئیلتزاماتانە دەخەنە ژێرپێوە. لـە بەرامبـەر جـەنگ سـالارو گەمـەکارە ناڕەسمیـەکانی دیـدا ڕۆژبـەڕۆژ کارامـەییان وەك دابینکـاری بـەها سیاسـیەکان لـە دەسـت دەدەن. بـە واتایـەکی دی، دەوڵەتی تێکشکاو ئیدی ناتوانێت، یان ئارەزووی لە جێبەجێکردنی فەرمانـەکانی دەوڵـەت- نەتەوەیـەکی مۆدێرنانـە لـە جیهانـدا نییـە. دەوڵەتـە تێکشـکاوەکان توانـای بەرقـەرارکردنی ئاسـایش-گـرنگترین و بنـەڕەتیترین ئیلتیزامـی سیاسـی- لـە هـەموو قەڵەمڕەوەکەیانـدا نییـە. هاوڵاتیـان لـە پێنـاوی دابینکردنـی ئاسایشـی خۆیـان و هـەڵاتن لـە تـرس هاوبەنـدی دەوڵـەت و حکومەتـە سـەنترالیەکانن. لێـرەوە کـە دەوڵـەتی ڕوولـە تێکشـکان توانسـتی دەستەبەرکردنی فەزایـەکی ئـارامی لـە سەرانسـەری وڵاتدا نییەو، بە دەگمەن دەتوانن دەسەڵاتی دەوڵـەت لـە دەرەوەی پایتـەخت پیادەبکـەن، تێکشـکانیان بێچەندوچـوون دەبێـت و، تەنانـەت پـێش ئەوەشـی گروپـە شۆڕشـگێڕەکان و بـاقی دانیشـتوانی شـارە گـەورەکان ببنـە هەڕەشـەو بەسـەر ئـەو هێزانـەدا کـە ورەیـان لەدەسـتداوە سـەربکەون دەوڵـەت تێکدەشکێت. بەهـەمان شێوە کە لـەم دواییانـەدا لـە لیبریاو سیرالیۆن ڕوویدا.

دەوڵەتە تێکشکاوەکان دامەزراوەی لاواز یان پڕ کـەموکورتیان هەیـە، بـەو واتایـەی کـە دامـەزراوەی ڕاپەڕانـدن تـەنها فـەرمانی خـۆی جێبەجێـدەکات. دامـەزراوەی یاسـادانان گـەر هەشـبێت لـە سـنوری دەستوری ئیمزا کردن و بە تـەواوی تەشریفاتیدایەو لەژێر کۆنترۆڵی دامـەزراوەی ڕاپەڕاندندایـە. نـەبوونی لێکۆڵینـەوەی دیموکراسـیانە بـە جـۆرێکی بەرچـاو دەبینرێـت. دەسـەڵاتی دادوەری سـەربەخۆیی نییـەو سەر بەدەسەڵاتی باوەو، هاوڵاتیان دەزانن لە پێنـاوی گەڕان بەدووی چارەسـەر یان هـەلی گـرنگ بەتایبـەتی

گەر بە زیانی دەوڵەت تەواوببێت ناتوانن پشت بە سیستمی دادوەری ببەستن. بیرۆکراسیەت لە کۆنەوە هەستی وەڵامدانەوەی پڕۆفیشناڵیانەی خۆی لەدەستداوەو، تەنها بۆ جێبەجێکردنی دەستورەکانی دەسەڵاتی زۆردارانەی باوی بەسەر هاوڵاتیاندا بە شێوەیەکی دڕندانە لە ئارادایە. لەوانەیە سوپا تاکە دامەزراوە بێت کە هەموو خودێتی خۆی پاراستبێت، هەڵبەتە هێزەکانی دەوڵەتی تێکشکاو ئاساییە زۆر سیاسین و ئەو ڕۆحیەتی کە سەردەمانێك خۆیان پێوە دەنواند لەدەستداوە.

لە تایبەتمەندیەکانی دەوڵەتانی ناکام دامەزراوەی ژێرخانی وێرانەیان ڕوو لە داتەپینە. وەك خوازە دەوترێت (چەندە کەندوکۆسپی ڕێگاوبانەکان زیاتربن، ئەگەری تێکشکانی دەوڵەت زیاترە) چونکە دەسەڵاتداران خەزێنەکانی دەوڵەت بەتاڵ دەکەن. بڕێکی کەمتر لە پارەی تەرخانکراو لە دەرامەتەکانی پایتەخت دەگاتە دەستی بەرپرسان لە کاروباری ڕێگاوبان و چاودێریکردن یان ڕاکێشانی هێڵی شەمەنەفەر بۆ شوێنە دووردەستەکان گرنگییەکی کەمترو کەمتری پێدەدرێت. لە هەندێك وڵاتانی وەك کۆماری دیموکراسی کۆنگۆ تەنانەت چاککردنی ڕێگای ئاوی و گەیاندنی کۆمەکە گرنگەکانی ژیان پشتگوێ دەخرێت. لەو ناوچانەدا کە هێشتا تۆڕی تەلەفۆن لە دەستی دەوڵەتدا بێت، ناکارامەیی سیاسی و ئابوری لە وێنەی تازەکردنەوە، چاودێری، سەرمایەگوزاریو پەیوەندی بیرۆکراسیانەی تێدا دەبینرێت. بڕینی پەیوەندی و چەند جارەکردنەوەی ژمارەیەك بۆ یەك پەیوەندی سادە،چاوەڕوانی دادوبێداد بۆ چاککردنەوە یان گەیاندنی خزمەتگوزاری ڕووداوی ڕۆژانەن. لە حاڵەتێکدا کە دامەزراوە دەوڵەتیەکان مۆڵەتی نوێکردنەوەی هێڵی تەلەفۆن و بواری خزمەتگوزاری مۆبایل بە کۆمپانیای تایبەت بدەن، ئەگەر هەیە کە هێڵە کۆنەکانی ژێردەستی دەوڵەت ببوژێننەوە. لە دەوڵەتی بێحکومەتی وەك(سۆماڵ)دا سیستمی نوێکردنەوەی تۆڕەکانی مۆبایل کاریگەرە.

لە دەوڵەتە تێکشکاوەکاندا سیستمی پەروەردەو تەندروستی شایستە بوون بە شتێکی تایبەت(سەرئەنجام ژمارەیەکی بەرچاو قوتابخانەو کلینیکی چارەسەرکردنی گوماناوی لە شارەکاندا بڵاودەبنەوە)یان زۆر نابووت و لاوازن و دابەزیوون بۆ ئاستێکی نزم. موچەی مامۆستایان، پزیشکان، پەرستار و فەرمانبەران درەنگ دەدرێت، یان هەر نادرێت. دەوام نەکردن لە کارکردندا پەرەدەستێنێت. کتێبی خوێندن و داودەرمانی پێویست دەبنە شتی دەگمەن. دەستگاکانی ڕادیۆلۆژی چاك ناکرێنەوە. ئەو سکاڵایانەی دەگەنە وەزارەتە تایبەتەکان بێ وەڵام دەمێننەوە. دایك و باوکان، مامۆستایان، نەخۆشەکان-لە توێژی گوندنشینەکان- وردە وردە لەوە تێدەگەن کە دەوڵەت پشتگوێی خستوون و، بە هێزە سروشتی و توانا ئاساییەکانی (غەریزەییەکانی) خۆیانی سپاردون. لە هەندێك لە دەوڵەتە-نەتەوەییە لێکدابڕاوەکانی وەك سودان خزمەتگوزاری پێویست تەنها بۆ هەندێك لە خەڵکی ئاستە بەرزەکان فەراهەم دەکرێت(باکوری سودان)و بۆ نیوەی دی کە بوونەتە قوربانی جەنگ هیچ کۆمەکێك لە ئارادا نییە. هەڵبەتە لە زۆر ڕووەوە دەوڵەت-نەتەوەی لاواز لە بەرامبەر هەموو ڕاپەڕاندنێکی ئەرکەکانیدا بێتوانایە. ئاستی خوێندەواری نزم دەبێتەوە، مردنی کۆرپەو منداڵان زیاد دەکات، نەخۆشی بە جۆرێك پەرەدەستێنێت کە دامەزراوە تەندروستیەکان ناتوانن بەرگری بکەن. ئاستی گوزەران نزم دەبێتەوەو ئافات نەهامەتی

ڕۆژبەڕۆژ خراپتر دەبێت. دەوڵەتی تێکشکاو هەلی ئابوری نایەکسان، هەڵبەتە بۆ ژمارەیەکی دیاریکراو لە خەڵك فەراهەم دەکات، ئەوانەی کە لە کەسی دەسەڵاتداربن یان دەسەڵاتی ئۆلیگارشی نزیکن دەوڵەمەند و زەنگین دەبن، بەڵام هاوشێوە بەدبەختەکانیان لەبرساندا دەمرن. بە کڕین و فرۆشتنی زەوی، دەڵاڵبازی و بەئاگابوون لەو دەستکەوتانەی کە بە ڕێکوپێکی دەخرێنە بەرنامەوە دەتوانن سودێکی زۆر بەدەستبهێنن. بەڵام کاتێك کە هەموو شتێك ڕوو لە نەهامەتی دەکات تازیار (امتیاز)ی بەدەستهێنانی دراو تەنها لە پشك و لەژێر پارێزگاریکردنی دەستەبژێرانی دەسەڵاتدایە، یان ئەوانەی لە دەرەوەی کارێك مەیسەر دەکەن. بەرپرسیارێتی دەوڵەت– نەتەوە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی دەرامەت و خۆشبەختی هەموو هاوڵاتیان، ئەگەر لە بنەڕەتدا هەبێت، بەئاشکرا نادیدە دەگیرێت.

گەندەڵی لە دەوڵەتە تێکشکاوەکاندا پەرەدەستێنێت و ئاساییە بە ڕێژەیەکی نادیار تێکدان لەئارادایە. گەندەڵی لە جۆرەکانی گەورەو بچوك بڵاوە. بەرتیل خواردن لەسەر ئاستی جیاواز لەهەر مەیدانێکدا کە مامەڵەی تێدا بکرێت هەیە، لەوانە هێنانی دەرمان، کتێبی خوێندن، پڕۆژەی ئاوەدانکردنەوە و ڕێگاوبان و بیناسازی. مۆڵەتی ئەنجامدانی کاری بازرگانی هەیەو نیشە. بەدەستهێنانی بەڵێن لە گروپی دەسەڵاتدار بۆ سەرمایەگوزاری تایبەتی و باجی بە زۆر پەرەدەسێنێت. دەستەبژێرە گەندەڵەکانی دەسەڵات سەرمایەکانیان نەك لە ناوەوە بەڵکو لە دەرەوە دەخەن گەڕ. ژمارەیەك لەوانە بە موڵکی دەوڵەت کۆشك و شوێنگەی ڕازاوە دروستدەکەن. ئەفسەرانی سوپا هەمیشە لەم دەوڵەتە پەندەڵانەدا سوودمەند دەبن و، وەك دەسەڵاتدارانی دی نانیزامی ئەم سەرچاوە نامەشروعانە دادەدۆشن.

یەکێك لە ئاماژەکانی تێکشکان–نەك بەڵگەی ئەوەیە–نزمبونەوەی ئاستی بەرهەمهێنانی ناوخۆی نەتەوەیی‌و باجە. ئاماژەی ئاماری زۆرترینی دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکان لە حاڵەتی شۆکدایە، بەڵام ڕێژەی بەرهەمی ناوخۆیی دەوڵەتە تێکشکاوەکان– بەتایبەتی ئەو دەوڵەتانەی پشت بە سەرچاوەی سروشتی زۆرو زەوەند دەبەستن– هەلومەرجێکی خراپتریان هەیە. ڕێژەی گەشەی ساڵانە شتێکی ئەوتۆنیەو، جیاوازی نێوان ئاستی گوزەرانی دەوڵەمەندو هەژاران زۆر بەرزە. کەمی بودجەی ڕەسمی (کە لە زیمبابۆی لە ساڵی 2001 بە سی لە سەدای بەرهەمی ناوخۆیی گەیشت) هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ خەرجی دەستبڵاوانەی ئاسایش و، بەتاڵکردنەوەی خەزێنەکان لەلایەن دەستەبژێرەکانەوە. لەگەڵ هێرشی نوخبەکانی دەسەڵات بۆ سەر بانکی سەنتراڵی‌و چاپکردنی دراو هەڵئاوسان فراوانتر دەکات. سەرئەنجام ئەم نائارامیە ئابوریە، کە ئاساییە دەسەڵاتداران بۆ زیاتر و زیاتری سوودمەندبوونی خۆیان و چەسپاندنی دەسەڵاتی سیاسی و ئابوریان دروستی دەکەن، بۆ سەرمایەگوزارانی دەستنیشانکراوی ڕژێمی دەسەڵاتدار دەبێتە سەروەت و سامانێکی بێهاوتاو، قاچاخچێتی بڵاودەبێتەوە. کاتێك کە سەردەمی تێکشکانی دەوڵەت کامڵ دەبێت دراوی نەتەوەیی بێبەها دەبێت، یان یەك دراو یاخود چەند دراوێك جێگای دەگرێتەوە. دراوگۆڕەرەوە(سەراف)ی یاسایی و نایاسایی لە هەموو کوچەو کەلەبەرێکدا هەن و، دەڵاڵبازی دەبێتە چالاکی نەتەوەیی ڕۆژانە.

لە هەندێك شوێندا، بەتایبەتی لەکاتی ڕوودانی ئافاتی سروشتی، بەڵای ئابوری و گوماناوی، کە لە

نێو دەوڵەتی تێکشکاودا بڵاوە، دەبێتە هۆی کەمی خۆراك و بڵاوبوونەوەی برسێتی-تەنانەت تا سنوری گرانیو پەنابردن بۆ کۆمەکی مرۆڤدۆستانەی نێو دەوڵەتی بۆ بەرەنگاربوونەوەی- ئافاتی سروشتی دەتوانێت ئەو دەوڵەتانەی تێکنەشکاون بەڵام لە ڕیزی دەوڵەتە لاوازەکانی جیهانن و لە حاڵەتی گەشەکردندا نابووت بکات. بەڵام لە کاتێکدا کە دەسەڵاتی زۆردارانەو دەستەبژێرانی دەسەڵات ئاگایانە گوانی دەوڵەتیان دادۆشیبێت، ئافاتی سروشتی پێشبینی نەکراو یان جەنگە دەستکردەکانی مرۆڤ دەتوانن ئەو خەڵکانەی کە نادیدە گیراون بەرەو لێواری قاتوقڕی کێش بکەن. کاتێك کە خەڵکی هۆکاری گوزەرانیان یان سەرچاوەی دەرامەتیان لەدەست بدەن بێلانەو بێپشتیوان و لاوازو بێبەش دەبن و، دواجار دەچنە ناو بازنەی بێکۆتایی کۆچکردن و کۆڵبەکۆڵییەوە. دەوڵەتانی تێکشکاو تۆڕی بیمەی کۆمەڵایەتیان نیەو تاکە هەژارو بێلانەکان دەبنە وابەستەی هەر کەسێك کە بتوانێت خۆراك و شوێنی نیشتەجێبوونیان بۆ دابین بکات. دەوڵەت-نەتەوە کاتێك کە بنەمای شەرعیەت بوونی لە دەست دەدات، واتە کاتێك کە سنورە دیاریکراوەکانی نائارام بن و گروپێك یان چەند گروپێك بیانەوێت لە بەشێکی قەڵەمڕەوەکەیدا یان لە سەرانسەری سنورەکەیدا ئۆتۆنۆم بن، تێکدەشکێت.

کاتێك کە دەوڵەت تواناکانی لە دەست بدات و، ئەو توانستە کەمەی کە ماوێتی تایبەتی بکات بە دەوڵەمەندان و گروپی کەمایەتی ئەتنیکی ژێر پارێزگاری خۆی، ئیدی نابێت چاوەڕوان بکرێت کەسانێکی کە فرێدراونەتە پەراوێزەوەو لە مافی خۆیان بێبەری کراون، وەفاداری دەوڵەت بن. کاتێك دەبینرێت کە دەسەڵاتداران تەنها بۆ خودی خۆیان و دەستەو تاقمەکانیان هەوڵدەدەن، شەرعیەتی بوونیان و شەرعیەتی دەوڵەت لەکەدار دەبێت. خەڵکی ئەوەیان لا ئاشکرا دەبێت کە دەوڵەت لەژێر کۆنترۆڵی گروپ یان چینێکی تایبەتدایەو، ئەوانی دی کەنارەگیر کراون. ئاساییە کە هاوڵاتیان کەمکەمە لە خاوەن پەیماننامە لۆکاڵیەکان وەك تاکە نواو سەرچاوەیەکی دابینکردنی ئاسایش و هەلی ئابوری بەئاگابێنەوە. لەم حاڵەتەدا وەفاداریو پشتگیری خەڵکی بۆ دەوڵەت ڕووت دەبێتەوەو ڕوو لە ڕابەری گروپەکان و دەستەکان دەکات و دەگوێزرێتەوە. هەندێك لەو ڕابەرانە دەبنە جەنگسالار. هەندێك لەمانە تاکی دەسەڵاتدار بۆ پاراستنی ناوخۆو دەرەکی کێش دەکەن. لە گۆشە دواکەوتوو مەحرومەکانی دەوڵەتانی تێکشکاودا لەپاڵ هەلومەرجی دروستبوودا بەهرەی پارچە پارچەییو شکستی دەوڵەتەوە، تیرۆریزمیش دەتوانێت گەشە بکات.

هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەت دواین قۆناغی ژیانی هەموو دەوڵەتێکی تێکشکاوە. بۆشایی لە دەسەڵاتدا بەتەواوی دەبینرێت. دەوڵەتی هەڵوەشاو دەربڕینێکی جیوگرافی ڕووتە. تەنگەیەکی ڕەشە کە کۆمەڵگایەکی سیاسی تێکشکاو کەوتۆتە ناوی. وزەیەکی ڕەش لەئارادایە، بەڵام هێزە شۆڕشگێڕە ئامانج ڕووناکەکان و یەکێتی خوازەکان، کە نەزمی هاوبەشیان لەنێوان خەڵکانی خاوەن پەیوەندی زمان یان سنوری هاوبەشدا دروستکردوە، ڕووناکی دەخەنە سەر ئەو خاڵە ڕەشە. کاتێك کە دەوڵەتێکی وەك سۆماڵ(لوبنان یان ئەفغانستان لەسەدەی ڕابردوودا و، سیرالیۆن لە کۆتایی دەیەی1990) هەڵوەشێت گەمەکارە بچوکەکانی ناو دەوڵەت سەردەکەون و ناوچەکە و دەوروبەری کۆنترۆڵ دەکەن. ئەوانە دەزگای ئاسایشی ناوخۆ،

مۆڵەتەکانی بازرگانی یان بەرنامە بازرگانیەکانی دی تایبەت بە خۆیان هەیەو، تەنانەت پەیوەندی نێودەوڵەتی لاوازیش پێکدەهێنن. بەپێی پێناسە ئەوانە شەرعیەتیان نییەو بە ڕەسمی نەناسێنراون. هەندێك لەوانە وەك شۆڕشگێڕانی باکوری سۆماڵ جلوبەرگی نیمچە دەوڵەتیان هەیە. هەڵبەتە لەناو هەناوی دەوڵەتی تێکشکاودا بێنیزامی، ڕەفتاری نەشیاو، هەلومەرجی جۆراوجۆری بازرگانی، بەتایبەتی لە بواری چەك و مادەسڕکەرەکان و هاوکاری تۆڕە تیرۆریستیەکان بڵاوە.

## دەوڵەتە تێکشکاوەکانی سەردەم

ئەفغانستان، ئەنگۆلا، برۆندی، کۆماری دیموکراتی کۆنگۆ، لایبیریا، سیرالیۆن و سودان دەوڵەتە تێکشکاوەکانی ئەم دەیەن. ئەم حەوت دەوڵەتە نیشاندەری ئاماژەی دەوڵەتی تێکشکاون. جگە لەوانەش دەوڵەتێکی هەڵوەشاوەش هەیە کە (سۆماڵ)ە . بە لایەنی کەمەوە لە دەیەی (1990)وە هەریەك لەم وڵاتانە پێناسە بوون بۆ دەوڵەتی تێکشکاو. لوبنان، بۆسنا، تاجیکستان و نێجیریاش سەردەمانێك بەشێك بوون لە دەوڵەتی تێکشکاو. زۆر لە دەوڵەتە مۆدێرنەکانی دیش تا سنوری تێکشکان ڕۆشتوون و، هەندێك لەوانە چارەنوسێکی خراپتری لەوانی دی هەیە. هەندێك لە دەوڵەتانی لاواز بۆ دەوڵەتێکی لە حاڵەتی شکستهێنان و پاشان بۆ تێکشکاو دەگۆڕێت.

یەکێك لە پرسیارە سەرنجڕاکێشەکان ئەمەیە، کە بۆچی و چۆن هەندێك لە وڵاتانی وەك هایتی لە لاوازی ئاشکراوە بەرەو شکستهێنان مل دەنێن؟ فەهرەستی دەوڵەتە لاوازەکان دوور و درێژە، بەڵام تەنها ژمارەیەك لەم دەوڵەتانە کە سەرەتا و کۆتاییەکی ناشایستەیان هەیە دەگەنە سنوری شکستهێنان، بۆچی؟ تەنانەت ئەجندەکردنی دەوڵەتێك کە لە ڕیزی دەوڵەتانی بەرەو شکستهێناندایە_وەك کۆڵۆمبیا و ئەندەنوسیا_ واتە شکستی تەواو بێچەند و چونی نییە. پرسیارێکی گرنگی دی ئەمەیە کە چ شتێك دەبێتە هۆی ئەوەی دەوڵەتێك کە لە حاڵەتی تێکشکاندایە لەبەریەك هەڵوەشێت؟ بۆچی سۆماڵی لەبەریەك هەڵوەشاو لە قۆناغی شکستهێناندا نەوەستا؟

دەوڵەتە تێکشکاو و هەڵوەشاوەکان هەموویان بە جۆرێکی تەواو هەڵگری تایبەتمەندی شکستهێنان نین. دیارە بۆئەوەی بە دەوڵەتێك بووترێت تێکشکاو دەبێت پێشتر خاوەنی پێوانە ئاشکراکانی شکستهێنان بێت. زاراوەی (شکستهێنان) پێناسەیەکە بۆ ڕستێك هەلومەرجی تایبەت و ئەو دەوڵەتانە ناگرێتەوە کە تەنها چەند مەرجێکیان تێدایە. بە واتایەکی دی، ئایا چۆنیەتی ڕێگاوبان و شەقامەکان، قوتابخانەکان، نەخۆشخانە و کلینیکەکان لە ڕاستیدا لە نزمترین ئاستدان؟ ڕێژەی بەرهەمی نەتەوەیی چەندە نزم بۆتەوە و، ڕێژەی لەناوچوون و مردنی منداڵان چەند بەرز بۆتەوە؟ تخوبەکانی کۆنترۆڵی دەوڵەتی سەنتەر تا کوێیە؟ شەرعی بوونی دەوڵەت بە ئەندازەی چەندی لێماوەتەوە؟ لە هەمووی گرنگتر، لێرەدا کە پێکدادانە ناوخۆییەکان لە تێکشکاندنی دەوڵەتدا ڕۆڵی بێچەند و چونیان هەیە، ئایا هێشتا دەوڵەت توانای دەستەبەرکردنی ئاسایشی هاوڵاتیانی هەیە؟ ئەگەر هەیەتی تا چ ڕادەیەکە؟ ئایا دەوڵەتی گرێدراو دەتوانێت ئاسایش فەراهەم بکات، یان تەنها لە ڕۆژە ئارامەکاندا ئەو توانایەی هەیە؟ ئایا دەوڵەت کۆنترۆڵی بەشێکی گەورەی لە وڵات لەدەستداوە، یان تەنها کۆنترۆڵی بەشێکی ناوچە و مەیدانەکانی لەژێر دەست دەرچووە؟

لێکۆڵینەوە لە هەندێك بابەتی وەك (سریلانکا) سەرنجراکێشە. ئەم وڵاتە بۆ ماوەی نۆزدە ساڵە دووچاری جەنگی ناوخۆیی کاول و وێرانکار بوە. گروپە چەکدارە جوداخوازەکانی (بەورەکانی تامیل) لە ماوەی دەیەی ڕابردوودا توانیویانە کۆنترۆڵی هەندێکجار لە سەدا پازدەی هەمووی خاکی سریلانکا بکەن، توانیویانە سەرۆك وەزیران تیرۆر بکەن و بێسزاش بۆی دەربچن، بۆمب گوزاری بۆ سەرکۆمار بکەن، دژە تامیلیەکان تیرۆر بکەن، لە ساڵی ڕابردووشدا فڕۆکەخانە و بنکەی سەرەکی ئاسمانی سریلانکایان وێران کرد. لەگەڵ ئەوەشی کە دەوڵەتی (سین لاها)کان هەتا ئێستا نەیانتوانیوە چەکدارەکانی تامیل لەناوببەن، دەوڵەتی نەتەوەییش هەتا ئێستا دوچاری شکستهێنان نەهاتوە و هەر لە قۆناغی لاوازیدا ماوەتەوە. لە دیدی هەشتا لە سەدای خەڵکی سریلانکاوە دەوڵەت بە باشی جولاوەتەوە. هەروەها لە سەرەتاکانی دەیەی (1990)وە سریلانکا بەرهەمی ئابوری بەرچاوی هەبوە. تەنانەت پێش ئاگربڕی دوایش دەوڵەتە یەك لەدواییەکەکان کۆنترۆڵی هەشتا لە سەدای هەموو وڵاتیان کردوە کە بەزمانی (سین لاها) دەدوێن، دووبارە کۆنترۆڵی هەندێك لەو ناوچانەشی کردۆتەوە کە جێگای مشتومڕی تامیلەکان بوە. پێش ئاگربڕی کاتی بە هۆی بوونی جەنگی ناوخۆوە خزمەتگوزاریەکانی وەك چاککردنی ڕێگاوبانەکان، خزمەتگوزاری پەروەردەیی، تەندروستی و بەها سیاسیە پێویستیەکانی دی گەر لە بۆتەیەکی تەسکیشدا بووبێت پێشکەش بەو ناوچانەش دەکرا کە بەهۆی جەنگەوە دوچاری زیان هاتون. لەگەڵ هەموو ئەم ڕاستیانەدا سریلانکا لەگەڵ ئەو جەنگە ناوخۆییەی کە پەراوێزکردنی کەمایەتی بە سوودی زۆرینە و بێبەشکردنی گروپێك بەهۆی جیاوازی نەتەوەیی و مەزهەبییەوە سەرچاوەکەیەتی، بە سەرکەوتوویی لە هەناوی شکستهێنانددا هاتۆتە دەرەوە.

(ئەندەنوسیا) نمونەیەکی دی دەوڵەتی لاوازە، کە هاوشان لەگەڵ نائارامیەکی گەورە لە دەست شکستهێنان هەڵاتوە. ئەمە لە حاڵەتێکدایە کە گروپەکانی دورگە پەرشوبڵاوەکانی ئەندەنوسیا، گەورەترین وڵاتی موسڵمانی جیهان، شوێنگەی پەروەردەکردنی جوداخوازییانە: ئاچەکان لەخۆرئاوا، پاپۆئا (ئیریان جایا) لە خۆرهەڵات، سەرەڕای جەنگی موسوڵمان و مەسیحیەکان لە ئامیون و ملوك، دوژمنایەتی موسوڵمان و مەسیحیەکان لە سولاویس، سەرهەڵدانی ئاژاوەی نەژادی لە کلیمانتای خۆرئاوا. بە لەبەرچاوگرتنی ئەم دەرگیریانە، کە توندیژی هیچ کامیان پاش کۆتایی دیکتاتۆر (سوهارتۆ) کەمتر نەبۆتەوە، بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت بوترێت کە ئەندەنوسیا لە گرفتی شکستهێنان نزیك دەبێتەوە. لەگەڵ ئەوەشی کە تەنها شۆڕشگێڕەکانی (ئاچە و پاپوئا) داوای جیابوونەوە لە دەوڵەت دەکەن، لە (ئاچە)دا سەربازانی دەوڵەتی باڵادەستن. لە ناوچەکانی دیدا دوژمنایەتی لە نێوان گروپەکاندایە و دژ بە یەکێتی دەوڵەت یان وڵات نین. ئەمانە بە پێچەوانەی ئەو جەنگە سوکەی کە لە (ئاچە) لەگەڕدایە، هەڕەشە لە هەموو وڵات و سەرچاوەکانی ناکەن. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هێشتا زۆربەی بەشەکانی ئەندەنوسیا ئارامە و بە جۆرێك لە هەستی نەتەوەگەرایی پێکەوە بەستراوە و، دەوڵەت هێشتا دەسەڵات و حوکمڕانی لەدەستدایە. لەگەڵ بوونی هەلومەرجی ئابوری مەترسیدار و ئاڵوگۆڕەکانی پاش (سوهارتۆ)، دەوڵەت زیاتر بەهای سیاسی فەراهەم کردوە و پارێزگاری لە بە شەرعی بوونی خۆی کردوە.

(ئەندەنوسیا) تەنها لە ڕیزی دەوڵەتە لاوازەکان دادەنرێت، کە دیارە دەبێت لە نزیکەوە چاودێری ڕەفتارەکانی دەوڵەت و بەرقەرارکردنی ئاسایش بکات.

هەلومەرجی کۆلۆمبیا چۆنە؟ ولاٌتێکی دەوڵەمەند، ساماندار و جێگیر، کە بەرزترین ڕێژەی کوشتنی لە جیهاندا بەناوی خۆیەوە تۆمارکردوە. سیاسەتمەدار و بازرگانەکانی کۆلۆمبیا گوللەنەبڕ دەپۆشن و ، بە هاوەڵی گاردی چەکدار سەفەر دەکەن و ، سێ سوپای تایبەت بە ئاسانی بەشێکی تاڕادەیەك فراوانیان لەو قەڵەمڕەوە کۆنترۆڵ کردوە و، دەسەلاٌتدارانی سیاسی و بەرگری حاکمیەتی ئەو ناوچانەیان پراکتیکانە بۆ چەکدار و قاچاخچیانی مادە سڕکەرەکان بەجێهێشتووە. لێرەدا ئەم پرسیارە دەکرێت: کە بۆچی کۆلۆمبیا لە ڕیزی دەوڵەتە تێکشکاوەکان دانانرێت؟ هەرچەندە ئەگەری ئەوە هەیە کۆلۆمبیا بکەوێتە بۆتەقەی تێکشکانەوە، بەلاٌم لە ئێستادا توانیویەتی حەفتا لە سەدای قەڵەمڕەوەکەی بپارێزێ و بە ڕەسمی لە ژێر کۆنترۆڵی خۆیدایە. هێشتا دەوڵەت توانای دابینکردنی بەها سیاسیەکانی هەیە و تەنانەت لە بەشێکی سەرەکی ئەو ناوچانەی لە ژێر کۆنترۆڵیدایە ئاسایش دەستەبەر دەکات و باشتری دەکات. کاتێك دەوڵەتی کۆلۆمبیا بتوانێت دووبارە دەسەلاٌتی بگەڕێنێتەوە بەسەر ئەو ناوچانەی ململانێی تێدایە، قاچاخچێتی بە مادە سڕکەرەکانەوە کەم بکاتەوە، دەسەلاٌتی دەوڵەت فراوان دەبێت و، دەوڵەتێکی لاوازی وەك کۆلۆمبیا کە لەسەر لێواری مەترسییە دەتوانێت لە ئەگەری شکستەوە بەرەو لایەکی بەهێزتری هاوکێشەکە بچێت.

زیمبابۆی نمونەی ولاٌتێکی ئەفریقایە، کە سەردەمانێك بێگومان ولاٌتێکی بەهێز، لە ڕاستیدا بە یەکێك لە دەوڵەتە بەهێزەکانی ئەفریقا دادەنرێت، بەلاٌم زۆر بە خێرایی بەرەو لاوازبوون ڕۆشت و گەیشتۆتە سەر لێواری شکستهێنان. زیمبابۆی بۆ کشان بەرەو ناوجەرگەی تێکشکان هەڵپڕی هەموو مەرجەکانە، تەنها بزوتنەوەیەکی ناوخۆیی بەرفراوان نەبێت، کە دەوڵەتی کردبێتە نیشانە. هەڵبەتە لەوانەیە لە دوایدا بزوتنەوەیەکی لەو جۆرەش سەرهەڵبدات. هاوکات بەرهەمی ناوخۆی نەتەوەیی لە دووساڵی ڕابردوودا بە ڕێژەی دە لە سەدا دابەزیوە، لە ماوەی هەمان کاتدا هەڵئاوسان لە سی لە سەدا بە سەد و دە لە سەدا گەیشتوە. دراوی ناوخۆیی لە بەرامبەر دۆلاری ئەمریکی شکاوە، لە سی و هەشت یەکە لە بەرامبەر دۆلارێك بۆ چوارسەد یەکە لە بەرامبەر دۆلارێك گۆڕاوە. سەرمایەگوزاری ناوخۆیی و دەرەکی بە شێوەیەکی سەرەکی وەستاوە. خزمەتگوزاری تەندروستی و پەروەردەیی تاڕادەیەك بوونی نییە و هەموو ڕۆژێك خراپتر دەبێت. چاودێریکردنی ڕێگاوبان و خزمەتگوزاری پەیوەندیگرتن بە ئاشکرا لە بارێکی نێگەتیڤدایە. هەرچەندە کە دەسەلاٌتی دادوەری تاڕادەیەك سەربەخۆیی خۆی پاراستوە، بەلاٌم لە هەمبەر فایلە سیاسیە هەستیارەکاندا سەرپشکێکی ئەوتۆی نییە. دەوڵەتیش بەلایەنی کەمەوە دووساڵە هاولاٌتیانی ئەشکەنجە دەدات و دەیانکاتە قوربانی. گەندەڵی پەرەدەستێنێت و لە نێوان دەستەبژێرەکاندا چاوچنۆکی بە ئاشکرا دەبینرێت. زیمبابۆی نمونەی ولاٌتێکی وەك سیرالیۆن و کۆماری دیموکراسی کۆنگرەی کۆنە، کە بەدەستی مرۆڤەکان خۆیان بەرەو تێکشکان پەلکێش کراوە.

ئەندەنوسیا، کۆلۆمبیا، سریلانکا و زیمبابۆی تەنها چوار دەوڵەتی نێوان دەوڵەت نەتەوەکانن، کە لەگەڵ بوونی فاکتەرە کاریگەرەکانی شکستهێناندا

ئەگەری ئەوەش هەیە تێکنەشکێن، بەتایبەتی گەر کۆمەکی شیاو لە دەرەوە بەدەستبهێنن. ئەوانە لە ڕیزی دەوڵەتە لاوازەکانن، بەلاّم لە گروپگەلی دەوڵەتەکانی لە حاڵەتی تێکشکاندان نزیکن، کە ئەوەش قۆناغی پێش تێکشکاندنی واقیعیە. سێ وڵاتانی (هایتی، چاد، قیرقیزستان) لە سێ کیشوەری جیهاندا نوێنەری لاوازیی قوڵن. ئەرجەنتینیش لەو دوایانەدا چۆتە هەمان لیستەوە و، ڕوسیاش سەردەمانێك بەئەندامی ئەو لیستە دادەنرا. هەروەها فیجی، دوورگەکانی سلێمان، تاجیکستان، لوبنان، نێجیریا، نێجەر، بۆرۆکینافاسۆ لاوازن. تەنانەت کینیا دەوڵەتێکی لاوازەو، لە کاتێکدا جیاوازی نەژادی ببێتە هۆی جەنگی ناوخۆیی ئامادەگی تێکشکانی تێدایە.

فەهرەستی دەوڵەتە لاوازەکان زۆرترەو ناجێگیرە. هەندێك لە دەوڵەتە بەهێزەکان بەرەو لاوازیو تێکشکان دەڕۆن، یان لێی دووردەکەونەوە. پێشبینی دەکرێت هەندێکی دی لە وڵاتان لاوازبن. بڕیاری گروپی دەسەڵاتدار دەتوانێ هەلومەرجی ئەندامێتی ناجێگیر بکات و بەرەو تێکشکانی بەرێت.

## دەستی مرۆڤ

تێکشکاندنی دەوڵەت سەرئەنجامی هەنگاوەکانی مرۆڤەکانەو، لە بنەڕەتدا ڕێکەوت و بەرهەمی فاکتەری جیوگرافیو ژینگەی دەوروبەر یان دەرەکی نییە. بڕیارو شکستی ڕابەرەکان دەوڵەت نابوت و کۆمەڵگەی سیاسی ناجێگیرو لاواز دەکات و بەرەو تێکشکان ڕاپێچی دەکات. حکومەتی شێتئاسای وەك (مۆبۆتۆ) مۆخی ناو ئێسقانی کۆماری دیموکراتی کۆنگۆی دەرهێناو هیچی بۆ پەیوەستبوونی هاوڵاتیان پێکەوە نەهێشتەوە.

زۆرترینی سەرچاوە دەولەمەندو سامانەکانی ئەو وڵاتە گەورەیە چوە گیرفانی خودی (مۆبۆتۆ) یان کەسە نزیکەکانیەوە. لەماوەی چوار دەیەی ڕابردوودا بە دەگمەن دراو بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی مرۆڤی کۆنگۆ، دامەزراوەی ژێرخان یان تەنانەت بەرقەرارکردنی ئاسایشی بنەڕەتی تایبەت کرا. دەوڵەتی (مۆبۆتۆ) تەنها بۆ کەسێتی ئەو بوە نەك بۆ کۆماری دیموکراسی کۆنگۆ.

وڵاتی پڕ لە نەوتی ئەنگۆلاش بەهۆی سێ‌دەیە لە جەنگ و، هەروەها دوورەپەرێزی سەرکۆمار (ئەدواد ودوس سانتۆس) و نزیکەکانی لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ ناوچە فراوانەکانی ژێر کۆنترۆڵیان بەرەو تێکشکان دەچێت. (ئەستینۆس)(1967–1985) لە پێناوی بەهێزکردنی دەسەلاّتی لە نێوان ئاژاوەو ئاشوبدا دەوڵەتی سیرالیۆنی کەنارەگیر کرد. ئەو دەوڵەتە هەتا ئێستاش نەیتوانیوە قەرەبووی زیانەکانی جەنگی ئەستیونیس بکاتەوە. لیبریاش پاش ئەو لێدانەی کە بەهۆی چاوچنۆکی(ساموێل دویە، پرنس جانسۆن، چارلس تەیلۆر) ەوە خواردی هێشتا نەهاتۆتەوە سەرخۆی. لە سۆمال (محمد زیاد) پارەو دەسەلاّت و تازیاری هەرچی زیاتر بۆ خۆیو دارودەستەکەی قۆرخ کردو ئیدی هیچی بۆ ئەوانی دی نەهێشتەوە. دەوڵەتی سۆماڵ لەناوچوو، مامەڵە لەسەر تواناکانی بۆ دەستەبەرکردنی بەها سیاسیەکان کراو بەو هۆیەوە کەوتە ناو گرفتی شکستهێنان و پاشان بە هەڵوەشانی تەواو گەیشت و، سەرکۆمار(ڕۆبرت گابریل موگابە) خودی خۆی زیمبابۆی لە دەسەلاّتەوە بەرەو گۆڕی شکستهێنان کێش کرد. دەسەلاّتە گەندەڵ و تاوانکارەکەی داهاتە نەوتیەکانی کردە گیرفانیەوە، سەرچاوە پڕبەهاکانی بەبادا، سەرمایە گوزاری ناوخۆیو دەرەکی

نەهێشت، دادگاكانی نائارام و ناچەسپاو كردو، لە ساڵی ڕابردووشدا وڵاتی بەرەو تخوبی قەیرانی گرانی پەلكێش كرد. لە سریلانكا (سلێمان و سیرمافوباندارا) یەك لە دوای یەك بە هەڵوەشاندنی مافی كەمایەتی و لاوازكردنی پەیمانی كۆمەڵایەتی، كە بە پێی ئەوانە دروست ببوو، بەورەكانی تامیلیان ناچار بە جەنگی تۆڵەسەندنەوە كرد. لە ئەفغانستان (گولبەدین حكمەتیار و بورهانەدین ڕەبانی) جگە لە تاجێك و پشتوەكان هەموو خەڵكی ئەفغانستانیان لە بەڕێوەبردنی وڵات دوورخستەوە، بڕیارە نابەجێو خۆبەخۆیەكانیان بوونە هۆی سەركەوتنی تالیبانەكان و، سەرئەنجام ئەفغانستان بوە شوێنگەیەكی ئارامی تیرۆریستان.

## ڕێگرتن لە تێكشكانی دەوڵەتەكان

بەهێزكردنی پلە بەپلەی دەوڵەتی لاواز لە بەرامبەر تێكشكان ئاسانترە لە دووبارە بونیاتنانەوەیان لە پاش تێكشكان و هەڵوەشاندنەوەی تەواو. وەك ئەوەی كە كێشەی پراكتیكیانەی ئەفغانستان دەیخاتە ڕوو، دووبارە بیناكردنەوە كاروانێكی دووورودرێژو پڕخەرجی و دژوارە. دامەزراندنی هێزی ئاسایش و ئارامی لە هەناوی یادەوەری تاڵ و ڕەشدا پێویستیەكی دەمودەستیە. پاشان قۆناغی دووبارە دامەزراندنەوەی بونیادی ڕاپەڕاندن لە یەكەم هەنگاوداو ئینجا دەزگای ئیداریو دابینكردنی موچەی كارمەندان و پۆلیسەكانی سەردەمی پێشو دەستپێدەكات. فۆرمی دادگاش پێداویستیەكی دییە، واتە دەست بە دامەزراندنەوە یان دووبارە دامەزراندنی ڕێكخراوێك و سیستمێكی مافپەروەرانە و یاسایی" پەروەردەی دادگایی، دادوەری و پارێزەری (بەو جۆرەی لەو دواییانەدا لە تەیموری خۆرهەڵات ئەنجامدراوە)و كردنەوەی دادگای بەڕێوەبەرایەتیەكان بكرێت. سەرئەنجامی كاری بنەڕەتی لە وێنەی كردنەوەی قوتابخانەكان، بەگەڕخستنەوەی مامۆستا، چاككردن و پڕكردنەوەی كەموكوڕی نەخۆشخانەكان، نوێكردنەوەی ڕێگاوبانەكان، تازەكردنەوەی ڕێگاكان و تەنانەت ئەنجامدانی ئاماركردن (بە تایبەتی لە ئەفغانستان كە بە هۆی جەنگەوە بە تەواوی وێران بوە) پێویستی بە ماوەی دوور و درێژ و خەرجی گەورە هەیە.

دەستپێكردنی هەڵبژاردن لە هەنگاوە سەرەتاییەكان نییە، بەڵكو لە سەرەتادا دەبێت دەستوری بنەڕەتی ڕێكبخرێت و پاشان بۆ برەودان بە دیموكراسی هەڵبژاردن ئەنجام بدرێت.

بەهێزكردنی دەوڵەتانی ئامادەی تێكشكانن پێش ئەوەی بگەنە ئەو قۆناغە سیاسەتێكی حساب بۆ كراوی عاقڵانەیە و، بە شێوەیەكی بەرچاو كۆمەك بە سیستمی جیهانی، كەمكردنەوەی ڕووبەڕووبوونەوە و زیانی تەلەفات، ئاوارەبوون و بێلانەبوونی تاك دەكات. دەرئەنجام كارێكی لەوجۆرە زۆر كەمتری تێدەچێت لە دووبارە دامەزراندنەوەی دەوڵەتەكان لە پاش تێكشكان. بەهێزكردنی دەوڵەتە لاوازەكان بەزۆری دەتوانێت ئەو مەیدانی دەسەڵات و حوكمڕانیانەی كە لانەی پەروەردەكردنی تیرۆریزمە هەڵتەكێنێت.

دیارە لە ڕوانگەی سیاسەتەوە ئەم تێزانە سادە دێنە بەرچاو. میكانیزمەكانی ڕیفۆرمیش ڕوونە. بۆ هاندانی سەركردەیەكی كە هەست بە لێپرسراوێتی دەكات و حكومەتێكی شایستە، دەبێت كۆمەكە داراییەكانی ڕێكخراوە قەرزدەرە نێودەوڵەتی و كۆمەك بەخشەكان بە جۆرێك ڕێكبخرێن تا تەنها سەركردەی پۆزەتیف بەهێز بكات. دەبێت پشتگیری

دارایی بە کارامەیی دارایی و دراویەوە مەرجدار بێت. سەرنجدان لە دووبارە بەڕێوەبردنێکی باش، ریفۆرمی سیستمی زەویداری و بەرگریکردن لە سەروەری یاسا دەبێت.

کۆمەکی دەرەکی لە پێناوی دووبارە دۆزینەوەی هەلی کارکردن لەناو وڵاتدا لە ڕێگای کەمکردنەوەی ئاستەنگە گومرگیەکان (بۆ نمونە لە پیشەسازی چنین) و پارێزگاریکردنی ڕاستەوخۆ لە سەرمایەگوزاری دەرەکی پێویستە. پارێزگاریکردن لە داهێنانەکانی کە دەبنە هۆی کەمکردنەوەی خەرجی هەناردە و هاوردەی نەتەوە لاوازەکان، چاککردنی تۆڕی تەلەفون و کارەبا لە ڕێگای بەتایبەتکردنیانەوە، کردنەوەی دەرگا داخراوەکانی ئابوری بە ڕووی خەڵکیدا، دۆزینەوەی ئایدیای نوێ بۆ کاروباری کشتوکاڵی و بەهێزکردنی هێزەکانی ئاسایش لە ڕێگای ئامادەکاری و پەروەردەوە گرنگ و ژیانین.

هەموو ئەو بەشە سەرکەوتوانەی ڕێچکەی بەهێزکردنی دەوڵەت پێویستن. سەرەڕای ئەوەش دەبێت بڕێکی زۆری دارایی بکرێتە کۆمەك بۆ نەتەوە لاوازەکان (ئەم کۆمەکانە زۆر جار لە ڕێگای سوودەوە ئەنجام دەدرێت) گرنگ ئەوەیە ئەم کۆمەکانە بۆ ماوەی دوورو درێژ بەردەوام بن. ناتوانرێت دەمودەست دەرئەنجامێکی پایەدار بەدەست بێت. ئەگەر سیستمی جیهانی دەیەوێت تیرۆر ریشەکێش بکات و هەنگاوی سوودبەخش و فراوان بنێت دەبێت خۆی و هێزەکانی ئامادەی کۆششێکی بەربلاوی ماوە درێژ بۆ چەند دەیەیەك بکات. لە پێناوی دووبارە بنیاتنانەوەی ئەفغانستان بڕێکی زیاتر لەو (4.7) ملیار دۆلارەی تەرخانکراوە پێویستە و، زیاد لەوەی کە (کۆڵن پاول) بە گەلی ئەمریکای ڕاگەیاندوە سەردەمێکی دەوێت تا ئەفغانستان دەبێتە دەوڵەتێکی پشت ئەستور بە خۆی. بۆ نموونە، بەهێزکردنی ئەندەنوسیا پێویستی بە چەند دەیەیەك لە هەوڵی جدیانەیە. بەهێزکردنی دەوڵەتانی دی ئاسیای ناوەڕاست و ئەفریقا، کە لە هەمان باری مەترسیدان، بە هەمان شێوەیە.

ڕێگرتن لە تێکشکاندنی دەوڵەتێك کارێکی پێویست، گرفتاوی و پڕخەرجییە، بەڵام دەرئەنجامی ئەم کارە تەنها بۆ سوودی دانیشتوانی وڵاتە بێبەشەکان و لاوازەکان نییە، بەڵکو بۆ ئاشتی جیهانیش سوود بەخشە. لەوانەی بەئاگابوون لە هەڕەشەکانی تیرۆریزم، کە لەم دواییانەدا پەرەی سەندوە، ئیرادەیەکی سیاسی پێویست بسەپێنێت. جگە لەم شێوەیە ترسو دوژمنایەتی لە نەژادپەرستی، زمانی و مەزهەبی ناجێگیری سروشتی و خۆڕسکی دەوڵەت – نەتەوەکانی جیهان لە لاوازییەوە بەرەو تێکشکان کێش دەکات. شکستهێنانێکی لەو جۆرە لە ڕووی ئاسایشی مرۆڤایەتی و دووبارە دامەزراندنەوەی وێرانیەکانی جەنگ خستویەتیەوە پڕ خەرجی تر دەبێت. قۆناغە تاڵەکانی پاکتاوی ڕەگەزی و گرانی دووبارە دەبنەوە و، گروپە تیرۆرستەکان لەسەر خاکە ئامادەکانی دەوڵەتە تێکشکاو و هەڵوەشاوەکان ڕیشە دادەکوتن.

## سەرچاوە

اطلاعات (سیاسي – اقتصادي)" شمارة 185–186" (دولت – ملت های ناکام و امنیت بین المللی)" نویشتە روبرت .1. روتبرگ (*Robert. I. Rotberg*)" منبع (*Washington Quarterly 2002*)، ترجمة نرگس اثباتي.

# پێناسەو ناوەڕۆك و ماهیەتی زانستی سیاسەت

**عەبدولڕەحمان عالم**

لە عەرەبییەوە: محەمەد کەریم

## 1-ناساندنی بەرایی

فیکری سیاسی لە سەردەمی دێرین، لەخۆرئاوادا لەیۆنانەوە دەستی پێکرد. بەڵام زانستی سیاسەت، وەکو بوارێکی خوێندنی باڵا، تاڕادەیەك تازەیەو لەماوەی سەد ساڵی رابردوودا گەشەی کردووە. بەرلەوە، لێکۆڵینەوەو سەرنجدانی بەردەوام لە سیاسەت بەتەنها پاوانی میرەکان، سیاسەتمەداران، فەیلەسوفانو مافپەروەران بوو. خەڵك لەکاروباری گشتیدا رۆڵێکی ئەوتۆیان نەبوو، هێندەش بایەخیان بەسیاسەتو تیۆریزەکردنی سیاسەت نەدەدا.

لەگەڵ سەرهەڵدانی دیموکراسی نوێو ناسیۆنالیزمدا، قۆرغکردنی زانستی سیاسەت کۆتایی هاتو سیاسەت بوو بەکاری هەمووان. بڵاوبوونەوەی پەروەردەو فێرکردن بوو بەهۆی گەشەکردنی هۆشیاری سیاسی کۆمەڵانی خەڵكو لەم ڕێگەیەشەوە خەڵك رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر لە ڕەوتە سیاسیەکاندا بەشداریان کرد. ئیدی هیچ سیاسەتمەدارێك یان بیریارێك نەیدەتوانی خەڵك فەرامۆشبکات ڕای گشتی گرنگیەکی زۆری پەیداکردو بەم پێیە نەك تەنها حکومەتەکان بەڵکو گروپە ڕێکخراوەکانو حزبە سیاسەکانیش هەوڵێکی زۆریان دا بۆ ئەوەی کار لەڕای گشتی بکەن. کۆبوونەوەو خۆپیشاندانە فراوانەکان بوون بە سیفەتی ڕەوتە سیاسیەکان. دەزگای حزبی بەرەو کامڵبوون هەنگاوی نا بۆ ئەوەی لە هەڵبژاردنی دەوریدا ململانێکە تائاستی سەرکەوتن بباتە پێشێ و لەماوەی نێوان هەڵبژاردنەکاندا بۆ ڕاکێشانی لایەنگرانی زیاتر کارئاسانی بۆ پروپاگەندەی فراوان بکات. تەنها لەم ڕێگەیەوە حزبە سیاسیەکان توانیان دەسەڵاتی سیاسی وەدەست بێنن، بەرنامەکانی خۆیان پراکتیك بکەن و ئەگەری دیموکراسی بوونی بەرفراوانی سیاسەتی عەمەلیان فەراهەم بکەن. تیۆری سیاسی ناتوانێ ئەو هەلومەرجە

لەبەرچاونەگرێ. لەبەرئەوە، ئەمڕۆ دەگوترێ کە هەموو دەسەڵاتێکی سیاسی پەیوەندیی بەخەڵکەوە هەیەو دەسەڵاتی سیاسیش دەبێ لەپێناوی بەرژەوەندییەکانی خەڵکدا کاربکات. لەڕاستیدا هەنووکە تیۆری سیاسی بایەخ بە هەڵسەنگاندنو تاوتوێکردنی دەزگا جۆراو جۆرە سیاسیەکان دەدات بۆ ئەوەی لەوە تێبگات ئایا ئەو دەزگایانە ئەوەیان لەتوانادایە کە بەرژەوەندییەکانی جەماوەر دابین بکەن یان نا. ئەمڕۆ بایەخدان بە تیۆری سیاسی چیتر کارێك نییە بۆ کاتی بێ ئیشی کەسانێك کە غەمی نانیان نییە، بەڵکو کاری هەموو ئەو کەسانەیە کە حەزیان لێیەتیو دەیانەوێ بایەخ بەتیۆریزەکردنی سیاسەت بدەن بۆئەوەی ڕەوتە سیاسییەکان ئاشکرا بکەن.

بەڵام لە لێکۆڵینەوەی سیاسەتەکانو خوێندنەوەی زانستی سیاسەتدا دژوارییەکی گەورە بەدیدەکرێ. هەروەکو (یلیینك—*Jellinek*) بەڕوونی وتویەتی، هیچ زانستێك بەقەد زانستی سیاسەت پێویستی بە زاراوەی زانستی ورد نییە. زاراوە زانستیەکانی ئەم زانستە مانای وردیان نیەو گرنگی زمانەوانیو بەکارهێنانی گشتیو چەمکی زانستی ئەم زاراوە زانستیانە، زۆرجار جیاوازیان هەیەو دەبنە هۆی سەرلێشێواندن و دەبنە هۆی ئەوەی کە زانستی سیاسەت ورد نەبێ.

سەبارەت بە زاراوە زانستیەکانی زانستە کۆمەڵایەتیەکانی دیکەش کەمو زۆر ئەم سەرلێشواویو ورد نەبوونە هەیە" بەڵام زانستی سیاسەت بەشێوەیەکی تایبەتی کەوتۆتە بەر هێرشە توندەکانی زاراوە تەمو مژاوییەکانەوە. (کاتلین—*Catlin*) پێی وایە کە لە باسە سیاسیەکانی زانستی سیاسەتدا بەدەگمەن زاراوەیەك بەدی دەکرێ کە تەمو مژاوی نەبێ. زانستی سیاسەت، تاڕادەیەك ئەم کەموکوڕییەی وەکو میرات لە ئەدەبیاتی کۆنو پێشووی خۆیەوە بۆ ماوەتەوە. بەڵام ئەوەش زیاتر پەیوەندیی بەوەوە هەیە کە زانستی سیاسەت، زانستێکی زیندووەو لەگەشەکردندایە. زاراوە زانستیەکانی سیاسەت لەبەرئەو بەها گشتیو جەماوەرییەی کە هەیانە، پاکیزەیی خۆیان لەدەست دەدەنو دەبنە قوربانی تەمو مژی جۆراو جۆر. هەندێ لەسیاسەتمەدارانو مافپەروەران، کە دەرئەنجامی بەهەڵە بەکارهێنانی زاراوە زانستییە جۆراوجۆرەکانی زانستی سیاسەتیان بەلاوە گرنگ نییە، لە قسەو نووسینەکانی خۆیاندا زاراوەکان بەکاردێننو ئەمەش دەبێتە هۆی تەمومژ لە تێگەیشتندا. لەڕاستیدا ئەم جۆرە کەسانە گوێ بە بەکارهێنانی ڕاستو دروست و وردی زاراوە سیاسیەکان نادەن، بەڵکو بۆ دروستکردنی کاریگەریی یان کارلێکردن بەکاریاندێنن. لەلایەکی دیکەوە ئەندێشەی نوێو تیۆری نەبیستراو بڵاودەبنەوەو لەئەنجامدا زاراوەی نوێ ڕەواج پەیدادەکەنو جاری واش هەیە کە واژە کۆنەکان لە مانایەکی نوێدا بەکاردێن. ڕەنگە هەلومەرجێکی لەو جۆرە بۆ زانستێك کە لە گەشەکردندایە قابیلی خۆلێلادان نەبێ، بەڵام بیرکردنەوەی ڕوونو لێتێگەیشتن تێکدەدات.

سیاسەتزانان لەم وردنەبوونەی زاراوە زانستیەکان ئاگادارنو جاری واش هەیە چەند هەوڵێك دەخرێنە گەڕ بۆ ئەوەی زاراوەکان بەدروستی پێناسەبکرێنەوەو بەکاربهێندرێن" بەڵام هێشتا ڕێگایەکی دوورو درێژ لەپێشەوەیە بۆ ئەوەی سەرئەنجام زانستی سیاسەت ببێتە خاوەنی مانای ورد بۆ زاراوە زانستیەکانی خۆی.

سەرلێشێواوییو نەبوونی یەکدەنگی سەبارەت بە بەکارهێنانی زاراوە زانستیە سیاسیەکان هەتا

ناوی (زانستی سیاسەت)یش دەگرێتەوە. هەندێ لە بیریاران و توێژەران (زانستی سیاسەت– Politic science) بەکاردێنن، بەڵام هەندێکی تر هێشتا لایەنگری لە شێوازە یۆنانیە کۆنەکەی، واتە (سیاسەت–politic) دەکەن. گروپی سێیەم ناویان ناوە (سیاسەتی تیۆری–theoretical politics) و سەرئەنجام گروپێکی تر بە (زانستی سیاسی– political science) دەزانن نەك (زانستی سیاسەت– the political science) دیارە ئەم ناولێنانانە روون نین، بەتایبەتی ئەوکاتەی کە واژەی (سیاسەت) واتە زاراوەی زانستی باوی یۆنانی بەکاربێنین کە هەم مانای (زانستی سیاسەت)ەو هەم مەبەست لە خودی (سیاسەت)یشە یان سیاسەت لە تیۆرو پراکتیکدا دەگرێتەوە.[1]

زاراوەی زانستی (سیاسەت (Politics) لە واژەی یۆنانی "پۆلیس" (Polis– شار)ەوە وەرگیراوە. ئەرستۆ، وتوویەتی (مرۆڤ بەحوکمی physis بوونەوەرێکە کە بۆ ژیان لە polis ڕسکاوە.)[2] لە ڕوانگەی یۆنانیەکانەوە سیاسەت زانستێك بوو پەیوەندیی بە کاروباری شارێکەوە هەبوو" بەڵام لە یۆنان شارو دەوڵەت قابیلی لێکجیابوونەوە نەبوون. یۆنانیەکان لەچەند جێگایەکدا دەژیان کە ئێمە ئەمرۆ ئەو شوێنانە بە (شار–دەوڵەت–city-state) ناودەبەین. هەر (شار–دەوڵەت)ێك، شارێك و دەوروبەرو زەوییەکانی چواردەوری دەگرتەوە. جگە لەوەش، واژەی (پۆلیس) لەزمانی یۆنانیدا تەنها (شار)ی نەدەگرتەوە، بەڵکوبە مانای (قەڵا)، (دەوڵەت)، و (کۆمەڵ) بەکاردەهات. حەمیدی عینایەت لەپێشەکی وەرگێڕانی فارسی کتێبی (سیاسەت)ی ئەرستۆدا ئەوەی روون کردۆتەوە کە:

(چەمکی شار لەگەڵ (polis)ی یۆنانیدا جیاوازییەکی ئاشکرای هەیە. شار، بەمانای شوێنی ژیانی خەڵك لە یۆنانیدا پێیان دەگوت asty. لە سەرەتادا polis قەڵایەك بوو کە لەخوار (Asty)ەوە دروست دەکرا، بەڵام مەفهومەکەی گۆڕاو بەمانای کۆمەڵگای ڕێکخراوی سیاسی بەکارهات. هەندێ لە توێژەران دەڵێن کە واژەی polis لە بەڵگەنامەکانی ئەسینادا بەتایبەتی بەمانای کۆمەڵگای سیاسی وڵاتێك لە پەیوەندی لەگەڵ وڵاتەکانی دیکەدا، یان بە دەربڕینێکی باشتر، بەمانای "کەسێتی نێو دەوڵەتی" وڵات هاتووەو لە بەرامبەر ئەویشدا واژەی "دێموس demos" (ریشەی "دیموکراسی"). بەکۆمەڵێ ڕێکخراوی ناوخۆی وڵاتێك وتراوە.)[3]

بەم پێیە، ئەگەر واژەی (پۆلیس) لە زمانی یۆنانی کۆن جیا بکەینەوە، زاراوەی زانستی (شار– دەوڵەت) بێ مانا دەبێ. لەڕاستیدا، سیاسەت، بەمانا یۆنانیەکەی، بریتی بوو لەزانستی حوکم کردن بەسەر شاردا، "سیلی" ئەم مانایەی خستۆتە ڕوو و سیاسەتی ناوناوە (زانستی شارەکان)[4]. بەڵام نابێ ئەم مانایە والێکبدرێتەوە کە سنووری جیهانبینی بیریارە سیاسیەکانی یۆنانی کۆن تەسك بووە یان ناوچەیی بووە. لێکۆڵینەوە سیاسییەکانی ئەوان لە زۆر لایەنەوە قوڵترو فراوانتر بوو لەو جیهانبینیانەی کە لەدوای هەڵوەشانەوەی شار–لە دەوڵەتەکانی یۆنان و ڕۆمی کۆن سەریان هەڵدا.

چەمکی پەسەندکراوو بەکارهێنراوی ئەمڕۆی "سیاسەت" لە چەمکی "زانستی سیاسەت" فراوانترە. ئەمڕۆ واژەی "سیاسەت" ئاماژە بۆ مەسەلە هەنووکەییەکانی حکومەت و کۆمەڵ دەکات کە لە مەفهومی زانستیدا ماهیەتی سیاسی و ئابووریيان هەیە. ڕۆبەرت دال وتەنی:

(سیاسەت یەکێکە لەو ڕاستیانەی ژیانی مرۆڤ کە خۆلێلادانی کاری کردە نییە. ئینسانەکان لە هەر ساتەوەختێکدا لەگەڵ جۆرێ مەسەلەی سیاسیدا

دەستەویەخەی دەبن)[5] تەنها لەڕێگەی رەوەندی سیاسیەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێ ئومێدەواربێ کە ژیانی خۆی بەپێی پایەی عەقڵو تەواوی پێویستیەکان دادەڕێژێ)[6] (پاریکلس)ی یۆنانی لەلاواندنەوەیەکدا وتویەتی: (ئەو کەسەی کە سیاسەت نەکات شایستەی ئەوە نییە کە سیفەتی هاوولاتی بێ زیانی بدرێتێ، بەڵکو دەبێ بە هاوولاتیەکی بێ خاسیەتی بزانین" کاتێ کە دەگوترێ کەسێك حەزی لە سیاسەتە، مەبەست لەوەیە کە ئەو کەسە بایەخ بە مەسەلە هەنووکەییەکانی ولات دەدات وەکو هاوردەو هەناردە(صادرات و واردات)، مەسەلە پەیوەستەکانی کارو کرێکار، پەیوەندییەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن لەگەڵ دەسەڵاتی یاسادانان، چالاکی حزبو رێکخراوە سیاسیەکانو زۆر مەسەلەی تر لەبابەتی چالاکی سیاسی–ئابووری، رۆشنبیریی و کۆمەڵایەتی. لەم مانایەدا سیاسەت لە زانستێك بەربلاوترە و سیاسەتمەداریش ئەو کەسەیە کە لەو جۆرە مەسەلانەدا بەشداری کاریگەر دەکاتو بڕیار دەدات، ئەگەرچی دوور نییە شارەزاییەکی ئەوتۆشی لە بنچینەو بنەماکانی زانستی سیاسەتدا نەبێ. لەکاتێکدا کە زانستی سیاسەت بریتیە لەهۆشیاری هاوبەشی ئینسانەکان لە هەموو کۆمەڵگاکاندا، سیاسەتی ولاتان لەگەڵ یەکتریدا جیاوازییان هەیە. بەم پێیە، هەم مانای زمانەوانیو پەلوپۆکانی و هەم بەکارهێنانی گشتی سیاسەت) لەبابەتی راستەقینەو واقیعی (زانستی سیاسەت) فراوانتردەکات. بەڵام بۆ ئاماژەکردن بۆ هۆشیاریو زانستی سیاسی، باشترە کە زاراوەی (زانستی سیاسەت) پەسەندبکرێ. زۆر لە بیریارانو توێژەرانی سیاسیش بۆ دەربڕینی زانستو هۆشیاری هاوبەشی سیاسی، "زانستی سیاسەت"یان لە "سیاسەت" پێ باشترە کە بە مانا یۆنانیەکەی لایەنی تیۆریو پراکتیکی دەگرێتەوە[7] یان، بەواتایەکی دیکە، لایەنی تیۆری سیاسەتیان بە (زانستی سیاسەت)و لایەنی پراکتیکیان بە زاراوەی (سیاسەت) دەربڕیووە. زانا سیاسیە ناودارەکانی سەرانسەری جیهان لە کۆنفرانسی یۆنسکۆدا کە لەئەیلولی 1948دا بەسترا "زانستی سیاسەت" یان لەجیاتی (زانستە سیاسیەکان) بۆناونانی ئەم بوارە زانستییە پەسەندکرد.[8]

بەڵام نووسەران یان بیریارانی مێژووی دێرین–ی وەکو ئەرستۆ، یلینك، هێنری سجویكو پول ژانت–*Paul Janet* زاراوەی (سیاسەت)یان لە (زانستی سیاسەت) پێ باشتربوو. هەندێ لە توێژەرانی هاوچەرخ لەوە دوودڵ بوون کە ئایا بەشێوەی زانستە وردەکان دەتوانرێ لە دیاردە سیاسیەکان بکۆڵرێتەوە یان نا، لە ئەنجامدا گومانیان لە زانستیبوونی سیاسەت کرد. بەڵام زۆربەیان لەسەر ئەوەیەکدەنگن دەبێ خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە سیاسیەکان لەکارە سیاسیە هەنووکەییەکان جیاوازبێو جودابکرێتەوە. ژمارەیەك لەو توێژەرانە لەو باوەڕەدان کە بەجیاکردنەوەی (سیاسەتی تیۆری) لە سیاسەتی پراکتیکی دەتوانرێ ئەو کارە ئەنجام بدرێ.

بەڵام کارێکی لەو جۆرە دەبێتە هۆی سەرلێشێوان. چونکە زانستی سیاسەت بەتەنها لە بنچینەو بنەماکانی تایبەت بە (رێکخراوە) سیاسیەکانو رەفتارە سیاسیەکان ناکۆڵێتەوە، بەڵکو لە چالاکی گروپو دامودەزگا جۆراو جۆرەکانیش دەکۆڵێتەوە کە لە هەوڵی بەدەستهێنان یان زیادکردن یا پاراستنی دەسەڵاتو نفوزدان. بە دەربڕینێکی دیکە، زانستی سیاسەت لە لایەنە تیۆریو پراکتیکیەکانی دیاردە سیاسیەکان دەکۆڵێتەوە. ئەم تێبینیە، توێژەرانی وەك(پولاك–*Pollock*) ی

ناچارکردووە خودی زانستی سیاسەت بۆ سیاسەتی تیۆریو سیاسەتی پراکتیکی دابەش بکەن. "گیتل–*Gettell*"یش "زانستی سیاسەتی پراکتیکی" بە ژێرەوەی دابەشکردنی زانستی سیاسەت دەزانێ. بەو پێیە، دیاریکردنی ئەو بابەتەی کە دەشێ قسەی لەسەر بکرێ وەکو "سیاسەتی تیۆری" لەگەڵ ئەوەشدا کە گرنگە، دەبێتە هۆی شێواندنی (هزر).

هەندێ لە توێژەرانی فەرەنسی لەو باوەڕەدان کە زانستی سیاسەت، بەتەنیا، بوونی نییە. هەموو زانستە کۆمەڵایەتیەکان کە سەروکاریان لەگەڵ کارەکانی کۆمەڵگای ڕێکخراوی مرۆڤایەتیدا هەیە، بە "زانستە سیاسیەکان" ناو دەبرێنو زانستی سیاسەت تەنها یەکێکە لەوانە. بەپێی ئەم بۆچوونە، زانستی سیاسەت، کۆمەڵناسی، ئابووری، ڕەوشتو لەوبابەتە، هەموویان بریتین لە (زانستە سیاسی)یەکانو ئەم "زانستانە" نەك تەنها پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە بەڵکو بەیەکەوە پەیوەستن. ڕەگەزێك لە حەقیقەت لەم بۆچوونەدا هەیە. لەڕاستیدا، ئەو کارانەی پەیوەندییان بەمرۆڤەوە هەیە قابیلی سنووردارن. توێژینەوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ دەبێ بە دروستی هەماهەنگ بکرێن بۆ ئەوەی تێگەیشتنێکی باشتر لە کێشەکانیەوە وەدەست بێت. بەڵام ئەم کارە ناتوانێ ببێتە هۆی جڵەوگیری لەوەی کە زانستە کۆمەڵایەتیەکان سەربەخۆنەبن یان بە سەربەخۆیی نەمێننەوە. لایەنگیرییەکی زۆر هەیە بۆ جودایی زانستە کۆمەڵایەتیەکانو پسپۆڕیکردنی لێکۆڵینەوەکانیان. هەنووکە ئەوە پەسەندکراوە کە دیاردە کۆمەڵایەتیەکان هێندە جۆراوجۆرنو وەها بەیەکداچوون کە تەنها هزرێك ناتوانێ هەموویان لەخۆی بگرێ.

بەو پێیە، لە چوارچێوەی (زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا) دەتوانرێ ناوی (زانستی سیاسەت) بهێنرێ، بەڵام ڕاست نییە کە هەموو زانستە کۆمەڵایەتیەکان بەزانستی سیاسی بزانین، هەرچەندە نابێ ئەوە فەرامۆش بکرێ کە هیچ شتێك لە سیاسەت بەدەر نییە.

## 2- پێناسەی زانستی سیاسەت

زانستی سیاسەت بایەخ بە شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی لایەنە سیاسیەکانی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان دەدات. (شیکردنەوەی سیاسی یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ ئەوەی باشتر شارەزای ئەو دنیایە بێت کە تیایدا دەژی لەنێوان ئەو بوارە جۆراوجۆرانەی لەبەردەمیدایە باشترینیان هەڵبژێرێو لە کۆتاییشدا بتوانێ کاری زیاتر لەو گۆڕانە گەورەو بچووکانە بکات کە هەریەکەیان یەکێکن لە لایەنەکانی ژیانو لێی جیانابنەوە)[9] قورسایی شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی زانستی سیاسەت دەوڵەتە (*State*).

هەندێکی دی رایان وایە کە زانستی سیاسەت سەروکاریی لەگەڵ حکومەت *government*دا هەیە. گروپی سێیەم تێکەڵکردنی ئەم دوو بۆچوونە پەسەند دەکەن، وەکو پول ژانت، بیریارو توێژەرەوەی فەرەنسی، کە دەڵێت: زانستی سیاسەت ئەو بەشەیە لە زانستی کۆمەڵایەتی کە لە بنچینەکانی دەوڵەتو پرانسیپەکانی حکومەت دەکۆڵێتەوە.

وەکو بیرو بۆچونی کۆن، زۆرجار گوتراوە کە لێکۆڵینەوە لە دەوڵەت، حکومەتیش دەگرێتەوە، چونکە دەوڵەت بەپێی نیازە پراکتیکییەکانی لەڕێگەی ئۆرگانەکانی حکومەتەوە کاردەکات. هارولد لاسکی وتویەتی (... بەپێی مەبەستی

بەڕێوەبردنی پراکتیکی کارەکان، دەوڵەت خودی حکومەتە.)[10] بەڵام لە هەندێ لایەنەوە، واژەی حکومەت گشتگیرترە. (حکومەت) ئەگەر بەمانایەکی فراوان بەکاربێ، پشتی بە ئەندێشەی بنەڕەتی کۆنتڕۆڵو ملکەچی بەستووە، دیاردەیەکە کە لەگەڵ کۆمەڵگای ئینسانیدا پەرەی سەندووە. بەڕای "سجویك"، زانستی سیاسەت (لەو کۆمەڵگایانە دەکۆڵێتەوە کە حکومەتیان هەیە، واتە ئەو کۆمەڵگایانەی کە بەلای کەمەوە، ئەندامەکانی لەچەند مەسەلەیەکی دیاری کراودا، لەسەر جێبەجێکردنی فەرمانەکانی هەندێ کەس یان کۆمەڵێ کەس، کە بەشێکن لە کۆمەڵ، راهاتون)[11] ئەم پێناسەیە بواری زانستی سیاسەت فراوانتر دەکاتو لە دەوڵەتیشی تێدەپەڕێنێ.

چەمکی کۆنی زانستی سیاسەت، وەکو زانستی لێکۆڵینەوەی دەوڵەت یان حکومەت ئیتر بەگونجاو نازانرێ. ئەم چەمکە جەخت لە فۆرم دەکاتەوەو دەبێتە هۆی یاساگەریی یان وردبوونەوەی روکەشی لەڕادەبەدەر لە جێبەجێکردنی یاسادا. هەروەها رەوتی دینامیکی ئەنجامەکانی لەبەرچاوناگرێ. بەشێوەیەکی گشتی ئەوە پەسەندکراوە کە دەبێ زانستی سیاسەت لێکۆڵینەوەی رێکخراوی نارەسمیو رەفتاری سیاسی لە کۆمەڵدا لەخۆی بگرێ کە بنەمای رەسمی حکومەتو هێزە سیاسییەکان کاریگەریی لەسەر ئەوانەش هەیەو دەیانگرێتەوە.[12]

بەیەکسان تەماشاکردنی زانستی سیاسەت لەگەڵ خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی دەوڵەتی نوێشدا کەوتۆتە بەر شەپۆلی ناڕەزاییەوە، وشەی "دەوڵەت" هەتا پێش سەدەی (15) وەکو وشەیەکی سیاسی بەکارنەدەهێنرا و کاتێ بەکارهێنانێکی لەو جۆرەی بەخۆیەوە بینی بە سیفەتێکی (نوێ) وەسفکرا.

پێناسەی زانستی سیاسەت لەگەڵ تێڕوانینی تایبەتدا بۆ دەوڵەت، بەڕای ناڕازیان، ئەو ئەنجامەی لێ دەکەوێتەوە کە دەوڵەتی نوێ فۆرمی کۆتایی دەزگای سیاسییە نەك (نۆرمێکی-ئینتیقالی) کە لەگەڵ زانستی سیاسەتدا سەروکاری هەیەو تاکە یەکەی سیاسییە کە خۆشگوزەرانی مرۆڤ دابین دەکات.

بەم پێیە، بواری ئەو زانستەی کە ئێستا زانستی سیاسەت هەوڵدەدا لەخۆی بگرێ، لە دەوڵەت فراوانترە. کاتلین لەو باوەڕەدایە کە "سیاسەت" بریتییە لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگای رێکخراوی جیهانیو بەرلەهەرشتێ لایەنە سیاسییەکانی ژیانی کۆمەڵگا دەخوێنێتەوە.[13] بەپێی بۆچوونی "بێرتران دی ژوونالّ"، "سیاسەت" لەو پەیوەندییە سیاسیانە دەکۆڵێتەوە، کە هاوکات لەگەڵ گردبوونەوەی مرۆڤەکاندا هاتۆتە ئاراوە.[14] ئەم جۆرە بۆچوونانە بواری خوێندنەوەکانی زانستی سیاسەت تا ئەو سنوورە فراوان دەکات کە هەموو ئەو شتانە بگرێتەوە کە بە لایەنی سیاسی ژیانی کۆمەلایەتیەوە پەیوەستە یان لە پەیوەندییە سیاسییەکانی ئینسانەکان لەگەڵ یەکتریدا دەکۆڵێتەوە. بەڵام سەرەڕای لەبەرچاوگرتنی بەرفراوانی زانستی سیاسەتو توانا تازەکانی ، دەبێ لەبەرامبەر ئەو دڵەراوکێیەدا بەربەرەکانی بکرێو جێگای هەموو شتێکی تێدانەکرێتەوە کە پەیوەندییان بە ژیانی مرۆڤەوە لە کۆمەڵگایەکی رێکخراودا هەیە . توێژەرانو بیریارانی وەکو (هارولد لاسول*H. lasswell*)، (چارلز مێریام-*Merrian*) ، (ماکس فیبەر-*M Weber*)، (بەرتراند روسل- *B Russell*)، (واتکینس-*Wathins*) و (هانس مورگنتا-*Hans Morgenthau*)، کە جەختیان لەسەر سروشتی دینامیکی سیاسەت کردۆتەوە، لەو باوەڕەدان، کە

دەسەڵات، چەمکی بنەڕەتی سیاسەتەو هەموو لقەکانی زانستی سیاسەت پێکەوە گرێ دەدات. بۆ نموونە، لاسول لە پێناسەی زانستی سیاسەتدا وتویەتی: "زانستی سیاسەت بەشێوەی سیستەمێکی ئەزموونگەریی بریتییە لەخوێندنەوەی چۆنیەتی دروستبوونی دەسەڵاتو بەشداربوون تیایدا"و "کاری سیاسی، کارێکە کە لەسەر بنەمای دەسەڵات ئەنجام دەدرێ"[15] سیاسەتو زانستی سیاسەت سەروکارییان لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەدا هەیە کە لە کۆمەڵدا هەیە لەڕووی ماهیەتو پایەو بوارو ئەنجامەکانەوە. "تەوەرەی بایەخدان"ی دانای زانستی سیاسەت روونو ئاشکرایەو بریتییە لە ناساندنی ئەو ململانێیەی کە لەڕێگەی وەدەست هێنان یان پاراستنی دەسەڵاتدا هەیە، یان لە بەکارهێنانی دەسەڵات یان کۆنترۆڵکردنی کەسانی دی، یان جڵەوگیری لە بەکارهێنانی دەسەڵات دەدرێت.[16] هەروەها گوتراوە کە "سیاسەت وتەزایەکە" لەبارەی دەسەڵاتەوە واتە پەیوەستە بە توانای کارگوزارانو کارگوزارییەکانو دامودەزگا کۆمەڵایەتیەکانەوە بۆ پاراستن یان گۆڕینی دەوروبەری کۆمەڵایەتی یان مادی خۆیان. وتەزایەکە دەربارەی ئەو سەرچاوانەی کە بنچینەی ئەو توانایە پێکدەهێننو ئەو وزانەی کە بەکاری دەهێننو کاری لێدەکەن."[17]

بایەخدانو تەئکیدکردنەوە لەسەر دەسەڵات، شێوەگەریی بۆچوونی کۆنی لەناوبردووەو شیکردنەوەی واقیعییانەی رەوتی سیاسی لێکەوتۆتەوە. هەروەها پێناسەی زانستی سیاسەت بە داشکاندن بەلای دەسەڵاتدا پێویستی بە حسابکردن بۆ ئەو واقیعە هەیە کە هێزەکانی کۆنترۆڵکەری شێوەو رەفتاری حکومەت هەروەکو ئەو هێزانە وان کە لە گروپە رێکخراوەکانی دیکەی وەکو خێزان، رێکخراوە کرێکاریو هەرەوەزییەکاندا کاردەکەن (کە چالاکی زۆربەیان سەرەکی نییە).

لەگەڵ ئەوەشدا، تیۆرەکانی تایبەت بە پێناسەی سیاسەت بەپێی دەسەڵات، لەهەندێ لایەنەوە مایەی رەزامەندی نین. یەکەم ئەوەیە کە، ئەم تیۆرانە جیاوازی لەنێوان بواری کۆمەڵایەتیو سیاسی دەسەڵاتدا ناکەن. پەیوەندی نێوان هێزو دەسەڵات کاتێك "سیاسی"یە کە تاڕادەیەك رێکخراو بێو لە جێگایەکدا "سیاسی"یە کە کاری رێکخراوەکان، جۆرێ لە شەرعیەتیان هەبێو خەڵك ملکەچیان بنو رێزیان لێبگرن. دووەم، سیاسەتی ململانێ لەپێناوی دەسەڵاتدا، لەهۆی ئامانجدار بەدەرنییە. بەڵام جەختکردنەوە لەسەر دەسەڵات، ئەو ئامانجانەی کە دەسەڵاتیان بۆ بەکارهاتووەو ناکۆکی ئامانجەکان کە دەسەڵاتی لێوە دروستبووە، تووشی ئاڵۆزی دەکات. لەڕاستیدا، کۆتایی سیاسەت، بریتییە لە گەیشتن بە ڕێڕەوێك–واتە پێکەوە هەڵکردنی بەرژەوەندییە پێچەوانەکان بەپێی چەند بەرژەوەندیو بەهایەکی دیاریکراو کە هاوبەشن. (دەیڤید ئیستۆنیش–*D.Easton*) باوەڕی وایە کە سیاسەت پەیوەستە"بە دابەشکردنی ئامرانەی بەهاکانەوە بۆ کۆمەڵ).

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، گرنگترین رەگەزی سەقامگیرکردنو جێبەجێکردنی سیاسەت دەسەڵاتەو ناساندنی دەسەڵاتیش ئەرکی سەرەکیو یەکەمی زانستی سیاسەتە. دەسەڵات بوونو چەقی قورسایی سیاسەت دروست دەکاتو هەموو کێشمەکێشەکان لەژیانی سیاسیدا پەیوەندیی بە دەسەڵاتەوە هەیە.[18] نولی، بەم شێوەیە چەند پێناسەیەکی سیاسەتی هێناوەتەوە:

1–سیاسەت "هونەری کەڵك وەرگرتنە لە ئیمکاناتەکان" زۆرجار سیاسەتمەداران ئەوەیان بۆ

نالوێ کە بەهەموو ئامانجەکانی خۆیان شادبن، هەربۆیە دەبێ بەرزە فڕییەکان لەگەڵ دەسەڵاتی خۆیاندا بگونجێنن. هیچ کەسێ ناتوانێ لە سیاسەتدا لە دەسەڵات و توانای خۆی زیاتر دەسەڵات بەکاربێنێ و کاریگەریی هەبێ.

2-سیاسەت "فەرمانڕەوایی کردنە بەسەر مرۆڤایەتیدا": (گاتیانو موسکا-*G Mosca*)باس لە چینی فەرمانڕەواو (ئاستین رونی-*A Runny*) باس لە حکومکردنی خەڵك دەکات، دەربارەی پەیوەندی ئەو کەسانەی کە حوکم دەکەن و ئەوانەی کە حوکمیان بەسەردا دەکرێ، واتە لە نێوانی فەرمانڕەواو فەرمان پێکراو دەدوێن و بەڵگە دەهێننەوە کە ئەو پەیوەندییە تەوەری ژیانی سیاسییە.

3-سیاسەت (خەباتە لەپێناوی دەسەڵات)دا: گرنگترین پێناسەی سیاسەت لەلای بیریارانی سیاسی خۆرئاوا ئەوەیە کە بە خەباتی دەزانن لەپێناوی دەسەڵات و نفوزو کارپێکردنیاندا.

4-سیاسەت واتە زانستی ئەوەی کە (کێ دەیباتەوە، چی دەباتەوە، کەی دەیباتەوە، چۆن دەیباتەوە، بۆچی دەیباتەوە) ئەمە پێناسەی هارولد لاسکییە بۆ سیاسەت کە لایەنی دروشمی هەیەو بەئاسانی دەتوانی فێری بی، بەڵام دەبێ ئەوە بزانرێ کە ئەمە پێناسەی (زانستی سیاسەتە) نەك خودی سیاسەت، چونکە لە زانین و زانست و هۆشیاری دەدوێ.

5-سیاسەت "بەزۆر دابەشکردنی بەهاکانە" کە ئەمەش تایبەتە بە (ئیستۆن) و ئەبستراکترین چەمکی سیاسەتە. سەرئەنجام نولی خۆی پێناسەیەکی سیاسەت دەکات و دەڵێت بریتیە لە (هەموو ئەو چالاکییانەی کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەگەڵ وەدەستهێنانی دەسەڵاتی دەوڵەت، سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت و بەکارهێنانی دەسەڵاتی دەوڵەتدایە)[19] پێناسەی نولییش تازە نییەو لەڕاستیدا دەربڕینێکی دیکەیە بۆ ئەوەی کە سیاسەت خەباتە بۆ وەدەستهێنان و پاراستن و زیادکردن و نیشاندانی دەسەڵات.

ئەگەر بمانەوێ پێناسەیەکی تاڕادەیەك گشتگیری سیاسەتمان لەبەردەستدابێ، دەتوانین بەم شێوەیە پێناسەی بکەین: سیاسەت رابەرێکی ئاشتیئامێز یان نائاشتیئامێزی پەیوەندیی نێوان کەس و گروپ و حزبەکان (هێزە کۆمەڵایەتییەکان) و کارە حکومیەکانی ناوخۆی وڵاتێکە و پەیوەندی دەوڵەتێکە لەگەڵ دەوڵەتانی دیکە لە مەیدانی جیهانیدا.

بەپێی ئەم پێناسەیە دەکرێ باسی سیاسەتی کەسێك، گروپێك، حزبێك، یان حکومەتێك بکرێ و لەڕووی نێو دەوڵەتیشەوە سیاسەتی دەرەکی دەوڵەت دەست نیشان بکرێ، سیاسەت هەڵگری بەرژەوەندیەکانی هەریەك لە هێزە کۆمەڵایەتیەکانە کە ناوهێنراون. لە حاڵەتی بوونی ناکۆکی لەنێوان ئەو هێزانەدا، ئەو بەرژەوەندییانە رووبەرووی یەکدەبنەوە و لە حاڵەتی بوونی یەکێتی و هاوکاریدا هاوئاهەنگی لەنێوانیاندا دروست دەبێ. بە دەربڕینێکی دیکە، هێزە کۆمەڵایەتیەکان لەحاڵەتی رووبەرووبوونەوە یان دژایەتی بەرژەوەندییەکانیاندا، لەگەڵ یەکتری دەکەونە کێشمەکێشەوە و لەحاڵەتی هاوئاهەنگی و هاوبەشی بەرژەوەندییەکاندا لەگەڵ یەکتری یەکدەگرن. چۆنیەتی رابەرایەتیکردن و ئاڕاستەکردنی ئەم رووبەرووبوونەوەو هاوئاهەنگیانە، سیاسەت بەرهەمدەهێنێ. سیاسەت رووبەرووبوونەوەو هاوئاهەنگی بەرژەوەندییەکان و پەیوەندی هێزە کۆمەڵایەتیەکانە.

لەم پێناسەیەدا، مەسەلەی بەكارهێنانی دەسەڵاتیش حسابی بۆكراوە. سیاسەت لە ناكۆكی یان لە تەباییەوە سەریهەڵدابێ. بەهەرحاڵ، لە دەسەڵاتەوە پەیدابووە، بەو جیاوازییەشەوە كە لەناكۆكیدا، دەسەڵات بەشێوەی شەڕخوازانە لەڕێگەی زەبرو زەنگ، زۆرلێكردن یان توندوتیژییەوە بەكاردێت، لە تەباییدا بەشێوەی ئاشتیخوازانە، لەڕێگەی هاندانو پاداشتو ئەو جۆرە شتانەوە بەكاردێت.

بە بەرنامەو شێوازی كەسو گروپو حزبو حكومەتو دەوڵەتەكانیش بۆ گەیشتن بە ئامانجەكانیان دەگوترێ سیاسەت. ئەم مانایەی سیاسەت، پەیوەندی بە بەرنامە داڕشتنو بەدواداچوونیەوە هەیەو هەڵبەتە هەمیشە شان بەشانی مانای یەكەمی سیاسەت دەڕوات.

سیاسەت ناسكترین مەیدانی چالاكی مرۆڤە لەكۆمەڵداو بەتوندی كەوتۆتە ژێر كاریگەریی كلتورو ئەندێشەی خەڵكو بەرژەوەندیو بۆچوونەكانی تاكو كۆمەڵ و فاكتەرە ئابوورییەكانی هەر كۆمەڵگایەكەوە، سیاسەت خۆشی كار لەوانە دەكات.

لەبەر رۆشنایی ئەو پێناسەیەی سیاسەتدا دەشێ "زانستی سیاسەت"یش ئاوا پێناسە بكرێ كە: زانستی سیاسەت بوارێكە لە هۆشیاری كۆمەڵایەتی كە ئەركەكەی بریتییە لە ناساندنی رێكوپێكی ئەو پرانسیپو بنەمایانەی بەسەر پەیوەندییە سیاسییەكانی هێزە كۆمەڵایەتییەكان لە وڵاتێكدا و پەیوەندی نێوان وڵاتاندا زاڵن لەمەیدانی نێودەوڵەتیدا.

ئەم بوارەی هۆشیاریو زانستی كۆمەڵایەتی، كاركردنی پرانسیپو یاسا باڵادەستەكان بەسەر پەیوەندی نێوان هێزە كۆمەڵایەتیەكاندا دەدۆزێتەوە چۆنیەتی كاركردنیشیان فێردەكات. زانستی سیاسەت بۆ دۆزینەوەی ئەو پرانسیپو یاساو رێسایانە، بەشێوەیەكی گشتی لە پێكهاتەو كردەوەی حكومەتو حزبە سیاسیەكانو گروپە خاوەن دەسەڵاتەكان، دامەزراوە كۆمەڵایەتیو ئەندێشە سیاسییەكان دەكۆڵێتەوە. لەڕووی پەیوەندیی نێودەوڵەتیشەوە بایەخ بە لێكۆڵینەوەی دامەزراوو رێكخراوە نێودەوڵەتییەكان، سیاسەتو حكومەت لەوڵاتە جۆراوجۆرەكاندا، دیپلۆماسی گشتیو پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەكان، یاسا نێودەوڵەتییەكانو سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان دەدات، بۆ ئەوەی دەربارەی بنەمای پەیوەندییەكانیان زانیاریو هۆشیاری پێویستی دەست بكەوێ.

## 3-مەیدانی زانستی سیاسەت

لەدوای پێناسەی زانستی سیاسەت، ئێستا ئیدی دەبێ مەیدانەكەی دەستنیشان بكرێ. ئەنیستیتۆی زانستە سیاسیو كۆمەڵایەتیەكانی ئەمریكا لە 28-1965/12/29دا بۆ باسو لێكۆڵینەوە دەربارەی مەیدان و ئامانجو میتۆدەكانی زانستی سیاسەت لە فیلادلفیا كۆنفرانسێكی گرت (ئەلفرێد دی گرازیا-*Alfred De Grazia*)و (دەیڤید ئیستون)و (هاری ئیكشتن-*Harry Eckstein*)و هانس مورگنتاو (نۆرمان پالمەر-*Norman Palmer*) و چەند بیریارێكی دیكە بۆ ئەم كۆنفرانسە بانگهیشت كرابوون.[20]

لەم كۆنفرانسەدا ئەوە وترا كە ناتوانرێ سنوورە وردو دیاریكراوەكانی زانستی سیاسەت دیاری بكرێ. هیچ لایەنێكی ژیانی كۆمەڵایەتی نییە كە پەیوەندیی بە سیاسەتەوە نەبێت و بەم پێیە، نەكەوێتە ناو بواری لێكۆڵینەوەی زانستی سیاسەتەوە. لەبەرئەوە زانستی سیاسەت لەزۆر

بــواری لێکۆڵینــەوەی کۆمەڵایەتیــدا بەشــدارەو پەیوەنــدیی بــە بــوارە زانســتیەکانی وەکــو مێــژوو، ئــابووری، کۆمەڵناســی، دەروونزانــی کۆمەڵایــەتی، ئەخلاق، مـاف، ئامـار، جوگرافیـاو بوارەکـانی تـرەوە هەیە. بەڵام هەروەکو دەبینین، زانستی سیاسەت یەك "سەرچـــاوەی بایەخپێـــدانی" هەیـــە کـــە خوێندنــەوەکانی خــۆی لەســەر ڕادەگــرێ. هــەروەها ئامرازو دراوی تایبەتی خۆی هەیە.

## زانستی سیاسەت دینامیکیە

زانســتی سیاســەت لــە سروشــتو بنــەماو ڕەوتەکانیو بوارو ئەنجامەکانی هێزو دەسەڵات لە کۆمەڵدا دەکۆڵێتەوە. لەم مانایەدا نابێ "دەسەڵات" وەکو هێزی زۆردار لێکبدرێتەوە. بنەمای ئەخلاقی دەســەڵاتو نفــوزی ئەندێشــەکان لەســەر مــرۆڤ بەشێوەیەکی سەرەکی لە فەلسەفەو سایکۆلۆجیای سیاسەتدا دەردەکەوێ. باسو لێکۆڵینەوە دەربارەی داخـــوازیو ئامانجـــەکانی دەســـەڵات بەقـــەد خوێندنــەوەی پراکتیکــی دەســەڵات گرنگــی هەیــە، ســەرباری ئەمــەش، سیاســەتزان لــە ئۆرگانــەکانی حکومەتەوە بەرەو هەڵسەنگاندنی دەزگاکانی تری وەکو یەکێتییە کرێکارییەکان، دەزگا ئاینیەکانو کۆمپانیا بازرگانیەکانو لەو بابەتە بەکێش دەکات. لەڕاستیدا، خوێندنــەوەی هــەرجۆرێ لــەو کۆمەڵــەو گروپانــەی دەســەڵاتخوازن، پەیوەنــدی بەزانســتی سیاسەتەوە هەیە.

بەم پێیە، بابەتی زانستی سیاسەت هەموو ئەو ئەندێشەو دەزگایانە لەخۆی دەگرێ کە لە کۆمەڵدا مامەڵەیان لەگەڵ دەسەڵاتو نفوزدا هەیە. هەروەها ئـــەم زانســـتە لـــە ڕەفتـــاری سیاســـی (واتـــە دەسەڵاتخوازیی) گروپو ڕێکخراو و دەزگاکانی کەم تا زۆر جودا لە دەوڵەت دەکۆڵێتەوە، کە هەوڵدەدەن کــار لــە سیاســەتی گشــتیو ڕەوتــی ئــاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی بکەن[21]. ئەم لێکۆڵینەوەیە تایبەت نییە بەهیچ قۆناغێکی تایبەتی مێژووییو هیچ بوارێکی دیــاریکراوی کۆمــەڵگای مرۆڤایەتییــەوە، مەگــەر لــەڕووی ئاســانکارییەوە بــۆ لێکۆڵینەوەکــە. لــەڕێی لێکۆڵینــەوەی مێــژوو و لــەڕێی لێکۆڵینــەوەوە لــەو ڕەوتانــەی لەکۆمەڵــدا هــەن دەتــوانرێ ئــەو دراوە ئەزموونیانــەی پێویســتن بــۆ زانســتی سیاســەت بەدەست بهێنرێ.

## زانستی سیاسەت ڕوونکردنەوەی حاڵی حازر

لێکۆڵینەوەی مەیدانیی ئەو دیاردەو ڕەوتانەی لــەئارادان بەشــێکی گرنگــە لــە ئــەرکی زانســتی سیاســەت. ئــەم لێکۆڵینەوەیــە بایــەخ بــە چــەمکە سیاسیە باوەکانو ئەو گروپو ڕێکخراوانە دەدات کە خوازیــاری دەســەڵاتو نفــوزن لەکۆمەڵــدا. زانســتی سیاســەت، بەتایبــەتی لــە چــەمکی دەوڵــەتو ڕەگو ڕیشــەکانی، تایبەتمەندییــەکانی، فۆرمو بنــەماکانی ڕەوتو کارکردنەکانی، ئامانجو کارە تایبەتییەکانی، پەیوەنــدیی لەگــەڵ دانیشــتوانو هاووڵاتیــانو گروپــە جــۆراو جۆرەکــان، هــەروەها لــە پەیوەندییــەکانی دەوڵــەت لەگــەڵ دەوڵەتــەکانی دیکــەو ڕێکخــراوە نێودەوڵەتییەکانـــدا دەکۆڵێتـــەوە. لەڕاســـتیدا، پەرەســـەندنی مافــە نێودەوڵەتیــەکانو ڕێکخــراوە نێودەوڵەتیـــەکان، ڕەهەنـــدێکی تـــازەی بـــۆ لێکۆڵینــەوەکانی زانســتی سیاســەت زیــاد کــردووەو بەمانایــەك کردوێتــی بــە کۆمەڵناســیی سیاســی جیهـانی.[22] حـاڵی حـازر لێکۆڵینـەوەکانی ڕەفتـاری سیاسی، بەتایبەتی دەنگدان، پڕە لە تەمومژ. بەڵام هەڵســەنگاندنی بــیروڕاو ئامارەکــانی هەڵبــژاردن ئــەنجامی پێویســت بــۆ ئــەم جــۆرە لێکۆڵینەوانــە

فەراهەم دەکەن‌و ئەم لێکۆڵینەوانە زانیارییەکی زۆر دەربارەی پاڵنەری دەنگدەرەکان بەدەستەوە دەدەن.

## زانستی سیاسەت، تێگەیشتن لە ڕابردوو

لێکۆڵینەوەی هێزو دەسەڵات‌و نفوزی رابردوو زۆر یارمەتی تێگەیشتن‌و ناسینی دەزگاو ئەندێشەو رەوتەکانی ئەمڕۆ دەدات. ئەم لایەنەی لێکۆڵینەوە، ئەو هەوڵ‌و کۆششانە لەخۆی دەگرێ کە لە کۆندا بەکارهێنراون بۆ ئەوەی دەربارەی دەوڵەت‌و حکومەت‌و ماف‌و رەفتارە سیاسییەکان چەندزانیارییەك بەدەست بهێنین‌و بگەینە چەند ئەنجامێك کە قابیلی تاقیکردنەوەبن. هەروەها لێکۆڵینەوەی قۆناغە سەرەتاییەکانی ژیانی سیاسی رێکخراوو کامڵبوونی فۆرمە سیاسیەکان لە سادەوە بۆ ئاڵۆزو لێکۆڵینەوەی مێژووی نووسینی دەستوور لەخۆدەگرێ. زانستی سیاسەت لێکۆڵینەوەی رەوتە جۆراوجۆرەکانی ئەندێشەی سیاسی‌و تێگەیشتن‌و ناساندنی رۆڵی ئەو گروپ‌و رێکخراوانە لەخۆی دەگرێ کە خوازیاری دەسەڵات‌و نفوزن لە کۆمەڵدا.

## زانستی سیاسەت، پێشنیازکەری سیاسەت

ئامانجی کۆتایی هەموو لێکۆڵینەوەکانی زانستی سیاسەت ئەوەیە کە بەو مەبەستە دیاردە سیاسیەکان بناسێنێ کە بڕیارە پراکتیکییەکانی لێبکەوێتەوە دەربارەی ئەو سیاسەتەی کە دەبێ بگیرێتەبەر. لەم بارەیەوە، سیاسەتزان میتۆدەکانی ئەزموونگەریی‌و مێژوویی و پێوانەیی ئاوێتە دەکات. مەیلی گشتی ئەم میتۆدە ئاوێتەییە ئەوەیە کە رێگای رەوتی گۆڕانی ئیحتیمالی بدۆزێتەوەو لەڕووی ئەو ئامانجانەوە کە دەیانەوێ بەدەستی بهێنن لەو رەوتە سیاسیانە بکۆڵێتەوە کە لەئارادان. پێشنیازو تێزەکان بۆ چاکردنی پێکهاتەو ئەو ڕەوتە سیاسیانەی لەئارادان، بەشی پەسەندکراوی زانستی سیاسەتە.

## زانستی سیاسەت لە قۆناغی کۆرپەییدا

وێڕایی ئەو راستیەی کە سەرهەڵدانی بیری سیاسی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە (2500) ساڵ، زانستی سیاسەت هێشتا لە قۆناغی ساواییدایە. ئێرنیست بارکەر یەکەم مامۆستای زانستی سیاسەت لە زانکۆی کیمبریج، لەوتاری دەستپێکی خۆیدا سەبارەت بەزانستی سیاسەت وتی کە هەندێ کەس زانستی سیاسەت "بە نامەفهوم‌و رەنگە بە جێگای گومان‌و مشتومڕ ئامێز" بزانن.[23] زانستی سیاسەت بە بەراورد لەگەڵ مێژوودا بە ئاڵۆزو لە بەراوردکردن نەهاتوو، بە بەراورد لەگەڵ ماف یان ئابووریدا واقبوڵ کراوە کە میتۆدی تایبەتی بیرکردنەوەو زاراوەی هونەریی نییە، و بە بەراورد لەگەڵ زانستە سروشتی‌و ژینگەییەکاندا، وردەکاریی‌و بابەتی دیاریکراوی نییە بەڵام ئەگەر زانستی سیاسەت لەگەڵ کۆمەڵناسیدا بەراوردبکرێ، بە سادەو گونجاوو کەڵەکەکراو دێتە بەرچاو، ئەگەرچی لەسەدەی رابردوودا زانستی سیاسەت زۆر پێشکەوتووە، بەڵام هێشتا لە گۆڕانی بەردەوام‌و گەشەکردندایە.

## 4- پۆلینکاریی زانستی سیاسەت

ئەو کۆمیتەیەی کە یونسکۆ لەساڵی 1948دا دایمەزراند بۆ ئەوەی پەیڕەوی ناوخۆی ئەنیستیتۆی نیودەوڵەتی زانستی سیاسەت ئامادەبکات، بەم شێوەیەی خوارەوە ئەو بابەتانەی ریزکرد کە زانستی سیاسەت لێیان دەکۆڵێتەوە:

1–تیۆری سیاسی

ا-تیۆری سیاسی، ب-مێژووی ئەندێشە سیاسییەکان.

2-حکومەت

ا-دەستوور، ب-حکومەتی نیشتمانی، ج-حکومەتی ناوچەیی و خۆماڵی (هەرێمی و ویلایەتی)، د-بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی، ه-ئەرکە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی حکومەت، و-دەزگا سیاسیە تەنفیزییەکان

3-حزب و گروپەکان و رای گشتی

ا-حزبە سیاسیەکان، ب-گروپ و کۆڕو کۆبوونەوەکان، ج-بەشداریی هاوولاتیان لە حکومەت و بەڕێوەبردنی کاروباری گشتدا، د-رای گشتی

4-پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان

ا-سیاسەتی نێودەوڵەتی، ب-رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، ج-مافە نێودەوڵەتیەکان.

زانکۆی ولاتە جۆراو جۆرەکان، بەپێی پێویست، گۆڕانکاریان لەم پۆلێنکارییەدا کردووە، بەلام چوارچێوەی گشتی بابەت و باسەکان، بەهەمان شێوەی کە یونسکۆ خستوویەتیەڕو، هەروا وەکو خۆی ماوەتەوە.

## 5-ئایا سیاسەت زانستە؟

تا ئێستا بەو مەزەنەیەی کە لێکۆڵینەوەی دیاردە سیاسیەکان لە ماهیەتدا دەشێ زانستی بێ، قسەمان کردووە. بەلام دەربارەی متمانەی ئەو مەزەنەیە دوودڵی لەئارادایەو پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە.

هەندێ لەو کەسانەی کە دەربارەی سیاسەت بیریان کردۆتەوەو نووسیوویانە، ئەوەیان قبوڵ نەکردووە کە بوارێکی زانستی بەناوی زانستی سیاسەتەوە هاتبێتە ئاراوە. لەساڵی 1843دا جۆن ستوارت میل، گومانی لە زانستیی بوونی سیاسەت کرد.[24] لە ساڵی 1857دا بوکلێ رایگەیاند "لە قۆناغی راستەقینەی زانستی مرۆڤدا، سیاسەت زۆر لە زانستی بوون دوورەو یەکێکە لە دواکەوتووترین بوارەکان"[25] وێڕایی ئەوەی کە لەماوەی یەك سەدەو نیوی رابردوودا پێشکەوتنێکی زۆر لە لێکۆڵینەوەی دیاردە سیاسیەکان بەدی هاتووە، هەندێ لە زانایان هێشتا گیرۆدەی دوودڵیەکی لەو جۆرەن. لەبەرئەوە دەبێ دەربارەی ئەوەی کە چ شتێ زانست دەهێنێتە ئاراوە هەندێ لێکۆڵینەوە بکەین بۆ ئەوەی بتوانین دەربارەی ئەم بابەتە ڕایەك دەربڕین.

لە پێناسەی زانستدا وتراوە زانست فۆرمێکە لە هۆشیاری و زانستی کۆمەلایەتی کە ئەرکەکەی بریتییە لە ناسینی رێکوپێکی ئەو یاسا بابەتیانەی بەسەر سروشت و کۆمەڵ و بیردا زاڵن و دۆزینەوەی چۆنیەتی کارکردنیان لە پراکتیکدا. زانست، بریتییە لە هۆشیاری و زانستی مرۆڤ کە لەگەڵ ئەو راستی و واقیعانەدا پەیوەندی هەیە کە رێکخراون و کاری یاسا گشتیەکان نیشان دەدەن. زانست شتە واقیعیەکان کۆ دەکاتەوەو بەپێی پەیوەندیەکی عیللەت و مەعلولی پێکەوەیان دەبەستێ، بەو مەبەستەی کە چەند ئەنجامێکی متمانە پێکراو بەدەست بێنێ. زانست زانینێکە لەسەر عەقڵ و بەڵگە بنیات نراوە، بەم پێیە قابیلی پێگەیشتن و گوێزانەوەیە لەڕێی دەربڕینەوە. خاسیەتە سەرەکیەکانی زانست بریتین لە:

ا-توانای خستنەڕووی فۆرمۆڵیکی وردو هەمیشەیی و پێکەوە گرێ دراوی هەبێ، ب-توانای گشتگیری و پێشبینی هەبێ، ج-توانای راگەیشتن بەدراوو گشتگیریەکان.

دەتوانرێ دوو خاسیەتی دیکە بخرێتە سەر ئەو خاسیەتە سەرەکیانە کە ئەمانەن:

1-پێکهــاتن ســـەبارەت بـــە میتـــۆد 2- بەشێوەیەکی گونجاو فێرکردنی ئەو کەسانەی کە کاری زانستی دەکەن.

بەڵام بەڕای هەندێ، ئەوەی زانست دیاریدەکات ئەوەیــە کــە "بەشــێوەیەکی تایبــەتی و لــەڕووی میتۆلۆجیاوە لەسەرعەقڵ وەستابێ"و ئـەزموونیی بوونو هـەبوونی توانـای پێشـبینی کـردن بـە شـتە پێویستیەکانی زانست ناژمێردرێ. زانست جەخت لــە هـــەبوونی میتـــۆدی ڕێکـــوپێکی لێکۆڵینـــەوە دەکاتـــەوە. بـــەڕای هاکســـلی، زانســـت کۆمەڵـــە زانینێکـــی ڕێکوپێکـــە کـــە لەســـەر عـــەقڵو بەڵگەهێنانەوە وەستاوە.

ئەو زانستانەی کە سەروکاریان لەگەڵ دیاردە سروشــتییەکاندا هەیــە بــە زانســتی سروشــتی و ژینگـــەیی نـــاو دەبـــرێنو ئـــەو زانســـتانەی کـــە سەروکاریان لەگەڵ دیاردە کۆمەڵایەتیەکاندا هەیە بەزانسـتی کۆمەڵایـەتی لەقەڵـەم دەدرێـن، زانسـتی سیاسەت سەر بە گروپی دووەمە.

هەروەکو ئاماژەی بۆکرا، هەندێ لەتوێژەرەکان زانســـتی بـــوونی لێکۆڵینـــەوەی سیاســـییان ڕەتکردۆتەوە. ئۆگەست کۆنت، باوکی کۆمەڵناسیی، ڕایەکی وای هەبوو بەڵگەی دەهێنایەوە کە:

1-توێژەرە سیاسیەکان دەربارەی میتۆدەکانی یەك دەنگ نین.

2-پرانسیپو ئەنجامەکانی بەشێوەیەکی گشتی پەسەند نەکراون.

3-گۆڕانو گەشەکردنی بەردەوامی تێدانییە.

4-ناتوانێ چەند کەرەسەیەك بۆ توانای پێشبینی ئامادەبکـــات.[26] ڕەخنـــەگرانی دوای ئۆگەســـت کۆنـــت چـــەند کەموکورتیـــەکی دیکـــەیان خســـتە سەرخاڵەکانی ئەو.

5-دیاردە سیاسیەکان هێندە ئاڵۆزو هەمە جۆرو شـــەپرێون کـــە میتـــۆدە زانســـتیەکان توانـــای لێکۆڵینەوەیانی نییە.

6-ئەو هۆکارانەی کە کار لە دیاردە سیاسیەکان دەکەن نادیارن لەبەرئەوە تۆمارکردنو جڵەوکردنیان دژوارە.

7-بێدەسەڵاتیی لە کۆنترۆڵکردنی ئەو فاکتەرانەدا کە کار لە دیاردە سیاسییەکان دەکەن تارادەیەك پێشـــبینی و ئـــەنجامگیریی دەکـــا بـــە کـــاری لەکردن نەهاتوو.

8-کەسایەتیو جیهانبینی توێژەر، زۆرجار کار لەو ڕاستیو ئەنجامانە دەکات کە بەدەستیان دەهێنێ. هەتا ئەگەر بێلایەنیش بێت، ناتوانێت وەکو توێژەری زانستە سروشتیەکانو زانستی ژینگە بێلایەن بێت. پـەروەردەو فێرکردنـیو دەوروبـەری کۆمەڵایـەتیو پیشـەیی توێـژەر کـار لـە جیهـانبینیو مامەڵـەی دەکات. سەرئەنجام، لەبەر نەبوونی ئامرازی وردی هەڵســـەنگاندن دەمـــارگرژیی لـــە دیـــاریکردنی ئەنجامەکاندا زیاد دەبێ.

تـەنها ئـەو ڕەخنەگرانە نـین کـە گومانیـان لـە ماهیەتی زانستیی لێکۆڵینەوە سیاسیەکان کردووە. هەنـدێ لـە پســپۆڕانی بـواری سیاســەتیش ئـەو ڕەخنانەیان گرتووە. بۆ نموونە، لە ساڵی 1946دا "بورگان" لە وتەی بەراییدا لە زانکۆی کیمبریجدا وتـی "ئـەمڕۆ دەبێ گومان بکەین کە ئایا بوارێکی زانسـتی هەیـە بـەناوی زانسـتی سیاسـەتەوە، ئـەو گومانەی کە بەلای پێشینانەوە لەڕووی زانستیەوە نەناسراوبوو".

لە قسەی ڕەخنەگراندا ڕەگەزێك لە ڕاستی خۆی حەشــاردراوە. لەڕاســتیدا، لێکۆڵینــەوەی زانســتی دیاردە کۆمەڵایەتیـەکان، بـەپێی سروشـتی خۆیـان نـاتوانن وەکـو زانسـتە سروشـتیو ژینگەییـەکان

وردبن. بەڵام سەبارەت بەوەی کە ڕەخنەگران هەموو جۆرە ئەگەرێکی زانستی بوونی لێکۆڵینەوە سیاسییەکان ڕەتدەکەنەوە، تاڕادەیەك بە زیادەڕەویی دێتە بەرچاو. ڕەنگە ئەوان تەنها ئەوە پەسەند بکەن کە ئەوەی تایبەتمەندیی بە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی دەبەخشێ وردی بێ لە ئەنجامگیریی و بەتوانایی بێ لەپێشبینی کردندا، لەڕاستیدا ئەمە تێگەیشتنێکی نەگونجاوە سەبارەت بە سروشت و ماهیەتی زانست. هەندێ زانستی سروشتی هەن کە توانای پێشبینی کردنی ڕاستییان نییە، وەکو ئەستێرە ناسی. ئایا دەبێ زانستی بوونی ئەم زانستانە ڕەتبکەینەوە؟ کەواتە چۆن دەبێ داوای وردیی لە ڕادەبەدەر لە زانستە کۆمەڵایەتیەکان بکەین. ئەگەر متمانەی گشتی ئەنجامەکان و ڕاستی تەواوەتی پێشبینی کردن، تەنها پێوەری زانستی بوون نەبێ، کەواتە چ شتێکی دیکە زانستی بوونی لێکۆڵینەوەیەك دیاری دەکات؟ لە وەڵامدا دەبێ بڵێین کە میتۆد فاکتەرێکی بێ چەندو چوونە. ئەگەر میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەیەك زانستی بن و توێژەرێکی بەتواناش بەکاریان بێنێ، لێکۆڵینەوەی بابەتکە شێوەیەکی زانستی وەردەگرێ.

بەشێوەیەکی گشتی زانستە کۆمەڵایەتیەکان ئەو تایبەتمەندیەیان هەیە. هەروەکو دەزانین زانستە سروشتیەکان تەنها لەڕووی گیانداریێتیەوە سەروکاریان لەگەڵ شتە بێگیانەکان و ڕووەك و گیاندارەکاندا هەیە، بەڵام زانستە کۆمەڵایەتیەکان وەکو ئەندامێکی کۆمەڵ پەیوەندییان بە مرۆڤەوە هەیە. بە پێچەوانەی زانای کۆمەڵایەتییەوە، زانای سروشتی بەئاسانی کار لە بابەتەکەی خۆیدا دەکات، ئەو بابەتەی ئەو لێکۆڵینەوەی لەسەردەکات لە هەموو شوێنی یەك ئەنجام بەدەستەوە دەدات. بۆ نموونە: دوو+دوو لە هەموو شوێنێ دەکاتە چوار، یان ئاو لە هەموو شوێنێ لە پلەی سەددا دێتە کوڵ، یان.. بەڵام ئەم یەك ئەنجامییە سەبارەت بە ڕەفتاری مرۆڤ لەئارادا نییە. مرۆڤ عەقڵ و لۆجیك و ئیرادەی ئازادی هەیە، لەبەرئەوە کەسە جیاجیاکان لە بەرامبەر پاڵنەرە تایبەتییەکاندا کاردانەوەی جیاواز نیشان دەدەن. هەر جۆرە ئەنجامگیرییەك، کە لەسەر ئەو شێوە دراوە چۆنێتی نادیارە وەستابێ، ئەگەری هەڵەی هەیە و حساب کردن لەسەر ئەگەرێکی وا زۆرجار هەڵەیەکی دژوارە، لەمەش بترازێ بەئاسانی دەکرێ دیاردە سروشتیەکان لە هەلومەرجی تاقیگەدا کۆنترۆل بکرێت و لێی بکۆڵرێتەوەو لێرەوە، لە بارودۆخی تاقیگەییدا بەئاسانی دەتوانرێ هۆکاری هۆیەك و هۆی هۆکارێك بناسرێت. بەڵام دیاردە کۆمەڵایەتیەکان بەو جۆرە نین. نەك تەنها پاڵنەرەکانی مرۆڤ ئاڵۆزن، بەڵکو هیچ گرەنتیەکیش لەئارادا نییە بۆ ئەوەی فاکتەرە لێکترازاوەکان کار لە ڕەوتی ڕووداوەکان نەکەن. دژوارییی لەکاتێکدا زیاتر دەبێ کە هیچ توێژەرێکی سیاسی ناتوانێت بابەتی لێکۆڵینەوەکەی لە بارودۆخی تاقیگەییدا بخاتە ژێر لێکۆڵینەوەوەو بابەتەکەی بخاتە ژێر جۆرەها تاقیگەوە بۆ ئەوەی بگاتە ئەنجام. لەو کاتەدا، بەپێچەوانەی زانای سروشتییەوە کە ئامرازو ئامێری پێوانەی وردی لەبەردەستدایە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکان، زانای کۆمەڵایەتی، هیچ جۆرە ئامرازێکی دەسکردی لەبەردەستدا نییە بۆ ئەوەی یارمەتی بدات کە تێڕوانینەکەی وردبێ[27].

وێڕای ئەم دژواریانە، زانستە کۆمەڵایەتییەکان پێشکەوتنی زۆریان بەخۆیانەوە دیوە. بەڵام ناتوانرێ چاوەڕوانی ئەوەبکرێ کە هیچ یەکێ لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەقەد زانستە پێشکەوتووە سروشتییەکان وردبێ. ئەمەش بۆ کەمتەرخەمی توێژەرە کۆمەڵایەتییەکان ناگەڕێتەوە، بەڵکو هەروەکو ئەرستۆ وتویەتی، لە سروشتی بابەتەکەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەو شتەی کە زانست لەتوێژەرانی چاوەڕێ دەکات ئەوەیە کە لە

لێکۆڵینەوەکانی خۆیاندا لە دەمارگرژیی بەدووربن‌و میتۆدێکی زانستی پەسەندکراو بەکاربهێنن. لە ناسینی راستیەکاندا ڕێ لە تێکەڵ بوونی جیهانبینی‌و هەستی خۆیان بگرن‌و وەکو زانایەك دەبێ زیاتر ئاگایان لە خودی راستی بێ تا ئەو ئەنجامانەی کە هەیەتی[28].

دەبێ دان بەوەدا بنرێ کە زانستی سیاسەت بەقەد زانستە سروشتییەکان وردنییەو ناشتوانێ وابێ. هەروەکو پێشیان وترا، زانستی سیاسەت، هەتا زاراوەی زانستی وردیشی نییە کە لەلایەن هەمووانەوە پەسەندکرابێ. زاراوەکان بەلای کەسە جیاجیاکانەوە مانای جیاجیایان هەیەو پرانسیپ‌و ئەنجامەکانی زانستی سیاسەت بەتەواویش راست‌و دروست نین. ناتوانێ هیچ ڕووداوێکیش بە وردی‌و بەڕاستی پێشبینی بکات. مەیلی ئینسانەکان بێگومان ئاڵۆزو نادیارن، نەریت‌و دەوروبەری کۆمەڵایەتیش دەوری خۆیان هەیە“ بەم پێیە، "جۆرێك لە بەردەوامی‌و هاوئاهەنگی لە مەیلی مرۆڤدا" هەیە کە دەتوانرێ لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ.

جیاوازی بیروبۆچوونی پسپۆڕانی بواری سیاسەت دەربارەی پرانسیپ‌و بنەماکانی زانستی سیاسەت نابێ، سەرسوڕهێنەربێ. زانستی سیاسەت، تەنها زانستێکی سەلمێنەر نییە کە شتە واقیعیەکان کۆبکاتەوەو بەشێوەی پەیوەندی هۆکارێکی (عیللی) ڕێکیان بخات. ئەگەر وابوایە جیاوازییەکی زۆر سەریهەڵنەدەدا. زانستی سیاسەت هەروەها زانستێکی ڕێباز سروشتیە. تەنها بایەخ بە لێکۆڵینەوەی ئەوە نادات کە لەئارادایە، بەڵکو بەمەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجێکی دیاریکراویش لە گۆڕانکارییەکان دەکۆڵێتەوە، لەوێوە کە داوەریی بەهادانانی هیچ یەکێ لە پسپۆڕانی بواری سیاسەت ناکرێ وەکیەك بێ، جیاوازیی سەبارەت بە ئامانجە خواستراوەکانی کۆششی مرۆڤ لە مەسەلە سیاسییەکاندا قابیلی خۆلێلادان نییە و ئەم جیاوازییەش کار لە لێکۆڵینەوە دەکات. بەم پێیە، ئەو بنەمایانەی کە لەبارەیانەوە یەکدەنگی دروست دەبێ، لەسەرهەڵداندان. هەروەها، ئێستا لەنێو توێژەرانی سیاسیدا سەبارەت بە میتۆدە گونجاوەکان بۆ لێکۆڵینەوەی دیاردە سیاسییەکان لێکگەیشتنێکی باش هەیە. لەبەرئەوە ئیدی بەڵگەیەکی باوەڕپێکراو لەئارادا نییە بۆ ئەوەی زانستی بوونی سیاسەت ڕەتبکەینەوە.

ئەم قسەیە بەو مانایە نییە کە زانستی سیاسەت هێشتا یەکێك نییە لەو زانستانەی کەم گەشەیان کردووە. لێکۆڵینەوەی بەردەوام‌و پەسەندکردنی میتۆلۆجیای گونجاو پێشگریمانە پێویستەکانی گەشەکردنی زانستی سیاسەتن لە داهاتوودا. تا ئێستا هیچ شاڕێیەك دروست نەکراوە، بەڵام پێشڕەوانی ئەم زانستە چەند کوێرە ڕێگایەکیان دروستکردووە کە بە تێپەڕبوون پیایاندا دەتوانرێ سەرلەنوێ ئەم زانستە دروست بکرێتەوە بۆ ئەوەی بیرناردشاو وتەنی "شارستانیەت رزگاری ببێ" ئەگەر زانستی سیاسەت پەیامێکی لەوجۆرە هەڵبگرێ، دەبێ بە هونەری باڵای مرۆڤایەتی، ئەو هونەرەی کە لە خودی سیاسەتدا خۆی حەشارداوە.

## 6-ڕۆڵی زانستی سیاسەت لە دیموکراسیدا

سەردەمی ئێمە سەردەمی دیموکراسییەو خەڵك لە دیاریکردنی سیاسەت‌و کارە تایبەتیە سیاسییەکاندا دەورێکی گەورەیان هەیە، سیاسەت ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ هەموو مرۆڤەکان دەگرێتەوە. زانستی سیاسەت چەند بنەمایەك دەکات بە بڕیار کە دەبێ لە کاروبارە گشتیەکاندا پەیڕەوییان لێبکرێ. زانستی سیاسەت، خەڵك سەبارەت بە ئەرك‌و مافەکانیان وریادەکاتەوە. خەڵك سەبارەت بە ئامانج‌و ئەرکەکانی دەوڵەت‌و پێگەی تاك‌و پەیوەندیی لەگەڵ دەسەڵاتی دەوڵەتدا

هۆشیاری پەیدادەكات. خەڵكێكی لەو جۆرە دەتوانن لە كاروبارە سیاسیو كۆمەڵایەتییەكاندا رۆڵێكی گرنگ ببینن. لەو وڵاتانەدا كە خەڵك هۆشیاری سیاسییان نییە، پێوەرەكانی ژیانی سیاسیو بەڕێوەبردنی كاروباری گشتیو هەڵبژاردنی سیاسەتمەداران لە ئاستێكی باڵادانییە، ڕێبەرەكان بەرپرسی كارەكانی خۆیان نینو سەبارەت بە رەخنە نیگەرانیان نییە. ئەمانجی سەرەكی فێربوونی زانستی سیاسەت، بەخشینی هۆشیاری سیاسییە بە خەڵكی كۆمەڵگایەكی ئازاد. هوشیاریی سیاسی خەڵكو هەستكردنیان بە لێپرسراویی لە بەرامبەر چارەنووسی خۆیانو وڵاتەكەیاندا دەتوانێ ببێتە هۆی مانەوەی ئەو كۆمەڵگایەی دەیانەوێ. ئەگەر هۆشیارییو لێپرسراوێتیەكی لەوجۆرە نەبێ، كۆمەڵگا لەبەریەك هەڵدەوەشێ. هۆشیارییو تێگەیشتنی ئاڵۆزییەكانی حكومەتو سیاسەت، بەهایەكە كە هەموو خەڵكێ دەبێ بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی خۆیان بیدەن.

زانستی سیاسەت هەوڵدەدا ئەم جۆرە هۆشیاریانە بهێنێتە ئاراوە. تەنها دەنگدان لە هەڵبژاردندا مەرجی تەواونییە بۆ بەشداریی سیاسی، بەڵكو زانینی وەڵامی راستی پرسیارە سیاسیەكان پێویستە. خەڵك دەبێ بزانن كە حكومەتی وڵاتەكەیان چۆن كاردەكاتو هەروەها دەبێ لەوە تێبگەین كە لەپشت سیاسەتە تایبەتەكانەوە ئەو بەرژەوەندییو هێزانە چین كە هەنو ئەنجامی پراكتیكی ئەو سیاسەتانە چین. چ كەسانێ بەڕاستی لەلایەن خەڵكەوە هەڵبژێردراونو خەڵك ئەو كەسانەی بۆ گەیشتن بە چ ئاوات گەلێك هەڵبژاردووە. ناهۆشیاری سیاسی، زۆرجار بۆتە هۆی لەناوچوونی وڵاتو ژیانی مرۆڤەكان[29].

هەروەها زانستی سیاسەت هەوڵدەدات بە بەخشینی زانیاری لەبار بەكەسانی تەیارو ئارەزوومەند، ئەو كەسانە بۆچەند پلەیەك لە كاروباری سیاسی، حقوقی، فێركاریی، خزمەتگوزاریی لەناو وڵاتو دەرەوەی وڵات ئامادەبكات. ئەم ئەركەی زانستی سیاسەت بەشێوەیەكی گشتی لە زانكۆكاندا ئەنجام دەردێو بڕوانامەی زانستی بەو كەسانە دەدرێ كە ئەو زانیاریانەیان وەرگرتووەو فێری بوون.

## پەراوێزەكان

1–لەهەمان شوێندا ئاماژە بۆ ئەوە كرا كە سیاسەت لەگەڵ زانستی سیاسەتدا جیاوازی هەیە. سیاسەت لە مەفهومی گشتیدا لە ژیانی كۆمەڵایەتیدا وجودی هەیە، بەڵام زانستی سیاسەت دەبێ وەكو زانستێكی دیكە بخوێنرێ و ئەوەشە كە لە زانكۆكاندا دەخوێنرێ یان كەسانێك بۆ خۆیان دراسەی دەكەن. بۆ سیاسەتو زانستی سیاسەت بڕوانە بەشی (پێناسەی زانستی سیاسەت) لە هەمان بەشدا.

2–ارسطو، سیاست، ترجمه حمید عنایت چاپ سوم تهران شركت سهامی كتابهای جیبی 1364 ص5 .

3–هەمان سەرچاوەی ژمارە 2 لاپەرە13,14.

*4-john R. seeley, Introduction to political Science (london: Gorge Allen and Unwin, 1923) p.32.*

5–رابرت دال، تجزیه و تحلیل جدید سیاست، ترجمه حسین ظفریان (تهران نشر مترجم، 1364)ص1.

*6- A.Rubinstein, G. Thumm, The Challenge of politics: Ideas and lssues, 3rded. (Englewood Cliffs, N. J.:prentice-Hall,Inc,. 1970) p.2.*

7–یەكێك لە یەكەمین بەكارهێنانەكانی زانستی سیاسەت لە دەهەی 189دا لە كۆلیژی زانستە كۆمەڵایەتیەكان لە زانكۆی كۆڵۆمبی بەناوی (كۆلیژی زانستە سیاسیەكان) دامەزرا، ئەم كۆلیژە چەند بوارێك وەكو ئابووری،

کۆمەڵناسی، مێژوو، هیومانیزم، ئامار، مافە گشتیەکان‌و حکومەت یان زانستە سیاسیەکانی لە خۆگرتبوو بڕوانە:

*Seymour Martin Lipset (ed) Politics and The Social Sciences (London Oxford University Press 1969) p x*

ئەم کتێبە لە پەیوەندی زانستی سیاسەت و مێژوو، هیومانیزم، کۆمەڵناسی، ئابووری دەروونزانی و ئامار دەکۆڵێتەوە.

*8-Unesco Contemporary political Science A survery of Methods Research andTeaching Unesco 1950 p.4.*

9-دال، پیشین، ص2 .

*10-Harold Laski, A Grammar of Politics, 5th ed. (London: C.Allen & Unwin, 1967)p.131.*

*11-Henry Sidgwick, The Elements of Politics (London: Mamillan 1920 ) p. 2:cited in : N.N.Agarwal, V.Dhushan, V.Bhagwan,Prinicples of Political Scinece 13th ed (new delhi: r.chand and co., 1991)p.7.*

*12-Ronald Pennock, David Smith, Political Scince (NewYork: Macmill an, 1964) p. 2.*

*13-G.E.Catlin, Systematic Politics (Toronto:Toronto Vniv Press , 1962 ) p.36.*

*14-Bertrand de Jouvenal , The Pure Theory of Politics (Cambridge: Cambridje University Press, 1963)p.82.*

15-دال، پیشین،ص7-8 .

16-بۆ چەند نموونەیەك لە لایەنگرانی هێز بروانە:

*Hans J.Morgenthau Politics Among Nations The struggle for Power and Peace NewYork Alfred A. Knopf, Inc,1972*

*D.D. Raphael, Problems of Political Philosohy 2nd London Macmillan 1990.*

*17- D. Held and A. Leftwich, (A. Discipline of Politics) in : A. Leftich (ed), What is Politics (Oxford: Basil Blackwell, 1984)p.144.*

18-لە فەسڵی چوارەمدا دەربارەی دەسەڵات‌و بەشێکی تر لە چەمك بنەما تازەکان لە زانستی سیاسەتدا زیاتر قسە دەکرێ. لێرەدا تەنها لەبەر ئەوەی هەندێ پێیانوایە ئەرکی سەرەکی زانستی سیاسی خوێندنەوەی دەسەڵاتە ئاماژەی بۆ کراوە.

*19- Okwudiba Nnoli, Lntroduction to Politics (Essex: Longman Group ltd., 1990)p. 2-5and 7.*

20-بۆ خوێندنەوە دەربارەی زانستی سیاسەت لە یەکێتی سۆڤیەت، بڕوانە:

*Ronald J. Hill ,Soviet Political political Science and Reford Martin Oxford Roberston and Co Ltd, 1980.*

21-ك.ك. رودی،ت، ج. اندرسن و ك.ك.کریستول، اشنایی با علم سیاست، ترجمە بهرام ملکوتی، 2جلد، چاپ دوم (تهران: کتابهای سیمرغ 1351)ج1،ص10.

*22-C.F. Beni Prasad, The Democratic Process (London: Oxrord University press, 1932) p.6.*

*23-E.Barker, The Stuty of Political Science and it's Relation Cognate Studies (Canbridge: Cambridge University press, 1928)p.1.*

*24-J.S.Mill, A System of Logic ,8 hted. (London :1900) Cited in: Agarwal, op.cit, p.19.*

*25-Buckle, History of Civilization in England, Vols. 3 (London: 1936) Vol. 3,p. 301, cited in Ibid.*

*26-Mill, Op.Cit. p. 547, in Ibid. p.20.*

*27-A.C. Kapur, Principles of Political Science, 17thed (New Dalhl: S. Chand and Co. Ltd, 1987) p. 19, and Agrwal. Op cit., p.21.*

*28-W.G. Runciman, Socaial Scial Science and Solitical Theory (Cambridge: Cambridge University Press, 1965) p.122.*

29-رودی پیشین، ص25.

## سەرچاوە

# وتووێژ سەبارەت بەئەفراندن "خلق – *Schopfung*"

ئیبەرهارد یونگل – پیتەر زلۆتەردایك
لە ئەڵمانییەوە: بەکر عەلی

پیتەر زلۆتەردایك لەدایكبووی 1947 لە بەناوبانگترین فیلۆسۆف و کولتورناسی نوێکاتی ئەڵمانیایە، بە دوو بەرگی کتێبی "رەخنەی عەقڵی گاڵتەجاڕی – 1983" ناوبانگی فەلسەفی خۆی لە ئەوروپادا سەپاند و ئەم کتێبە فرۆشراوترین کتێبی فەلسەفی سەدەی 20 بوو. یەکێك لە کارە گرنگەکانی تری بریتییە لە سێینەکتێبی "کایە – *Sphaer*" لە دووتوێی چەند هەزار لاپەرەیەکدا. جگە لە چەندین کتێب و گوتار و دیداری فیکری گرنگ، بەرنامەیەکی فەلسەفیشی لە کەناڵی *ZDF*ی ئەڵمانی بەناوی چوار کوچکەی فەلسەفی هەیە. پاییزی 1999 بە گوتاری "چەند رێسایەك بۆ باغی مرۆڤ" بۆمبێکی خستە ناو ماڵی خامۆشی فەلسەفەو زانستەوە، کە سەبارەت ئاسۆ ئایندەییەکانی جینتەکنیك لە ناو کایەی ئەنترۆپۆلۆگیدا دەدوا، لێرەوە شەڕی گەورەی لەگەڵ هابەرمازدا دەستپێکرد. ئەها ڕاگری کۆلێژی پێکهێنانە لە کارلسرۆ.

**یونگل:** خوشك و برایانی بەڕێز، ئێوە گەواهیحاڵی ئەم ئەزموونەن کە بەڕێز زلۆتەردایك و من پێشتر دەرفەتی ئەوەمان بۆ نەرەخسابوو سەبارەت بەم گفتوگۆیە بدوێین، واتە ئەم گفتوگۆیە ئەفراندنێکە لە هیچەوە، کە ئێوە هەنووکە لەگەڵماندا دانیشتوون. سەرەتا من خۆم چەند سەرنجێك لەمەڕ وتەزای "ئەفراندن" دەدەم، کە بەلامەوە زۆر پڕ مانا و پێویست دەردەکەوێت، چونکە ئێمە پتر لە سەدەی 20دا وتەزای "ئەفراندن" و داتاشراوەکانی ئەم وتەزایە بە گوێیەکی هەستیارەوە دەبیستین وەك لە سەدەکانی پێشتردا. لە دەوروبەری سەدەی 20دایە کە خەلقاندن دەنگدانەوەیەکی تایبەتمەندی هەیە، بگرە بووشە بە زرنگانەوەیەکی مەترسیدار، ئەم مەترسییەش هێندە گەورە دەردەکەوێت تەنانەت خودی کریستەکانیش |مەسیحەکانیش کە لەو

باوەڕەدان و دەشزانن کەوا یەزدان نەك ئەوانی هەر ئەفراندووە، بەڵکو دەشیانپارێزێت. قسەکردنی من لێرەدا لەمەڕ پاراستنی ئەفراندن لە میانەی مرۆڤەوە دەبێت. ئایا چەمکی "ئەفراندن" و هەردوو ئەم چەمکەی سەربەون "پاراستن و پاسەوانکردن"، گەر ئێمە سەبارەت پاسەوانکردنی ئەفراندن لە ڕێی مرۆڤەوە بدوێین، تا ئێستا بە گونجاوی بەکاربراون؟

بەپێی چاوەدێری من ئەوە دەرەنجامی ئەو گەشەسەندنەیە کە بە شێوەیەکی ناکۆکئامێزانە پەیوەستە بەوەی کەوا خودی مرۆڤ خۆی چەشنی ئەفراندنەکەی پەسەند و ستایش کردووە. شاعیر هەمیشە بە یەزدانی دووەم دانراوە و هونەرمەندیش _ ناوبەناو_ هەروەکو بوونەوەرێکی ئەفرێنەر: "مەرگی لە مادەوە دانەماڵیوە، باریك و سووکەڵە، وەك ئەوەی لە هیچەوە دەئەفرێنێت، لە ڕینیسانسیش بەدواوە ئیدی مرۆ ستایشی ئەمەی لە دیدێکی فەلسەفییەوە وەها چەسپاندووە: هەروەکو یەزدان ئەفرێنەر بین. ئەمەش بەشێوەیەك بایەخی قەشەی کاتۆلیکی، کاردینالی مەزن "نیکۆلاوسی کویز" بوو، کاتێك دانی نا بەو چەشنایەتییەی مرۆڤدا. ئیدی لە میانەی گەشەسەندنی سروشتناسییەوە ئەم ساتەوەختە پێویستەیە سەرهەڵدەدات و، دواتریش تیۆرگەرەکان تەنیا لە ڕێی تیۆرەکانیانەوە دەبن بە بکەر. بە نموونە تیۆرییەکەی گالیلی بریتییە لە کردارێك. ئیدی ئەو بوو بە بزوێنەری زەوی و بەو کەسەی خۆر ڕادەگرێت. مرۆڤ هەموو شتە یەزدانییەکان دووبارە دەنرخێنێتەوە و دەگۆڕێت، ئەو شتانەی مرۆ پێی خۆشحاڵە و تا بەر لە سی چل ساڵێك لەمەوبەر شانازی پێوە دەکرد، ئێستا دەبینێت بەهرە ئەفرێنەرەکانی خۆی زیان بە ئەفراندن دەگەیەنێت. ئەوەی هەڕەشە لە ئەفراندن دەکات بریتی نییە لە دەسەڵاتە شەڕانگێزەکان یان پۆخڵ و نەوییەکان، یاخود بەدکاری، بەڵکو هێزە ئەفرێنەرەکەی خۆیەتی ئەو هەڕەشەیە دەکات، بە شێوەیەکی ئەوتۆ هەنووکە وا پێویست دەکات خودی کریستیان| مەسیحیەت سەبارەت ئەوە بدوێت کەوا ئەفراندن لە ڕێی کارەکانەوە بپارێزێت.

**زلۆتەردایك:** پاش ئەو دەروازەیەی بەڕێز یونگل، وەك تیۆلۆگێك، بایەخی خۆی بەم چەمکە لە لێکدانەوەیەکدا خستەڕوو، منیش لە دیدی خۆمەوە دەخوازم هەوڵ بدەم لەوەی، چی وا دەکات ئەم وتەزایە شیاوی بیرکردنەوە بێت. من تەواو لەگەڵ بەڕێز یونگلدا سەبارەت بەو واتایە تەبام کەوا ئێمە لێرەدا لە "هیچ" ەوە شتان دەئافرێنین. کە ڕەنگە بە مانایەکی زۆر ورد بریتی بێت لە پێکەوەلکانی دووپارچە "هیچ" بۆ یەك "کۆ هیچ".

بەو پێیەشی "هیچ" بریتییە لە "شت"، ئەوا وادیارە لە مۆدێرنەدا، بووبێتە "کۆ". ئەمەش دەبێت ئێمە هەر لە سەرەتاوە وەك تێبینییەکی گچکە لە شوێنگەی "شت" دا بیچەسپێنین.

**یونگل:** هیچێکی زۆر توانستدار.

**زلۆتەردایك:** من هەر لە سەرەتاوە دەرك بەوە دەکەم کەوا ئێوە خەسڵەتە کۆنزەرڤاتیڤەکەی "ئەفراندن" دەهێننەوە، بەلای کەمەوە گەر ئەو وتەزایە، کە وەکو ئەمڕۆ بە ڕاگەیاندنی سەر دیوارەکانەوە بێت، ئەوا لەم ڕێیەوە بەڕاستی جۆرێك لە ئاژێری کاتۆلیکی *_katholischer Alarm_* دێتە ئاراوە. من پێم وایە مرۆ بۆی هەیە ئەمە گریمانە بکات. ئێمە هیچمان لە کاتۆلیزمی ئەم ئاژێرەوە بە مانایەکی تەسك کارتێکراو نین، چونکە ئێمە هیچ کاممان گومان لەم ئایینزایە ناکەین، بەڵام...

**یونگل:** جارێ نا.

**زلۆتەردایك:** ڕەنگە ئەم "جاریٚ" یە ئەمە بگەیەنێت: گەر مرۆ تەواو قووڵ بیر بکاتەوە، ئەوا دواجار دەبێتەوە بە کاتۆلیك؟ ئەوسا ڕەنگە ئەمە ببێتە شتێکی قووڵی ئەوتۆ کە تاوەکو ئێستا بەلامانەوە هێشتا لەناو دوابەرەنجامەکانی خۆیدا بە پیت ماوەتەوە. هەڵبەت من پێم وایە ناوکی گرنگی ئەم بیرلێکردنەوە تیۆلۆگییە زۆر گرنگە، هێندە گرنگ، کەوا دانایانە دەردەکەوێت گەر لە تێڕوانینێکی ترەوە، یان لە فاکولیتی| کۆلیژی فەلسەفییەوە دووبارە بکرێتەوە، یاخود بەلایەنی کەمەوە ڕاستنووس *paraphrasieren*بکرێتەوە. ڕاستییەکەی بەوجۆرەیە، ئێمە پێویستە سەردەمی نویٚ وەکو قۆناغێك تێبگەین کە تێیدا پەیوەندی نێوان یەزدان و مرۆڤ لە ژێر ئاماژەیەکی دیدا دەنوێنرێت. دەکرێت بڵێین: چاخی پاسیڤێتی "بوون" کۆتایی دێت و چاخی ئەکتیڤیزمی "بوون" دەست پێدەکات، بەتایبەتیش بەهۆی ئەو هۆکارانەوەی کە لێرەدا بە شێوەیەکی تاکوتەرا بلاٌو نین، بەڵکو ئەوان لە هەموو سەردەمێکی تردان. ئەو دەزانێت کەوا ئەویش وەکو پاشبەندێکی مۆدێرنە هاوکارە لەو توانا لوولپێچییەدا، گەر ئەم گوزارەیە شیاو بێت، لوولپێچێك *einne Spirale* کە هەمیشە خۆی بە بەردەوامی لەمیانەی سەدەکانەوە شل کردۆتەوە، لوولپێچێکی بەشدار لە شۆڕشی توانادا، شۆڕشی سەرپشککردنی تەکنیکیانەی ڕەگەزی مرۆیی، ئەو شۆڕشەی کە تاوەکو ئەم چرکەساتە ڕێبەریمان دەکات و بەبیٚ هیچ گومانێکیش زۆر دوورتریش هەڵماندەگرێت. من هیچ بیانوویەك بۆ ئەوە نابینمەوە گومان لەوە بکەین کەوا لوولپێچی دەسەڵات *Machtspirale* بەردەوام بۆ کاتێکی نادیار هەر بەرەو ژوور لوول دەخوات. بەلاٌم لەگەڵ هاودووەکەم "بەڕێز یونگل" و تیۆلۆگە ئاژێرەکاندا *Alarmtheologen*و هەروەهاش لەگەڵ ئاژێرگەرە سەوزەکاندا *Alarmisten gruene*ئەو مۆتیڤانە دەبینمەوە کە لە پێناویاندا قسەدەکرێت بۆ سازدانی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی لە ڕزگارکردنی تواناکانی مرۆڤ. بە چەند وشەیەکی تر: تاوەکو پەیوەندی نێوان "توانین و | نە توانین" هێندە دڕندانە گەشە بکات و هێندە پڕ کارەسات بێت وەك ئەوەی لە باری ئێستای ژیاریدا بەرجەستەیە، ئەوا ئێمەش ئیدی ئەو بیانووەمان هەیە کەوا هەست بکەین هەڕەشە لێکراوین. لەبەر ئەمەیە ئێمە بیر لە مانای هاوکێشەی "پاراستنی ئەفراندن" دەکەینەوە. سەرەتاش دەبێت مانای تەواوی گفتوگۆی لەو جۆرە لە نێوان تیولۆگێك و فیلۆسۆفێکدا_ ئەوەی کە هەمیشە بۆ خۆمی دادەنێم_ بۆ ئەو تێمایە لەوەدا ببینرێتەوە کەوا ئەوە تایبەتکارییە کۆنەکانی فەلسەفە لە مەسەلەکانی سەرهەڵدانی گەردوونیدا دەوەستێتەوە. بەڕێز یونگل پێش کەمێك خۆتان گوتتان، جانازانم لە داخەوە بووبێت یان لە خۆشییەوە، لە ڕینیسانس بەدواوە شاعیران خۆیان بە یەزدانی دووەم دادەنێن، ئەوەی لای من بە تەمومژاوی دەمێنێتەوە ئەوەیە، داخۆ ئەمە ماف بەخۆدانێکە یاخود گەشەسەندنێکی بیٚ چەندوچۆنی حەتمییە؟ هەرچۆنێك بێت ئێمە دڵنیاین لەوەی کەوا چەمکی ئەفراندن بە شێوەیەکی بنەڕەتی و سەرەتاییانە بەربۆتەوە ناو مۆنۆپۆلی تیۆلۆگیاوە، هەروەها دڵنیاین لەو جەغت کردنەی کەوا ئەمە پەیوەستە بە دینامیکیەتی تایبەتمەندی سەردەمی نوێوە کە دەخوازێت ئەم مۆنۆپۆلکردنە وردوخاش بکات. یەکەمین ئاماژەش لەسەر وردوخاشکردنی ئەم مۆنۆپۆلکردنە کاتۆلیکییە دەکرێت لە سەدەی2 و3 دا ببینرێتەوە، کە بە ئەنتیکی درەنگ ناونراوە، کاتێك تیۆلۆگە گنۆستییەکان/ عارفەکان دەستیان کرد بە وتنەوەی

هەڵەکانی ئەفرێنەر/ خالق. گەر دوورتریش بڕۆین ئەوا کاتێك "ئەفراندن" لە مانا گشتییەکەیدا وەکو "شکست" تەماشا بکرێت و یەزدانیش وەکو یەکەم "فەرامۆش" سکاڵای لێبکرێت، ئیدی کاری یەزدانیش هەر لەو شتە چەپەڵەی مرۆڤ دەچێت کە چ هاوبەشێکی نییە. کەواتە ڕەخنە لە پیشەی دەستەوە باز دەدات بۆ سەر ئاستی پرینسیپەکان، ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کەوا بابەتی "توانینی نەـ توانین" هێندەی تیۆلۆگیا خۆی کۆنە، کەواتە ورتەورتکردن لەمەڕ چەمکی ئەفراندن خۆی بریتییە لە ڕەخنەییە دژەکانی ئەفراندن.

**یونگل:** ڕەنگە شیاو بێت ئەوە بهێنینەوە یاد کەوا ئەوە هێشتاکە لە دۆخی سەردەمی ڕامانی دیدگاییانەی خوداناسیدا | گنۆستیکدا نەبوو بوو، چونکە گرفتەکە کۆنترە لە ڕامانە تیۆریەکانی گنۆستیکەکان و تیۆلۆگیای مارسیۆن *Marcion*. مارسیۆن کە سەرێکی گەورە و تیژی هەبوو، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کەوا جیهان لەلایەن دەمیورگەنیکەوە/ خالقێکەوە *Demiurgen* دروستکراوە، کە ئەو یەزدانە بەدەیە کە "توانین" ناتوانێت، لە کاتێکدا یەزدانی ئینجیلی یەزدانێکی نامۆ و دوورە، ئێستا ئەم یەزدانە پێویستە دووبارە دەست بکاتەوە بە چاککردنی ئەو شتانەی خودای ئەفرێنەر خراپی کردبوو. بەڵام تێڕوانینەکە ئەوەیە کەوا "ئەفراندن" بەو شێوەیەی لەلایەن ئێمەوە دەناسرێت، یان دروستتر بڵێین، لەلایەن ئێمەوە "ڕاستی" بەو شێوەیە دەزانرێت، "ئەفراندن" باسکراوە. ئیزرائیل خۆی لە باری هەڕەشەدا بینییەوە و لە دژی ئەم هەڕەشەیەشدا لە ڕێی "تۆهووابۆهو – *Tohuwabohu*" وەوە و هەروەها لە ڕێی دژیارەکانەوە باوەڕی بەوە هێناوە کەوا یەزدان بە ئاشکرا ئەم گەلەی هەڵبژاردووە، یەزدانیش ئەوەیە کە تەواوی "ڕاستی" ئەفراندووەو دەشیپارێزێت. بە ڕادەیەك ئیدی ئەفراندن بە پلەی یەکەم بریتییە لە دژەچەمکێك بەرامبەر بە"ڕاستی"یەکی تەواو نەزانراو. پاشان ڕەنگە لەوەدووکەوتنی ئەو بیرۆکانەی تردا جارێکی تر بە توندی پێ لەسەر ئەوە داگیرێتەوە، کەوا مرۆ تەنیا ئەو ساتە بە ڕەوایی قسە سەبارەت "ئەفراندن" بە مانا کریستیانییەکەی دەکات گەر لە هەمان ساتدا باسی لە "پاراستن" کرد. ئێمە کە لۆتەریانە گەورە بووین ئەمە لە کتێبە بچووکەکەی ڕێسای ئایینی کریستیانی/ شەریعەت "کاتەشیزم – *Katechismus*"دا فێربووین. من لەو باوەڕەدام، کە یەزدان من و هەموو بوونەوەرانی تری ئەفراندووە و، لەش و گیان و چاو و گوێ و هەموو ئەندامەکانی تر، عەقڵ و هەموو هەستەکانی تری پێداوم و تا ئێستاش ڕایگرتووە و دەیپارێزێت. لە ڕاستیدا "پاراستن" بریتییە لە ناوەڕۆکی "ئەفراندن"، تەنانەت شلایەر ماخەری گەورەش نەیویستووە لە بارەی ئەفراندن لە دەستپێکەوە بدوێت، بەڵکو سەبارەت هەموو ئەو شتانەی کە لە بڕگەی –1– دا هەن، وەکو زانستێك لە بارەی پاراستنی یەزدانییەوە پیشاندراوە. ئەگەر ئەمەش زێدەڕەوییەك نەبێت ئەوا دەتوانین هەر لەوێدا بەجێی بهێڵین و واز لەم مەسەلەیە بهێنین. بەڵام شتە ئاشکراکە ئەمەیە: پەیوەندی هاوچەرخانەی ئەفراندن بریتییە لە جیهانی هەنووکە پارێزراو، کە تێیدا "ئەفرێنەر" وەکو "پارێزەر" دەناسرێت. ئەگەر ئێستاش مرۆڤ لەوەدا خۆی لەگەڵ "توانین"ەکەیدا هاوشان بکات، ئەوا، بەڕێز زلۆتەردایك، گەر ئەمە بەس بێت، ئەوا بەلای منەوە پێدەچێت پرسیارەکە تەنیا لە نێوان شکستی "توانین" و سەرکەوتنی "توانین"دا جیابکرێتەوە: ئایا پێویست ناکات ئەوە

بچەسپێنرێت کەوا شتەکانی تریش بە چەمك و وتەزای "توانین" جیابکرێنەوە؟ ئەفرێنەر دەتوانێت لە هیچەوە شت دروست بکات، مرۆڤیش دەکارێت لە شتەوە هیچ دروست بکات. ئەمانەش دوو شێوازی تەواو جیاوازی توانینن.

**زلۆتەردایك:** پێموایە ئێوە لەم پنتەی دواییاندا کەمێك گەشبینن. من لەو باوەڕەدانیم، کەوا مرۆ دەتوانێت لە "شت"ەوە "هیچ" دروست بکات. کە بێگومان ئەوەش خەونێکی مەزنە. هەڵبەت من ناخوازم نکوڵی لەوە بکەم کە لەناو مرۆڤدا توانستێکی لەناوبەر هەیە، شیاوی سەرنجدانیشە. ئێمە خەون بەوەوە دەبینین کە بتوانین کون بکەینە بوونەوەرەکان، بانگهێشتی "هیچ"بکەین و لەگەڵیدا بڕێك شوێن بگۆڕینەوە، بەتایبەت بۆ ئەو جێگایانەی کە شتێکی وەڕزکەر خۆی زۆر زۆر بەرین کردبێت. جۆرێك لە فانتازیای خاڵیکردنەوە و چۆڵکردن و لەناوبردن هەیە کە هەمیشە شکست دەهێنن، چونکە تێکشکاندنیش پاشماوە دروست دەکات، کەواتە "لەناوبردن"یش هەمیشە وەکو "شت"ێك دەمێنێتەوە.

**یونگل:** ئایا بۆم هەیە بەرپەرچی ئەوە بدەمەوە؟ من لەوەدا کۆکم کەوا کون دروستکردن بریتییە لە خەونی منداڵێتی. هەردوو کوڕی یەزدانەکە *Patensoehne*، کە زۆر تایبەت لە دڵمدا پێگەییون، تەواو شارەزای ئەوە بوون لە هەرکوێیەکدا بێت کون دروست بکەن، بێگومان ئەمەش تا کۆتایی سەرناگرێت، هەر بۆیە دواجار دەکەوتنە گریان. ئەوەی من لەمەدا مەبەستمە، ئەوەیە مرۆڤ دەتوانێت لە شتەوە هیچ دروست بکات، گەر روونتری بکەمەوە، ئەوا دەڵێم، بەلای بیرکردنەوەی بیبل/کتێبی پیرۆزو تیۆلۆگیای ڕێکخراوەوە بە شێوەیەکی گشتی "بوون" بریتییە لە "پەیوەنداری" و "پەیوەستی". وە گوناهی مرۆڤیش لە تێگەیشتنی بیبل دا بریتییە لەوەی مرۆڤ خۆی لە "بێ پەیوەندیداری" دا چڕبکاتەوە. ژیانی ئێمە یان ئەوەتا ژیانێکی پڕ پەیوەندییە، یاخود بە هیچ جۆرێك هەر ژیان نییە. چڕبوونەوەی مرۆڤیش لەناو بێ پەیوەنداری و تەنگبوونەوەدا و جەختکردنی لەسەر بچڕاندنی پەیوەنداری، ئەمە گوناهێکە لەخۆیداو هەر لێرەشدایە کە شتێکی وەك "لەناوبەر" ڕوودەدات و، ئەوساش شیاو دەبێت گەر هەر پاشماوەیەك بمێنێتەوە. منیش لەوەدا کۆکم لەگەڵتاندا، کە ئەمە نێگەتیڤیکی ڕووت نییە. بەڵام ئەوەی لەمەوە پەیدا دەبێت، ئەوە گەلێك خراپترە. واتە پەیوەندییەکی تێکشکێنەر پڕ بەدترە لە هیچێکی سادە. چونکە هیچی ڕووت شتێکی بێ زیانە. پاولۆسی پەیامبەر لە نامە ڕۆمییەکاندا نووسیویەتی:"مەرگ کرێی گوناهێکە.". واتە دواجار چڕبوونەوە لەناو بێ پێوەندیداریدا خۆی لەناو "مەرگ" دا بەرکەماڵ دەکات و مەرگیش خۆی بریتییە لە ڕوودانی بەرکەماڵبوونی بێ پەیوەنداریێتی و پڕبوونەوەی بێ پەیوەستداری، لە مەرگدا پەیوەندیم بە خودی خۆمەوە کۆتایی دێت، لە مەرگدا پەیوەندیم بە دەوروبەرو ژینگەکەمەوە کۆتایی دێت، پەیوەندیم بە هەبوونی مێژوویی و سروشتی و تەنانەت بە یەزدانیشەوە کۆتایی دێت. بەڵام داخۆ پەیوەندی یەزدان بە منەوە کۆتایی دێت، ئەمە پرسیارێکی تری تەواو جیاوازە.

**زلۆتەردایك:** من دەخوازم جارێکی دی بزەڤڕێمەوە بۆ ئەو پنتەی کە تێیدا ئێوە بنەڕەتی چوارچێوە کولتورییەکەی ئێمەتان بەستەوە بە چیرۆکی ئەفراندنەوە، ئەمەش بە واتای تەنگبوونەوە و چڕبوونەوەی کات / سەردەم لەناو جوولەکایەتیدا وەکو ئێوە ناوی دەنێن. ئێمە هێشتا ئەوە نازانین

داخۆ ئەفسانەناسانن، ڕابییەکانن "زێوانی جوولەکە" یاخود پێغەمبەرانن فۆرمەلەی ئەو تێکستانەیان کردووە، کە ئێمە ئەمڕۆ لێیانەوە ناونیشانی "چیرۆکی پێکهێنانی دونیا–سفر التکوین– *Genesis* " مان خواستووە. من وای دەبینم ئەوە زۆر گرنگە، ڕوونی بکەینەوە ئەو دەستنووسانە لە چ هەلومەرجێکدا فۆرمەلە کراون. بێگومان نموونەی کۆنتر بۆ "چیرۆکی ئەفراندن" هەبووە، کە لێرەدا ئێمە کارمان پێیان نییە. من پێموایە ئێمە دەتوانین سەبارەت شێوەگیربوونی ناوەرۆکی "سەرهەڵدان و پێکهێنان– *Genesis*" تەنیا لە ناوەرۆکە مێژووییەکەیەوە لێی تێبگەین. گەر من دروست زانیبێتم ئەوا بەلای "تەوراتەوە، العهد القدیم – *Alttestament*" شتێکی چەسپاوە کە ناوکی پتەوی ئەو چیرۆکانە، کە تا ئەمڕۆش هەر هەن، لە سەردەمی تاراوگەیی بابلیۆنەوە داڕێژراون. ئەمەش سەبارەت دیمەنێکی تیۆلۆگیای بەرگرییە بە بەستنەوەی بە فاکتۆرێکی تیۆلۆگیای سەرکەوتن – *Triumphtheologie*– چونکە ئەوەی ئێمە ئەمڕۆ دەیخوێنینەوە، جەغتکردنێکە بۆ ئەوەی کەوا دەشێت جوولەکایەتی چاوبخشێنێتەوە بە شتە کتوپڕییە یەزدانییەکەی سەدەی 6دا، کە باسی ئازادبوونی گەلی ئیسرائیل لە ڕێی داگیرکردنە فارسییەکەوە لە بابلیۆندا دەکات. ئێمە کارمان بە دیمەنی تیۆلۆگیای ململانێکەیە، کە لە لایەن تیۆلۆگەکانی گەلێکەوە داڕێژراوە کە تیۆلۆگیایەکی ئیمپریالییانەی درێوی سەرکەوتووی شێوازی بابلیۆنانەیان لە پێشدەمدا هەبووە، کە خۆیان بە وەڕزکردنی ئەم بورجە گەورەیەی ناوەند دێتەوە یاد. گەلی ئیسرائیل دوو وەچەی تەواویان بەرەو کۆیلایەتی برد، جارێك شیوەنیان لەپاڵ ئاوەکانی بابلدا، وەکو لای هاینریش هاینە ئەوە دەخوێنینەوە کاتێك لە لایەن فارسەکانەوە ئازادکرا، وە جارێکیش پاش شکستە سەربازییەکەی زۆردارە کۆنەکە، ئەوە دێتەوە یاد کەوا لە بابیلۆندا پەنجا یەزدان دەپەرستران، کە دەبوو زۆربەی کاتەکانی تر بەبێ چ گرفتارییەك لە خانەگەورەکاندا ئەو یەزدانە پەتییانە، کە دیارە چیدی هەنووکە هیچیان پێ ناکرێت، شوێنێکی گەورەو بەرفراوان دروست بکەن. ئێستا دەبینین کرۆکی "چیرۆکی پێکهێنان – *Genesis*" ی جوولەکەیی لەوەدایە، کەوا ئەو بەرجەستەی تیۆلۆگیایەکی زیدەڕەوی هێرشئامێزانە دەکات. بە واتایەکی تر، من مەبەستم لەوەیە کەوا هەموو تیۆلۆگە باڵاکان زێدەڕەوئامێزن، هەمیشەش هەوڵی ئەوە دەدەن لە کەسانی تر چاکتر سەبارەت یەزدان بدوێن. کورتتر بڵێم: من بە یەك ئەندازە لە تیۆلۆگیاو لە فەلسەفەشدا زانستی ململانێ دەبینمەوە، کە تیایاندا پێشبڕکێی ئەوە ساز دەکرێت، داخۆ کێ دەتوانێت باڵاترین چەمك سەبارەت یەزدان دابڕێژێت. لە ڕاستیدا تیۆلۆگەکان بە بەردەوامی جۆرێك لە خولی ئستیدلالیانەی ئۆلۆمپی سازدەکەن، بە مەبەستی ئەوەی، دەبێت چەمکی یەزدان تابشێت باڵاتر دیاری بکرێت، بەڵام ئەوە هەیە ئەم ململانێ گوتارییە لە گۆڕەپانێکی پەرژینداردا ساز ناکرێت وەك ئەو وتووێژانەی سکولاستیکەکانی سەدەی ناوەند دەیانکرد. نەخێر، تیۆلۆگەکانی گەلە مێژووییەکان تیۆلۆگیاکەیان بەرەو گۆڕەپانی هەقیقەت دەبەن، ئەوان تیۆلۆگیا دەکەن بە ژیان و بە مەرگ، چونکە ئەوان دەرکیان بەوە کردووە کە بە گووتە فێرخوازییەکانیان سیستەمێکی بەرگری ڕەمزی بۆ کلتورەکەیان فۆرمەلە دەکەن. میللەتێکی ئاوا توند لێدراوی وەك جوولەکە هەرچۆنێك بێت توانیویەتی لە بەندیخانە بابلییەکاندا بە زیندوویی بمێنێتەوە، دیارە ئەمەش پەیوەستە بەوەوە کەوا

ڕێبەرە ئاینییەکانی ئەوسایان توانیبوویان تێگەیەکی یەزدانی ئەوتۆ فۆرمەلە بکەن کە تێیدا سەرکەوتن و زاڵبوونی یەزدانی میللەت خرابووە پێشەوەی یەزدانە ئیمپریالییەکانی ئیمپراتۆریەتی بابلیۆنەوە. بەم جۆرە هەراجی تیۆلۆگی دەستپێکردو لە یەکتاپەرستیدا *Monotheismus* کۆتایی پێ هات. ئیدی دەبوو خواکانی بابل بەم بورجە بەربادەوە بپەرستین، کەچی خودای ئیسرائیل تەنیا بورجەکانی دانەمەزراند، بەڵکو ئەو هەموو جیهانی دامەزراند. ئێستا ئێمە لێرەدا کارمان بە یەکێك لەو چیرۆکانەی سەرەتا هەیە، لەو چیرۆکانەی تیایاندا "جیهان دامەزراندن *Weltbauen*" دروست مانای تەواوی خۆی داڕشتووە. ئەفرینەرگەرایی/ دیمیورگیزمی *Demiurgismus* چیرۆکی پێکهێنان– سفر التكوين– *Genesis* بریتییە لە بەرفراوانبوونێکی دژەبابلیۆنی. کە بریتییە لە بڕێکی گەورەی شالاوی تیۆتەکنیکیانە، کە هەوڵدەدات یەزدان وەکو بکەری هەموو شتەکان، وەکو دروستکەری هەمووان پیشان بدات. ئەم یەزدانە دەتوانێت گەلێك شتی زۆرتر لە پادشاکانی بابلیۆن بکات، هەروەها زۆرتریش لە هەموو یەزدانە ئەستێرەییە بابلییەکانیش، کە بۆ ڕۆژی دووەم لەلایەن ئەوەوە دروست دەکرێن، ئاوەها لێرەدا دیمەنێکی زەبرئامێزی زێدەڕەوی تیۆلۆگی لە پێشدەمماندا پەیدادەبێت، ئەمەش مانای ئەو هەوڵە لێکدەداتەوە، کە بگات بە ڕۆحی باڵای مرۆ لەو ئاستەی کە بشێت لە پلەی بەرگرییەوە پێی بگەین. پێدەچێت یەزدانی *q uo maius cogitari non potest* بۆ یەکەمجار لەسەر ئەم ڕێگەیە شێوەگیر بووبێت.

**یونگل:** منیش لەگەڵتاندا کۆکم، لە ژیاندا ئەمە ئەو کانگایە بووە کە مێژووی قەشەییانەی ئەفراندنی لێوە بەرپابووە. ئیسرائیل دەبوو یەزدانەکەی خۆی وەکو هەمەکیترین یەزدان لە هەموو شت بپارێزێت، تاوەکو لە بارودۆخی مەترسی ئامێزی تاراوگەدا متمانەی خۆی و دڵنیایی خۆی لەکیس نەدات. هەروەها لەوەشدا کۆکم لەگەڵتاندا کەوا بێ هیچ چەندوچۆنێك ئەوەش جۆرێکە لە تیۆلۆگی، کاتێك ئێمە سەبارەت یەزدان باشتر قسە بکەین وەك سەبارەت بە شتەکانی تر، تاوەکو بشێت شتێکیش سەبارەت یەزدان بگووترێت. لێرەدا تاکە پرسیاری بڕیاردەر ئەمەیە، ئەم باشترە چی دەگەیەنێت؟ ئێوە لەسەرەوە ڕستەکەی ئەنسلمی کانتەربوری *Anselm von Canterbury*تان " *id quo maius cogitari non potest*" بۆ پێناسەکردنی یەزدان خواست، کە بەمانای "لە یەزدان بەدەر شتێکی گەورەتر نییە بیری لێ بکرێتەوە" دێت. ئیدی بەم جۆرە ئێمە دەتوانین باشتر سەبارەت یەزدان بدوێین، من لای لۆتەر ئەمەم خوێندۆتەوە: هیچ شتێك زۆر گەورە نییە، یەزدان گەورەترە، هیچ شتێك زۆر بچووك نییە، یەزدان بچووکترە. ئەمەش بریتییە لە جۆرێکی تری باشتر قسەکردن سەبارەت ئەو. تیۆلۆگیای ئەفراندنی کابالا *Kabbala* عارفە جوولەکەکان ئەم بیرۆکەیەیان کردووە بە فیگورێکی زۆر تایبەتمەند، کە بانگەشەی ئەوە دەکەن، گوایا بۆ خودی یەزدان خۆیشی ئەفراندن بە واتای پاشگەزبوونەوە یاخود خۆگەڕاندنەوە دێت. زمزم *Zimzum* بەلای کابالاوە واتە ئەو خۆی دەگەڕێنێتەوە تاوەکو شوێنێکی تر ببوژێنێتەوە. بەرامبەر ئەم جۆرە قسەکردنە، واتە سەبارەت یەزدان باشتر قسەکردن، ئەوا هێشتا لەناو یەزدان خۆیدا جۆرە مۆتیڤێکی تر هەیە کە تەنیا وەکو بکەرێکی ڕەها ئاشکرا دەبێت، لەو ئەفرێنەرەشدا ئاشکرا دەبێت کە ناخوازێت بە تەنیا خۆی بسەپێنێت، بەڵکو دەشخوازێت ئەوانی تریش هەبن، وە ناشخوازێت ئەم ئەوانی ترەش بێئاگایانە بێلایەن هەبن، بەڵکو ئەرێ بکرێن و وەك

ئەرێکراوێکیش بانگ کرێنە بوونەوە. سەبارەت بە جۆری لەسەر یەزدان باشتر قسەکردن وەك لە شتەکانی تر، من هیچ ڕێگرییەك شك نابەم.

**زلۆتەردایك:** باشە، هەروەك بە چیرۆکی لافاوەکەدا *Sintfluterzaehlung* دەیناسینەوە، یەزدان خۆیشی لە هەموو بارێکدا لەگەڵ کات و سەردەمی ئەوانی تردا بووە و باشتریش بووە. یەزدان لە پاش لافاوەکەوە بە ئاشکرا حیکمەتێکی بەرامبەر ئەفراندنەکەی تێپەڕاند، ئەمەش بەڕاستی بۆ ئەو بە لەدەست دەرچوونێك دادەنرێت، کە بە ئاشکراش لەم تێکستەدا هاتووە: ئەو پەشیمانە لەوەی مرۆڤی دروست کردووەو بڕیاریشیداوە کە لەناوی بەرێت. ئیدی لافاوێکی بۆ هەڵدەکات و هەموو ژیان ڕادەماڵێت، تاوەکو دەگاتە کەشتییەکەی نوح، بەڵام کاتێك ئاوەکە ڕێدەکات، ئەو جارێکی دی پەشیمان دەبێتەوە. پەشیمانی لەسەر پەشیمانی دەبێت، لەسەر گۆڕینی تەواوەتی هۆشمەندی ئەفرێنەر دەبێت، لەسەر توانای – بوونێکی نوێی ئەو مرۆڤایەتییە دەبێت کە لە گوناهکردن ناکەوێت. دەشێت ئێمە لە فیگورە بیرۆکەی *Denkfigur* زمزمدا گەمەیەکی پێشوەخت ببینینەوە. لێرەدا من ئەم هاوکێشەیە لە ڕودیگەر زافرانسکی دەخوازم: یەزدانی پاش لافاوەکە خۆی لە بناغە و ژێرخانەوە *Fundi* بۆ واقعی و سەرخان *Realo* گۆڕی. ئەو لە سەرەتادا یەزدانێکی بناغەیی ڕەوشتی دیاربوو، کە مرۆڤی بەجێنەدەهێشت و نەشیدەتوانی خۆی بەوە بگۆڕێتەوە، کەوا ئەو ئازادییەی ئەو بۆ مرۆڤی فەراهەم هێناوە، بۆ ئەوە بەکار بهێنن کە پشت بکەنە ئەو و بێهوودەیی پێ بکەن. هەر لە پاش لافاوەکەوە بوو یەزدان گەیشتە ئەو فۆرمەی کە لەلایەن کابالا لوریانییەکانەوە *Lurianischen Kabbala* دەشێت بە فیگورە بیرۆکە وردو نەرمە ناسراوەکە ڕاڤە بکرێت..

**یونگل:** کەچی ئێوە وەکو ئەوان هێندە وردونەرم نین.

**زلۆتەردایك:** گەر ڕێم پێ بدەن بە وردونەرمێتییەکی تر، بە ئیرۆنیەتەوە/ تەوسەوە، بێت یان بەبێ ئیرۆنیەت، ئەوا دەوێرم دانەیەکی تریش سەربار بخەم. هەڵبەت هەندێك ڕاڤە هەیە پێیانوایە یەزدانیش هەر لە سەرەتای یەکەمەوە خراوەتە شوێنگەیەکەوە کە دواتر کابالیستەکانی سەدەی ناوەڕاستی باڵا خۆیان گەیاندێ، واتە بۆ یەزدانیش ستەمە خۆی لەو شکستە دوورەپەرێز بکات کە لە ڕێی ئەفرێنراوەکانەوە ناسنامەی دەگۆڕێت. هەروەها ئەو دیمەنە جوانانەش لەناو چیرۆکی ئەفراندندا *Genesiserzaehlung* هەن، کەوا یەزدان و ئادەم لە ئێوارەیەکی فێنکدا، بەبێ ئەوەی ڕێکەوتی یەکتری بکەن، چوونە پیاسەکردنی دارستانی بەهەشت، خۆ گەر ڕێکەوتی یەکتریشیان بکردایە، ئەوا پێدەچوو لەبەر لەیەکچوونیان یەکتریان نەناسیبایەتەوە. هەروەها دیمەنێکی تریش هەیە، کە تیایدا یەزدان بە دوای ئادەمدا دەگەڕێت و نایبینێتەوە، ئەگەرچی هاوارێکی زۆری بەدوادا دەکرد. ئەمەش دواجار ئەوە دەگەیەنێت کەوا ئیدی یەکسەر لە دوای ئەفراندنەکەوە پەتەکان دەبچڕێن و ئەم بچڕاندنەی ئەفرێنراوەکان لەلایەن ئەفرێنەرەوە، ئەم تەنگژە ئەفرێنەرییە – دیمورگییە *demiurgische Krise* – هەر لە یەکەمین ساتەوەختەوە ڕوودەدات. کەواتە دەبێت ئاگامان لەوە بێت، چۆن قۆناغەکانی هەستکردنی ئەم چیرۆکە گەورانەی ئەفراندن خۆیان لە یەکتری دادەبڕن، دواتر بە میتافیزیککردنی مێژووش بریتییە لە جیاکردنەوەو دابچڕاندنی لەم دیدگە بنەڕەتییە مەزنەی ئەفسانەی پێکهێنان.

ئەوانەشی ئەویان دۆزییەوە، دروست بەهۆی پەشێوییانەوە، ئەفراندوویانەو تێگەیشتووتریشن لەو تیۆلۆگانەی سەدەی ناوەڕاستی بالاّ کە خۆیان بە فەلسەفە دەوڵەمەند کردبوو، چونکە ئەوان هەر لە سەرەتاوە کێشەی نامۆبوونی نێوان ئەفرێنەر و ئەفرێندراویان لەبەرچاو گرتبوو.

**یونگل:** لەوەشدا زۆر لەگەڵتاندا تەبام کە چیرۆکە بابلییەکە یەزدانێك دەگێڕێتەوە کە توانای خۆگۆڕینی هەیە. ئەمەش شتێکە مایەی وروژاندنە گەر بمانەوێت ئەوە بە نموونە لەگەڵ یەزدانە ئەرستۆتیلییەکەدا بەراورد بکەین. یەزدانی ئەرستۆتیلیس بریتی بوو لە ئیدینتیتێتێکی/ هاووێنەیەکی، پەتی بیرکردنەوەی بیرکردنەوە *noeseos noesis*، ئەو یەزدانێکە تەنها لەبەرئەوە جێی بایەخی مرۆڤە، چونکە لە ئیدینتیتێکەی خۆیدا ئیدیالی بەرکەماڵبوونی خۆی پیشان دەداتەوە. هەنووکە هەمووان دەخوازن ئاوەها بەرکەماڵ بن، بۆیە هەمووان هەوڵی بۆ دەدەن، ئەوان ئەویان خۆشدەوێت، کەچی ئەو ئەمانی خۆشناوێت. ئەرستۆتیلیس گوزارەی لەمە کردووە و دواتر سپینۆزا دووبارەی دەکاتەوە: " *deus neminem amat*" واتە، ئەم یەزدانە کەسی خۆشناوێت و ناشتوانێت کەسێکی خۆش بوێت، چونکە ئەو بەبێ چ ماندووبوونێك بەردەوام سەرقاڵی خۆیەتی. یەزدانی بیبلی کە دڵێکی هەیە پەشیمانە لە تووڕەبوونەکەی، من ئەوەش زۆر بە گرنگ دەبینم کەوا ئێوە پێ لەسەر ساتەوەختی خۆبەتەمەنکردن، کە دەکرێت هەروای ناوبنێین، دادەگرن. پرسیارێکی تەواو جیاوازی تر ئەوەیە، داخۆ ئەو لە ساتی ئەفراندنی مرۆڤدا دڵی نەبوو، لای ئێوە ئەو تەنیا لە پاش لافاوەکەوە دڵی دەبێت، منیش بە هۆی تێکستەکانەوە گومانی زۆرم لەوەدا هەیە.

لێرەدا من ناخوازم لەگەڵ ئێوەدا بڵێم، یەزدانی ئەفرێنەر یەزدانێکی ڕەوشتی *Moralgott* بووە. نەخێر، مرۆ ڕاستەوخۆ بەوە نازانێت، چاکە چییە و خراپە چییە. ئەم دیمەنە بەهەشتییە دەکەوێتە پێش هەموو ڕەوشتێکەوە. نەك ئەودیوی چاکە و خراپەوە، بەڵکو هەر لە پێشەوەی چاکە و خراپەدایە، دواجار مرۆڤیش هەروەکو دادوەرێك چاکە و خراپە لە یەکتری جیادەکاتەوە، ئەمەش ئەو خولیایەی مرۆڤە کە دەخوازێت وەکو یەزدان بێت. وە دوای ئەوەی ئەو جارێك ئەوەی کردووە، ئەوا پێویستە هەر بیکاتەوە. هەنووکە پێویستە ئێمە تاوەکو ڕۆژی ئایین *juengsten Tag* / ڕۆژی دوایی، دادوەری بکەین، ئەوسا، سوپاس بۆ خوا، کە ئەو ڕۆڵی دادوەری وەردەگرێت و ئێمە ئیدی واز لەوە دەهێنین دادوەر بین. بەڵام تا ئەو کاتە ئێمە هەر لە ژێر ئەو نەفرەتەداین، کە هەر دەبێت دادوەری بکەین، واتە بەجۆر و شێوازێکی شێواو لە شێوەی یەزداندا بین. بەڵام خودی ئەفرێنەر لە خۆیدا یەزدانێکی ڕەوشتی نییە، بەڵکو مرۆڤ خۆی ڕەوشتی لە جیهاندا داهێناوە. لێرەوە حەزدەکەم بڵێم، بەلای یەزدانی ئەفرێنەرەوە ئامادەباشی تەواو شتێکی جیاوازە، واتە ئەفرێنراوەکان بەرامبەر ئەو وا ڕەفتار بکەن کە بگەنە ناو شتێکی تەواو جیاوازەوە، واتە بگەنە ناو خودی خۆیان. دواتر تیۆلۆگەکان ئەمەیان کردووە بە گوزارەیەکی بالاّی دۆگما، کە بریتییە لە دۆگمای سێکوچکەیی *Dogma rinitarischen t.* دۆگمای سێکوچکەیی بریتییە لەوەی ئەگەرچی یەزدان بوونەوەرێکی تاکە، کەچی لە سی کەسدا بوونی هەیە، ئەمەش بە واتای ئەوەی لە ناو خودی یەزداندا کەسانی تر هەن — بەداخیشەوە مێژووی دۆگماکان کەمجار بە قووڵییەکی تەواوەوە ئەمەیان سازکردووە — واتاکەش ئەوەیە *Alius, alius, alius*

نەك *aliud, aliud, aliud*، یەكێكی تر نا، بەڵام یەكێكی تر كە باوكە، یەكێكی تر كە كوڕە، یەكێكی تر كە گیانە. وەهاشمان زانیوە كە: "باوك" لە ڕووی میتافۆرەوە دروست ئەو كەسەیە كە بە بنەڕەتی "بوون" و "ژیان" دادەنرێت. كوڕ بە خاچدا هەڵدەواسرێت و دەمرێت. "*Duo maxime contraria*" لوتەر جارێك وەهای گوتووە، "شتی تر بوون" لەوە قووڵتر دەركی پێناكرێت. لە دۆگمای سێكوچكەگەریدا بیرۆكەی ئەوە هەیە كە یەزدان دەتوانێت بەرامبەر شتەكانی تر بێت و شتی تر بوونیش ئەرێ بكات. كەواتە "شتیتربوون/ ئەویتربوون" وەكو ژان و ناسۆرێك دەركی پێناكرێت، بەڵكو "ئەویتربوون *Anderssein das*" وەكو ئەریكەرێكی/ قبوڵكەرێكی گەورە دەركی پێدەكرێت. ئەم دیدگایە لە دۆگمای سێكوچكەگەردا لە شێوازی كە، لەو زێدەتر نییە *unueberbietbar* فۆرمەلە بووە.

**زلۆتەردایك:** ئەم چەمكە بەرزەی یەزدان، كە فیلۆسۆفێكیش دەتوانێت بایەخی پێ بدات، بەبێ ئەوەشی خۆی لە كۆلێژەكەی وێڵ بكات، كاردەكاتە سەر داڕشتنی ئەو تیۆرانەی كە بە ناونیشانی "لەو زێدەتر نییە" دەردەكەون و سنوورەكانی كۆلێژیش تێنەپەڕێنێت، لێرەوە من پێموایە كەوا ئێوە دروست چوونەتە ناویەوە. ئێستاش ئێمە لە دەرەوەی كۆلێژی تیۆلۆگییەوە و هەندێك جاریش لەو ئەدەب و لێتەراتۆرانەوە دەخوێنینەوە، كە لە ناویاندا ئەو مەزادكارییە تەواو غەیبانییەی تیۆلۆگە كۆنەكان بەشێوەیەكی ناهەڵبژاردەیی بەڕێ دەكرێت. هەندێك فیلۆسۆف هەن سەبارەت چەمكی یەزدان لە ئەودیوی سێكوچكەگەراییەوە بیردەكەنەوە. ئەوان دەیانەوێت هانی یەزدان بدەن ببێتە یەزدانێكی زێدەبەهاتر، یەزدانێك كە بتوانێت تا چوار بژمێرێت، یەزدانی چواركوچكەیی، یەزدانێك بگرە تەنانەت پێنجكوچكەییش بێت و زاڵیش بێت بەسەر پێكهاتە بەرزەكەی پەیوەندیدا و خودی خۆیشی لە كایە ئاڵۆزەكەی سەرەوەدا دادگایی بكات. ئێمە — وەكو فوندامێنتالیستی دووبەهایی، ساناتر بڵێین وەكو خاوەنی تێگەی دروستی مرۆیی — تا ئێستا توانیومانە لەوانەوە هزرێكی كەم سازبكەین. بەرەنگارییەكەش لەبەرەی تەكنیك فەلسەفیەكان دەردەچێت، ئەمەش لەبەر ئەو هۆكارانەی بە ئاسانیش چێ دەبن. گرفتی تەكنیك لەسەر ئاستە مرۆییەكەیدا بریتییە لە دووبارەكردنەوەی گرفتی ئەفراندن. ئیدی لێرەدا لە پاش كردەی پێكهێنان *Genesis* ڕەهەندی كردەی پێكهێنانەوە، یاخود لاساییكردنەوەی پێكهێنان *Epigenesis* پەیدا دەبێت، شتێك، ئەفسوس، تیولۆگەكان كە بایەخیان پێداوە. وە لەبەرئەوەی تیۆلۆگەكان تیۆرییەكی چاكی ماشینەیان لا نییە، ئەوا هێندە زۆر شپرزە دەرناكەون، هێندە نەبێت لە فاكولیتێت و كۆلیژەكاندا هەندێك عەقڵ هەراسان دەكات. گۆتهارد گیونتەر قەشەی باوەڕپێكراوی منە، ئەو ماوەی چل ساڵێك كۆششی ئەوەی دەكرد تیۆرییەك بۆ سەردەمی "ئێستا" و سەردەمی "داهاتوو" وەكو سەردەمی لاساییكردنەوەی پێكهێنانی تەكنیكی دابڕێژێت. ماشینەی باڵا یاخود عەقڵی دەستكرد *Intelligenz kuenstlische* هێمای ئەوە بوو. ئەو سەرنجەشی زۆر لە فێنۆمێنەی ماشێنەی دووەم دەدرێت، ئەو ڕاستییەیە كەوا مرۆڤ بەهەمان ئەو شێوەیە لە خۆی بەرپرسیارە كە یەزدان لە عەقڵ و سروشتی مرۆیی بەرپرسیارە. كیونتەر ئاماژەش بەوە دەدات كەوا مرۆڤ وەكو دروستكەری ماشینە ئەمڕۆ بەربۆتەوە ناو دۆخێكی خولقێنەرییەوە/ دەمیورگی *Position demiurgische* یەوە. ئێوە بەشێكی ئەو ڕۆحەتان بەرجەستە دەكەن كە تاوەكو

هەنووکە دەستبەرداری نەبوون و بە خودگەرێتییەکی خۆتان داناوە، کە دەشێت بڵێین، تەواوی ئاڵۆزکاری خودگەرییە کارگەرەکە، ئەم کارگەرانەش لە ماتریالیکی فیزیکیدا بەرجەستە دەبن و بەرهەمە دروستکراوەکەش دەگەڕێننەوە لای خۆیان، لەوەشدا ئەوان لە لایەن خۆیانەوە تووشی جۆرە ڕاچڵەکانێکی ئەفراندنی *Schock* *demiurgischen* هاتوون. بەراوردکردنی ئەو تەنگژانەی یەزدانە بەپێی نەرمی و وردبینییە زۆرەکەی من و هەروەکو هەموو بیستیشمان، تووشی بوو، نەك تەواو بەهۆی بەرەکەتی تەوراتەوە *Alttestament* مانا شاردراوەکانی تووش بووبێت. لێرەوە ئێمە دەکەوینە ناو قۆناغێکەوە کە پێدەچێت تێیدا یەزدانی بیبلی لە نێوان کردەی "ئەفراندن" و "لافاو"ەکەدا هاوشێوە بن. هەر لێرەوەیە زۆر لە ئێمە پەشیمانین لەوەی کە هەر لە سەرەتاوە دروست کراوین. بە ڕادەیەك تەنانەت لە ناونیشانی ئەم کۆڕەشەوە گوێبیستی دەنگەکانی ئەم پەشیمانییە دەبین. ئێمە پەشیمانین کە ماشینەمان دروستکرد، بگرە هەندێکجار لە تەواوی کولتوریش پەشیمانین. کێشەکەش تەنیا ئەمەیە: ئایا دەبێت ئێمە لافاو بۆ ماشینەکان بنێرین؟ ئایا دەبێت ئێمە بە ئیرۆنییەکی غەیبی و ناسروشتییەوە خۆزگەی ئەوە بخوازین کە ماشینەکان یەکتری بسڕنەوە؟ یاخود دەبێت ئێمە لەسەر ڕەوڕەوەکە دانیشین و بۆ دوای لافاوەکە ماشینە دروست بکەین و بۆ بەدیهێنانی یەزدانی ئارای سەرزەمینی *Realos* ببینە عەقڵی دەستکرد *kuenstlichen Intelligenz?* لە راستیشدا لەم ساتەوەختەدا ئێمە هێندە ئامادە نین کەوا ئێمە لەگەڵ کارەساتی خودگەرێتییەکەماندا *Subjektivitaet* بتوانین بڕۆین. ڕەورەوەی پێکەوەهەڵکردن و پێکەوەبوون *Koexistenz* لەگەڵ ماشینە باڵاکاندا هێشتا بەرقەرار نەبووە. زۆر کەس حەزدەکەن لە رووی ڕۆبۆتەکان و هۆمونکولۆزی تەکنیکییەوە *Homunculus technischen* دۆخە کۆنەکان دروست بکەنەوە.

**یونگل:** بۆچی دەبێت تیۆلۆگی شتی لە دژ ماشینەکان هەبێت؟ من رەبەنێکم و خۆشحاڵیشم بە هەموو ئەو ماشینانەی لە ماڵەوە کارم بۆ سانا دەکەن. خۆ ئەگەر ئێستا ئەمانە پاش لافاوەکە بن یاخود پێش لافاوەکە، ئەوا جارێ لێیان دەگەڕێم. هەرچۆنێك بێت لەو شتانەدا کە ئێمە دەست بە چوکڵەیەکدا دەنێین و لە پڕێکدا بە میکانیزمێکی نادیار گەرممان دەبێتەوە، ئەوا ئەو سەرنجەم لە چی دەکات کەوا ئەمانە پاش لافاوەکەن. تیۆلۆگی قێزوبێزی خۆی لە ماشینە نایەتەوە، بەس لە ماشینەی فێرکردن. ئایا بۆمان هەیە مرۆڤ وەکو ماشینە تێبگەین، وەك ئەوەی لە مەتری *La Mettrie* دەیکرد؟ ئیدی بەرەنگارییە تیۆلۆگییەکان خۆیان رادەگەیەنن. ئەگەریش مرۆڤ هاووێنەی یەزدان بێت، ئەوە مانای وایە، دەشێت یەزدانیش ماشینە بێت، داگرتنی یەزدانیش بۆ ماشینە جنێودانە بە یەزدان.

**زلۆتەردایك:** دڵنیانیم، ڕەنگە وا بێت..

**یونگل:** کەواتە دەشێت ماشینە ئەوە بێت کە بە هەڕەمەکێتی *Spontanitaet* دادەمەزرێت، ئەمەش چیدی ماشینە نییە.

**زلۆتەردایك:** با، با، شتەکەش سەبارەت ئەوەیە. ئێمە دەبێت فێربین بیر لە ماشینە هەڕەمەکیەکانیش *Spontane Maschinen* بکەینەوە. ئێمە تاوەکو پێکەوە بیر لە هەڕەمەکێتی *Spontanitaet* و میکانیزم *Mechanizmus* نەکەینەوە، ئەوا ڕەنگە ئێمە تا ئەو ساتە بە چەمکێکی گەلێك بچووکی ماشینەوە

وابەستەبین. ئەوەش لە ژێر فشاری ژینگە هەنووکەییەکەماندا لە ڕێی ماشینە فێرکەرەکانمانەوە دەگۆڕدرێت. زوو بێت یان درەنگ تیۆلۆگیش بە دەنگ ئەوەوە دەچێت. ئایا ئەوە خۆش نییە، گەر یەزدان ماشینەیەك بێت و بەلایەکدا پرۆگرام بۆ بوونەوەری سروشت بنووسێت و بەلایەکی تردا پەیوەندییەکانی نێوان مرۆگەل دروست بکات؟ من ئەوەش بە شیاو دادەنێم، گەر ئێمە چەمکی سێکوچکەیی یەزدانمان پتر بە ئاقاری چوارکوچکەییدا گەشە پێبدایە، کە تیایدا مێژووی سروشت لەگەڵ مێژووی ڕۆح و مێژووی ماشینەدا لە ئاوێتەیەکی بالآدا کورت بکردایەتەوە. یەزدانی سێکوچکەیی توانایەکی تەواو لۆگێکی نییە بۆ ڕاگرتن و پاراستنی جیهان لە خۆیدا، جیهانێك کە تێیدا لەپاڵ زوبیەکتیڤێتی مرۆیی و ئاژەڵیشدا، زوبیەکتیڤیتیکی دەستکردانەی ماشینەش هەیە. یەزدانێك توانی ئەمە بکات، دروست دەشێت ئەوە یەزدانێك بێت کە بۆ وەسفە گچکە ئاڵۆزەکەی خۆی داوای چوارکوچکەیی بکات.

**یونگل:** کەواتە دەشێت سەبارەت ئەوە قسە بکەین. کەواتە دەبوو ساتەوەختی تەنگژەکان، ئەو تەنگژانەی کە ئێوە لێیەوە زۆر دروست نیگاتان بڕییە سەر یەزدان، دیسانەوە بەربێتەوە ناو قەیران. ئەمەش دەبوو ئەو ماشینەیەش بگرێتەوە، وەکوتریش من ئەوە بە بیرۆکەیەکی گەلێك گرنگ دەزانم. بە جیاوازی لەگەڵ بیرکردنەوەی فیزیکی میتافیزیکی کلاسیکدا، ئەوا لە ڕاستیدا بیرکردنەوەی ئەفراندن لە تەنگژەکە دەرچووە، ئێستاش نەك هەر لە مانا نیگەتیڤییەکەدا، بەڵکو دروستکردن مانای جیاکردنەوە و جیاوازیش دەگەیەنێت.

یەکەمین هەواڵی چیرۆکی ئەفراندن، وەکو جیاوازییەکی بنەچەیی لە دروستکردن تێدەگات: ئاسمان/ زەوی، ڕووناکی/ تاریکی، ئاو/ خاك. ئەمە ئەو یەزدانەیە کە بە بەردەوامی لە تەنگژەدایە، بەلآم لە ناو کردەیەکی بەرهەمهێنەردایە: جیاوازی وەکو ساناکردنەوەی ژیان.

**زلۆتەردایك:** زۆر ڕاستە. ئەگەر مرۆ چەمکێکی لەو جۆرە وەربگرێت، ئەوا بێگومان پێویستە دووبارە هەموو سروشتێکی بەر لە مرۆیی لە چەمکی یەزداندا بیر لێ بکاتەوە، ئەو سروشتە بەر لە مرۆییانەی کە وەك خۆجووتکەر لەگەڵ بینای ماشینەی ئاژەڵیدا بەدی دێن. بەشێوەیەکی گشتی ڕەنگە تەواوی مێژووی کۆنی سروشت لە شێوازێکی فرەوابەستەتردا بیری لێ بکرێتەوە، لە هەموو حاڵەتێکدا وابەستەترە لەوەی لەناو حاڵەتی ئەم تیۆلۆگییە کریستییەدا بوو، ئەو تیۆلۆگییەی کە بەشێوەیەکی کەسیانە کورتکراوەتەوە. لەهەرکوێیەکیشدا کەسگەرایی *Personalismus* زاڵ بێت، لەوێدا تەواوی ئەو ئەفراندنانەی دی بزر دەبن، کە سروشت وەکو ناوەڕۆکی جۆرەکان و وەکو جەوهەری ژینگە لۆکالییەکان دەبینن. وەك بۆ منیش دەردەکەوێت، کەوا هەندێك لە تیۆلۆگە هاوچەرخە دەرکەوتووەکان زۆر دروست کۆششیان کردووە پەیوەندی بابەتەکانیان لە فەرامۆشی هەموو ئەو بوارە زلانە بە عەقڵی بەر لە مرۆیی و بە خودگەرێتییەوە *Subjektivitaet*، کە ئێمە ئاژەڵی ناودەنێین، ڕاست بکەنەوە. هەروەها دەشێت ئێمە لە ئاژەڵ پتریش بڕۆین تا دەگەینە ئەو شێوە و فۆرمە سادانەی کە هەنووکە پێویستە تێکڕا بچنە ناو یەکەوە و ئاوێزان بن.

**یونگل:** بەلآم قەشەکانیش لەلایەن خۆیانەوە چیرۆك و هەواڵیان سەبارەت ئەفراندن هەیە، کە

دەڵێت: مرۆڤ وەدوو دەکەوێت، سەرەتا هەموو بوونەوەرە بەر لە مرۆییەکان هەبوون، پاشان "تاجی ئەفراندن"! بیرۆکەکە بەو جۆرەیە، کەوا هەمان گوزارە لە گێڕانەوەی چیرۆکی ئەفراندندا بۆ مرۆڤیش و بۆ ئاژەڵیش هەڵدەبژێردرێت، مرۆڤ دەبێتە "نەفەش هایا – *neffesch hajja*"یەك، واتە زیندەوەرێکی چالاك، کە هەمان ئەم گوزارەیەش بۆ ئاژەڵ بەکاردەبرێت. ئەوەش تایبەتمەندییەکی ئەنترۆپۆلۆگیانە نییە کەوا "نەفەش هایا – زیندەوەری چالاك" بین. کەواتە دەشێت گێڕانەوەی ئەفراندن بیبلیش لە لایەن خۆیەوە هەیبێت. ئێوە گلەیی بەس لەوە دەکەن، کە ئەمڕۆ چەندێك تایبەتمەندی کەسێتییانە لە ناو دەرکپێکردنی کریستیانەدا هەیە. ئەگەر ئەوەش لە هاوکێشەی پەیوەندارێتی "من – تۆ"دا دەرکی پێبکرێت، ئەوسا منیش لەگەڵتاندا تەبا دەبم. بەڵام بەوەی کەوا ئەفرێنەر تەنیا ئەفرێنراوەکان دروست ناکات، ئەوا بەم پێیە ئەفرێنراو بریتی نییە لە کارێکی دروستکراو، بەڵکو ئەوەیە کە ئەفرێنەر دروستی دەکات و قبوڵیشی دەکات، هەر لەبەر ئەمەشە ئەمی وەك هاوبەشێکی بەرانبەر داناوە، ئەمەش وا دەکات نەتوانرێت واز لە چەمکی کەس یان شتێکی هاوشێوەی ئەم چەمکە بهێنین. وە بۆ مەسەلەی کۆنترۆڵکردنەوەش، کە دەشێت جارێکی تریش ڕووبکەینەوە لای ماشینە، حەزدەکەم بپرسم: ئایا پەیوەندی ئەفرێنەر بە ئەفرێنراو و هی ئەفرێنراو بە ئەفرێنەرەوە چۆنە؟ چونکە گەر ئەو خالقی بنەڕەتی بێت ئەوا پێویست ناکات بەشێوەیەکی ناچاریانە مەخلوق پابەندی خۆی بکات و بە پابەندار بمێنێتەوە؟ ئێمە لە چەمکی پابەنداری *Abhaengigkeit* دەسڵەمینەوە. دەشێت مرۆ پابەندی ماشینە بێت. ئەو لاوانەی لەبەر کۆمپیوتەر دادەنیشن و لاناچن، من مەبەستم لەم جۆرە پابەندارییە نییە، بەڵکو ئەو پابەندارییەی کارل ڕانەر *Karl Rahner*، گەورە تیۆلۆگی کاتۆلیك خستویەتییە ڕستەیەکەوە، کە دەڵێت: تا پابەنداری یەزدان بێت، ئەوا سەربەخۆتری. *desto selbstaendiger, Je abhaengiger von Gott*. بە هەمان شێوە شلایەرماخەر دەڵێت: پێویست ناکات مرۆ چەمکی پابەنداری خۆی لە نێوان پابەنداری چاك و خراپدا بەیەك بگەیەنێت، تاوەکو یەزدانی ئەفرێنەریش وەکو یەکێك دەرکەوێت کە لە ئێستایدا یەزدانی ئەفرێنەری بەهەموو ئەو تەنگژانە و ئەو تەنگژانەشی دواتر دروستکراون و سەر بەون لێ ڕابکێشرێتەوە.

**زلۆتەردایك:** دەتوانم یەکڕاست ڕوویەکی ئەو بیرکردنەوەیەتان پەسەند بکەم. لە بنەڕەتدا بۆ بیری فەلسەفی ئەوە زۆر سانایە کە چەمکێکی پۆزەتیڤی پابەنداری دابڕێژێت. کە ئێمە ناوی دەنێین بە: پەرش و بڵاوکردنەوە/ ناسەنتەریکردن *Dezentrierung*. بەم گوزارەیەش فەلسەفەی هەڵکشاوی سەردەم دابڕانی خۆی لەو ڕەوشە سەیرەی زوبیەکتگەرایی هیومانیستی ڕادەگەیەنێت. بەڵام لە ڕاستیدا بە ستروکتور هەمان شتە هەروەکو ڕێکخستنەوەی تیۆلۆگیانەی مرۆڤ وەکو مەخلوقێك کە پابەندە بە خالقەکەیەوە. ڕەوشتی پۆست مۆدێرنە و ڕەوشی تیۆلۆگی لەم ڕووەوە هاوبەشییەکی بەهێزیان هەیە. لە ڕاستیدا چیدی ئێمە بایەخ بە زێدەبەهێزبوونی زوبیەکتی مرۆیی *Humansubject* نادەین.

**یونگل:** ئەم پەرش و بڵاوکردنەوەیەش وەکوتر لە ناو تیۆلۆگیای ریفۆرماتۆریدا/ چاکسازیدا لەو ڕێیەوە گوزارەی لێکراوە، وەك دەڵێن، کەوا چەق/ سەنترۆم دروست لەناو مندا نییە، بەڵکو لە دەرەوەی

مندایە. "هیچ کاتێك مرۆیەکی کریستیان لەناو خۆیدا ناژی، بەڵکو لەڕێی باوەڕەوە بەرەو یەزدان خۆی تێدەپەڕێنێت" ئەمەش لە کۆتاییدا لای لوتەر واتای کتێبی پیرۆزی ئازادی دەگەیەنێت. سۆفییەکان هەموو کات دەرکیان بەمە دەکرد. خەڵوەتی و مەستی بۆ ئەوان بریتییە لە هەقیقەتی مرۆڤ: خەڵوەتیش لەناو جۆرە ناسەنتەریکردنێکی وەهادا ساز دەبێت کە لە هەمانکاتدا مانای پابەندداری دەگەیەنێت.

**زلۆتەردایك:** بەڵام دروستتر بگوترێت، پابەنددارییەکە، کە بە شانازییەوە پەسەند دەکرێت. من بە کزییەکەوە حەزدەکەم جەغت لەوە بکەمەوە، کەوا مرۆ تەنیا لە دەرەوەی فاکولیتێتی تیۆلۆگییەوە لە هەناسەیەکی ئەم ئاماژەیە دەگات. ئەمەش جارێکی تر دەمگەیەنێتە ئەوەی کەوا ئەو پەژارە فەلسەفییە سروشتییە لە سەردەمی ئێمەدا تەواو خۆی گۆڕیوە بۆ پەژارەی فەلسەفەی تەکنیك. ئێمە هیچ گرفتێکمان لەگەڵ ئەو شتانەدا نییە، تاوەکو مرۆ زێدەڕەوی بکات لە چەمکی زیندووکردنەوەی "گشتی ئاخنراو" لە "یەك"ێکدا و ئەم چەمکی یەکەش لە یەزداندا بەرجەستە بکات. ئەمەش کار لە واتای راستەقینەی فەلسەفییانەی بێباوەڕی مۆدێرن بە یەزدان "ئەتایزم – *Atheismus*" دەکات. ئەمەش دەتوانێت و دەیەوێت دەستبەرداری ئەوە بێت، کە جیهان لە دواهەمین خۆرئاوێزاندنەوە *Integration* و لە لەخۆگرتنێکی رەهاوە بباتە ناو راڤەکردنی یەزدانەوە. من لێرەدا بەو مانایە لە گوزارەی ئاوێزاندن دەگەم، کەوا ئاماژەیە لەسەر ئەو هزرەی کە، ئەم جیهانە لە تاکە جێگایەکدایە کە لەناو عەقڵی خواییدا یاخود لە ناو خودی خواییدا وەکو گشتێك پێ دەزانرێت. من هەوڵ دەدەم کارلێك بکەم لەگەڵ هەڵچوونی ئەو تیۆلۆگەی کە دەتوانێت چەمکی یەزدانەکەی تەنیا لەسەر ئاستی بەرزی توانستە فیکرییەکانی خۆرئاوادا بهێڵێتەوە، ئەگەریش ئەو سور بێت لەسەر هەموو ئەو پێوەرە گەورانەی هزر، کەوا لە شوێنێکدا جێگەیەك، ئەرکێك، خانەیەك، یان وەك هەمیشە دەمانەوێت پێی بڵێین، جێگایەك هەیە، کە تێیدا گشت وەکو گشت و وەکو تاکی هەمەکی دەناسرێت. وەکو باویشە بەو جێگایە دەگوترێت: یەزدان. لەو جێگایەدا هەموو شت پابەندی خۆیەتی، هەموو شت خۆی هەیە، ڕەنگە هەموو شتێکیش هەر چێژ لە خۆی وەربگرێت. بەبێ هیچ گومانێك ئەمەش بەجۆشترین بیرۆکەی میتافیزیکی کلاسیکە – واتە هزری گردکردنەوەی "گشت" لەناو ناوەندێکی زانیار و ئەفرێنەردا. بەبێ جێگەیەکی لەو جۆرە، کە تێیدا هەموو شت بریتییە لە رۆح و لە خۆناسین، ڕەنگ بوو جیهان چ پەیوەستییەکی نەبووایە، بەم پێیەش چ مانایەکی نەدەبوو. بە دیدی من ئەتایزمی نوێ هەوڵێکە بۆ بەجێهێشتنی ئەو جێگایە، بەڵام بەبێ ئەوەی دەستبەرداری بێت. ئەوەشی پێی دەگوترێت "مەرگی یەزدان"، ئەوە دەرئەنجام دەکات، کەوا ئێستا مرۆ کونێکی ڕەشی کردۆتە ئەو جێگایەی کە هزری ناوەندە زیندەباڵەکە *die ueberbeseelte Mitte*ی تێدا دەکرا.

**یونگل:** تیۆلۆگی تەواو بێگوناه نییە لەو ئەتایزمەدا، چونکە ئەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد گوایا یەزدان هێندە چاك ئەفراندنەکەی کردووە کە هێشتا یاساکانی کاریگەرن و ڕێدەکەن: "گەر یەزدان نەبووایە، ئەوا مرۆ بەبێ تاوانێکی گەورە بۆی نەبوو بانگەشەی شتێك بکات" (گرۆتیوس – *Grotius*)، بەڵام دەتوانێت لە ڕووی شیمانەو هیپۆتێتەوە ڕۆچێتە ناو بیرکردنەوەیەکەوە، کە تێیدا ئەتایزم ئامادە دەکرێت. من لەگەڵتاندا کۆکم، کەوا پێدەچوو ژیان بە دژواری لە ئەستۆ هەڵبگیرایە، گەر ئەوەی کە

لەسەدەی رابوردوودا پێی دەگووترا: "ئێستای راستەوخۆی تەواوی هەبوونە بێ هاوبەشەکە"، نەهاتبایەتە دی. بەڵام من ئەم پرسیارە دەکەم: ئایا دەشێت، ئەم گشتە، لە جیهانەوەو لە کەرتەکانی خۆیەوە هەڵتۆقیبێت؟ ئایا ئەوە گشتێکی تۆپزیئامێزانە، یاخود تەوتەمێکی هەمەکی نییە کە دەبێت بە بەردەوامی خۆی رابگەیەنێت؟ ئایا دروست ئەزموونکردنی گشتایەتی پشت نابەستێت بە هێزی دەرەکێتی *Externitaet* و بە بەرامبەرەکەی تری گشت کە لەوێش زۆرترە؟ ئەمە دوا پرسیاری من بوو، وا ئاگاداریش کرامەوە، کە لە کاتی دروستدا دەست هەڵبگرین: رەنگە ئێوەش دوا پرسیارتان هەبێت؟

**زلۆتەردایك:** پێموایە منیش دواپرسیاری خۆم کردبێت. جیهان چییە، وە گەر ئێمە بیر لەو بکەینەوە، ئەوا چی لە توانستەکانی ئێمە دەمێنێتەوە ئەگەر لەناویدا چ شوێنگەیەکی تایبەتمەند وەرنەگرین. شوێنگەیەك کە تێیدا دەشێت جیهان گشت جیهان بێت و ئێستاش ئەم بارەگایەی جیهان لە گیانی مرۆییدا یاخود لە خودایەکی دەرەکیدا ببینرێتەوە. لە هەندێك باردا ئێمە تەنیا هەڵبژاردنمان لە نێوان گیانێکی ئەبسکۆندیتاو *abscondita anima* لە نێوان یەزدانێکی ئەبسکۆندیتا *deus abscondita* دا هەیە. ئەگەر شوێنگەیەکی لەو جۆرە هەبێت، کە نییە، شوێنگەیەك کە تێیدا خۆوەرگرتنی گشت چێ دەبێت، ئەوا گوزارەی جیهان مانای خۆی دەگۆڕێت. ئەوساش ئەو دەتوانێت راڤەیەکی زۆر زۆر کەم بکات، وەك لەناو ترادیسیۆنی میتافیزیکی و تیۆلۆگیدا هەیە. مرۆگەل، هێندەی ئێمە دەیناسین، "دروستکەری جیهانە" بەپێی مانا هایدگەرییەکەی ئەم گوزارەیە. بەڵام رەنگە ئەوەش ناوازە بێت، گەر بمانەوێت خۆرەنگدانەوەی گشت لەناو هۆشمەندێکی کۆتاداردا جێنشین بکەین. ئاوەها تەنیا یەزدان وەکو شوێنگەی ڕەهای رەنگدانەوەی جیهان دەمێنێتەوە. بەڵام ئەمە هەر رایەك بێت، بۆ ئێمە وەك مەتەڵێکی تەواو تەواو چڕ دەمێنێتەوە، چونکە ئێمە ناتوانین چاوەدێری ئەوە بکەین چۆن یەزدان چاوەدێری جیهان دەکات. یەزدان بۆ ئێمە بەشێوەیەکی ڕەهایی شیاوی چاوەدێریکردن نییە و بەم مانایەش ئیدی ئەو لە ئەبسکۆندیتوس *absconditus* یێك پترە.

**یونگل:** بەڵێ، هەڵبەت ئەوەش جیاوازییەکی کۆلێژەکانە. من زۆر لەگەڵتاندا تەبام: کە گیان بریتییە لە *abscondita anima*. یەزدان خۆی راگەیاندووە و جۆشی ئەوەشی کەوا داوای ماف بکاتەوە، ئەوا تەواو وەك جۆشدارێك خۆی درکاندووە. هەر لەبەر ئەوەشە کە من ویستوومە سەبارەت کۆت و کۆسپەکان لە هەمان هەناسەی *anima abscondita* و *deus asconditus* بدوێم. بەڵام کاریگەرییەکی شاراوەی یەزدان هەیە، کاریگەرییەکی شاراوەی سامناکی یەزدان بەسەر مێژووی جیهانەوە. بەڵام ئەو خۆیشی وەها ئاشکرا راگەیاندووە، کە دەکرێت بڵێین، هەرچۆنێك بێت گەر لێرەدا باوەڕمان بەم کتێبە هەبێت کە وا هەنووکە تیۆلۆگی پاراستنی ئەم کتێبەی لە ئەستۆ هەڵگرتووە، ئەوا لە ناو یەزداندا رووناکی هەیە نەك تاریکی.

**زلۆتەردایك:** لەبەرئەوەی ئێوەش پشتتان بە کتێبی کتێبەکان بەستووە، ئەوا ڕێ بە خۆم دەدەم پەراوێزێك سەرباری ئەوە بخەم. گۆتهارد گیونتەر چیرۆکێکی نایاب لە مەڕ داگیرکردنی مەکسیکۆوە دەگێڕێتەوە: ئیسپانییەکان دەچنە لای ئینکا *Inka* "شارستانیەتی ئینکاییەکان -و-" و خۆیان نمایش

دەکەن و لەسەر سەکۆیەکەوە جاڕنامەیەکی درێژیان بۆ دەخوێننەوە، کە پوختەی ماناکەی ئەمەیە: پاشای ئیسپانیای ئەمڕۆ لە ڕێی ڕەوایەتی ئەم کردەیەوە کە لە لایەن یەزدانەوە دانراوە بالادەست دەبێت بەسەر ئەم شانشینەدا. دواتر ئینکا داوای بەڵگە دەکات. لەم کاتەدا پاپاقەشەیەك دێتە پێش، کە پێموایە، ناوی سامیرە *Samera* بوو، ئەویش ئەم کتێبەی دایە دەست و ئینکاش وەریدەگرێت و تەماشایەکی دەکات و، دەینێت بە گوێیەوە و دەڵێت: "ئەوە خۆ هیچ ناڵێت."، ئینجا بە قاقایەکی تەوسئامێزانەوە دەیدات بە زەویدا. ئەم ڕووداوە ڕەوتی خۆی لەوەدا بەرئەنجام کردووە کە کتێبەکانی مێژوو لە ژێر ناونیشانی *Conquista* دا دەیگێڕنەوە. ئەم چیرۆکە نایابە *die Anikdote* ئاماژەیە لەسەر ئەوەی، کەوا کتێبان لەلایەن خۆیانەوە بە تەنیا هیچیان پێ ناکرێت، بەڵکو بۆ ئەوەی کاریگەر بن ئەوا پێویستیان بە پاشکۆ و پاشبەند هەیە.

**یونگل:** ئەمە لە ڕووی کاتۆلیکەوە شتێکی چاکە، لە کاتێکدا چاکساز – لوتەر – دەڵێت: کتێبی پیرۆز خۆی خۆی ڕاڤە دەکات، " *sui ipsius interpres sacra scriptura*".

**زلۆتەردایك:** من پێشموایە، گەر لوتەری چاکساز لە شوێنی قەشە سامیرا بووایە، ئەوا پێدەچوو (ئینکاش) بە هەمان شێوە کتێبەکەی بدایە بە زەویدا.

**یونگل:** ئەوە شتێکی حەتمی نییە کە تەنیا *Conquista* بەرئەنجامی ئەوە بێت. پێموایە دەتوانین لێرەدا کۆتایی بهێنین.

# نامەیەکی کراوە بۆ مەهدی بازرگان(1)*

میشیل فۆکۆ
لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

هاوڕێی ئازیزم "حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ" دوای دە ساڵ لێکدابڕان، لە هۆڵەندەوە دیارییەکی بەنرخی بۆ هێنام، کتێبێکی نایاب دەربارەی تێڕوانینی میشیل فۆکۆ بۆ دەسەڵات، لێرەدا دەقی ئەو نامەیە بڵاودەکەمەوە کە کاتی خۆی فۆکۆ ئاراستەی مەهدی بازرگان سەرەك وەزیرانی ئەوسای ئێرانی کردبوو.

## بەڕێز میستەر سەرەك وەزیران

لە ئەیلولی ساڵی رابردوودا – شەش حەوت هەزار ژن و پیاو لەسەر شەقامەکانی تاران گوللە باران کران – تۆ گەرەنتی چاوپێکەوتنێکت پێدام. ئەوە لە قوم(2) بوو، لە شوێنی نیشتەجێی ئایەتوڵڵا شەریعەت مەداری. دەدوانزە هەڵسوڕاوی مافەکانی مرۆڤ هانایان بردبوو بۆ ئەوێ و سەربازەکانیش بە دەمانچەی ئۆتۆماتیکییەوە بەردەمی ئەو دەروازەی بەرەو شەقامە بچووکەکەیان گرتبوو.

ئەو کاتە، تۆ سەرۆکی رێکخراوی مافەکانی مرۆڤ بوویت لە ئێران. ئەوەش جوامێریی بوو لە لایەنی تۆوە. جوامێرییەکی جەستەیی: بەندیخانە چاوەڕوانی دەکردیت، تۆش بەوە راهاتبوویت. جوامێرییەکی سیاسی: سەرۆکی ئەمریکا لەم ماوەیەدا شای لە لیستی ئەوانەدا نێوزەد کردبوو کە داکۆکیی لە مافی مرۆڤ دەکەن**. ئەمەش زۆرێك لە ئێرانییەکانی تووڕە کردبوو. ئەوانە پیشانیان دا کە دەزانن چۆن جەخت لە مافەکانی خۆیان بکەن. ئەوانە قبووڵیان نەبوو تاوانبارکردنی رەشپێستێکی لاو لە باشووری ئەفریقیای راسیست(3)، هاوتای تاوانبارکردنێك بێت لە تاران، لە لایەنی ئەشکەنجەدەرانی ساڤاکەوە. کێ دەتوانێت لۆمەیان بکات؟

چەند هەفتەیەك لەمەوبەر، تۆ دادگاییە رووکەشییەکان و لەسێدارەدانە خێراکانت راوەستاند. لە هەموو شۆڕشێکدا، دادپەروەریی و نادادپەروەریی خاڵێکی گرنگە: چونکە ئەو شوێنەی لێی لەدایکبوون، زۆرجار هەر ئەو شوێنەیە کە تێیدا رێگایان لێ هەڵە دەبێت و دەمرن. هەروەها لەو کاتەوەی تۆ بەشێوەیەکی جەماوەریی ئاماژەت بۆ

ئەمە كردووە، هەستدەكەم پێویستە دەمەتەقێكەی خۆمانت لەو بارەیەوە بیر بهێنمەوە.

من و تۆ باسی هەموو ئەو رژێمانەمان كرد كە خەڵكی سەركوت دەكەن، لە كاتێكدا كە باسی مافی مرۆڤ دەكەن. تۆ گوزارشتت لە هیوایەك كرد: لەو خواستەی بەشێوەیەكی گشتی لە ئێرانییەكاندایە، حكومەتێكی ئیسلامیی گەرەنتیی تەواوی ئەو مافانە بدات. سێ هۆشت بۆ ئەم هیوایە خستەڕوو. وتت رەهەندێكی رۆحییانە هەژانی گەل كپ دەكاتەوە، ئەو هەژانەی كە تێیدا هەموو تاكێك هەوڵ بۆ جیهانێكی بە تەواویی جیاواز دەدا، سەرەڕۆیی بە هەموو شتێكەوە دەكات (بەشی زۆری ئەم "هەموو شتێك"ە لە خودی خۆیان نە زیاتر و نە كەمتر نییە): ئەوە ئارەزووی ئەو نەبوو كە لە لایەن حكومەتێكی مەلاكانەوە فەرمانڕەوایی بكرێن. پێموابێت تۆ ئەم گوزارشتەت بەكارهێنا. وەلێ ئەوەی من لە تارانەوە بۆ عەبادان[4] بینیم، پێچەوانەی خۆزگەكەی تۆ نییە، بەڵكو هەر زۆر دوورە لێی.

تۆ وتیشت، ئیسلام لە قوڵایی مێژوویی و دینامیزمی ئامادەگییە رۆژانەییەكەیدا، لە توانایدا هەیە خۆی بدات لەم مەسەلەیە، مەسەلەی مافەكان، ئەو كێبڕكێ خۆلێلانەدراوەی كە سوسیالیزمیش نەیتوانی باشتر دەستی بۆ ببات – لانی كەم – لە چاو سەرمایەدارێتیدا. هەندێك دەڵێن، مەحاڵە – واتە ئەو تاكانەی پێیان وایە زۆر شت دەربارەی كۆمەڵگا ئیسلامییەكان، یاخود دەربارەی سروشتی ئایین، دەزانن. من زۆر لەوان میانڕۆتر دەبم، پێموانیە كە پێویستە موسوڵمانەكان قەدەغە بكرێن لەوەی ئایندەی خۆیان لە ناو ئیسلامێكدا بەدی بهێنن كە بە دەستی خۆیان سیماكەی دروست دەكەن. زاراوەی "حكومەتی ئیسلامی" بۆچی بە بەكارهێنانی سیفەتی ئیسلامیی گومان لە خۆتان دەوروژێنن، زاراوەی حكومەت هۆی بەسە بۆ وریاكردنەوە. هیچ سیفەتێكی وەك – دیموكراسیی، سوسیالیست، لیبراڵیی، میللیی – حكومەت لە ئەركەكانی سەرشانی نابەخشێت.

تۆ وتت، حكومەتێك دەسەڵاتی خۆی لە ئیسلامەوە بخوازێتەوە، مافە بەرچاوەكانی سەروەری مەدەنی كورت دەكاتەوە بۆ ئەو ئەركانەی لەسەر بناغەی ئایین دامەزراون. حكومەتێك ئیسلامیی بێت، ئەوا بە ژمارەیەك ئەركی لاوەكی دەور دەدرێت. هەروەها رێزیش لەو پێوەستییانە دەگرێت، چونكە گەل دەتوانێت سەرلەنوێ ئایین دژی بەكاربهێنێتەوە. بەلای منەوە بیرۆكەكە گرنگ دیارە. خودی خۆم تا رادەیەك بە گومانم بەرامبەری ئەو بایەخە خۆبەخشانەیەی حكومەتەكان مەیلیان لێیەتی بیدەن بە ئەركەكانی سەرشانی خۆیان. هەرچۆنێك بێت، بۆ ئەوانەی فەرمانڕەوایی دەكرێن، وا باشە بتوانن هەستنە سەرپێ و ئاماژە بكەن بۆ ئەوەی فەرمانڕەوایان هەر هیچ گەرەنتی ئەو مافانەیان نەداوە بەوانەی فەرمانڕەواییان دەكەن، بگرە هەوڵ دەدەن خۆیان لە ئەركەكانیشیان بدزنەوە. هیچ حكومەتێك ناتوانێت خۆی لەو ئەركە بنچینەییانە قوتار بكات. بۆیە لەم تێڕوانینەوە، ئەو دادگایانەی ئێستا لە ئێراندا ساز دەكرێن، هیچ نین جگە لە زەنگی خەتەر.

لە مێژووی گەلێكدا، هیچ شتێك لەو ساتە دەگمەنانە گرنگتر نییە كە تێیاندا یەكدەستە رادەپەڕێت بۆئەوەی ئەو رژێمێك بڕوخێنێت، لەم ساتانەدا ناتوانێت چیتر لێبوردە بێت. لە لایەكی تریشەوە، لە ژیانی رۆژانەی گەلدا، هیچ شتێك لەو ساتانە گرنگتر نییە، كە دەسەڵاتی میللی زۆر بە سانایی دژی تاك هەڵدەگەڕێتەوە، بە دوژمنی خۆی لە قەڵەمی دەدات و بڕیار دەدات بیخاتە سەر زەوی:

چیتر لە هیچ شتێك ناپرینگێتەوە. ئیتر دادگاییە سیاسییەكان سەنگی مەحەكن. نەك لەبەرئەوەی تۆمەتباركراوەكان تاوانبار نین، بەڵكو لەبەرئەوەی دەسەڵاتی میللی بەبێ دەمامك خۆی دەخاتە روو، خۆی دەبێت بە دادگاییكەری دوژمنەكانی.

ئەو دەسەڵاتە میللییە هەردەم بانگەشەی ئەوە دەكات كە خۆی وا لێبكات رێزی لێبگرێت. وەلێ، لە راستیدا، ئەو لەوێدا ئامادەگیی هەیە و پێویست دەكات رێزی تەواوی لێبگیرێت. ئەو مافەی بۆ داكۆكیكردن لە گەل پیادەی دەكات، هەر خۆی سەرشانی بە لێپرسراوێتیی گران، قورس دەكات.

ئەوە گرنگە - پێویستیشە وا بێت - كە ئەو كەسەی لە ناو دەبرێت، هەموو هۆیەكی داكۆكیكردنی بۆ فەراهەم بكرێت و هەموو مافێكی شیاوی پێبدرێت. ئایا ئەو لە بنچینەدا تاوانبارە؟ ئایا رای گشتی بە تەواو دژی ئەون؟ ئایا خەڵكی رقیان لێیەتی؟ ئەمانە بە راشكاویی مافن دژی ئەو، ئەو مافانەی كە دەبێت زۆر دیار و بەرهەست بن، ئەو ئەركی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایە كە گەرەنتیی ئەمانە بدات، چونكە حكومەت بۆی نیە، لانیكەمی ئەو مافانەی شایستەی مرۆڤن ببەزێنێت. هەروەها ئەوە ئەركی هەموو حكومەتێكە كە پیشانی هەموو كەسێكی بدات - مەبەستم لە نزمترین و سەرسەخترین و نابیناترینی ئەوانەی فەرمانڕەواییان دەكەن - كە لە سایەی چ مەرجێكدا، بە چ رێگایەك، بە پێی كامە پرەنسیپ، دەسەڵات مافی ئەوەی هەیە سزا بدات. ئەو سزایەی لێی نەكۆڵراوەتەوە بە بیانووی ئەوەی رەوایە هێشتا هەر سزایەكی نادادپەروەرانەیە بەرەو ئەوانەی تاوانباركراون، هەروەها بەرەو هەموو ئەوانەشی كە لە سایەی شەریعەتی فەرمانڕەوادان.

پێموایە ئەم ئەركە بدرێت بە دادگا، كاتێك یەكێك دەیەوێت دادگایی بكات، دەبێت دادگاییەكە لە لایەنی حكومەتەوە قبووڵ كرابێت، لەگەڵ رێزگرتنی هەموو مرۆڤەكانی سەرانسەری زەویدا. من ئەندێشە دەكەم تۆ لە من زیاتر گەرەنتی ئەو پرەنسیپەی سەروەریی ناكەیت، كە تەنیا هەر ئەوەندەی لەسەر بێت خۆی وەڵامی خۆی بداتەوە. فەرمانڕەوایی بەبێ ئاخاوتن نابێت، وەك چۆن بە كوشتن و تاوانباركردنیش بەرێوە ناچێت. ئەوە باشە كە كەسێك، گرنگ نییە كێ، تەنانەت ئەگەر كەسێكی ئەوسەری دونیاش بێت، بتوانێت بێتە قسە لەبەرئەوەی ناتوانێت قبوڵی ئەوە بكات كەسێك ببینێت ئەشكەنجە بدرێت یان لەناو ببرێت. ئەوە دەستێوەردانی كاروباری ناوخۆی دەوڵەت نییە. ئەوانەی لەبری تاكە ئێرانییەكی ئەشكەنجەدراوی ناو زیندانەكانی ساڤاك نارەزاییان دەربڕیوە، دەست دەبەن بۆ گەردوونیترین مەسەلەی دونیا.

رەنگە بوترێت كە زۆرینەی ئێرانییەكان متمانەی خۆیان بەخشیوە بەو رژێمە، بۆیە دەبێت كردەوەكانیشی بسەلمێنن. راستی قبووڵكران، هیواپێدران، دەنگ بۆ دران، ئیلتیزاماتەكانی حكومەتەكان كەم ناكاتەوە، بەڵكو قورستریان دەكات.

بێگومان، جەنابی سەرەك وەزیران، من هیچ دەسەڵاتێكی ئەوەم نییە لەم رووەوە ئامۆژگاریی تۆ بكەم - مۆڵەتی ئەم كارە لەوەوە هاتووە كە لە یەكەمین ئاخاوتنماندا، تێگەیشتم تێڕوانینی تۆ بۆ فەرمانڕەوایی كردن ئارەزوو كردن نییە، بەڵكو ئەركێكی یەكجار گرانە. ئەركی سەرشانی تۆیە دڵنیا بیت لەوەی كە ئەو گەلە هەرگیز ملی كەچ ناكات بۆ ئەو هێزەی كە بەهۆیەوە خۆی رزگار كردووە.

## پەراویز

*ئەم نامەیە بۆ سەرەك وەزیرانی ئێران لە *Le Nouvel Observateur* دا بلاو کراوەتەوە، لە نیسانی 1979 دا.

**لە سالی 1978 دا، سەرەك جیمی کارتەر ناوی شای وەکو داکۆکیکەر لە مافی مرۆڤ بردووە.

## پەراویزەکانی وەرگێر

1–خومەینی لە یەکی شوباتی سالی 1979 دا گەڕایەوە بۆ ئێران و دەستی کرد بە کۆنترۆلکردنی حکومەت. سەرەك وەزیرانی شای دەرکرد و مەهدی بازرگانی کرد بە سەرەك وەزیران. بازرگان پیاوێکی لیبرالّ بوو، حەزی لە دیموکراسی بوو، زۆر کەس پێیان وا بوو کە حکومەتی نوێ بوارێکی فراوان دەڕەخسێنێت بۆ بیری ئازاد. لە ریفراندۆمەکەی کۆتایی ئاداردا، جەماوەر دەنگیان دا بۆ شێوازێکی نوێی حکومەت، لە مانگی نیسانیشدا خومەینی حکومەتی ئیسلامیی ئێرانی دامەزراند و بازرگان بە ناچاریی ولاتی جێهێشت و رووی کردە تاراوگە. جێی خۆیەتی ئاماژە بەوەش بدەین کە وەزیری دەرەوەی حکومەتەکەی بازرگان، ناوی کەریم سنجابی بوو، کورد بوو.

2–قوم *Qom* شارێکە لە ناوەڕاستی ئێراندا، ناوچەی ئیداریی هەرێمی قومە، دەکەوێتە 120 کم لە باشوری تارانی پایتەختەوە، لەسەر روباری قوم بیناکراوە کە لە چیاکانی زاگرۆسەوە هەلدەقولێت. شاری قوم هێلی ئاسنین و کارگە و فاکتۆری گەورەی تێدایە، قالی دەسکرد و سیرامیك و شوشە و چنین و مافوریش بەرهەم دەهێنێت. لە باکوری خۆرهەلاتی شارەکەوە لە نزیکی گوندی ئەلبورز ناوچەیەکی نەوتینی دەولەمەند هەیە، بەلام جۆری نەوتەکەی باش نییە، لە سالی 1920 بە دواوە قوم بە پەیمانگا و کۆلێجەکانی پێڕەوی شیعە نێوبانگی دەرکردووە. هەروەها لە شەش حەوت سەدە بەر لە ئێستاوە شارەکە بووە بە جێگەیەکی پیرۆزی شیعەکان، چونکە مەزاری فاتیمەی لێیە. ئەسلّ و فەسلی ئەم شارە روون نیە، بەلام مێژوویەکی دووری هەیە و بەردەوام ناوچەیەکی ئاینیی بووە. لە سەردەمی ساسانییەکاندا (224–651) شەش حەوت پەرستگای گرنگی زەردەشتییەکانی لێبووە. دوای ئەوەی موسولمانە عەرەبەکان ئێرانیان داگیر کرد، قوم بۆ ماوەی زیاتر لە 200 سالّ وەك سێنتەرێکی ئاینی زەردەشتی مایەوە. کاتێك زەردەشتییەکان پەنای لایەنگیرانی عەلی و حوسەینیان لەناو شارەکەدا کردەوە، لە ماوەی سەدەی هەشتەمی زاینیدا بەشی زۆری شارەکە چوونە سەر پێڕەوی شیعە، ئەمەش پالی بە فاتیمەی هاوسەری رەزای هەشتەمین ئیمامی شیعەکانەوە نا روو بکاتە ئەوێ و لەوێ بە نەخۆشی دەمرێت. لە سالی 1996دا ژمارەی دانیشتوانەکەی 777.677 کەس بووە.

3–راسیزم سیاسەتێکی شۆڤێنییانەیە، لەسەر بنەمای رەچەلەك مامەلە لەگەلّ مرۆڤەکاندا دەکات و فەزلی رەچەلکێك دەدات بەسەر رەچەلەکەکانی تردا.

4–عەبادان *Abadan* شارێکە لە باشوری خۆراوای ئێران، دەکەوێتە هەرێمی خوزستانەوە. شاری عەبادان بەشی باکوری خۆراوای دورگەی عەبادان داگیر دەکات، کە دورگەیەکی باریکە نزیکەی 29 کم درێژە و لە ناو روباری شەتولعەرەبدایە. شارەکە بەرامبەری بەندەری خوڕەمشەهرە. لە سالی 1900ەوە عەبادان بووە بە شارێکی نەوتین، بەندەرێکی گرنگی ئێرانە. لە سەدەی هەشتەمی زاینیدا، ئەم شارە دروستکراوە و ناوی نراوە عەبد کە یەکێك بووە لە عەباسییەکان. لە سالی 1980دا لە جەنگی عێراق ئێراندا، عێراق هێرشی کردە سەر شارەکەو دوای هەژدە مانگ بەرگری تەسلیم بوو، بەلام هەرگیز تەواوی شارەکە نەکەوتە دەستی عیراقەوە، بەلام بەشی زۆری وێرانکرا. لە سالی 1980دا دانیشتوانەکەی 300.000 کەسێك دەبوو، زۆربەیان پەرت و بلاوبوونەوە بۆ ناوچەکانی تری ئێران. لە دوای جەنگەوە دەست کرا بە ئاوەدانکردنەوەی شارەکە و لە سالی 1997 دا، توانرا بڕی بەرهەم هێنانی نەوت بگەیەنرێتەوە سالانی پێش جەنگ. لە سالی 1996دا، ژمارەی دانیشتوانەکەی گەیشتەوە نزیکی 40.000 کەس.

# ئۆلیڤیه مۆنژن

رامین جەهانبەگلو

لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

***ئێوە چ ساڵێك چوونە گۆڤاری "ئیسپری"یەوە؟**

-ساڵی 1975 لە بەشی فەلسەفەی سیاسیدا خوێندنم تەواوکردبوو و، سەرنووسەری ئەوسای گۆڤارەکە، واتە پۆڵ تیبو" داوای لێکردم بچمە گۆڤارەکەوە و یارمەتیی بدەم.

***ئەی چ ساڵێك ئێوە کران بە سەرنووسەری گۆڤارەکە؟**

-ساڵی 1988.

***"ئیسپری" گۆڤارێکە شەست ساڵە هەیە. دەزانین کە دامەزرێنەرەکەی، واتە ئەمانوێیل مۆنیە، لە رووی فیکرییەوە لایەنگری کەسێتیگەرایی (*individualisme* ) و ئەو ئایدیۆلۆژیایە بوو کە ئەو فیکرەی کردبووە پشتیوانی خۆی. بە رای ئێوە ئایا "ئیسپری" لە سەرەتای چالاکییەوە تا ئەمڕۆ لە بواری تیۆریدا تەوژم و هێڵێکی بەردەوامی هەبووە" یان لەم نەریتە جیابووەتەوە؟**

-شێوازی گۆڤارەکە بە زۆری هەمان ئەو شێوازەی سەرەتایەتی. بەڵام لەبەرئەوەی مەسەلەکانی کۆمەڵگای ئەمڕۆ و تەنانەت چاخناسیی ئەمڕۆش لەگەڵ ئەوانەی ساڵانی سیەکاندا جیاوازە، هەر بۆیە لە نێوان ئەو شتانەی ئێمە دەیڵێین و ئەو شتانەدا کە مۆنیە دەیگوتن جیاوازی هەیە. بڕوانە، لە چاخناسیی ئەمڕۆدا دوو هێڵ هەیە، یەکێکیان درێژەی هەمان چاخناسیی ساڵانی سیەکانە، واتە تا ئێستا هەر باس لە "قەیرانی ژیار" دەکات و بڕوای وایە کە ئەو دیموکراسییەی ئێستا بەسەر خۆرئاوادا باڵی کێشاوە" تێپەڕە و بەردەوام دەشێ شێوەی تازەی فاشیزم بێتەوە گۆڕێ. هێڵەکەی تریش کە ئێستا (ئیسپری) گرتوویەتیە بەر" بڕوای وایە کە حکومەتە دیموکراتەکان رەگوڕیشەیان لەوە قووڵترە کە تەسەور دەکرێ و، مەسەلەکەش لێرەدا پتەوکردن و مەحکەمەکردنیانە. کەواتە بە ردەوامبوونەکە لە شێوازی گۆڤارەکەدایە. بەڵام وا نەزانیت ئەوە مەسەلەیەکی کەمە. شێوازی کار لە (ئیسپری)دا یەکێکە لە گرنگترین تایبەتمەندیەکانی ئەم گۆڤارە. بڕوانە (ئیسپری) لە رووی شێوازی کارکردنەوە لەگەڵ هەموو گۆڤارەکانی تری فەرەنسادا جیاوازە. دەتوانین بڵێین کە (ئیسپری) گۆڤارێکە بە شێوەیەکی دەستەجەمعی بەڕێوە دەچێت، واتە بە شێوەیەکی

دەستەجەمعی بابەتەکانی هەڵدەبژێردرێ و بە شێوەیەکی دەستەجەمعیش لە بارەیانەوە تێدەفکرین. لە ڕووی بەراوردەوە، دەبینین کە گۆڤارێکی باشی وەکو (دیبا) بەستراوەتەوە بە دوو سێ کارگێڕی سەرەکیەوە، بەڵام (ئیسپری) وا نییە. (ئیسپری) لە ڕێی کارگێڕەکانیەوە باس ناکرێ" بەڵکو لە ڕێی تایبەتمەندێتییەوە لە شێوازی کاریدا. لە ڕاستیدا گۆڤارەکەی ئێمە فەزایەکی نەریتیە کە کەسەکان بە بیروباوەڕی جیاوازیانەوە پێکەوە کاری تیا دەکەن. هەر لەناو هاوکارەکانی (ئیسپری)دا تیایاندایە ڕاستڕەون و لایەنگری لیبرالیزمن، هەندێك هەن کاتۆلیکن، هەن پرۆتستانتن، ژمارەیەکیان جوولەکەن و، تیاشیاندایە هیچ ئاینێکیان نییە. هەڵبەت لە ڕووی سیاسیەوە زۆربە لەگەڵ چەپە نامارکسیستەکاندایە. هێزی (ئیسپری)یش لەوەدایە کە وەکو "تاقیگەیەکی ڕۆشنبیری" وایە و فەزای کارکردنی عەلمانییە و، ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە دامەزرێنەرەکەی خوازیاری بوو. فەزای عەلمانی" واتە فەزایەك کە هەموو کەسێك بتوانێ تیایدا بە بیروباوەڕی خۆیەوە ئامادەیی هەبێت. هەر ئەم بە عەلمانی بوونەشە وای کردووە کە (ئیسپری) تەمەنێکی درێژی وای هەبێت. هەروەها دیسانەوە هەر لەبەر ئەمەشە کە (ئیسپری) بەبێ کێشە لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی دی دەمێنێتەوە.

***تۆزێك زیاتر سەبارەت بە شێوازی کارتان لە گۆڤارەکەدا بۆمان بدوێن. وتار و بابەتەکانی هەر ژمارەیەك چۆن هەڵدەبژێرن؟**

–هەندێ لە وتارەکان لە دەرەوەی گۆڤارەکەوە بە دەستمان دەگەن، زۆربەی ئەم وتارانە باشن و بەرزیی ئاستی ئەو وتارانەی کە پێمان دەگەن" نیشانەی ئەوەن کە گۆڤارەکەمان لە دۆخێکی باشدایە. خۆیشمان هەندێ فایل دەکەینەوە. عادەتەن لەو ڕۆژەوەی کە بڕیار لەسەر دروستکردنی فایلەکە دەدەین تا ئەو ڕۆژەی تەواو دەبێت و دەبێتە بابەتی تایبەتیی ژمارەیەك لە ژمارەکان" دوو ساڵ دەخایەنێت. کەسێك یان چەند کەسێك لە ئامادەکردنی وتارەکانی فایلەکان بەرپرس دەبن. هێزی (ئیسپری) دەگەڕێتە بۆ ئەم فایلانەو، ئەمەش باشترین کارمانە کە ئەنجامی دەدەین. زۆر بابەت هەن کە بایەخی ڕۆژانەی خۆیان لەدەست دەدەن" بەڵام ئێمە بڕوامان وایە کە هێشتا هەر گرنگن. زۆر مەسەلەی تریش هەیە کە ئێمە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە لە ئایندەیەکی نزیکدا گرنگی بەدەست دەهێنن و بۆیە پێشتر فایلیان لەسەر دەکەینەوە. بۆ نموونە تەواوی ئەو باسانەی کە ئەمڕۆ سەبارەت بە کەنارگیری لە فەرەنسادا لە ئارادایە، ئێمە پێشتر پێشبینیمان کردبوون و فایلمان لەسەر کردبوون. لەبەرئەمەیە کە ئێمە ئەمڕۆ لە بواری مەسەلەکانی جوانناسیدا لە پێش هەمووانەوەین. ئێستاش ئێمە خەریکی ئەوەین کە کار لەسەر بە گشتیکردنی ڕەخنەی تۆتالیتاریزم دەکەین لە بواری کەلتووریدا، لەبەرئەوەی بڕوامان وایە کە بەم زووانە ئەم باسە لە کۆمەڵگادا دەوروژێت.

***(ئیسپری) چۆن بەڕێوە دەچێت، چۆن سەرنووسەر هەڵدەبژێرن؟**

–(ئیسپری) ئەنجوومەنێکی ئیداریی هەیە کە ئەرکی هەڵبژاردنی سەرنووسەر لە ئەستۆی ئەودایە، بەڵام عادەتەن کاتێ سەرنووسەرێك وازدەهێنێت" ڕای خۆی سەبارەت بە باشترین کەسێك دەردەبڕێت کە دەکرێ ببێتە جێگرەوەی. من کاتێ بەرپرسیارێتیی بەڕێوەبردنی (ئیسپری)م قبووڵ کرد، گۆڤارەکە بە دۆخێکی زۆر خراپدا تێدەپەڕی و لە ڕاستیدا بڕیاردرابوو کە لەبەر گرفت و کێشەی ماددی دابخرێت. بە ڕای من ئەم کارە بە

هەڵەداچوونێکی گەورە بوو. من پرۆژەیەکی چاپەمەنی ماددیم ئامادەکرد و توانیمان بەسەر کێشەکاندا زاڵ بین. تەواوی بڕیارە ئیدارییەکان لە ئەستۆی ئەنجومەنی بەڕێوەبردندایە. ئەندامانی دەستەی نووسین زۆربەی ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە پێکدەهێنن و باقی ئەندامەکانی تریش بریتیە لە کادێری دارایی و بڵاوکەرەوەکانی گۆڤارەکە.

***لە ئێستادا "ئیسپری" بە تیراژی چەند دەردەچێت؟**

–ئێستا تیراژی نۆ هەزار دانەیە. پێنج هەزار بەشدارمان هەیە نزیکەی سێ تا چوار هەزار نوسخەش بە دانەدانە دەفرۆشرێ، هەندێ لە ژمارەکانیشمان بۆ جاری دووەم چاپ دەکەینەوە.

***چۆن بودجەی گۆڤارەکە دابین دەکەن؟**

–ئیسپری لەم بوارەدا حاڵەتێکی زۆر تایبەتی هەیە، واتە گۆڤارێکە تەواو سەربەخۆ. ئیسپری وەکو کۆمپانیایەکی سەرمایەدار تۆمارکراوە و ئەم کۆمپانیایە گۆڤارەکە بەڕێوە دەبات. ئێمە لە ڕووی داراییەوە تەواو سەربەخۆین و سەربەخۆیی شەخسیشمان پەیوەندیی بەم سەربەخۆییە داراییەوە هەیە. تاقە کۆمەکێك کە وەریدەگرین لە "سەنتەری نەتەوەیی ئەدەبی فەرەنسا"یە کە یارمەتیی هەموو گۆڤارەکان دەدات، بەڵام ئەم کۆمەکە بە بەراورد لەگەڵ بودجەی گشتیی گۆڤارەکەدا هیچ نییە. زۆربەی ئەو گۆڤارانەی لە "ئیسپری" دەچن سەر بە دەزگایەکی بڵاوکردنەوەن، بەڵام ئێمە وانین.

***بەڵام ئێوە پەیوەندییەکی نزیکیشتان لەگەڵ دەزگای بڵاوکردنەوەی "سوی"دا هەیە؟**

–بەڵێ، پەیوەندییەکی نزیکمان هەیە، بەڵام یەکێك نین لە گۆڤارەکانی ئەم دەزگایە. بڕوانە" بەسەرهاتی ئیسپری و سوی بەم جۆرەیە:

دامەزرێنەرانی سوی پەیوەندییەکی نزیکیان لگەڵ ئیسپری دا هەبوو. بەڵام لە کاتی ڕووداوەکانی مانگی ئایاری ساڵی 1968دا لە فەرەنسا" جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیاندا دروست بوو. سوی ڕەگێکی کاتۆلیکی هەبوو، "ئیسپری"یش فەزایەکی عەلمانی (نادینی)، ئەمەش بووە مایەی ناکۆکییەکی زۆر لە نێوانیاندا. لەگەڵ ئەو ناکۆکیانەشدا سوی دەیتوانی لە سەرەتای حەفتاکاندا "ئیسپری" بکات بە گۆڤاری سەرەکیی خۆی، بەڵام نەیکرد. ئەمڕۆ ئەو ناکۆکیانە کاڵبوونەتەوە و ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ "سوی"دا باشە، بەڵام لە ڕووی داراییەوە سەربەخۆین و بەهەرحاڵ "سوی"یش وەکو گەلێ دەزگای بڵاوکردنەوەی دی ڕووبەڕووی قەیران بووەتەوە و ئەمەش مایەی ئەفسووسە.

***لەگەڵ دەوڵەتدا چۆن بوون؟ هیچ کاتێك لەگەڵیاندا دووچاری شتێك بوون؟ ئایا ڕووبەڕووی سانسۆر و شتی لەم بابەتە بوونەتەوە؟**

–لە کاتی شەڕی جەزائیردا لەگەڵ دەوڵەتدا بەیەکداهاتین و چاپکردنی هەندێ بابەتمان لێ قەدەغە کرا. ئەم قۆناغە، قۆناغێکی زۆر سەخت بوو.

***لە بنەڕەتدا "ئیسپری" چ پەیوەندییەکی لەگەڵ سیاسەتدا هەیە؟ ئایا بۆ نموونە دەتوانین بڵێین "ئیسپری" هەڵوێستێکی سیاسیانەی هەیە، چ لە بواری مەسەلە ناوخۆییەکانی فەرەنسادا و چ لە بواری مەسەلە نێو نەتەوەییەکاندا؟**

–بەڵێ دەتوانین وا بڵێین و ئێمە زۆریش هەوڵ دەدەین کە لە بواری سیاسەتدا ئامادەییمان هەبێت و چالاك بین. بایەخدانی ئێمە بەم بوارە لە بواری کۆمەڵایەتی زیاترە. هەوڵ دەدەین کەمتر خۆمان لە قەرەی شیکردنەوەی پەیوەست بە گۆڕانکاریی حیزبە سیاسیەکان بدەین. لەبەرئەوەی ئەم جۆرە شیکردنەوانە بووە بە خۆراکێکی ئاسایی ڕادیۆ و

تەلەفزیۆنەکان و، هەر لەبەرئەمەش زوو دووبارە دەبنەوە.

***واتە لەم بوارەشدا ئێوە هەوڵ دەدەن کە بە ڕەچاوکردنی بایەخپێدان و هەستیارێتی بەرامبەر بە مەسەلەکانی رۆژ" بچنە سەروو "ڕۆژنامەنووسی"یەوە.**

–بەڵێ وایە، ئێمە پەیوەندیمان بە ڕۆژنامەنووسییەوە نییە. مەسەلەی ئێمە لە بواری سیاسەتدا، بەها بەخشینە بە سیاسەت و کاری سیاسی. ئەمڕۆ دەزگاکانی ڕاگەیاندن و شێوازی ژیان خەریکن بە تەواوەتی سیاسەت بێبەها دەکەن" کە ڕەگی لە چەمکی نوێنەرایەتیدایە. تەوەری کاری ئێمە ئەوەیە پیشانی بدەین کە مەسەلەی نوێنەرایەتی لە چوارچێوەی فەلسەفە، جوانناسی و سیاسەتدا زۆر گرنگ و ڕۆڵێکی دیاریکەری هەیە و پێویستە سەرلەنوێ بایەخی پێ بدەینەوە. هەر لەبەرئەمەشە کە ئێمە تەواو دوورین لە گوتاری بونیادشکێنی (*deconstructivisme*)، کە سیاسەت بە بێبەها سەیر دەکات. ئێمە تەنانەت گەر ئەوەشمان پێ قبووڵ بێت کە دیدگای کەسێکی وەکو دێریدا لە ڕووی فەلسەفییەوە جێی سەرنجە و شتی ڕاست دەخاتەڕوو، بەڵام وەختێ بە مەسەلەی دیموکراسی دەگەین، ئەم دیدگایە بێمانا دەبێت. لەبەرئەوەی دەبێتە مایەی دروستکردنی گومانی گشتی و هەروەها گومانکردن لە دیموکراسی و، ئێمە ڕەخنە لەم تێڕوانینە دەگرین. ئێمە بڕوامان وایە کە ئەگەر ئادەمیزادەکان چاودێری دیموکراسی بن، سیستمە دیموکراتەکان ئایندەیان دەبێت. دیموکراسی پاکەتێك نییە ئادەمیزادەکان تیایدا لە پەنا یەکترەوە ڕیزکرابن. دیموکراسی پێویستی بە کار و بەرپرسیارێتیی تاکەکەسەکانە. با بزانین بەرامبەر بە ڕژێمە دیموکراتەکان ئێمە چ ئاڵتەرناتیڤێکمان هەیە. تەنانەت گەر هەموو ئەو جۆرە ئایدیۆلۆژیا نوێیانەش ئەفەرۆز بکەین کە لە ئارادان، دیسانەوە مەسەلەی کۆمۆنیزم هەر دێتە پێشەوە. هەڵبەت کۆمۆنیزم ئەمڕۆ چیدی لافی جیهانگیری لێنادات و زیاتر لە شێوەی کۆمۆنیزمی نەتەوەییدا لە چین درێژە بە ژیانی خۆی دەدات. بەڵام، بەهەرحاڵ تا ئەم نموونەیەش لە ئارادا بێت" ناتوانین باس لە مەرگی کۆمۆنیزم بکەین و بەم پێیەش بەرگریکردن لە دیموکراسی بێبایەخ و ناپێویستە.

دەبینین کە چین تەنانەت هەوڵدەدات کۆمۆنیزم لەگەڵ بنەماکانی سەرمایەداریدا سازش پێ بکات. واتە جگە لە دیموکراسی هەموو شتەکانی خۆرئاوای پێ قبووڵە. هەروەها بە ڕای من هەندێ لە ئیسلامیەکانیش لە هەموو شتەکانی دی زیاتر هێرش دەکەنە سەر دیموکراسی، کە هێشتا نازانم بۆچی. دەبێ ئەم ڕەخنانە بە جیدی وەربگرین و، لە ئەنجامیشدا، پشتیوانی لە دیموکراسی بکەین. دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە ئەوروپا سەری خۆیان بەوە ئاسوودە دەکەن کە ڕەخنەی ئیسلامەکان دواکەوتووانەیە و دەیانەوێ بۆ دواوە بگەڕێینەوە و، ئەمەش شتێکی مەحاڵە. ئەو قسانە بە جیدی ناگرن، لە کاتێکا بە ڕای من ئیسلامگەرایی بە تەنها ئەم لایەنەی نییە، بەڵکو هەروەکو "داریوش شایگان"یش دەڵێت" خاوەنی دوالیزمێکی دیارینەکەرە، واتە نە تەقلیدییە و نە نوێخواز. هەر لەبەرئەمەشە لە وڵاتێکی وەکو ئێراندا، کە وڵاتێکی نە تەواو تەقلیدییە و نە تەواو مۆدێرن" هاتە ئاراوە. واتە نابێ بگوترێ کە گوتاری ئیسلامگەرایان گوتارێکی دواکەوتوو و کۆنە و گوتاری لادێیە بەرامبەر بە شار. نەخێر، بەم سادەییە نییە. ئیسلامگەراکان مەسەلەی یەکسانی دەخەنە ڕوو" کە مەسەلەیەکی گرنگە. سەرەنجام دەبینین" کە لە بەیەکترگەیشتنی ئەم گوتارانەدا" پێویستە پایەی

دیموکراسی بپارێزین و لە ڕێی ڕەخنە و دووبارە هەڵسەنگاندنەوەیانەوە کۆتایی بەو قەیرانەی و هەروەها قەیرانی کۆمەڵگا ئەوروپییەکانیش بهێنین. ئایا دیموکراسی سیستمێکی لیبراڵ و یەکسانیخوازە؟ ئایا دیموکراسی ڕێز لە کەسێتیی تاکەکەسەکان دەگرێت؟ ماوەیەکە لە ئەمریکادا ئەم باسانە لە گۆڕێن و فەرەنساش ناچارە بچێتە ناو ئەم باسانەوە. هەر لەبەر ئەمەش لێکۆڵینەوەکانی ڕۆڵز و واڵزەر سەبارەت بە عەدالەتی کۆمەڵایەتی بۆ ئێمە زۆر گرنگن. ئێمە پێویستە وەڵامی ئەو پرسیارە سەرەکیە بدەینەوە کە کۆمەڵگایەکی دیموکرات و لیبراڵ بایەخ بە کام پەیوەندییانە دەدات.ئەگینا نابێ سەرمان لەوە سووڕبمێنێت کە جۆرەها وەڵامی خەمئەنگێز و وەڵامی پاش دیموکراسییانە بەم پرسیارانە بدرێتەوە.

***زۆر چاکە، بەڵام ئێوە خۆتان لەم بوارەدا چۆن بیردەکەنەوە، واتە چۆن مەسەلەی دیموکراسی دەخەنە ڕوو؟ لەبەرئەوەی مەسەلەی دیموکراسی، هەمیشە و هەر لە سەرەتاشەوە مەسەلەی "ئیسپری" بووە.**

–ڕاستە، دیموکراسی هەمیشە مەسەلەی "ئیسپری" بووە. بەڵام ئەمڕۆ بە بەراورد لەگەڵ سالانی سیەکاندا، تێگەیشتنێکی ترمان بۆ ئەم چەمکە هەیە. بەلای "مۆنیە"وە کە دامەزرێنەری "ئیسپری" بوو، دیموکراسی هاوبەهاو هاوتای لیبراڵیزم و تاکگەرایی بوو، ئەویش هەر چاوەڕێی ئەم شتانەی لە دیموکراسی دەکرد. هەربۆیە، لەو قۆناغەدا زیاتر باس لە قەیرانی ژیار دەکرا نەك دیموکراسی. بۆ نموونە چەمکی وەکو "تاکگەرایی کۆمەڵایەتی" لە ئارادا بوو، کەسە جیاوازەکان لە ڕوانگەی مارکسیستی یان ئێگزیستانسیالیستی یان لیبرالیەوە وەڵامیان دەدایەوە و وەڵامی ئێمەش زیاتر کەلتووری بوو نەك سیاسی.

لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا و لەژێر چاودێریی بەڕێوەبەرایەتیەکەی پۆڵ تیۆدا، "ئیسپری" وەرچەرخانێکی گرنگی ئەنجام دا و پێویستە بڵێم کە کتێبی "کۆمەڵە دوورگەکانی گولاك"ی سولژنیتسین ڕۆڵێکی دیاریکەری لەم وەرچەرخانەدا هەبوو، لەبەرئەوەی سەرنجی ئێمەی بەلای دیاردەی تۆتالیتاریزمدا ڕاکێشا و، ڕەخنەگرتنیش لە تۆتالیتاریزم، چ لە شێوە فاشیستیەکەیدا و، چ لە شێوە کۆمۆنیستیەکەیدا“ ئێمەی بە مەسەلەی دیموکراسی گەیاند. ئێمە لە ڕێی ڕەخنەگرتنی سیاسییەوە لە کۆمەڵگایەکی چوونیەك کە یەك حیزبی سیاسی تیایدا دەسەڵاتدارە، توانیمان بە تێگەیشتنی خۆماندا بۆ دیموکراسی بچینەوە. ئەم پیاچوونەوەیەش لە ڕێگای چەمکگەلێکی وەکو ناکۆکی و بەراوردەوە ئەنجام درا.

بەلای ئێمەوە، کۆمەڵگای مۆدێرن بە تەنها لە شێوەی کۆمەڵگایەکی بەشبەشبوودا مانای هەیە. ئێستاش مەسەلەکەی ئێمە ئەوەیە کە بە ڕەچاوکردنی ئەم دابەشبوونە“ چۆن دەتوانین ڕێککەوتنێکی تیۆریی وا بە دەست بهێنین کە ببێتە سەرچاوەی پایەداریی هەر کۆمەڵگایەك. بە واتایەکی دی و، هەروەکو پۆڵ ڕیکۆریش دەڵێت، دیموکراسی فەزای "ڕێککەوتنی بۆچوونەکانە بە تێکەڵبوون لەگەڵ پێکدادانەدا". بڕوانە، لە کۆمەڵگایەکی دیموکراتدا، تاکەکان لەسەر ڕێساکان ڕێك کەوتوون، لەسەر دەزگاکان ڕێك کەوتوون، بەڵام ئەم ڕێککەوتنانە نابێ ڕی لە بە یەکداچوونی بیروباوەڕەکان بگرن و، لەمەش گرنگتر، نابێ بەشە جیاوازەکانی کۆمەڵگا لەناوبەرن. لە ڕاستیدا ئەگەر جیاوازی لە ئارادا نەبێت“ کە مایەی پەیدابوونی شێوە جۆراوجۆرەکانی وزەیە لە کۆمەڵگادا، مەترسیی ئەوە هەیە کە ئەوەی "ڕێککەوتنی

بۆچوونەکانە" بەرەو "حوکمڕانیی بیروباوەڕ" بچێت. بەم پێیە، دەبێ لە یەك کاتدا هەم بیر لە ڕێککەوتنی بۆچوونەکان و هەم لە جیاوازیی بۆچوونەکان بکەینەوە. لەم ڕووەشەوە، بە بۆچوونی ئێمە مەسەلەی سیاسی گرنگترین مەسەلەیە و ئێمە لەو بڕوایەداین کە کۆمەڵگا بە تەنها لە شێوەی کۆمەڵگای سیاسیدا بوونی هەیە و ئەوە پەیمانی کۆمەڵایەتیە کە توانای ژیان و بەردەوامی بە کۆمەڵگایەکی مێژوویی دەبەخشێت. بەڵام ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەماندا لە دەرگای کۆمەڵناسیەوە ناچینە ژوورەوە، بەڵکو بیر لە "ڕێککەوتنی بۆچوونەکانی تێکەڵ بە پێکدادان" دەکەینەوە، واتە ڕێککەوتن لەسەر ڕێساکان هاوکات لەگەڵ توانای گەشەدان بە کۆمەڵگای سیاسی لە ڕێی هێزە جۆربەجۆرەکانەوە.

***باسی ڕیکۆرت کرد و دەزانم کە هانتا ئارێنت و کلۆد لۆفۆریش لەم ساڵانەی دواییدا کاریگەرییان لەسەر هێڵی فیکریی "ئیسپری" هەبووە. دەتوانیت کەمێك لەسەر کاریگەری و چۆنێتیی ئاشنابوون و هاوکاریی ئەم کەسانە لەگەڵ "ئیسپری"دا بۆمان بدوێیت؟**

–بۆ پەیبردن بە کاریگەریی ئەم کەسانە لەسەر "ئیسپری"، دەبێ سەرنج لە هزری فەلسەفی و سیاسیی ئەوان بدەین.

هەروەکو دەزانیت، ڕیکۆر کارێکی گرنگی هەیە بەناونیشانی "پارادۆکسی سیاسی". ئەوەی ڕیکۆر لەم نووسینەیدا دەیڵێت ئەوەیە کە گەورەترین باشە، واتە گەورەترین ئەقڵانیەت، دەشێ ببێتە مایەی گەورەترین خراپە. گەورەترین ئەقڵانیەت لە ڕوانگەی ئەوەوە هەمان توانای ڕێکخستنی پێکەوەژیانی تاکەکەسەکانە لە کۆمەڵگایەکی عەلمانیدا، واتە توانای گەیشتن بە "پەیمانی کۆمەڵایەتی"ی ڕۆسۆ. بۆئەوەی ئەم پێکەوەژیانەش مەیسەربێت، جیهانی مۆدێرن دەزگای نوێنەرایەتی دەهێنێتە ئاراوە و ناوی لێدەنێت "دەوڵەت". بەڵام ئەم دەوڵەتە دەشێ خۆی ببێتە سەرەکیترین ئامرازی دەسەڵات. بەم مانایە" دەشێ گەورەترین خراپە، کە دەسەڵاتی ڕەهایە" لە گەورەترین ئەقڵانیەتەوە لەدایك ببێت. کەواتە هەر ئەوەندەی پێ دەنێینە ناو کۆمەڵگای مۆدێرنەوە، پێ دەنێینە ناو سنوورێکەوە کە تیایدا دەسەڵاتی ڕەها هەیە. هەر لەم ڕوانگەیەشەوەیە کە ئەو وا دەڕوانێتە دیموکراسی کە ڕێککەوتنی بۆچوونەکانە تێکەڵ بە پێکدادانیان و هەروەها بیر لە ماف و سیاسەت و دەزگاکانیش دەکاتەوە. لەم ڕووەوەیە کە ڕیکۆر بەلای ئێمەوە نووسەرێکی گرنگە. کارەکانی ڕیکۆر بە دڵنیاییەوە لەژێر کاریگەریی بیروبۆچوونە ئایینیەکانیدان. بەڵام لە بیروڕاکانی ئەودا جیاوازییەکی تەواو لە نێوان ئیمان و فەلسەفەدا هەیە. واتە ناتوانین لە ڕێی ئیمانی ئایینیی ڕیکۆڕەوە پەی بە فەلسەفەکەی بەرین. ئەو بە مانای تایبەتیی وشەکە فەیلەسووفە. کاریگەریی ئایین لەسەر هزری ئەو لە هەمان بە سەنتەریبوونی خراپەدا کۆدەبێتەوە. بەڵام شێوەی مەسەلەی خراپە لای ئەو لەگەڵ گوتاری باوی پەیوەنددار بەم بابەتەدا جیاوازە. ئەوانی دی بڕوایان وایە کە خراپە چواردەورمانی تەنیوەتەوە و هێرشمان دەکاتە سەر، لە کاتێکا، ڕیکۆر بڕوای وایە کە خراپە بەسەرماندا ناسەپێنرێ و ناتوانێت لە بەردەم کارکردنماندا ببێتە ڕێگر. ئەو بڕوای وایە کە هەر لەبەر ئەوەی حراپە هەیە و بوونی ئەو پێش بوونی من دەکەوێت" بۆیە دەبێ کار بکەم و وەڵامی بدەمەوە. بڕوانە، دەتوانین بە دوو شێوە باسی خراپە بکەین. یەکێکیان بەرەو گومانمان دەبات و ئەوی تریشیان بۆ کارکردن هانمان دەدات و مەسەلەی ڕوونکردنەوەی سیاسەتی دیموکراتیمان بۆ دەهێنێتە گۆڕێ. لە بیروڕاکانی ڕیکۆڕدا فاکتەری

بەرجەستەکردنی فەلسەفەیەکی کار هەیە و لە پرۆژەی هایدیگەری و دێریدایی بونیادشکێنی جیاوازە. ڕیکۆر فەلسەفە لە مێژووی فەلسەفەدا کورت ناکاتەوە. گرنگیی هزری ئەویش بۆ ئەو کارەی کە ئێمە دەیکەین لەم هاندانی کارکردنە و هەوڵدانەدایە بۆ ڕوونکردنەوەی سیاسەتی دیموکراتی. بۆیە کاتێ ئێمە دەڵێین مەسەلەکەی ئێمە سیاسییە، واتە مەسەلەکەی ئێمە سەبارەت بەوەیە کە هەلومەرجەکانی کارکردن لە بواری سیاسیدا بڕەخسێ.

بەڵام سەبارەت بە ئارێنت، کاتێ من هاتمە گۆڤاری "ئیسپری"یەوە تازە خەریك بوون بایەخیان بە هانا ئارێنت دەدا. ئەودەمە کەس لە فەرەنسادا باسی ئەوی نەدەکرد. لە ساڵی 1974دا گروپێکی فەلسەفیمان دەربارەی ئارێنت پێکهێنا و لە ساڵی 1979دا ژمارەیەکی تایبەتمان بەو دەرکرد. ئارێنت زۆر سەرنجی ڕاکێشاین و لەسەر پێشکەوتنی فیکریی ئێمە زۆر کاریگەر بوو. ئارێنت بە شێوەیەکی تەواو نوێ سەرگەرمی ڕەخنەگرتن لە تۆتالیتاریزم بوو. لە بیروڕاکانی ئارێنتدا لایەنێکی سەرنجڕاکێشی تریش هەیە. ئەو نووسەرێکە دژ بە دوورەپەرێزییە لە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان. بە بڕوای من ئەو کەسانەی کە بیرمەندی کاربوون، بیرمەندی جۆرێك لە ڕووناکبینیی گەورە بوون و، لە ئاست مێژوودا، بە بیرمەندی سیاسی لە قەڵەم دەدرێن. ئارێنت ئەو توانایەی هەبوو کە بیر لە مەسەلە هاوچەرخەکان بکاتەوە و، هەروەکو دەشزانن، ئەم کارە شتێکی بنەڕەتییە بۆ ئێمە. کاتێ ئێمە باس لە ڕەخنەگرتن لە تۆتالیتاریزم دەکەین، لە هەمان کاتدا توانای بیرکردنەوە سەبارەت بە مەسەلە هاوچەرخەکان و سیاسەت لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دەخەینە ڕوو.

دەربارەی کلۆد لۆفۆریش دەبێ بڵێم کاتێ بۆ "ئیسپری" هاتم نامەی ماجستێرەکەم لەسەر هزری لۆفۆر تەواو کردبوو، بەر لەویش کارم لەسەر بیروڕاکانی مۆریس میرلۆپۆنتی کردبوو. ئەو بابەتەی کە سەرنجی منی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا ئەوەبوو کە چۆن ئەو بیروباوەڕانەی پشتبەستوون بە دیاردەناسیی دەرککردن" دەبنە سەرچاوەی بیرکردنەوە دەربارەی سیاسەت. بە بۆچوونی من شتێکی ڕێکەوت نییە. کاتێ دەبینین کە ڕەخنەگرتن لە تۆتالیتاریزم تا ئەم ڕادەیە کاریگەریی لەسەر هزری دیاردەناسانە (فینۆمینۆلۆژیانە) هەیە.

هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە پەیوەندی لە نێوان ڕەخنەگرتن لە تۆتالیتاریزم و توانای وەسفکردن و شیکردنەوەی ڕاستیدا هەیە. بەرامبەر بەمەش، دەتوانیت ئەوە ببینیت کە هزری پشتبەستوو بە بونیادشکێنی لە مەسەلەی سیاسیدا ڕووبەڕووی چیەها گرفت دەبێتەوە.

***هەرکاتێ قسە لەسەر دیموکراسی دەکرێ" باسی بەجیهانیبوون و ڕێژەیی کەلتووری دێتە ئاراوە. دەمەوێ هەڵوێستی گۆڤاری "ئیسپری" لەم بارەیەوە بزانم؟**

–ئێمە لەم بوارەدا وتاری زۆرمان بڵاوکردۆتەوە، لە نێویاندا وتاری پیرهاسنەر و میشیل والزەر کە بەرگری لە هزری فرەچەشنیی بەجیهانیبوونەکان دەکەن. ئەو قسەیەش بەو مانایە نایەت کە مەسەلەیەکی بەجیهانیبوو دەبووایە حەتمەن خۆی لەگەڵ کەلتوورە جیاوازەکاندا بگونجاندایە، واتە بۆ نموونە، مافی مرۆڤی چینی یا مافی مرۆڤی ئێرانیمان هەبێت. بەڵکو مەسەلەکە لەسەر شێوەیەکی سیاسیی جیاوازە کە بەرگریکردن لەم مافانە لە چوارچێوەی کەلتووریی جیاجیادا" لەخۆ دەگرێت. سەرباری ئەمە، قسەی ئێمە ئەوەیە کە دیموکراسی نە بە تەنها فەرمانڕەوایی خەڵکە واتە

فەمرانڕەوایی زۆرینە، نە بە تەنها دەوڵەتی قانوونە و، نە بە تەنها مافی تاکەکەسەکانیشە“ بەڵکو هەرسێکیانە بە یەکەوە. ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە پیرهاسنەر ناوی لێناوە "سێگۆشەی ئاڵتوونی". واتە ناتوانین وا بیر لە دیموکراسی بکەینەوە کە بە تەنها بریتییەلە حوکمڕانیی زۆرینە. دیموکراسی هەم فەرمانڕەوایی خەڵکە و هەم مافەکانی تاکەکەس. بەم پێیە دەبێ بەم سێ ئاقارە خەبات بکرێ.

***وەکو دواپرسیار حەزدەکەم بزانم کە ئایا هەوڵ دەدەن لەگەڵ گۆڤاری تری وڵاتانی تردا پەیوەندیتان هەبێت و، بۆچی؟**

–بەڵێ، دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ هەموو ئەو گۆڤارانەدا کە وەکو ئێمە کاردەکەن بەلای ئێمەوە زۆر گرنگە. لە بنەڕەتدا ئیسپری گۆڤارێکی نێونەتەوەییە. ئێمە ڕۆشنبیرانێکی کۆسمۆپۆلیتی نین کە لەسەر بەرزاییەك دەوەستن و بەمتمانەوە بە لەسەر هەقبوونی خۆیان دەڕواننە کۆمەڵگاکەیان. هەرچۆن ئێمە خۆمان بە ڕۆشنبیران و نووسەرانی ژێر ستەم یان ستەمدیدەی ئایندە نازانین. ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە ئەوەیە کە جەمسەری ڕۆشنبیریی جیاجیا لە کۆمەڵگاکاندا پەیدا ببن و دۆخە دیموکراتەکان یارمەتیی پەیدابوونی هزری ئازاد بدەن و ئەم جەمسەر و هزرانە پێکەوە و لەسەر ئاستێکی جیهانیدا لەگەڵ یەکدا پەیوەندییان هەبێت. لە هەمان کاتدا“ بە ڕای من ئەوە بەس نیە کە چەند کەسێك لە گۆشەکانی دونیاوە ناوبەناوێك لە دەوری یەك کۆببنەوە. دەبێ پێشتر خۆمان بۆ ئەم دیدارانە ئامادە بکەین. دەبێ بۆ گۆڤارەکە کار بکەین“ ئەگینا دەکەوینە داوی سیمینارباز ییەوە. ئامانج لە کۆبوونەوە دەبێ ئەوە بێت کە بۆ ڕۆژی ئەنجامدانی، کۆمەڵێك ئامانج و ئاسۆ دیاری بکەین و بە ئەنجامیان بگەیەنین. بۆئەوەی بۆ پرسیارەکەی پێشووی ئێوەش سەبارەت بە جیهانیبوون بگەڕێمەوە، دەبێ بڵێم کە ڕۆشنبیر بە تەنها ڕۆشنبیری کۆمەڵگاکەی خۆی نییە، هەرچەندە کە هەر ڕۆشنبیرێك لەسەر ئاستی نەتەوەییدا مەترەحە، ئەگینا سەر بە هیچ کوێ نابێت، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو ڕۆشنبیرەی کە ڕێز لە مافەکانی مرۆڤ دەگرێت“ ناتوانێت کۆسمۆلپۆلیت بێت. کەواتە ئەبێ ئەندامێکی کۆمەڵگاکەی خۆت بیت“ بەبێ ئەوەی تیایدا بتوێیتەوە. ئەبێ لایەنگری مافی مرۆڤ بیت، بەڵام کۆمەڵگاکەی خۆت لەم مافانە تێربکەیت، دەنا مافی مرۆڤ دەگۆڕێ بۆ کۆمەڵێك پرنسیپی ڕووکەش.

ڕۆشنبیرێك کە لە گۆڤارێکدا کاردەکات، نە جیهانییە و نە کۆیلەی نەتەوەکەی خۆی، بەڵکو کەسێکە هەوڵدەدات پەیوەندی لە نێوان ئەم دووانەدا دروستبکات.

کانونی یەکەم/ 1993

# شیعر واتا.. نوێکردنەوەی زمان

لە فارسییەوە: فەرەیدون بێوار

## پێشەکی

مـــەحمود دەروێـــش سەرناســـترین شـــاعیری ئەمرۆکـەی عـەرەب، لـە سـاڵی (1941) لـە فەلەسـتین هاتۆتـە دنیـاوە. بنەماڵەکـەی پاشـی حـەوت سـاڵ لـە فەلەسـتین هـەڵاتن، بـەڵام جـارێکی تـر گەڕانـەوە بـۆ ئیسـرائیل و مـەحمود دەروێـش لەوێنـدەرێ چـووە قوتابخانە.

دواتـر وەکـو رۆژنامەنووسـێ دەسـتی کـرد بـە چالاکی نواندن و هەفتەنامەی (الاتحاد)ی دەرکرد کە بڵاوکراوەیـەکی کۆمۆنیسـتی بـوو. تـاکو ئێسـتاکە چەندان کۆمەڵە شیعری مەحموود دەروێش کراون بە ئـەڵمانی و بڵاوکراونەتـەوە کـە بـەناوبانگترینیان بریتییە لە: (رۆژەکەمان) و (فەلەستین وەکو سمبول – چەندین وتووێژ دەربارەی ئەدەبیات و سیاسەت) و (بۆچـی ئەسـپەکەت تـەنیا جێهێشـت) و (ئێمـە نیشـتیمانێکمان هەیـە لـە وشـەکان) و دواتریشـیان (شوێنگەی گەمارۆدراو).

ئەمـەی بەردەسـتتان دیمانەیـەکی هەفتەنامـەی (دی تسایت)ی ئەڵمانییە لەگەڵ مەحمود دەروێشدا سەبارەت بە شیعر و ئەدەبیاتی عەرەب.

**دی تســـایت:** جـەنابی دەروێـش! بـەڕێزتانیش وەکـو زۆربـەی زۆری شـاعیرە گـەورەکانی عـەرەب، زۆرترین بەشی ژیانتان لە تاراوگەدا بەسەر بردووە. کۆچکردنی بەڕێزتان چۆن دەستی پێکرد؟

**مەحمود دەروێش:** هەڵاتنی یەکەمم بەشێ بوو لە هـەڵاتنی کۆمـەڵی. تاراوگەیـەکی کۆمەڵی و پـتر لـە ســـەدان هـــەزار فەلەســـتینی (دوای راگەیانـــدنی سـەربەخۆیی ئیسـرائیل) لـە گونـد و شـارەکانیان وەدەرنـران. بنەماڵەکـەی منـیش سـاڵێك لـە لوبنانـدا مایـەوە، دواتـر ئێمـە بـە نهێنـی گەڕاینـەوە. لـە گوندەکەمانـدا تەنانـەت شـوێنەواری کەلاوەیـەکیش بـەجێ نـەمابوو. ئێمە لـە نیشـتمانی خۆمانـدا وەکـو هەڵاتویـەك دەژیـاین. کاتـێ کـە ئێمـە لەوێنـدەرێ نـەبووین سـەرژمێریەکیان ئەنجامـدابوو کـە تێیـدا ئێمـەیان وەکـو (ئامادەبووانی نـەهاتوو) نـاوبردبوو. کۆچـکردنی مـن لـە سـاڵی 1970 بـە پێچـەوانەی یەکەمجار، بەشێ نەبوو لە هەڵاتنی کۆمەڵی. من بە فەرمی دەرنەکرام، بەڵام لە بارودۆخێکدا دەژیام کەم تـا زۆر منـی ناچـار دەکـرد بـە تاراوگەیـەکی خۆویستانە.. نزیکەی دە ساڵ مۆڵەتی جێهێشتنی

شاری (حیفا)م نەبوو. جگە لەمەش سێ ساڵ زیندانی بووم. لە پاش کۆچکردن ساڵێك لە مۆسکۆ و دوو ساڵیش لە قاهیرەدا ژیام و دواتر لە ماوەی ئەو دە ساڵەی کە بەیروت شوێنی مانەوەم بوو، بینەری شەڕی ناوخۆیی و داگیرکردنی ئەم وڵاتە بووم لە لایەنی ئیسرائیلەوە لە ساڵی 1982دا. پاشی رەشەکوژییەکانی (سەبراو شتیلا) بەیروتم بەجێهێشت. چووم بۆ تونس و لەوێشەوە بۆ پاریس چەند ساڵێك لەوێندەرێ ژیام. پاشان گەڕامەوە بۆ (عەمان) و لەوێشەوە هاتمە (رام الله).

*لە کاتی دەستبەسەری ناوخۆیی و حوکومەتی، ئێوە ئەندامی حیزبی کۆمۆنیستی ئیسرائیل بوون. پاشان بۆ چەند ساڵێك بویتە ئەندامی کۆمیتەی بەڕێوەبردنی رێکخراوی ئازادی (پی – ئێڵ – ئۆ) بەشی فەلەستینی. مەحموود دەروێشی سیاسەتمەدار و مەحموود دەروێشی شاعیر، چ پێوەندیەکیان پێکەوە هەیە؟ ئایا شیعر لە بنەڕەتدا گرنگییەکی هەیە بەلایەنی سیاسی بەتایبەت، ئایا شیعر لە خزمەتی ئاشتیدایە یاخود شەڕ؟

–شیعرێکی تەواو مرۆیی ناتوانێ لە خزمەت شەڕدا بێت. ئەو شیعرە بەهۆی ناوەڕۆك و بونیەوە لە خزمەتی ئاشتیدایە. شیعر لە پێوەندی نێوان مرۆڤەکاندا، بەرگری لە ئازادی و جوانی دەکات. جوانیی ژیان، شیعر هەرگیز ناتوانێ لەگەڵ شەڕ و توندڕەویدا پێوەندی هەبێت، سەیر و سەمەرەیی مرۆڤە سەرەتاییەکان و شادییەکانی جیهان و ترسی لەناوچوون لە شیعردا رەنگ دەدەنەوە و ئەرکی شیعریش بەرگرییە لە بەرامبەر ئەو شتانەی کە هەڕەشە لە ئازادی مرۆڤ و گەورەیی ژیان دەکات. مرۆڤ لە کاتی خوێندنەوەی شیعرێکدا هەستی کەسێك دەناسێت کە ئەم شیعرە لەوەوە هەڵقولاوە و چێژ وەردەگرێت لە زمان و وێنەی ئەو کەسە. واتە شیعر مرۆڤەکان لە یەکدی نزیك دەکاتەوە و نابێتە هۆکاری جیابوونەوەیان. بەڵام لە بواری پێوەندی نێوان سیاسەتمەدار و شاعیری لە ناخی خۆمدا، وا هەست دەکەم رەوشی مێژوویی و پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان کە من تێی کەوتووم، ئەو نیعمەتەم پێنابەخشێت کە لە سیاسەت دوورەپەرێزبم. ئەگەر بڵێم لە سیاسەت دوور دەکەومەوە بەو واتایە دێت کە من هێڵی پێوەندیم لەگەڵ راستیدا بزرکردووە. سیاسەت لە ناوچەی ئێمەدا لەگەڵ ئەو ناوچانەی کە شەڕی تێدا نییە، چەند پێوەرێکی تری هەیە، بەڵام بەشداری کردنی من لە کاری سیاسیدا، بەهەرحاڵ ئەمڕۆکە خۆویستانە نییە. من لە ناو ئاپارتمانەکەمدا دانیشتووم و لەودیو پەنجەرەکەمەوە تانکێك دەبینم. بەم جۆرە لەودیو تانکەکەوە سیاسەت بەرەو رووم دێت. ئەو درەختەی کە دەمەوێ لە سایەیدا بحەسێمەوە، رۆژی دواتر بڕاوەتەوە. ئەوە سیاسەتە کە دەیبڕێتەوە. لە نێوان شمشێر و خوێندا، ئەو توانایەم نییە کە بەبێ لایەنی بمێنمەوە، چونکە ئەوەی کە دەڕژێت خوێنی منە. بەڵام لێرەدا پرسیارەکە لەسەر چۆنیەتی دەربڕینی پێوەندی نێوان شیعر و سیاسەتە. من ئەوە رەت دەکەمەوە کە سیاسەت بەشێوەیەکی راستەوخۆ لە شیعردا خۆی بنوێنێ. دەسکەوتگەلی قوڵ و فۆرمێك لە تێکەڵی رەگەزەکان پێوەستن بە شیعرەوە کە تەنیا ئەتوانرێت بەشێوەیەکی شاعیرانە دەربڕدرێت. من لە دەرەوەی شیعردا، لە بواری سیاسەتیشدا چالاکم. رەنگە مرۆڤ لە شیعردا ئاستێکی سیاسی وەرگرێت بەڵام دەبێت ئەمە شاراوە بێت تاوەکو شیعر بە شیعری بمێنێتەوە.

*لە شیعرەکانی پێشوی بەڕێزتانا، فەلەستین میحوەر بوو. دواتر بەڕێزتان رووتان کردە بابەتە

گشتییە مرۆییەکان. ئایا بەڕێزتان لە تازەترین کۆمەڵە شیعرتانا (شوێنگەی گەمارۆدراو) بەرەو جۆرێ لە شیعری تایبەتی فەلەستینی گەڕاویتەوە؟

–نا، نا من بە هیچ جۆرێ بۆ سەرەتای خۆم ناگەڕێمەوە، لە لای من گەڕانەوە بۆ شێوازی رابردوو بوونی نییە. من بەردەوام بەرەو پێشڤە دەچم و لە دژی ئارەزووە شاعیرانە سەرەتاییەکانم دەجەنگم. لەوەتەی گەڕاومەتەوە بۆ فەلەستین کۆمەڵەیەکم لەبارەی ئەڤین و کۆمەڵەیەکی ترم لە بارەی مەرگەوە چاپ و بڵاوکردۆتەوە.

بەڵام (شوێنگەی گەمارۆدراو) راستییەکە کە من بەشێوەیەکی رۆژنامە وەرمگرتووە و لە یاداشتنامەکانی رۆژانەی شاعیرانەمدا تۆماری دەکەم. بەڵام ئەمە بە هیچ شێوەیەك شێوازی پێشوی من لە خۆ ناگرێ. چونکە من ئەمڕۆکە شێوازی (ئەسکتیك) بە باشتر دەزانم. من لەگەڵ وێنەگەلێکی ئاڵۆزدا کار دەکەم کە لەگەڵ دیمەنەکانی فیلمێکی سینەماییدا شیاوی بەراوردن. ئەم شێوازە بۆ من بەتەواوەتی شتێکی نوێیە. جگە لەمەش لە شێوازی مۆدێرندا، هەرگیز تەنیا بابەتێك لە شیعرێکدا تاوتوێ ناکرێ. تەواوی بابەتەکان، پێکەوە پێوەستن و تێکەڵاویان هەیە. شیعری مۆدێرن، لە تۆڕێکی ئاڵۆزکاو دەچێ کە لەگەڵ ئاڵۆزی شوێنگەی مرۆڤەکانی ئەمڕۆکەدا شیاوی بەراوردە.

–بە ڕاستی شیعری هاوچەرخی عەرەب چۆن دەتوانێ لە بارودۆخێکدا بێتە کایەوە کە جیهانی عەرەب نوێکردنەوە رەت دەکاتەوە، لە ئاستی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاینییەکاندا؟ ئایا شیعر رێزپەڕە؟

*ئەمە لە کرداردا دژواری شیعری عەرەبییە. چۆن شیعر دەتوانێ لە کۆمەڵگەیەکی بێ مودێرنێتەدا مودێرن بێت؟ لە کۆمەڵگەیەکدا کە لە بنەڕەتدا پێش مودێرنە؟ لە جیهانی عەرەبدا، جگە لە بواری شیعر و دەستگاکانی ئاسایش، نوێکردنەوە بوونی نییە. ئەو کارە دەبێتە هۆی ئەوەی کە شیعری هاوچەرخی عەرەب، وەکو دورگەیەکی داخراو لە بزاوتندا بێت. ئەو شیعرە لە ژێر گوشاری نەریت و بە هەمان شێوە لە ژێر گوشاری کەسانێکدایە کە بە توندی و سەرسەختیەوە لە بەرامبەر میراتی شیعریدا رادەوەستن. لەگەڵ ئەمانەشدا، شیعری مۆدێرن بە تەواوی خۆی جێگیر کردووە.

*بەڕێزتان بڕواتان بە سازش هەیە لە نێوان نوێخوازی و نەریتدا؟

–من بڕوام وا نییە کە دەبێ شیعری مۆدێرن بەشێوەی (جەبری) هەموو شتێکی نەریتی (سوننەتی) لەناوبەرێت. ئەمە بەر لە هەموو شتێك بەرهەمی مێژووی ئەدەبییە. لە چەرخی نەزانییەوە تاوەکو ئەمڕۆکە چەندان بزووتنەوەی نوێخوازانە لە ئارادا بووە. مۆدێرنێتە لە شیعردا، واتە نوێکردنەوەی هەمیشەیی زمان. مۆدێرنێتە بە بەردەوامی ریتمی قۆناغەکانی خۆی هەم لە کۆمەڵە شیعردا و هەم لە تاك تاکی شیعرەکاندا پەیڕەو دەکات. شیعری عەرەبیش بەرلەوەی بە تەواوی لەگەڵ رابردووی خۆیدا پێوەندی بچڕاندبێت، ئەو بەرگری و مەوداگیریانەش دەناسێت کە لە چوارچێوەی ئەودا دەتوانین لە وێستگەکانی نوێکردنەوە بدوێین. هەندێ لە نوێکاران میراتی خۆیان ناناسن. لەم بارەیەوە، چەندان نوێکاری نابالغ سەرهەڵدەدەن کە لەگەڵ وەرگرتن و قبوڵکردنی گوێگرانی عەرەب، ڕووبەڕوو نابنەوە. بەڵام نوێکارانێکیش هەن شایەنی پەسەندن کە پێویستن و بواری بالغ بووی خۆیان لە رێگەی گەشەی ئەدەبیات و کاریگەری بەرامبەری باقی لایەنەکانی ئەدەبی، بەدەست دێنن. شاعیرانی

بەهرەمەند و خوێنەرانی فێرکراو ڕێخۆشکەر و بەرەو پێشبەری نوێکارین لە شیعردا.

*بەڕێزتان گرنگی دەدەن بە هەوڵدان بۆ بەرۆژئاوایی کردنی کلتوری عەرەبی؟

–من شتێکی وام نەوتووە. جگە لەمەش چارەی پێشتر ئامادەکراو لە ئارادا نییە. کلتووری عەرەبی دەبێ هەمیشە خۆی لەبەردەم پرسی خۆی دابنێت. لەگەڵ کرانەوە لە بەرامبەر ئایدیا هاوبەشەکان کە کلتوری مرۆیی پێکدێنن. نابێ کلتوری عەرەبی بە سادەیی ببێ بە رۆژئاوایی. هەروەها ناشبێ پابەندی نەریتیش بێت. ئیمکانی باس و گۆڕینەوە هەیە لە نێوان کلتوری عەرەبی و کلتورەکانی تردا، کە ویست و ناویستانە کاریگەری بەرامبەریان هەیە لە سەر یەکتری. تەواوی کلتورەکان پێوەستن بە یەکترییەوە، پێکەوە دەژین و تێکەڵاوی یەکتربوون. ئەگەر ئێمە نە لە زیندانی نەریتەکانی خۆماندا بمێنینەوە و نە لەگەڵ تەواوی کلتورەکانی تردا بگۆڕێین ئەوکات ناسنامەی کلتوریمان ناکەوێتە بەر مەترسی.

## سەرچاوە

گۆڤاری کۆمەڵگەی نوێ (جامعەء نو)، ژمارە 12، ساڵ، 2002.

# ئاسمان

مانوبیێل پیلاس *Manuel, Pelas*
لە ئیسپانییەوە: حەمەی ئەحمەد رەسوول

لــە چـلەکانی کۆتــایی ســەدەی رابــردوو لــە شارۆچـکەیەکی نزیـک – مەدریـد– لـەدایکبووە، بـە نـەوەی بیسـتونۆیەمی مێـژووی شـیعری ئیسـپانیی مۆدێرن لـە قەڵـەم دەدرێـت، هۆنـەر و رۆماننووسـە و شــیعرەکانی زۆر ســادە و ســاکارن و تێکــەڵ بــە فەلســـەفەن، لەگـــەڵ سروشـــت و کەرەســـتەکانی دەوروبەریـدا مامەڵەیـەکی زۆر دەکـات.. (ئاسمـان *Gielo El*) ناوی نوێترین نامێلکەی شیعریی پێلاسە.

ئاسمـان بنمیچـی گـەورەی دونیـا و بنمیچـی گچکەی هەریەکێکیشمان دەگرێتەوە، ئەو ئاتمۆسفێر و کـەش و هەوایـەی کـە هەریەکـەمان ژیـانی تایبـەتی خۆی تێدا دەگوزەرێنـێ، لـە ژیـان و گوزەرانی مرۆڤـە سـادەکان دەدوێ و بۆیــەش بــە زمــانێکی ســادە و رەوان دەیـەوێ ئاخـاوتنێکی سـاکار و سـەرمەدییان لەگەڵدا ساز بدات.

دیوانــە چــاپکراوەکانی پــێلاس بــریتین لــە: کارەسـاتی گڕ 1990، لمـی لیبیـا 1993 دوو سـاڵی بەختەوەر 1996 لە 2000 دا نامێلکـە شیعرییەکەی –ئاسمـان–ی بڵاوکردۆتــەوە کــە بۆتــە سەرچـاوەی وەرگێڕانی ئەم دوو هۆنراوەیە.

### ئاسمان

*-1-*

ئەڕۆم.. بەرەو ئاراستەی خۆم ئەڕۆم
من بەرەو ئاراستەکەم ئەڕۆم..
بەیانی، هەر بەیانییە و وەدووەمدەکەوێ
گەر ئەو پەڵە هەورە شینە پەرشوبڵاوە نەبێ
کە لە لای خۆم، لە ئاسمانەکەی خۆمدا گلمداتەوە
من ناوی ئەنێم "گەمەکەی خۆم"
ئەوە منم کە بەرەو ئاراستەکەی ئەو ئەڕۆم
بەیانی هەر بەیانییە و
پەرشوبڵاو و داخراوە..

"گەمەکەی خۆم"
پەڵە هەورە شینەکەی خۆم، ئەویش هەر پەرشوبڵاوە
وەلێ کراوەیە، .. دڵگیر و دولبەرە..
بۆیە بەرەو ئاراستەکەی خۆم ئەڕۆم...!

### -2-

ئاسمان" دڵگیر و دولبەرە
ئاهەنگسازدانێکی بێهوودەیە..
ئەمشەوە ئاتمۆسفێرێکی شەرمن و کەمدووە..
لە کیژە پاکیزەکانی بیابان دەچێ..
شتێ نابینم بۆنی ئەوی لێبێ..
پۆشاک و کراسەکەی ئەو، گەرمیم پێنابەخشێ..
چونکێ زۆربلێیی و هەڵەوەریش، مایەی سەریەشەن..
حەز بە پیاسەیەك دەکەم..
شەقامەکانی بیرکردنەوە بە وێنە تەنراون
وێنەکانیش، تەنها وێنەکانن"
بیرەوەری ژیانمان دەپارێزن..
بۆیە ئاسمان نابینم،
ئاسمان لە وێنەکانا رەش و سپین..
ئەو وێنانە، بۆ رێکلامێکی هەرزانبەها دەیانبەخشینەوە.

* * *

دووا ینجار
بۆ دووا ینجار، کەسێکی وام بینییەوە شایانی رێنوومابیم بێ..
کە پەنجەکانم بگووشێ و خوێنم بڕێنێتەوە
پێم دەڵێت" روانگەکانت کێماسی دێنن
تێڕوانینت گەرەکە..
چاوێلکەکەت پاککەرەوە و چاوانت بنووقێنە
لەسەر کورسی هەیوانەکەت راکشێ و تاوێ بیرکەرەوە
شەو پاشەکشە ناکا و ئاسمانی تۆ هێجگار دوورە
ئەوە خۆتیت دەڕۆیت و لەگەڵ خۆتا بیبەرەوە..
ئەمڕۆش ئەڕۆم،
ئەڕۆم چونکێ چاوەکانم بۆ هەڵنایەن
ئەوەی هەردەم و هەنووکەش کە پێیدەگەم، ئاسمانە ئاسمانەکەی خۆمە، کە دڵگیر و چاوشین و جوانە....!

### سەرچاوە

*Manuel Pelas, El cielo. Madrid, 2000.*

# شەمەندەفەر

## ریموند کارڤەر

لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

### لە بارەی نووسەرەوە

ریموند کارڤەر شاعیر و چیرۆکنووسێکی ئەمریکاییە. لە دوای هەمەنگوایەوە بە گەورەترین چیرۆکنووسی ئەو وڵاتە دادەنرێت. لە هەموو کورتە چیرۆکنووسانی ئێستای ئەمریکا ناودارترە و یەکێکە لە لووتکەکانی ڕیالیزمی پۆخڵ (*DirTy Realism*) کە شەپۆلێکی ئەدەبیە و مەبەست چوونە ناو دنیای ئەوانەیە کە لەسەر ئاستی ڕەسمی و دەزگایی ئەمریکاوە دوورن و لە شوێنە تاریکەکانەوە دەردەکەون، دنیای سڕکردن، لادەرانی سێکس، ئاوارە، بێوەژن و دزان. لەسەر ئاستی شێوازیش واتا چڕکردنەوەی زۆر. دوورکەوتنەوە لە بێمانایی زمان و ئاماژەپێدانی خێرا.

کارڤەر هەندێك خەڵاتی گرنگی لەسەر ئەدەبی چیرۆك وەرگرتوە. وەك خەڵاتی گاگن هایم (1979) خەڵاتی یارمەتی میللی (دووجار) میداڵیای هارولد شتراوس (1983). لە دوا ساڵانی تەمەنیدا هەموو ساڵێك (15000) پانزە هەزار دۆلاری خەڵات دەکرا تا هەموو کاتی بۆ نووسین تەرخان بکات. ئەمە گەلێك کاری کردە ژیانی ئابوری و گۆشەیەکی لە نەبوونیەکەی پڕ کردەوە. کارڤەر هەمیشە مەست و جگەرەکێشێکی لە ڕأدەبەدەر بوو، هەر ئەوە تووشی نەخۆشی شێرپەنجەی سی کرد و تەنیا لە نێوان ساڵانی 1976-1977دا چوار جار لە نەخۆشخانە کەوت. ئەو نووسەرە بەهرەمەندە ساڵی 1938 لە شاری گلاتسکانیای ئورگان لە ئەمەریکا هاتە دنیاوە و ساڵی 1988 مرد. شەمەندەفەر یەکێکە لە چیرۆکە دیارەکانی.

ژنەکە ناوی خاتوو (دینت) بوو، سەر لە ئێوارەی ئەمڕۆ دەمانچەکەی لە پیاوێك ڕاکێشا، پیاوە بە دەم گریانەوە و بۆ ئەوەی نەیکوژێت لووتی لە زەویەکە ژەند و لە تاوا نیوەگیان دەستی لەنێو گەڵا وەریوەکانی درەختەکان وەردا، ژنە ڕووی دەمانچەکەی تێکرد و هەندێك شتی تایبەتی پێوت، ئەوەیش کە ئەو بۆی نیە بەردەوام هەستی خەڵکی تر پاکۆ بدات (نەجووڵێیت) ژنە ئەمەی پێوت، ئەگەرچی پیاوەکە چ لەنگەیەکی بۆ نەکردبوو، بێجگە

لەوەی کە نەیتوانی بەسەر بزۆکی پەنجەکانیدا زاڵ بێت کە دەیانویست زەویەکە هەڵبکەنن، هەردوو قاچیشی لە ترسا لێك ترازابوون و بە لەرز هاتبوون. کە هەموو شتێکی پێوت، پێی نایە سەر پشتی ملی و دەموچاوی بە زەویەکەوە قرساند. دەمانچەکەی نایەوە ناو جانتا دەستیەکەی و بەرەو لای وێزگەی شەمەندەفەرەکە گەڕایەوە. لە ژوورە چۆڵەکەی چاوەڕوانی کردندا لەسەر سەکۆیەك دانیشت و جانتاکەی لە باوەشی نا. پەنجەرەی بلیت فرۆشیەکە داخراو و کەسی لە دەور نەبوو. تەنانەت شوێن وەستانی ماشێنەکانی دەرەوەی وێزگەکەیش چۆڵ و هۆڵ بوو. چاوی حەسانەوەی بەسەر سەعاتە گەورەکەی سەر دیوارەکەدا گێڕا و حەزی کرد ئیدی بیر لەو پیاوە و ئەو ڕەفتارانەی نەکاتەوە کە لەگەڵ باوکی ئەمدا کردوونی و بە هەموو مەرامێکی گەیشتوە.

وەلێ ئەم هەرگیز دەنگی لووتی ئەو کابرایە لە یاد ناکات کاتێك کەوت و ئەژنۆی لە زەوی دا. چاوی لێکناو گوێی بۆ دەنگی شەمەندەفەرەکە هەڵخست. دەرگای ژووری چاوەڕوانیکردن کرابووەوە. خاتوو (دینت) تەماشای تارمەکەی کرد، دوو کەس بەرەو ژوورەکە بەڕێوە بوون، یەکێکیان پیرە پیاوێکی سەرسپی بۆینباخێکی سپی ئاوریشمینی بەستبوو. ئەوی تریان ژنێکی تەمەن مام ناوەند بوو، تەنوورەیەکی مەخمەڵ لەبەردا و لێوی بە سووراو و چاویشی بە ماسکارە ئارایشت دابوو. ئەگەرچی ئێوارەکەی سارد بوو، بەڵام بێ پاڵتۆ بوون. بێجگە لەوەی کە پیاوەکە پێڵاویشی لە پێدا نەبوو، لە هۆڵەکەدا وەستان و کە ئەویان لە ژووری چاوەڕوانیکردندا بینی سەرسام بوون، خۆیان وا دەرخست تووشی نائومێدی نەبوون. ژنەکە چەند وشەیەکی بە پیاوەکە گوت، بەڵام گوێی خاتوو (دینت) ڕاوی هیچ وشەیەکی بۆ نەکرا و ئەوان خۆیان بە ژووردا کرد. پێدەچوو هاتنیان بێزاریەکی بۆ خاتوو (دینت) بەدی هێنابێت، بیری بۆ ئەوە چوو دەشێت شتێکی لێ ڕوودابن، شتێك کە تەنانەت نەتوانن لێی بدوێن و زۆر بە پەلە جێگاکەیان جێهێشتبێت، ڕەنگیشە زۆریان خواردبێتەوە.

ژنە و پیاوە سەرسپییەکە لە سەعاتی سەر دیواریان ڕوانی، وەك سەعاتەکە شتێکیان پێ بڵێت کە وابەستەی حاڵەتەکەیان بێت، یان بۆ لەمەودوا چی بکەن. خاتوو (دینت)یش تەماشای سەعاتەکەی کرد، وەلێ هیچ شتێك هەواڵی لە هاتن و دەرچوونی شەمەندەفەرەکە نەدەگەیاند، بەڵام ئەو خۆی بۆ چاوەڕوانییەکی درێژ ئامادە کرد، ئەو دەیزانی ئەگەر زۆر چاوەڕێ بکات شەمەندەفەرەکە هەر دەگات، ئەوسا سوار دەبێت و لەم شوێنە دوور دەکەوێتەوە (شەوباش) پیاوە پیرەکە ئەمەی بە خاتوو (دینت) وت و ئەویش بە خەیاڵی خۆی وای دانا دەشێت پیرە پیاوێکی گرنگ بێ. لە ئێوارەیەکی هاویندا قات و پێڵاوی شەوانەی لەبەر کردبێت. (شەوباش) (دینت) وەڵامی دایەوە، ژنەکە لە کراسە مەخمەڵیەکەی دینتی ڕوانی و ئەم هەستی کرد کە بوونی ئەویان لەو ژوورەدا پێ ناخۆشە، هەردووکیان بەرانبەر خاتوو (دینت) لەسەر سەکۆیەك حەسانەوە، ئەم سەرنجی پیرەی دا چۆن پانتۆڵەکەی لەسەر ئەژنۆیەوە هەڵکرد و قاچی نایە سەر قاچ، کەوتە جووڵاندنی قاچە بێ پێڵاوەکانی. پاکەتە جگەرەکەی و دار جگەرەکەی لە گیرفانی دەرهێنا، جگەرەکەی پێوە کرد و دیسان دەستی بە گیرفانی پانتۆڵەکەیدا گێڕا (چەرخم پێ نیە) پیرە وای بە ژنەکە وت (بە گومانم تۆ شتێك لە من گەیشتبیت، زۆری لێ نازانیت، ئەگەر زۆرت حەز لە جگەرەکێشانە، لەو ژنە بپرسە دەشێت چەرخی پێ بێت).

ژنە بەدەم ڕوو لە خاتوو (دینت) کردنەوە ئەمەی وت، بەڵام دینت سەری نەخێری ڕاوەشاند، جانتاکەی ڕاکێشا و ئەژنۆکانی پێکەوە قرساند، جانتاکەی نایە سەر ڕانی (دەوەرە دوای ئەو هەموو ڕووداوە چەرخێکت دەست نەکەوێت) پیرە دیسان بە دەم پشکنینی گیرفانیەوە ئەمەی وت، هەناسەیەکی هەڵکێشا و جگەرەکەی لە دارجگەرەکە دەرهێنا، هەردووکیانی خستە ناو پاکەتەکەی و لە گیرفانی کراسەکەی نا. ژنە بە زمانێك کەوتە پەیڤین خاتو (دینت) هیچی لێ تێنەگەیشت، وایزانی زمانی ئیتالیە، وشەکان هێند خێرا دەردەپەڕین دەت وت سۆفیالۆرینە و لە فیلمێکدا قسە دەکات. پیرە سەری ڕاوەشاند و وتی (فریات ناکەوم، تۆ زۆر خێرا قسە دەکەیت، دەبێت لەسەرخۆ بیت و بە ئینگلیزی بدوێیت، من فریات ناکەوم) خاتوو (دینت) توند جانتاکەی لە باوەشی هەڵگرت و لەسەر سەکۆکەی تەنیشتی داینا. لە قفڵەکە ڕاما، نەیزانی چی بکات! ژوورەکە چکۆلەیە و ناکرێت یەکسەر هەستێت و ڕوو لە جێگایەکی دی بکات، چاوی بە سەعاتی سەر دیوارەکەدا گێڕایەوە. (ناتوانم بیر لەو کۆمەڵە شێتە نەکەمەوە) ژنەکە وای وت (سامناکە، وشە لاڵە لە دەربڕینیا، خودایە!) ژنە بە دەم سەربادانەوە ئەمەی وت، وەك زۆریش ماندوو بێت لەشی خۆی بەسەر سەکۆکەوە نەدەگرت، بۆ چرکەساتێك چاوی لە بنمیچەکە بڕی. پیاوە پیرەکە بە هێوریی یاری بە بۆینباخەکەی ملی دەکرد، دوگمەی کراسەکەی کردەوە و بۆینباخەکەی بۆ ناوەوە ڕادا، لە دەم و چاوی هەردووکیانەوە دیاربوو کە بیریان لە شوێنێکی ترە، ژنەکە وتی (من خەم بۆ کچەکە دەخۆم، ئەو کچە پەپوولە ئاسا و تەنیایەی لەوماڵەدا لەناو کۆمەڵێك ماردا دەژی، ئەم داخەیە دەمکوژێت، هەر ئەویش لە ئەنجامدا زەرەر دەکات نەك ئەوانی دی، بە تایبەتی ئەو گەمژەیەی پێی دەڵێن کابتن نك، بەڵام خۆ ئەویش بەرپرسیار نیە، نا).

پیرەمێردەکە چاوی بەناو ژوورەکەدا گێڕایەوە و کەمێك نیگای خستە سەر خاتوو دینت، بەڵام دینت لە پشت سەری ئەوەوە تەماشای ئەو دارتەلە کارەباییەی دەکرد کە ڕووناکییەکەی دەدایە پەنجەرەکە و شوێن ماشێنە چۆڵەکان. هەردوو دەستی لە کۆشی نایەوە و کەوتەوە دوای خەمە تایبەتیەکانی. بەڵام بە قسەی نێوان ژنە و پیرە قەڵس ببوو (ناتوانم زۆر شتت پێ بڵێم و تەنیا بیرم لای ئەو کچەیە) ژنەکە ئەمەی وت (لەو خێزانەدا کێ بە کێیە، هەموو شتێکیان بریتیە لە قاوە و شیر. جگەرە، شوکولاتەی سویسری و ئەو تووتیە مەلعوونە، بێجگە لەوانە چ شتێکی دی لای ئەوان نرخی نیە، خۆزگا لەمەودوا ئەوانەم هەر نەدیبا. لێم دەگەیت؟ ئەوە نزیکە) (بێگومان، تێت دەگەم، بە دڵنیاییەوە) پیرە وای وەڵام دایەوە. قاچی خستنیە سەر زەوی و جارێکی تر نانیەوە سەر یەك و وتی (لەو بارەیەوە دڵ لە دڵ مەدە) پاشان وتیەوە (دڵ لە دڵ مەدە) ژنەکە پێی وت (بۆ لە ئاوێنەدا تەماشای خۆت ناکەیت؟) پیاوە وەڵامی دایەوە (لە بارەی منیشەوە دڵ لە دڵ مەدە).

–زۆر شتی خراپم بەسەرهات و هەر لێرە ماومەتەوە.

بە دەم زەردەخەنەیەکەوە سەری بۆ ڕاوەشاند.

–لە بارەی منەوە دڵ لە دڵ مەدە.

–چۆن ئەتوانم بۆ تۆ دڵ لە دڵ نەدەم، ئەی کێ خەمت دەخوات؟ دەشێت ئەو ژنەی بە جانتاکەیەوە دانیشتوە لە خەمی تۆدا بێت؟!

ژنە لەسەر قسەکانی ڕۆیشت (بەس لە خاتوو دینت بڕوانە، بە جدی قسە دەکەم هاوڕێ، تەنیا

تەماشای خۆت بکە، خودایا، ئەگەر من پێشتر بە خەمی زۆر گەورەدا تێنەپەڕیمایە ئێستا لێرەدا دەتەپیم، پێم بڵێ بێجگە لە من کێی تر دەتوانێت دەربەستی تۆ بێت؟ من بە جدی ئەم پرسیارە دەکەم، تۆ زۆر دەزانیت و دەبێت وەڵامم بەیتەوە).

پیرە هەستایە سەر پێ و دیسان دانیشتەوە.

—هەر خەم لە من مەخۆ، خەم لە کەسێکی دی بخۆ، لەو کچە و کابتنەکە، من لە ژوورەکەدا بووم کە کابتنەکە وتی (من جدی نیم بەڵام ئەو کچەم خۆش دەوێت) ئەمە دەقی قسەکەی بوو. ژنەکە وتی (من دەمزانی شتێکی وا هەر ڕوودەدات) هەردوو دەستی بە گرمۆڵەیی بە لاجانگیەوە نووساند و لەسەر قسەکانی ڕۆشت (من دەزانم تۆ دەتەوێت شتێکی وام پێ بڵێیت، بەڵام لای من ئەوە سەیر نیە، نا، من لەوانە نیم کە سروشتیان ناگۆڕێت، کەس قسەی وا ڕاستی نەکردوە کە دەڵێت بژی و ببینە، وەلێ کاتێك بە ئاگا دێیت کە بویتە پیرێکی خەڵەفاو، وەڵامم بدەوە) دیسان کەوتەوە قسە (ئایا تۆ ئەو کەرەیت کە تا نەقیزە ئاژنی نەکەن نەجووڵێت! خودایا، بۆ ناچیت لە ئاوێنەدا تەماشایەکی خۆت بکەیت، چاك لە خۆت بڕوانیت) پیرە لەسەر سەکۆکە هەستا، بەرەو ئاوساردکەرەوەکە چوو، دەستێکی خستە پشتیەوە و خۆی بۆ ئاوخواردنەوە لارکردەوە، لەشی ڕاست کردەوە و چەنەی بە دەستی سڕی، هەردوو دەستی لە پشتی نا و وەك لە پیاسەدا بێت کەوتە هەنگاونان. خاتوو دینت سەرنجی دا چۆن چاوی بەسەر زەوی و، سەکۆی خاڵی و، تەپڵەکی جگەرەدا دەگێڕا، زانی بە دوای پاکەتی جگەرەدا وێڵە، داخی لێهات کە خۆی پێی نیە. ژنەکە وەرگەڕا و چاوی لە شەقاوی پیرە پیاو بڕی، (مریشکی سوورەوەکراوی کونتاکی لە قوتبی باکوور، کۆڵۆنیل ساندرز بە پاڵتاوێکی قورس و پێڵاوێکی لووت درێژەوە، ئیتر باوەلێ بایەکی بەسە) پیرە هیچی نەوت، هەر لە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو تا لە بەردەم پەنجەرەکەی پێشەوەدا ڕاوەستا. هەردوو دەستی خستەوە پشتی و چاوی بۆ شوێن وەستانە خاڵیەکەی ماشێنەکان هەڵخست. ژنە بۆ لای خاتوو دینتی ڕوانی، ژێربالّی کراسەکەی چاك کرد: (لەمەودوا سەیری ئەو فیلمانە دەکەم کە پەیوەندیان بە ئاسکیمۆوە هەیە، دانیشتوی ڕەسەنی ئەمریکا.. لێیان دەپرسم.. خودایا، هیچ قەرەبووی ئەوە ناکات کە مرۆڤ کەمێك بیربکاتەوە، بێجگە لەوە، هەندێکیان بە بێزاریەوە دەیانەوێت دوژمنەکەیان بکوژن، تۆ پێویست ناکات لەوێ بیت) ژنەکە بە تەوسەوە ئەمەی وت، پاشان بوێرانە چاوی بڕیە خاتوو دینت، دینت جانتاکەی لەسەر سەکۆکە هەڵگرت و نایەوە کۆشی، تەماشای سەعاتەکەی کرد کە میلەکەی زۆر هێور دەجوولا و نەیش وەستابوو (تۆ زۆر قسە ناکەیت، بەڵام گرەو دەکەم ئەگەر یەکێك لەوان بتدوێنێت قسە زۆر دەکەیت، وا نیە؟ تۆ دانیشتویت و دەمە چکۆلەکەت دوریوە.. کەچی ئەوانی دی چیان لە مێشکایە هەڵی دەڕێژن، ڕاست ناکەم؟ دەی ئاوە قووڵەکە دەست پێ بکە، ئەمەیە ناوەکەت؟ بە چی ناوت دەبەن؟) ژنەکە ئەمەی لێپرسی. (خاتوو دینت، بەڵام من تۆ ناناسم) خاتوو دینت وای وەڵام دایەوە، (ناتناسم، نایشمەوێت بتناسم، چۆنت دەوێت وای بیر لێ بکەرەوە، من هیچ ناگۆڕم، بەڵام ئەوە دەزانم کە بڕوام پێیەتی، وایش دەزانم کە بۆنێکی ناخۆش دەکەم).

پیرەمێردەکە لای پەنجەرەکەی بەردا و چوە دەرێ، کە گەڕایەوە جگەرەیەکی داگیرساوی بەلالێوەوە بوو، پێ دەچوو باری دەروونی باش بێت، پشتی دایەوە و ملی قوت کرد و لە پاڵ ژنەکەدا دانیشت:

(دەنکە شقاتەم دۆزیەوە، لە کەنار ڕێگاکەدا زۆری لێ فڕێ درابوو، دەشێت یەکێك فڕێی دابن) (تۆ بەم حاڵەی ئێستایشتەوە هەر بەختەوەریت، من هەمیشە ئەمە لە تۆدا دەبینم، ڕەنگە کەسی تر نەیبینێت، بەخت شتێکی گرنگە).

ژنەکە بە دەم تەماشاکردنی خاتوو دینتەوە ئەمەی وت (تۆیش.. ژنە گەنجەکە، گرەو دەکەم لە ژیانتا زۆرت کارەسات چەشتوە. من دەزانم، لە دەم و چاوتا دیارە، بەڵام تۆ ناتەوێت باسی ناخۆشیەکانت بکەیت، بەردەوام بە.. هەر بێدەنگ بە.. با ئێمە قسە بکەین، تۆیش پیر دەبیت و قسەت دەبێت بۆ وتن. لێگەڕێ با بگەیتە تەمەنی من، یان تەمەنی ئەم پیاوە) ئاماژە بۆ لای پیرە دەکات. (ئەوسا شتت دەبێت لەسەری بدوێیت، خوانەکەردان، بەڵام ئەو ساتە لەکاتی خۆیدا دێت، پێویست بە چاوەڕێکردنی تۆ ناکات، دوودڵ مەبە، خۆی زۆر بە ئاسایی دێت).

خاتوو دینت لە جێگاکەی هەستا و بەرەو لای ئاوساردکەرەوەکە چوو، چەند قومێك ئاوی خواردەوە، گەڕایەوە و کەوتە تەماشاکردنیان، پیرە لە جگەرەکێشان بووەوە و ئاغزەکەی فڕێدایە ژێر سەکۆکە. دەمی دارجگەرەکەی بە لەپیدا کێشا و خستیەوە گیرفانی، ئەویش لە خاتوو دینت ڕامایەوە، خاتوو دینت خۆی بۆ قسە ئامادەکرد، نەیزانی لە کوێوە دەستپێبکات، ڕەنگە پێیان بڵێت دەمانچە لە جانتاکەیدا نیە، یان بڵێت خەریك بوو ئەمشەو پیاوێك بکوژێت. وەلێ پێدەچوو لەو چرکەساتەدا گوێیان لە دەنگی هاتنی شەمەندەفەرەکە بووبێت، لە پێشدا دەنگی شووتەکەی و پاشان خڕەخڕی تایە و زەنگی ئاگاداریەکەی. دوای ئەوە ڕێگاکەیان بەرێبەست لە هاتوچۆکردن خست.

ژن و پیاوەکە هەستان و بەرەو لای دەرگاکە چوون، پیرە پیاو دەرگای بۆ ژنە هاوڕێکەی کردەوە، ئینجا زەردەخەنەیەکی هاتێ و جووڵەیەکی چکۆڵەی بە پەنجەکانی کرد تا خاتوو دینت بکەوێتە پێشی، دینت جانتاکەی بە خۆوە نووساند و کەوتە دوای ژنە لە خۆی بە تەمەنترەکە، شەمەندەفەرەکە بۆ جاری دووەم شووتی لێدا و لەسەرخۆ لە بەرایی وێزگەکە وەستا. ڕووناکی ناو ژووری شۆفێرەکە بەرەو لای ڕاست و باکوور دەچەرخا. شەمەندەفەرەکە بریتی بوو لە دوو فارگۆنی زۆر ڕووناك، بۆیە ئەم سێ کەسەی لەسەر سەکۆکە وەستابوون بە ئاسانی ناو شەمەندەفەرەکەیان بینی کە تاڕادەیەك چۆڵ بوو، بەڵام بۆ ئەم شەوە درەنگ وەختە ئەمە جێی سەرسووڕمانیان نەبوو، ڕەنگە ئەگەر پڕبوایە سەریان سووڕبمایە. هەندێك لە دانیشتووی ناو فارگۆنەکان لە پەنجەرەکانەوە تەماشای دەرەوەیان دەکرد. بە لایانەوە سەیربوو لەم نیوەشەوە درەنگەدا، سێ کەس لەسەر سەکۆکە وەستابن و چاوەڕێی شەمەندەفەر بن، دەبێت چیان هەبێت لە کاتێکی وادا کە مرۆڤ دەخزێتە ناو جێگای خەویەوە ئەمان ماڵیان جێهێشتبێت!

گڵۆپی خانووی سەرگردەکان پاك و ڕێك و پێك بوون، دەمێك بوو مەکینەی قاپ شتنەکان لە کاری خۆیان ببوونەوە، هەموو شتەکان لە شوێنی تایبەتی خۆیاندا بوون، لە ژووری منداڵانەوە ڕووناکیەکی کز پێدزەی بۆ دەرەوە دەکرد، چەند کیژۆڵەیەك کە پێدەچوو هێشتا لە ڕۆمان خوێندنەوە نەبووبێتنەوە، پەنجەیان وەردابووە ناو قژیان و وەك جاران یاری هۆنینەوە و بەردانەوەیان پێدەکردن. ژن و مێردەکانیش سەرقاڵی کاری شەوانەیان بوون. سەرنشینەکان کە تۆزێك لە نیودەرزن زیاتر بوون، لە پەنجەرەکانەوە لە سەیری دەرەوەدا بوون و لە

ناوەوەیاندا پرسیاری ئەو سیانەیان لەخۆ دەکرد. ژنە ناوەند تەمەنەکە بە تەنوورەی مەخمەڵی پەمەیی و ماکیاجە خەستەکەیەوە بە پلیکانەی فارگۆنەکەدا سەرکەوت، لە دوایەوە کچە گەنجەکە بە بلوزێکی هاوینەوە کە کەوتبوە سەر تەنوورەکەی و بە جانتاکەی دەستیەوە سەرکەوت. لە دوایانەوە پیرەی بە ویقار بە سەری سپی و بۆینباخ و گۆرەویە بێ پێڵاوەکانی پێیەوە، گەشتیارەکان وایان بە بیردا هات کاری ئەم سیانە هەرچیەك بێت کە بەم شەوە سواری شەمەندەفەر دەبن ئاکامی بە چاك ناگەڕێت، بەڵام ئەوان لە ژیانیاندا گەلێك شتی لەمە سەیرتریان دیوە کە ئێستا لەبەرچاویاندایە، دنیایش ئاسایی پڕە لە سەیروسەمەرە. کەواتە ئەوەی دەیبینن لە هەرە خراپەکانی نییە. بۆیە بیریان لەو سیانە کەلا خست کە هاتنەژووریَ و لەسەر کورسیەکان دانیشتن.

ژن و پیاوەکە لە پاڵ یەکترا دانیشتن، کچەیش بە خۆی و جانتاکەیەوە چەند کورسیەك لە دوایانەوە دانیشت، نیشتەنیەکان سەیری وێزگەیان کرد و کەوتنەوە بیری کاروبارە تایبەتیەکەیان، ئەوانەی پێش گەیشتنە وێزگەکە هەر لەو بیرانەدا بوون. پشکنەرەکە تەماشای هێڵە ئاسنینەکەی کرد و پاشان چاوی بەرەو ئەولایە وەرگێڕا کە شەمەندەفەرەکەی لێوە هاتبوو، دەستی ڕاوەشاند و بە چراکەی دەستی ئاماژەی بۆ لێخوڕەکە کرد، ئەم چاوەڕێی ئەوەی دەکرد. گێڕەکەی گۆڕی و عەتەلەکەی دادایە خوارێ، شەمەندەفەرەکە لە پێشدا لەسەرخۆ بەڕێکەوت، پاشان تا هات خێراییەکەی زیادی کرد. جارێکی دی بەناو تاریکایی گوندەکاندا خێراتری کرد. هەندێك لە ماشێنەکانی ئەوناوە شەوقیان دەخستە سەر هێڵە ئاسنینەکە و بەردەمیان ڕووناك دەکردەوە.

## سەرچاوە

ڕۆژنامەی "الزمان" الف یاء، ژمارە 1626، 4ی ئۆکتۆبەری 2003.

# ئەو رۆژەی کە ونبووم

**ئایزاك باشیڤیس سینگەر**

لە ئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف

ناسینەوەم زۆر ئاسانە. ئەگەر پیاوێکت لەسەر شەقامەکە بینی چاکەتێکی زۆر درێژی لەبەردا بوو و جووتێك پێڵاوی زۆر زلی لەپێدابوو و شەپقەیەکی قەراخ پان و قوپاوی لەسەردا بوو، چاویلکەیەك کە لایەکی بێ شووشە و لەبەر خۆر لە چاوی دەکرد و، چەترێکی هەڵگرتبوو، ئەو پیاوە منم، پرۆفیسۆر شلێمیل.

زۆر نیشانەی ئاشکرای دیکەش هەن بۆ ناسینەوەم: گیرفانەکانم هەمیشە هەڵئاوساون بە گۆڤار و رۆژنامەو کاغەز، هەمیشە جانتایەکی سیخناخم هەڵگرتووە و بەردەوام هەڵە دەکەم.

چل ساڵ زیاترە لە شاری نیویۆرکدا دەژیم، کەچی هەر کاتێك بمەوێت بچم بۆ سەرووی شار، خۆم لە خوارووی شاردا دەبینمەوە. هەمیشە دوا دەکەوم و هەرگیز کەس ناناسمەوە.

هەرگیز شت لە شوێنی خۆی دانانێم. رۆژی سەد کەڕەت لە خۆم دەپرسم: قەڵەمەکەم لە کوێیە؟ پارەکەم لە کوێیە؟ جانتاکەم لە کوێیە؟ دەفتەری ناونیشانەکانم لە کوێیە؟ من ئەو کەسەم کە پێی دەڵێن: پرۆفیسۆری گێژ و وڕ.

چەند ساڵێکە بابەتی فەلسەفە لە هەمان زانکۆدا دەڵێمەوە، کەچی هەتا ئێستا بە تەواوی نازانم پۆلەکانم لە کوێن. زۆر جار تووشی بەزم دەبم لەگەڵ ئامێری ئاسانسەر (مصعد)دا. ئەگەر بمەوێت بچم بۆ نهۆمەکانی سەرەوە، خۆم لە خوارەوە دەبینمەوە. رۆژێك نییە دەرگای ئامێری ئاسانسەرەکە بەسەرمدا دانەخرێت. ئەو دەرگایە خراپترین دوژمنمە.

سەرەڕای ونکردن و هەڵەی چەوت، شتیشم بیر دەچێتەوە. دەچمە قاوەخانەیەك، پاڵتۆکەم هەڵدەواسم، پاشان دەردەچم و نایبەم. کاتێك کە پاڵتۆکەم بیر دەکەوێتەوە و بۆی دەگەڕێمەوە، شوێنەکەم بیر دەچێت. شەپقە وندەکەم، کتێب وندەکەم، چەتر وندەکەم، لە هەمووشی زیاتر دەستنووسەکانم وندەکەم. هەندێجار ناونیشانی ماڵەکەی خۆشم لەبیر دەچێت.

رۆژێکیان تاکسییەکم راگرت چونکە دەمویست بە پەلە بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە. شۆفێری تاکسییەکە لێیپرسیم: "بۆ کوێ؟". لەبیرم چوو لە کوێ دەژیم. وتم: "بۆ ماڵەوە".

بە سەرسامییەوە پرسی: "ماڵەوە، لە کوێیە؟"

وتم "له بیرم نییه".

"ناوت چییه؟"

"پرۆفیسۆر" شۆفێرەکه وتی "ئێستا ئەتبەم بۆ کۆشکێکی تەلیفۆن. سەیری دەفتەری تەلیفۆنەکە بکه و ناونیشانی ماڵی خۆتان دەدۆزیتەوە".

بردمی بۆ دەرمانخانەیەك که کۆشکی تەلیفۆنی تێدا بوو، بەڵام رازی نەبوو لەسەرم بوەستێت. کاتێك کە دەچوومە ژوورەوە بۆم دەرکەوت کە جانتاکەم بەجێهێشتووە. بە شوێن تاکسییەکەدا رامکرد و هاوارم کرد "جانتاکەم، جانتاکەم!" بەڵام تاکسییەکە دوورکەوتبوەوە و شۆفێرەکە گوێی لێم نەبوو.

لە دەرمانخانەکە دەفتەرێکی تەلیفۆنم دۆزییەوە، بەڵام کاتێك کە سەیری پیتی (ئێس)م کرد، زنۆقم چوو، چونکە ژمارەیەك ناوی (شلێمیل)ی تێدا بوو، کەچی ناوی منی تێدا نەبوو. بیرم کەوتەوە کە خۆم داوامکردبوو ژمارەی تەلیفۆنەکەم نهێنی بێت چونکە خوێندکارەکانم ئیش و کاریان لەوە زیاتر نەبوو کە لە نیوەشەودا تەلیفۆنم بۆ بکەن. زۆر جاریش (شلێمیل)ی دیکەیان دەویست بەڵام بە هەڵە ژمارەی تەلیفۆنەکەی منیان لێدەدا.

دەفتەرێکی بچووکی ناونیشانم هەبوو کە هەمیشە لە گیرفانی بەرباخەڵمدا هەڵمدەگرت، بەڵام بە رێکەوت ئەو رۆژە بڕیارمدابوو کە گیرفانەکانم بەتاڵبکەمەوە.

ئەمڕۆ رۆژی لەدایکبوونم بوو. ژنەکەم کۆمەڵێك هاوڕێی بانگکردبوو. کێکێکی گەورەی دروستکردبوو و بەمۆم رازاندبوویەوە. هاوڕێکانم دەهاتنە بەرچاو کە لە ژووری دانیشتن چاوەڕوانیان دەکردم بۆ ئەوەی پیرۆزبایيم لێ بکەن، منیش وا لە دەرمانخانەیەکم و لەبیرم نییە لە کوێ دەژیم.

پاشان، تەلیفۆنی ماڵی هاوڕێیەکی خۆم بیرکەوتەوە کە ناوی (مەزەرهێد) بوو. بڕیارمدا کە داوای یارمەتی لێبکەم. ژمارەکەم باداو دەنگی کچێك وەڵامی دایەوە.

"دکتۆر (مەزەرهێد) لە ماڵەوەیە؟"

کچەکە وتی: "نەخێر".

"ئەی، ژنەکەی لە ماڵەوەیە؟"

"هەردوکیان لە دەرەوەن". کچەکە وتی.

وتم: "دەتوانیت پێم بڵێیت لە کوێن بۆ ئەوەی پەیوەندییان پێوە بکەم؟"

"من تەنها دایەنێکی منداڵانم، بەڵام لاموایە داوەتی ئاهەنگێکن لە ماڵی پرۆفیسۆر شلێمیل. دەتەوێت پەیامێکیان بۆ بەجێبهێڵێیت؟ بێ زەحمەت، بڵێم کێ تەلیفۆنی کرد؟"

"پرۆفیسۆر شلێمیل".

کچەکە وتی: "سەعاتێك لەمەوبەر چوون بۆ ماڵی ئێوە".

پرسیم "دەتوانیت پێم بڵێیت بۆ کوێ چوون؟"

"پێم وتیت" کچەکە وتی "چوون بۆ ماڵی ئێوە".

"ئاخر، ماڵی ئێمە لە کوێیە؟"

"پێم رائەبوێریت!" کچەکە وای وت و تەلیفۆنەکەی داخست.

بۆ ژمارەیەك هاوڕێی دیکە (کە ژمارەی تەلیفۆنەکانیانم لە بیر مابوو) تەلیفۆنم کرد و هەمان وەڵامم بەدەست کەوت: "چوون بۆ ئاهەنگەکەی ماڵی پرۆفیسۆر شلێمیل".

لە شەقامەکە وەستابووم و بیرم لەوە دەکردەوە کە چی بکەم، کاتێك کە باران دەستیپێکرد. "چەترەکەم لە کوێیە؟" لە خۆم پرسی، یەکسەر وەڵامەکەشم دەزانی: لە شوێنێك لەبیرم چووە. چوومە ژێر چەتری دوکانێکەوە. بارانێکی بەخوڕ دەباری و هەورە تریشقە و بروسکەیەکی زۆر هەبوو. بەیانی ئەو رۆژە خۆش و گەرم بوو، کەچی کە

چەترەکەم ونکرد ئەم زریانە دەستیپێکرد و لەوەش دەچێت ئەمشەو هەر بەردەوام بێت. بۆ ئەوەی خۆم بە شتێکی دیکەوە خەریك بکەم، بیرم لە کێشەیەکی فەلسەفیی کۆن کردەوە. مریشکێك هێلکەیەك دادەنێت. لەسەر هێلکەکە کڕ دەکەوێت و جووجەڵەیەك هەڵدەهێنێت. کامیان پێشتر هەبوون؟ جووجەڵەکە یان هێلکەکە؟ هیچ فەیلەسووفێك هەتا ئێستا وەڵامی ئەم پرسیارە هەمیشەییەی نەداوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت وەڵامێك هەبێت. لەوانەیە لە چارەنووسی مندا، پرۆفیسۆر شلێمیل، نووسرابێت کە وەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزمەوە. بارانەکە هەر بە سەختی دەباری. پێم تەڕببوو و زۆرم سەرما بوو. دەستمکرد بە پژمین و ویستم لووتم بسڕم، بەڵام دەستەسڕەکەم نەمابوو.

لەو کاتەدا سەگێکی رەشی زلم بینی. سەگەکە لەبەر باران وەستابوو و هەموو لەشی بە تەواوی تەڕببوو و بە چاوێکی غەمناکەوە سەیری دەکردم. یەکسەر زانیم کێشەکەی چییە. ئەویش وەکو من ونببوو. ئەویش ناونیشانی ماڵی خۆی لەبیر چووبوو. وەکو مرۆڤێك دواندم. وتم "هاوڕێ، هەردوکمان هەمان کێشەمان هەیە. من شلێمیلی پیاوم و تۆش شلێمیلی سەگ. لەوانەیە تۆش بۆنەی رۆژی لەدایکبوونت هەبێت و ئاهەنگت بۆ کرابێت، بەڵام، ئەوەتا لەبەر بارانەکە لەسەرما دەلەرزیت و بەجێهێڵراویت. لەوانەیە خاوەنەکەت لەملاو لەولا بە شوێنتا بگەڕێت. لەوانەشە، وەکو من، برسیت بێت".

دەستم بەسەر سەرە تەڕەکەیدا هێناو ئەویش کەوتە کلك بادان.

"هەرچی بەسەر مندا بێت بەسەر تۆشدا دێت" پێم وت "لەگەڵمدا دەبیت هەتا هەردوکمان ماڵەکەمان دەدۆزینەوە. ئەگەر خاوەنەکەتم نەدۆزییەوە، دەتکەم بە سەگی خۆم. ئادەی لەپێتم بدەرێ!" سەگەکە قاچی راستی بەرز کردەوە. گومان لەوەدا نەبوو کە لە قسەکانم دەگات. تاکسییەك بەوێدا تێپەڕی و باراناوی ئەو ناوەی پێدا کردین. لەپڕ تاکسییەکە وەستا و گوێم لێبوو یەکێك بانگی کردم: "شلێمیل! شلێمیل!" سەرم هەڵبڕی و وبینیم کە دەرگای تاکسییەکە کرایەوەو سەری یەکێك لە هاوڕێکانم دەرکەوت. وتی:

"شلێمیل، ئەوە چی دەکەیت لێرە؟ چاوەڕوانی کێ دەکەیت؟"

پرسیم: "تۆ بۆ کوێ دەڕۆیت؟"

"بۆ ماڵی ئێوە، بێگومان. بمبوورە کە درەنگ هاتووم، شتێك دوایخستم. بەهەرحاڵ، درەنگیش بێیت لەوە باشترە هەر نەیەیت. بەڵام، بۆچی لە ماڵەوە نیت؟ ئەم سەگە هی کێیە؟"

بە سەرسامییەوە وتم: "تۆ خودا ناردووتی. ئای چ شەوێك بوو! ناونیشانی ماڵی خۆمانم لەبیرچووە، جانتاکەم لە تاکسییەکەدا بەجێهێشتووە، چەترەکەم ونکردووەو نازانم دەستکێشەکانم لە کوێن!"

هاوڕێکەم وتی: "شلێمیل، کەس نییە هێندەی تۆ شتی لەبیر بچێت!"

کە لە زەنگی شوقەکەم دا ژنەکەم دەرگای لێ کردمەوە و قیژاندی: "شلێمیل، هەموو چاوەڕوانت دەکەن، ئەوە لە کوێ بوویت؟ کوا جانتاکەت؟ کوا چەترەکەت؟ ئەم سەگە چییە؟"

هاوڕێکانم دەوریاندام. وتیان: "لە کوێ بوویت؟ زۆر خەمی تۆمان بوو. وامانـدەزانی کە شتێکی خراپت لێ قەوماوە!"

"ئەم سەگە هی کێیە؟" ژنەکەم دووبارە پرسییەوە.

وتم "نازانم. لەو شەقامە دۆزیومەتەوە. با ناوی بنێین باوهاو".

"باوهاو، وایە، راستدەکەیت!" ژنەکەم بە سەرزەنشتەوە وتی "تۆ دەزانیت کە پشیلەکەمان رقی لە سەگە. ئەی تووتییەکانمان؟ خۆ دەیانتۆقێنێت!"

وتم: "سەگێکی هێمنەو زوو رەفاقەت لەگەڵ پشیلەکەدا دەگرێت. دڵنیاشم لەوەی کە تووتییەکان خۆشیان دەوێت. گوناهە، دڵم نەهات لەبەر بارانەکە بەجێی بهێڵم لە سەرما بلەرزێت".

کە وام وت سەگەکە دەستیکرد بە وەڕینێکی سامناك. پشیلەکە بە راکردن هاتە ژوورەوە. کە سەگەکەی بینی پشتی رەپکرد و تفێکی لێکرد. ئامادەبوو کە بە چڕنووك چاوەکانی دەربهێنێت. تووتییەکان، لە ناو قەفەزەکانیانەوە دەستیانکرد بە باڵە فڕێ و قیژاندن. خەڵکەکە هەموو پێکەوە دەستیان بە قسەکردن کرد. بوو بە غەڵبە غەڵب.

دەتەوێت بزانیت مەسەلەکە چۆن کۆتایی هات؟

باوهاو هێشتا لەگەڵماندا دەژیت. لەگەڵ پشیلەکەدا بوون بە هاوڕێ. تووتییەکان فێربوون وەکو ئەسپ سواری پشتی دەبن. ژنەکەشم، لەمن زیاتر، سەگەکەی خۆشدەوێت. کە لەگەڵ خۆمدا سەگەکە بۆ دەرەوە دەبەم، پێم دەڵێت: "ئاگاداربن، هەردوکتان، ناونیشانیماڵەوەتان لەبیر نەچێت."

جانتاو چەتر و دەستکێشەکەم هەرگیز نەدۆزییەوە. وەکو هەموو فەیلەسووفەکانی پێش خۆم وازمهێنا لە دۆزینەوەی مەتەڵی کێ لە پێشەوە هاتووە، هێلکە یان مریشك. لە بری ئەوە، ئێستا دەستمکردووە بە نووسینی کتێبێك بە ناونیشانی (یادەوەرییەکانی شلێمیل). ئەگەر دەستنووسەکەیم لە تاکسییەك، یان چێشتخانەیەك، یان لەسەر کورسی باخێکی گشتیدا لەبیر نەچێت، لەوانەیە رۆژێك لە رۆژان بیخوێنیتەوە، ئەمەش کە دەیخوێنیتەوە نموونەیەکە لەو یادەوەرییانە.

## سەرچاوە

*understanding short stories.*

*Tehran, 1999*

# ئەقڵانیەت چییە؟

هارۆڵد برایت
لە ئینگلیزییەوە: عەبدوڵڵا سیوەیلی

وا لێکدراوەتەوە کە کۆنترین قۆناغەکانی ئایین بریتی بێت لە شت –پەرستی، واتە پەرستنی مادده جا شێوەبەند کرابێت یان نا. لە قۆناغی دواتردا ئایدیای خواوەندێتی (*divinity*) لە مادده جیابووەوە، بەڵام مرۆڤ رۆحە خوداییەکانی بەشێوەیەکی ئەنترۆپۆمۆرفی وێنا دەکات، سیفاتی مرۆڤییان پێدەبەخشێت و بە شێوەی مرۆڤانە لە شێوەی خۆی و ئەوانی دیدا دەیاننەخشێنێت. کاتێك باشێتی خواوەندێتی (الوهیە) و بە رۆحیەتێکی شت پەرستیانەوە دەدرێتە پاڵ شێوە، ئەوا بتپەرستی دێتە ئاراوە. هونەر لە پەیوەندیدا لەگەڵ ئایدیا ئاینییەکاندا گەشە دەکات" هونەری مەسیحی سەرەتایی هیچ پێشنیارێکی نیە بۆ مەسەلەی بتپەرستی. مەسەلەی خواوەندێتی تەنها و زۆر بە دەگمەن لە خودی مەسیحدا بەرجەستە کرابوو. لە سەرەتای قۆناغی چاخەکانی ناوەڕاستدا داواکاری بۆ چەمکاندنێکی (مێینە) یان (نێرینە) بۆ خواوەندێتی خستنەڕووی پاکیزەیی (*Virgin*) دەناساند – بەڵام نەك خوای باوك و چارەسەری شت پەرستی بۆ وێنە تایبەتەکان دێنە ئاراوە.. ئەمە سەرباری بوونی ئایکۆنوکلاستەکانیش (ئەوانەی هەڵدەستان بە شکاندنی پەیکەر و شێوەکارییە ئاینییەکان) لە کەنیسەی خۆرئاواییدا و سەرباری خۆ قێزەوەندکردنەکانی قەشە ئاگۆبار لیۆنی لە سەدەی نۆهەمدا. ماهۆمێدانیزم (*Mahomedanism*) بە تەنها بەردەوام بوو لەسەر رەتکردنەوەی بت–پەرستی بە هەردوو شێوەی پراکتیکی و تیۆریش. لە کەنیسەی چاخەکانی ناوەندا، پەرستنی شت و بە تایبەت وێنە کارێکی هاندراو بوو.

ئەو هونەرەی کە بریتی بوو لە درێژبوونەوەی جوانی، لە گریکی کۆن و ئیتالیای رێنیسانسدا گەشەی کرد کە بێگومان گەر لە شێوەی پاڵنەرێکی ئاینیدا نەبوایە لە گەشە دەوەستا. هونەری تەلارسازی گۆتی کە بوو بووە تەواوترین دەربڕینی مانای جوانی لەلایەن سۆزی قوڵی ئاینییەوە کاری تێکراو لە لایەن هونەرەکەی (سەینت پیتەر)ەوە

جێگەی گیرایەوە کە جۆرێکی باڵای ئەو هونەرە بوو کە دواتر خاڵیبووەوە لە سۆزی ئاینی“ هەروەك چۆن ئەمە لە پەیکەر و نەخشاندنە گەچییە ئاینییەکانی مایکڵ ئەنجیلۆدا رەنگی دابووەوە. بەعەلمانیکردنی هونەر، روحیەتی ئەقلاندنی نوێی دیاریکرد کە لە هەردوو روانگەی شت–پەرستی و ئەنترۆمۆرفیزمەوە خزمەتی بەو هونەرە کرد. لەبەرئەوەی کە لە قۆناغە کۆنەکاندا ئایین مامەڵەی لەگەڵ جوانیدا، جوانی هەستی (حسی)، مامەڵەیەکی ترسناك بووە و بە داوی شەیتانی لەقەڵەمداوە. لەوەش زیاتر هەتا باشتر هونەر ببوایە بە بابەتێك بۆ وێڵ بوون، زیاتر رێگاکانی هونەر و ئایین لێك جیادەبوونەوە.

بزووتنەوەی گشتی عەقلانیەت بەشێوەیەکی قووڵ بەهۆی پێشکەوتنی زانستی سروشتییەوە کاریتێکرا. رێبازی ئیلهامی ئینجیل دەکرا بەسەر لێکدانەوە مەجازییەکەیدا جێبەجێ بکرێت، پرۆسەیەك کە لە راستیدا بۆ سەرسوڕماندنی درێژییەکان پەیڕەوکرابوو، بەڵام ئەمە هەروەها بەسەر کپکردنی تەواوەتی هەموو لێکۆڵینەوە زانستییەکانیشدا جێبەجێ کرا کە دەتوانرا لەلایەن هەر دەستەواژەیەکی ناو ئینجیلەوە نکوڵی لێبکرابایە و وەك دەسەڵاتی کۆتایی لە ئاژاوە نەبڕان لەقەڵەم بدرابایە“ بۆ نموونە، لەبەرئەوە بڕوا بوون بە بوونی دژیەکەکان (جەمسەرەکان) یەکسان بوون بە کوفر. هیچ راستیەکی زانستی لە دەرەوەی ریزی نووسەرە عیبریە دێرینەکان ناتوانرێت راست بێت، ئەو راستیانە لە بارەی هەرچییەکەوە بن دەبێت راست بن، گریمانەیەکە کە لە خودی خۆیدا رێگرتنێك بووە لەبەردەم گەشەکردنی زانستدا کە لە سەردەمی چاخەکانی ناوەڕاستدا تەنها لە ژێر سایەی ئیسلامدا مومکین بووە.

مەعریفەی باڵا تەنها بووە هۆی وروژاندنی ترس و گومان. گەر بە خەملاندن ئەم مەعریفە باڵایە پیشان بدرابایە ئەوا دەبووە کوفر، گەر وەکو لێکۆڵینەوەی سروشتیش پیشانبدرابا ئەوا دەبووە جادوو. کارە بەنرخەکەی رۆجەر باکۆن *Roger Bacon* تەنها زیندانی کردنی خودی باکۆن خۆی لێکەوتەوە کە دواتر لە سێدارەش درا لەسەری. دۆزینکارییە گەردونیەکانی کۆپەر نیکۆس *Copernicus* و گالیلۆ *Galileo*، کە لە دەوروبەری سەدەی حەڤدەهەمدا بوونە مایەی گرنگی پێدانی نیوتن *Newton* و دیکارت *Descartes*، ئەو چەمکەی لەبەریەك هەڵوەشاند کە مرۆڤی بە چەقی گەردوون دادەنا. کەنیسە چیتر نەیدەتوانی پێشکەوتن و گەشەسەندنی روحیەتی زانست قەدەغە بکات و کارەکە بەهۆی گەشەسەندنی کیمیا و دواتر لەسەدەی نۆزدەهەمدا بەهۆی جیۆلۆجیاوە تەواو بوو“ کیمیا جەختی لەسەر روونکردنەوەی سروشتیانەی دیاردەکان لە دژی سەرو سروشت دەکردەوە و جیۆلۆجیاش جەختی لەسەر تەمەنی ناکۆتای گەردوون دەکردەوە کە ئینجیل وای لێکدەدایەوە کە گەردوون تەنها شەش هەزار ساڵ تەمەنی دەبێت.

ئەم ئاراستە نوێیە لە بەرامبەر رەخنەی ئینجیلیدا پەرچەکرداری نواند و زۆری دەکرد کە لێکدانەوەی دەقەکان بەهۆی سەلماندنە زانستییەکانەوە پتەوبکات و وەك بابەتێك کە پێی وابوو کە مەعریفەی عیبریەکان لە ئیلهام یان سروشەوە بە دەست نەهاتووە، بەڵکو ئەو گریمانانەی دەنواند کە لە سەردەمی خۆیاندا هەبووە و تۆماری راستەقینەی رووداوەکان بەشێوەیەکی سروشتی بەو گریمانانە رەنگکراون.

گۆڕانێکی هاوشێوه له مەیدانی گەشەسەندنی ئاکاریدا سەرهەڵدەدات. ڕاست و چەوت ڕەهاو نەگۆڕن، بەڵام بەدیهێنانی ڕاست و چەوت له بەشه تایبەتەکاندا بریتییه له مەسەلەی گەشەسەندن. ئاراستەی بەرەو ڕاستێتی بە بەرەو پێشچوونی شارستانیەت لایەنی تر وەردەگرێت" سۆزی مرۆڤایەتی له هیچ سەردەمێکدا له لادان له کۆمەڵگه خۆش نابێت. ڕێبازه ئاینییەکان یان دۆگماکان که له پێکدادانـدان لەگەڵ ئیدراکه ئاقارییه گەشەسەندووەکاندا تەنانەت ئەوانەشیان که له پێکدادانـدان لەگەڵ مەعریفەی زانستی گەشەسەندوودا له بوارەکه کێشرانەوە. بەهێزیی مەسیحیەت لەو ڕاستیەوە سەرچاوەی گرتووە که هەر بەرەو پێشچونێکی ئاکاری تەنها بەشێوەیەکی تەواوتر تەکامولی ئاکاری نموونەکەی خۆی دەردەخات، که له فێرکردن و له کەسی دامەزرێنەردا بەردەوامی بەخۆی دەدات.

## سزا

سۆزی ئاکاری که ئاینی گریك و ڕۆمه دێرینەکان له دەوری دەسوڕانەوە بریتی بوو له هەست و کبریائی چاکه (*Virtue*)،که بانگەشەی چاکێتی بۆ خۆی دەکرد. سۆزی ئاکاری ئاینی مەسیحی بریتی بوو له هەستی تاوان، غیابی چاکێتی له دروستکراودا" "ئێمه هەموو خزمەتکاری بێکەڵکین". مەسیحیەتی سەدەکانی ناوەڕاست پشتی به ڕێبازی فڕێدانه خوارەوەی ئادەم و لەدایکبوانەی تاوانکارانەی هەموو نەوەکان بەستبوو که گوایه ئەمه ئاکامی شیاوی سزای ئەو تاوانەیه و هەرکەسێکیش که ببێته ئەندامی کەنیسه لەو تاوانه پاك دەبێتەوە و ڕزگاری دەبێت. ڕێبازی ڕزگاربوون بەم شێوەیه ڕاستەوخۆ بەرپرسه له تیۆری سزادان له بەرامبەر بیروڕا ئاینییەکان، چونکه وا بیردەکرایەوە که بیروڕای ڕاست ئەو بیروڕایەیه که بۆ ڕزگاربوون پێویسته. بەم جۆره منالی ساوای (تەعمید) نەدراو چارەنووسەکەی بریتییه له غەم و پەژارەی هەتاهەتایی لەسەر حسابی تاوانەکەی ئادەم که بەر له پێنج یان شەش هەزار ساڵ بەر له لەدایکبوونی ئەم ڕوویداوه. لوثه ر و کالڤن هێندەی ڕۆم *Rome* توند و تیژ بوون لەسەر ئەم مەسەلەیه. بێباوەڕه گەورەکان شان بەشانی مناڵه (تەعمید) نەدراوەکان نەفرەتیان لێکرا. هەریەك له زوینگلی و سۆکینەس *Zwingli & Socinus* له سەردەمی چاکسازیدا به تەنها جەختیان لەسەر زەمیر دەکردەوە، نەك باوەڕی دۆگمایی، پێشەواکانی ئەقلانیەت، وەك حەکەم، ڕەفتاریان دەکرد و ئەقلانیەتیش ئەو کارەی که لەلایەن دەسەڵاتەوە بایەخی پێدەدرا گواستیەوە بۆ خودی ئەقڵ. ئەوه له نێوان سەردەمی باکۆن *Bacon* و لۆك *Locke* دا بووە که چیلینگۆرث بۆ یەکەم جار له ئینگلتەرەدا بەرائەتی ڕەهای هەڵەی ڕاستگۆ ( *the absolute innocence of honest error*)ی فێری خەڵکی کرد و فەرمانی (*Deherelico comburendo*) له کتێبی دەستوردا سڕدرایەوە.

هەڵەیەکی گەورەیه گەر وا دابنرێت که ناتوانرێت بیروڕا کپ بکرێت یان تەنانەت به تەواوەتی سەرکوت بکرێت بەهۆی ڕێوشوێنی سزاییەوە. لەهەر شوێنێك که بیروڕا ڕزگاری بوو و سەلمێنرا که سەرکەوتووە بەسەر سزای توند و تیژدا، ئەوا ئەو ڕاستییه بەشێوەیەکی گشتی به پێی ئەو مەسەلانەی ترەوە بووە که تێوەگلاون" و سزای ئاینیش زۆرجار سەرکەوتوو بووە. زۆر جار سزا لەلایەن ئەو گۆڕانەی که له کەشوهەوای فیکردا ڕوویداوه بەزێنراوە و له دواجاردا خودی سزای لاواز کردووە و بگره کۆتایشی پێهێناوە. نەخێر، له

هەندێ حاڵەتدا، سزادراو لە سزادان وەستێنراوە لە کاتێکدا کە دەسەڵات کەوتۆتە دەست خۆیان. ڕێبازی ڕزگاربوون بەشێوەیەکی حەتمی سزا دەهێنێتە ئاراوە بۆ ئەوەی ڕۆحەکان ڕزگاریان ببێت بەمجۆرە جەستەکان لە ڕێگەی سەرکوتکردنی ڕێبازی چەوتەوە تیادەچێت. سزادەرە مەسیحییە کۆنەکان بەڵگەنامە یاساییەکانی خۆیان لە کۆدی لێڤییێك (*Levitical code*)دا دەدۆزیەوە کە بتپەرستی نەك هەر بە هەڵەیەك دادەنا بەڵکو بە ئاواتیشی لە قەڵەم دەدا. ئاریان و کاسۆلیکەکان وەك یەك سزای بێباوەڕەکانیان دەدا" وە ڕێبازی سزادان پاڵنەری توندوتیژی خۆی لە سەینت ئۆگەستین (*St. Augustine*)ەوە وەرگرت. بە بڕوای ئۆگەستین کوفر (بێ بڕوایی) گەورەترینی تاوانەکانە. ڕێبازی خۆگرتنەوە ئاسای خۆبێزراندن و زیاتر بێزراندنی جەستە دڵی مرۆڤەکانی ڕەقکردو ناڵاندنی جەستەیی لێکەوتەوە. دەسەڵات کە ڕەوایەتی کەنیسەی دەسەلماند لە زۆر ڕووەوە وەك کاریگەرییەکی بە مرۆڤانە کردن و بە شارستانیانە کردن جێبەجێ دەبوو" بەڵام بەشێوەیەکی یەکلایی نەبووەوە هەموو سەربەستییەکانی فیکری ووردوخاش کرد و دواجار بەرپرس بوو لە سەرهەڵدانی ژمارەیەکی زۆر لە ناڵاندن و خوێن ڕشتن بە ناوی ئاینەوە.

بەم جۆرە پرۆتستانتیزم لە جەخت کردنەوە لە (ماف و ئەرك)ی مومارەسەکردنی هەڵسەنگاندنی تایبەتیەوە سەرچاوەی گرتبوو. بەهەرحاڵ، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ کاریگەری بەربڵاوی خۆی هەبوو لەگەڵ هەمان چەمکی تاوانباریی هەڵە و هەمان ڕێبازی ڕزگاربوون کە لە ڕاستیدا لەگەڵ بنەمای گرنگی خۆیدا وێك نەدەهاتنەوە کە بەلایەوە لێخۆش بوون کارێکی پێویست بوو، بەڵام تەنها لە ڕەوتی دووسەدەدا بوو کە بنەمای گرنگ بەسەر خودی دامەزراوی فیکردا بڵاوبووەوە. لە فەرەنسا، گومانگەرایی مۆنتایگن وەك پیاوێکی دنیایی، گومانگەرایی دیکارت وەك فەیلەسوفێك، گومانگەرایی بایلێ وەك زانایەك، گەورەترین کاریگەرییان هەبوو، لەو بوارانەدا کە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد، لە گەشەپێدانی ئەم ئاراستە ئەقڵانیخوازەدا، بەڵام لە هەموویان زیاتر، ئەوە گومانگەرایی ڤۆڵتێر بوو کە ڕووبەڕووی نائەقڵانیەتی ئوسولی سزادان بووەوە. لە ئینگلتەرا ئایدیای لێخۆشبوون لە گومانگەراکانەوە سەرچاوەی نەگرتبوو. بەهێزترین دەرکردنی یاسای لێخۆش نەبوون بریتی بوو لە ئاریۆپاگیتیکا (*Areopagitic*)ەکەی میلتۆنی پاکژخواز (پیوریتان)، وە ڕوحیەتی لێخۆشبوون لە کتێبی ئازادی پێشبینی کردن (*Liberty of prophesying*)ی جێرمی تایلۆردا هەناسەی خۆیدا، لە کاتێکدا ئەمە زۆر لە نزیکەوە وابەستە بوو بە فێرکردنەکانی چیلینگۆرس (*Chilling worth*) و قوتابخانەکانی کەنیسەی ئەنگلیکانییەوە کە بەشێوەیەکی توندو تیژ لە لایەن قوتابخانەی ترەوە سەرزەنشت کرا بەڵام نەرمونیانی بێسنوری پرۆتستانتیزم ئەمەی پێقبوڵ کرا.

## بە عەلمانیکردنی سیاسەت

لەم لقەی بابەتەکەماندا، ئێمە یەکەمجار سەرنج لە حەزە سیۆلۆژییەکان دەدەین کە چۆن نەیانتوانی بەردەوام بن لەوەی کە ببنە بابەتی تێکهەڵکێشانە سیاسییەکان، دووەمیش، کە چۆن بناغەکانی دەسەڵات بە عەلمانی کران، دوو کاریگەری و پاڵنەری ئاکاری بەشێوەیەکی سەرەکی مێژوویی مرۆڤیان کۆنترۆڵ کردووە، نیشتمانپەروەرێتی و ئایین. لە جیهانی دێریندا نیشتمانپەروەرێتی لە پێش هەموو شتێکەوە بووە ئینجا بە دوایدا ئایین

هاتووه. بەڵام ئەمە لای عیبریەکان بەو جۆرە نەبووە و ئەوان ئەو دوانەیان تەشخیص کردووە. لەگەڵ سەرهەڵدانی مەسیحیەتدا، حەماسەتی ئایینیی جێگەی بە حەماسەتی نیشتمانپەروەرێتی لەق کرد و کەنیسەش زاڵ بوو بەسەر سیاسەتدا، ئەمەش بە تایبەت لە سەردەمی جیهاددا کە سەردەمی پاپا مەزنەکانیش بوو. مەسیحیەت بەوپەڕی توانایەوە لە دژی ئیسلام جەنگاو کەنیسە توانی ئاگربەستی خودا *Truce of God* بەهێز بکات. بەڵام لەگەڵ رێکخستنی روو لە باشبوونی حکومەتە مەدەنیەکان و لاوازبوونی پێگەی پیاوانی ئاینی، کاروباری بەڕێوەبردن لە دەستی پیاوانی کەنیسە دەرچووە، حکومەتەکان چیتر لە کەنیسە نەدەترسان و جەنگە نوێیەکانی ئایین کە لەگەڵ سەرهەڵدانی چاکسازیدا هەڵئایسان، بە پێچەوانەی شەڕەکانی جیهادەوە، لەلایەن حەز و ئارەزووە سیاسی و نیشتمانیەکانەوە گۆڕران، ئاڵۆزتر بوون، کۆنترۆڵ کران. لەدوای (شەڕی سی ساڵە)، جیاوازییە ئاینییەکان نەیانتوانی جارێکی تر ببنە فاکتەری سەرەکی تێکهەڵکێشانە سیاسیەکاندا.

گەشەسەندنی هەستی سیاسی و نەریتی سیاسی فیکر، دابڕانی سیاسەت و سیۆلۆژیای لێکەوتەوە. لە سەردەمی چاخەکانی ناوەڕاستدا، سیاسەت لەلایەن سیۆلۆژیاوە کۆنترۆڵ کرابوو، کاتێك کە ئەمە مەسەلەکە بوو، ئایین بە توندی ئەوەی فێردەکرد کە لە کاتێکدا کە رەنگە ملکەچ نەکردن راست بێت، ئەوا هەڵگەڕانەوە و بەربەرەکانی کردن لەگەڵ دەسەڵاتێکی دەستوریدا تاوانە. هەڵگەڕانەوە تەنها کاتێك پاساوی هەبوو کە لە ژێر ملکەچی کەنیسەدا بوایە کە بریتی بوو لە دەسەڵاتی هەرە باڵا نەك پادشای کاتی، کە بۆ پاراستنی ئاکار و سەرکوت کردنی بێ بڕوایی کار دەکات. بەڵام کەنیسە لە کێبڕکێی خۆیدا لەگەڵ هێزی دنیاییدا، هەروەها لە هەندێ لایەنی دیاریکراوی فێرکردنی مەسیحیدا، دوژمنکارانە بووە لە بەدڕندەکردنی زۆرداری و بە بەزەیی بووە لەگەڵ زۆرلێکراودا. لە کاتێکدا کە چاکسازی بە بانگەشەکردن بۆ حوکمدانی تایبەتی، مەیدانخوازی لەگەڵ دەسەڵاتدا هاندەدا جا دەسەڵات لە سیاسەتدا بێت یان لە سیۆلۆژیادا، کەچی عوزورخواهێنەرەوە هەرە توندوتیژەکانی زۆرداری لەنێو تەریقەتی جێسیوت (*Jesuits*)ەکاندا بوون. بەڵام لەو وڵاتانەدا کە پیاوانی کەنیسە هەستیان کردوە کە بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ شانشینیدا تێکئاڵاوە — بۆ نموونە لە فەرەنسای کاتۆلیکی و ئینگلتەرەی پرۆتستانتیدا — کەنیسە خۆی خستۆتە بەرەی مافی خودایی (*Devine Right*)ەوە" لە کاتێکدا لەهەرکوێیەك پرۆتستانتیزم کە لە نێو خەڵکیدا سەریهەڵدابێت ئەوا پرۆتستانتیزمێکی سیاسی بووە و لە کاراکتەردا دیمۆکراسی بووە و ئارەزووی کردووە کە دوا دەسەڵات بدات بە خەڵك نەك بە پادشا و ویستویەتی کە پەیمانێکی کۆمەڵایەتی لەگەڵ شانشینیدا فەراهەم بکات.

لە ئینگلتەرا دروستکەرانی ئازادی سیاسی و هەروەها لێخۆشبوونی ئاینی بریتی نەبوون لە بیریارە ئازادە ئاینییەکان — هۆبز *Hobbes*، بۆلینگبرۆك *Bolingbroke*، هیوم *Hume*، هەموو پێکەوە و بەشێوەیەکی نێگەتیڤانە لایەنگری تاج بوون — بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی پیوریتانەکان، ئینگلیز و سکۆتی، یان پیاوانی دین لە مێشکدا چەسپیو، پێکەوە و بە هاوڕابوون لەگەڵ لۆك (*Locke*)دا، لایەنگری پرۆتستانتیزمیان دەکرد. لە فەرەنسای کاسۆلیکیدا بینیمان کە لایەنگرانی لێخۆشبوونی ئاینی و جەنگاوەرانی دژی سزا بریتی

بوون له گومانگەراکان" چونکه سوربوونی توند لەسەر دۆگما سزای لەو دەوڵەتە کاسۆلیکەدا چەسپاند، له کاتێکدا که فرەڕەنگیی پرۆتستانتیزم و به پشتبەستن به بنەمای حوکمدانی تایبەتی، نەتوانرا له دواجاردا به سزا یەکلایی بکرێتەوه. پرۆتستانیزمی فەرەنسی ئەمەی ئەنجامدا، وه له راستیدا و کاری وەك یاسای ( *Vindiciae Contra Tyrannes*)ی بەرهەمهێنا، که جەختی لەسەر بنەڕەته هەلبژاردنیەکانی پادشایەتی دەکردەوه. بەڵام لەسەر ئاستی کیشوەرەکه به گشتی، ئەوه له کلاسیکەکانەوه بووه که بانگەشەی ئازادی ئیلهامی ئەوانی پەلکێش کردووه، سەرچاوەیەك که به دەگمەن دەکرێ لەگەڵ هەم پیوریتانیزم یان لەگەڵ کاتۆلیکیزمدا ئاشتەوایی بکات. وه پەرەسەندنی رێبازەکانی ئازادی رەنگه راستەوخۆ بگەڕێتەوه بۆ پێکهێنانی چینێکی مامناوەند بەهۆی زیادبوونی سامانەوه و لەوێشەوه بۆ بڵاوبوونەوەی مەعریفه له رێگەی میدیای نووسراوەوەو هەروەها پەرەسەندنەکەی بۆ چەك چینه خاوەن ئیمتیازەکانی له باڵادەستی سەربازی بێ بەش کرد و دواجار بۆ گەشەسەندنی زانستی ئابووری سیاسی پەلی کێشا.

## سەرچاوه

www.public bookishelfs.com

# بانگەشەی ئەقڵ

## رەخنە و تیور

**کریستۆفەر نۆرس**

له عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

بارۆك سپینۆزا کاریگەرییەکی زۆری لەسەر ڕێڕەوی دیالۆگی رەخنەیی هاوچەرخ بەجێهێشت، بە تایبەتی لای ئەو تیورسازانەی بواری رەخنە کە زۆر بە لێهاتویی کاری رەخنەییان دەربارەی شیکردنەوەو راڤەکردن ئەنجامدەدا، یان رووبەڕووی ئەو ئاڕاستەیەی رەخنەگران دەوەستانەوە کە لەو سەردەمەدا باوبوو، لەپێناو رەهاکردنی زۆرترین مانا و دەلالەتی شاراوە لە دەقدا یان لەهەر پەرەگرافێکی دەقدا لەکاتی خوێندنەوەی رەخنەییدا. دەتوانین بەئاسانی سەرەتاکانی ئەم نەریتە (نوێیە) لای کۆلێردج بدۆزینەوە، لە وتارە رەخنەیی‌و پراکتیکییە بەناوبانگەکانیدا دەربارەی (شکسپیر) و (ۆردزۆرس) و چەند شاعیرێکی تر(*Coleridg,1817,1983*). بەڵام ئەم نەریتە گوڕێکی گەورەتری وەرگرت کاتێ ت.س.ئیلیۆت زنجیرەیەك وتاری فەلسەفی نوسی، بەتایبەتی "نەریتەکان و بەهرەی تاکەکەسی *Tradition and the individual talent*، شاعیرە میتافیزیکەکان *The metaphysical poets* "، کە تیایاندا زۆر بە وردی ئەرکی ڕاستەقینەی رەخنە یەکساندەکاتەوە بە خوێندنەوەی ورد یان شیکردنەوەی رەوانبێژیانە بۆ دەق (بڕوانە: *Eliot,1964,a,b*). پاشماوەی چیرۆکەکەش لەکاتی بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی ولیام ئیمپسۆندا ئاشکرابوو "حەوت جۆر ئاڵۆزی *Wiliam empson, seven types of ambiguity*"، کە تیایدا مانای لێکدراو و فرەئەدگار دەکاتە بەردی بناغەو خەسڵەتی جیاکەرەوەی بەهای شیعریی، هەمان چیرۆك بەردەوام دەبێ تا دەرکەوتنی رەخنەی نوێ *New Criticism* لە ئەمریکاو رەخنەی پاش بونیادگەریی لە فەرەنساو شێوازەکانی رەخنەی شیتاڵگەری (هەڵوەشاندنەوە)، کە تا رادەیەك دەرفەتی ئازادی شیکردنەوەو خوێندنەوەی رەخنەییان لەبەردەم رەخنەگرانی ئەدەبدا رەخساند، ئەو دەرفەتەی کە پێڕەوانی رەخنەی تەقلیدی بێبەشبوون لێی (بۆ نمونە بڕوانە: *Hartman, 1990,1981;Miller,1985; Leich,1983*).

بەهەرحاڵ وەك پشتیوانییەك بۆ بانگەشە بنەڕەتیەكەی كیرمۆد، دەكرێ بڵێین سەرەتا ئەو پێشكەوتنە گەورەیە لە پرۆسەی راڤەكردنی دەقەكانی كتێبی پیرۆزەوە دەستیپێكرد،كە لە هەندێ روویەوە دەچێتەوە سەر ئەو چاوگە. ئیلیۆت نوسینێكی دەربارەی قەشە "لانسۆلت ئەندرۆس Lancelot Andrewes"[1] هەیە كە تیایدا تەنها سەرنجمان بۆ لای پێگەی مێژوویی ئەو قەشەیە ڕاناكێشێ وەك بەرگریكەرێك لە بەرژەوەندییە باڵاكانی كڵێسا، بەڵكو ئاماژە بۆ ستایڵە تایبەتەكەیشی لە پەخشان و وتاربێژیدا دەكا، بەتایبەتی شێوازە هونەریەكەی لە دابەشكردنی وشەی یەزدان و پراكتیسكردنی جۆرێك لە شیكردنەوەی دەق كە گرنگی زیاتر بە وردەكاریەكان دەداو لەهەندێكیاندا لە توخمە رەخنەییەكانی خودی ئیلیۆت دەچێ (*Eliot,1928*). بەپێچەوانەی ئەوەوە، واتە پێچەوانەی ئینتمای ئایینیەوە، دەبینین جیفری هارتمان *Hartman Geoffery* لە وتارە هاوچەرخەكانیدا نمونەی شیكردنەوەی جولەكەكان "میدراش"[2] دەخاتەڕوو، وەك نمونەیەك بۆ رزگاربوون لە كۆتوبەندی شیكردنەوەی فەندەمێنتاڵی، كە زۆر ئازادانە بەنێوان دەقە رەسەنەكان و هاوشێوەكانیان و شیكردنەوەی نەیارەكانیدا تێدەپەڕێ (بڕوانە: *Hartman,1980*). لێرەوە كیرمۆد بێ هیچ دوودڵییەك رایگەیاند كە بەشێكی زۆری رەخنەی ئەدەبی نوێ لەو تەكنیكانەوە سەرچاوەی گرتووە كە لە بنەڕەتدا لە خزمەت كتێبی پیرۆزدا خراونەتەگەڕ.

بەڵام وەك روونمانكردەوە كیرمۆد هەڵەیە كاتێ سپینۆزا وەك یەكێك لە پێڕەوانی ئەم نەریتە ئەژماردەكا. لە راستیدا سپینۆزا لە ریزی ئەو رەخنەگرو تیورسازانەیە كە نەیاری بیرۆكەی شیكردنەوە *Interpretation* و بەكارهێنانی ئەو بیرۆكەیەن وەك دروشمێك بۆ چالاكی رەخنەی ئەدەبی‌و فرەكردنی ئەدگارەكانی مانا، یان فرەدەقی *Plural Text* وەك یەكێك لە غایەتەكانی لێكۆڵینەوەو شیكردنەوە. بەڵام نەریتی ئاڵتەرناتیڤ دەگەڕێتەوە بۆ ئەرستۆ، كە لە كتێبی "هونەری شیعر"دا ئاماژە دەكا بۆ خەسڵەتەكانی دەروازەیەكی مەنهەجی رێكوپێك، بۆ سەرنجدان لە توخمە ئاوێزانەكانی ستراكتوری دەقە جیاوازەكانی یەك ژانری ئەدەبی دیاریكراو، پاشان هەڵێنجانی ئەو پێوەرو یاسایانەی كە ئەو ژانرە جڵەودەكەن. گرنگترین میراتگرانی هزری ئەرستۆیی لە سەردەمی ئەمڕۆدا بریتین لە پێڕەوانی شێوەخوازی *Formalism* و بونیادگەری *Stracturalism* ، ئەوانەی هیچ تایبەتمەندییەكی ئەوتۆ نابینن لە هەڵێنجانی فۆرمی بریقەدار لە دەقە تاك و دابڕاوەكاندا، بەڵكو ئەوەی پێیان گرنگە چنگكەوتنی ئامرازە شیعریەكانە (یان فۆرمەكانی بەگەڕخستنی گێڕانەوە)، وەك خەسڵەتێكی گشتی گوتاری ئەدەبی ( *Todorov, 1977; Genette, 1979; Rimmon- Kenan, 1983*)... (واتە هێندەی لە فۆرمدا بەدوای بارگەی شاراوەدا دەگەڕێن، هێندە عەوداڵی مانا پەنهانە جیاوازەكان نین... و_ك).

چەند هۆكارێكی دیكە لە ئارادان، كە پەیوەندییەكی پتەویان بەم بابەتمانەوە هەیەو گومان لای رەخنەگران دەوروژێنن و بێمتمانەیان دەكەن لەئاست راڤەكاری‌و شیكردنەوەدا، بەجۆرێك واهەستدەكەن زادەی گوێرایەڵییەكی كوێرانەیە بۆ نەریتە باوەكانی بیركردنەوەی دەسەڵاتخواز (بڕوانە: *Coller,1975* ). لەو بڕوایەدام كیرمۆد پەردەی لەسەر هۆكاری یەكێك لە گومانەكانی خۆی لادا، بەڵكو ئاماژەی بە سەرەتای تیوری هیرمینیۆتیكای مۆدێرن دا لەڕێگای پچڕاندنی هەر پەیوەندییەك لەنێوان

حەقیقەت و مانادا کە پێشتر جڵەوی پرۆسەی شیکردنەوەی کتێبی پیرۆزی دەکرد. ئێستا دەکرێ رەخنەگرە شیکەرەوەکان باس لەوەبکەن کە کارە رەخنەییەکانیان سەربەخۆیی تەواویان هەیەو ملکەچ نین بۆ کۆتەکانی گوێرایەڵی سەپێنراو و رێزگرتنی فەرمانەکانی ئەقل، لۆجیك و وانەی مێژوویی، یان پێوەرە نائەدەبییەکان کە بەرگێکی مەعریفییان بە بەرداکراوە. بەدەربڕینێکی تر، گوتارێکی تایبەت بە دیالۆگی ئەدەبی/رەخنەیی هاتۆتە ئاراوە کە وەك شتگەلێکی نامۆ مامەڵە لەگەڵ ئەو پێوەرانەدا دەکا، نامۆ بە بنیاتەکانی مانای فرەئەدگارو لێکدراو (تەونی ئاڵۆزی *Ambiguity*، هاودژی *Paradox* ، دژەتەنز *Irony* ،...هتد)، هەموو ئەو رەگەزانەی کە شیعریان لە فۆرمەکانی تری زمانی پەیوەندیی رۆژانە دابڕیوە.

ئەم خاڵە بووە پرنسیپێکی بایەخدار، بەتایبەتی لای رەخنەگرە مۆدێرنەکان، بگرە بووە جۆرە عەقیدەیەك، یان پەرچەکردارێك بۆ دوورکەوتنەوەی خوێندنەوەی رەخنەیی تەقلیدی لە "دەقی چاپکراو"و خوگرتنێکی خراپی رەخنەگران بەباسکردنی ئەو وردەکاریە مێژووییانەو ئەو زانیاریە بیۆگرافیانەی کە شتگەلێکی نامۆن بە دەق. گەورەترین شکستی ئەم خوێندنەوە نەریتییە لەوەدا بوو کە رەچاوی جیاوازیی نێوان فۆرمی "حەقیقەت"ی خەیاڵیی ناوازەو بلیمەتی نەکرد کە تەنها شیعر ئیلهام بەخشیەتی، جگە لەو حەقیقەتانەی کە بەرهەمی پراکتیسکردنی پێوەرەکانی لۆجیك و واقیعن. دواتر دەبلیو.ویمسات *W.K.Wimsatt* لەپێشەوەی تیورسازان و پارێزەرانی نەریتە باوەکان، لە بزاوتی رەخنەی نوێدا نەفرەتی گومڕاییو لەڕێگەلادانی باراند بەسەر هەموو ئەو چەنەبازانەی (کە بەبڕوای ئەو تەنها قسەیان هەیەو هیچی تر). چونکە لەدیدی ئەودا گەورەترین گوناه ساناکردنەوەی دەقی شیعرییە بەجۆرێك دەلالەتی شیعریی لە دیدیکێ لۆجیکییەوە وردەکاتەوەو ئامرازە هونەریەکانی وەك هاودژی *Paradox* و دژەتەنز *Irony* ... لەبەرچاوناگرێ، کە کرۆکی ئامرازەکانی گوتاری رەخنەیی نوێیە. بەڵکو لەپشت ئەمەوە گەورەترین هەڕەشە بۆسەر پرۆسەی رەخنەیی، خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە چامەکان بە جدیی وەرگرین بەڵام بەشێوەیەکی هەڵە" وەك ئەوەی هەڵگری چەند وێنایەك بن و حەقیقەت پێشکەش بکەن، یان لەقەرەی ئەو بابەتانە بدەن کە ناچنە چوارچێوەی دەلالەت و بەها سەربەخۆکانیان. ئەڵبەتە مرۆڤ دەتوانێ، لەدوای وتارە گرنگەکانی ئیلیۆتەوە، پرۆژەی رەخنەی مۆدێرن کورتبکاتەوە بەوەی رەفتارێکی ئاڵۆزی چاودێریکردنی تەندروستییە *Cordon Sanitaire*، واتە سیستمێك بۆ چاودێریکردن و وردبینیو رەخنەکردن و پاراستنی شیعر، تا تێکەڵ نەبێ لەگەڵ مێژو، سیاسەت،بابەتە رۆشنبیریەکان و پرسە کۆمەڵایەتییە بەرفراوانەکان.

ئەم پرۆژەیە توانی باشترین فۆرمی رەخنەییو قەناعەتپێهێنەر وەرگرێ لە کتێبەکەی کلینس بروکس "گوڵدانە پتەوەکە" *Cleanth Brookes: The well Wrought Urn, 1947*، کە زنجیرەیەك وتاری رەخنەیی دەربارەی چەند شاعیرێك لە چەند نەسکێکدا لەخۆدەگرێ، هەر لە (دۆن)و(مارڤێڵ)ەوە تا (ۆردزۆرس)و (کیتس)[3]. هەر نەسکێکیش بە یەك پوختەی بازنەیی کۆتایی دێت، بەوەی کە هەموو شیعرێکی باش هەڵگری خەسڵەتی هاودژییە *paradox* ، بەجۆرێك دەبێتە بەشێکی دانەبڕاو لێی. بەو پێیەی ئەم خەسڵەتەو هەموو ئەو میتافۆرە بەلاغیانەی لێیدەبنەوە وەك "ئاڵۆزی، هاودژیو...هتد" گەوهەری شیعرن، ئەوا دەبنە

سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی بەها ئێستاتیکیەکان. بەڵام زۆرجار حوکمی لەمجۆرە زادەی جۆرێك لە خوێندنەوەیە کە بێبەری نیە لە ئارەزووی تاکەکەس، لایەنگیریی مێژوویی پێشوەخت، یان دەمارگیریی ئایدۆلۆجی. ئاشکراترین نمونەش لەم بارەیەوە ئەو نەسکەی کتێبەکەی (برۆکس)ە کە تەرخانی کردووە بۆ لێکۆڵینەوە لە چامەیەکی مارڤێڵ " قەسییدەیەکی هۆراسی: بۆ کرۆمویڵ بەبۆنەی گەڕانەوەی لە ئایرلەند *Horatian Ode: to Cromwel on his return from ireland*". ئەو لیکۆڵینەوە بابەتێکی رەخنەیی بوو بەئامانجی خوێندنەوەیەکی رەوانبێژیانەی ورد کە لە سەرنجە بەناوبانگەکانی ئیلیۆتەوە دەربارەی جوانیو ناسکیی وەك دوو مۆرکی شیعری ئیلهامی وەرگرتبوو. پاشان برۆکس چامە هۆراسییەکە ستایشدەکا، بەو پێیەی هاوسەنگیی لە نێوان هاودژیدا راگرتووە: واتە هاوسەنگیڕاگرتنێکی ورد لەنێوان هاوسۆزی بۆ کرۆمویڵ و هاوسۆزی بۆ لایەنەکەی تریش. لێرەوە بۆ مرۆڤ ئاشکرادەبێ کە رەخنەگر نەك هەر شمەکێکی مێژوویی یاساغی زۆری گلداوەتەوە بۆخۆی، بەڵکو ستایشی شاعیریشی کردووە لە گەمەکردن لەنێوان سودوەرگرتن یان دوورکەوتنەوە لە بابەتەکان، بەپێچەوانەی مێڵتۆنەوە *Melton* کە زۆر بەتوندی پابەندبوو بە هەڵوێستێکی سیاسیی رادیکاڵانەوە.

هەربۆیە رێکەوت نیە کە برۆکس لە پێوەرە ئێستاتیکیەکانیدا بایەخ بەو شیعرە دەدا کە خۆی بێبەریدەکاو رێگەنادا بەوەی جوانی شیعریی ئاوێتەی هەڵوێستێکی سیاسیی روون بکا. بەڵام لەڕاستیدا مرۆڤ زیادەڕۆیی ناکا گەر بڵێ سەرلەبەری فەرهەنگی رەخنەی مۆدێرن کە زاراوەگەلێکی وەك (هاودژی، دژەتەنز، بەڵگەنەویست، هاوسەنگی، پەتیکردن"تجرد" و...هتد) لەخۆدەگرێ، بۆ بەرزکردنەوەی پایەی شاعیرگەلێکی وەك (دۆن *Dunne* ومارڤێڵ *Marvell*) داڕێژراون، کە کارە شیعریەکانیان جۆرێك لە بێبایەخکردنی سیاسەتی پێوەدیارە، هەروەها بۆ نزمکردنەوەی پایەی شاعیرانێکی تری وەك (میڵتۆن و شێللی) داڕێژراون، کە هەڵگری هزری کۆماریخوازیو شۆڕشگێڕانە بوون. لێرەوە دەتوانین لەو هێرشە سەرسەختەی ئیلیۆت دژی میڵتۆن و شێللی بگەین، کە هۆکارەکەی بەپێچەوانەی ئیدعاکانی خۆیەوە هۆکاری هونەری نەبوون، ئەگەر وانییە ئەو توندییە لە هێرشەکانیدا لەپای چیبوو؟ (بڕوانە: *Eliot,1957a,b*)، لیڤیس *Leavis* یەکێك بوو کە بەناوی ئەو بزاوتە رەخنەییە نەریتپارێزەوە قسەی دەکرد، کاتێ دەیوت بەزاندنی نەریتی باو لەلایەن میڵتۆنەوە "گێرمەوکیشەیەکی ئەوتۆی نەخستەوە". رەنگە ئێستا توانیبێتمان لە هۆکاری دژایەتیکردنی لیڤیس بۆ هەڵوێستە سیاسییە شۆڕشگێڕیەکان تێبگەین، کە لەپێناو پاراستنی شکۆی شیعردا بوو، بەهەمان ئەو ئەندازەیەی بۆ پەسەندکردنی پێداویستیەکانی خوێندنەوەیەکی رەخنەیی ورد بوو (*Leavis,1952*).

بەم دواییانە رەخنەگرەکان پەییان بەوەبرد کە هاوپەیمانییەك هەیە لەنێوان (شیعر)و (بوون)، بەوپێیەی یەکەمیان مەملەکەتی ماناو دەلالەتە سەربەخۆکانە“ دووەمیشیان ئایدیۆلۆجیایەکی ئێستاتیکی پەنهانە لە هەناوی رەوانبێژیی فۆرم و ناوەرۆکدا (بڕوانە: *Graff, 1970, 1979; Man 1986; Srinker, 1987*). ولیام ئیمپسۆن لە کتێبەکەیدا "بنیاتی وشە ئاڵۆزەکان" *The Structure of Complex*، یەکێك بوو لەوانەی کە هەر لە سەرەتاوە ئاماژەی بەو هاوپەیمانییە دا، ئیمپسۆن ئەوکات زۆر بەدگومان بوو لە رەخنەی نوێ لە ئەمریکا، ئەو رەخنەیەی بانگەشەی بۆ شەپۆلێك لە نائەقڵانیەت

دەکرد کە هاوزەمان بوو لەگەڵ بزوتنەوەیەکی بەرفراواندا بۆ "بوژاندنەوەی مەسیحیەتی نوێ". تەنانەت گومانی بەرامبەر کتێبەکەی پێشوتری خۆیشی پەیداکرد "حەوت جۆر لە ئالۆزی"، کە رەخنەگرانی "رەخنەی نوێ" کردبوویانە بناغەی دنیابینی رەخنەیی خۆیان، بەڵام ئیمپسۆن دواتر بێبەریبوونی خۆی لێراگەیاند. زۆرکەس لەوانەی کتێبی " حەوت جۆر ئالۆزی"ی ئیمپسۆن_یان خوێندبۆوە، بەتایبەتی ئەو نەسکانەی کە تایبەتبوون بە شاعیرە ئایندارەکانی وەك (دۆن Dunne، هێربێرت Herbert، هۆپکینز Hopkins) پێیانوابوو ئەو یەکسانییەك دەسازێنێ لەنێوان بەهای ئێستاتیکیی ئەدەب و فرەمانایی لەنێوان چەند نمونەیەکدا لێرەو لەوێ. هەروەها لەوەدەچوو میتۆدەکەی زۆر بەڕوونی لەو شوێنەدا بەرجەستەدەبێ کە لە شیکردنەوەی چامەکانەوە دەگاتە سەر فرەمانایی، ئالۆزی و هاودژی" بەجۆرێك پەرچەکردارەکانی تاقە دەقێکی زمانەوانی دەبێتە "دۆخگەلێکی هەلاوساو بە ململانێو کێشمەکێشی دەروونی"، ئەو دۆخانەی بەبڕوای ئیمپسۆن زادەی ململانێی نێرڤسی (عوسابی)ن لەگەڵ ئاستە پەنهانەکانی عەقیدەی مەسیحی. بەمجۆرە کتێبەکەی بە قۆناغی "ئالۆزیی لۆجیکیو دەروونی گەشەکردو" لە دەلالەتی دەقدا دەستپێدەکا، بەڵام لە خاڵێکدا کۆتایی دێ کە زاراوەی " ئالۆزیو فرەمانایی" مەغزای خۆی لە وێناکردنی ناوەرۆك و بەها دژەکانی دەق لەدەستدەدا.(ل 184).

ئاشکراترین نمونە لەسەر میتۆدەکەی ئیمپسۆن، لە شیکردنەوەی چامەی"قوربانی"ی هێربێرت (Herbert,The Sacrifice)دا دەردەکەوێ، کە تیایدا هەموو رەخنەگرەکان، ئایندارەکان و عەلمانییەکان پێکەوە، بریندار دەکا. بەڵام پێشتر دیدی رەخنەگرەکان بۆ کتێبی "حەوت جۆر لە ئالۆزی" زۆر ئازاری دابوو، چونکە کردبوویانە سەرچاوەو کۆڵەکەیەکی سەرەکی بۆ خوێندنەوەیەکی بەلاغیانەی دەق کە لەسەر چەمکی "هاودژی" دامەزرابوو، بەوپێیەی خەسڵەتێکی تایبەتی زمانی شیعرە. ئەوە بووە هەڵوێستی هەموو رەخنەگران، لەپێشیانەوە رەخنەگرە نوێکان، کە خاوەن دیدێکی رەخنەیی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بوون لەمبارەیەوە، تا ئەو شوێنەی لە شیکردنەوەکانیاندا زۆر دوور دەڕۆشتن و پێیانوابوو شیعرو ئاین پەیوەندییەکی نەپساوەی گەرم لەنێوانیاندا هەیە“ چونکە خاوەنی یەك غایەتی هاوبەشن لەپێناوی گەیشتن بە حەقیقەتە قووڵەکانی خەیاڵ، کە لە توانای شیکردنەوەی زانستیی هۆشیارانەو لۆجیکی ئەقڵیی سارددا نیە بیانگاتێ. پاشان "هاودژی" بووە پرنسیپی ئاراستەکەری خوێندنەوەی رەخنەیی لای کلینت برۆکس، بەئەندازەیەك لەشوێنێکدا وتی: "وۆردزۆرس نەیدەتوانی ئەو شتانە بڵێ کە ووتونی گەر پەنای نەبردایە بۆ بەکارهێنانی و گەر ئەو ئامرازەی بەکارنەهێنایە بۆ گوزارشتکردنە بەهێزەکانی" (Brooks,1974,p.198). ئیمپسۆن لەوە دەترسا ئەو شەپۆلە نوێیەی شیکردنەوەی بەلاغی رێڕەوێکی ئاینی وەرگرێ لەو رێڕەوەی کە ئیلیۆت لە وتارە رەخنەییەکەیدا دەربارەی لانسلۆت ئەندرۆز پێڕەوی کرد. بە دەربڕینێکی تر، شەپۆلە نوێیەکە هەڵگری هەموو ئەو نیشانانە بوو کە دەیکردە عەقیدەیەکی ئاینیی ئاڵتەرناتیڤ، لێوانلێو بە حوکم و یاساغە ئایدیۆلۆجیەکان. لە کاتێکی واشدا سەخت بوو جڵەوبکرێ، یان رێبگیردرێ لەوەی _ وەك ئیلیۆت و پێڕەوەکانی ئومێدیان دەخواست _ ببێتە عەقیدەیەك کە لەسەرو رەخنەو لەپێش رەخنەشەوە رەگی

داکوتیوه، هەروەك چۆن ئاین بۆتە چوارچێوەیەکی مەرجەعی بۆ شیکردنەوەی حەقیقەتێکی رەها کە بەربەستە لەبەردەم هەموو بیرکردنەوەیەکی ئەقڵانی ئازاددا بۆ شیکردنەوەی دەقە پیرۆزەکان.

لە راستیدا ئیمپسۆن، بەئاسانی لەلایەن رەخنەگرانی "رەخنەی نوێ"ەوە قوتنەدەدرا،چونکە لەلایەکەوە دژەهەڵمەتێکی بۆسەر مەسیحیەت بەرپاکردبوو، لەلایەکی تریشەوە پابەندبوو بە هەڵوێستێکی ئەقڵانی نەگۆڕەوە، دواجاریش لەبەرئەوەی لە کتێبی "حەوت جۆر لە ئاڵۆزی"دا بەتەواوی ئەو بیرۆکەیەی رەتکردبۆوە کە زمانی شیعر دۆخێکی تایبەتی گوزارشتکردنە، لەدەرەوەی هەموو ئەو لۆجیك و حوکم و تێگەیشتنانەی کە پێیئاشناین. سەرسەختیی ئەو لەمبارەیەوە گەیشتە ئەو ئاستەی کە چامەکانی پەخشدەکرد بەسەر چەند بەش و پەرەگرافێکی بچوك و جیاوازدا، بەمەبەستی دەستخستنی مانا لە پەرەگرافێکی دیاریکراوداو دەستوالاکردنی خوێنەر بۆ سەرلەنوێ گرێدانەوەو پێکەوەگونجانەوەی ئەو بەش و پەرەگرافە لێکترازاو و بچوکانە پێکەوە. ئەم میتۆدە تازەیە، بەپێچەوانەی رێچکەی رەخنەی نوێ وە، واتایەك لەخۆدەگرێ کە دەکرێ پوختبکرێتەوە بۆئەوەی کە دەشێ بەڵکو پێویستە شیعر پەنابەرێ بۆ لۆجیك، چونکە مەبەستەکانی شیعر بەندن بە ئیدراکە سروشتیو زانستیەکانی ئێمەوە" ئەو رەخنەگرو توێژەراوانەشی کە جەخت لەسەر پەخشنەکردن، یاخود بەپەخشاننەکردنی شیعر دەکەن، جۆرە دەسەلاتخوازییەك پێڕەودەکەن کە دەبێتە رێگر لەبەردەم تێگەیشتنماندا. بەهەرحاڵ ئیمپسۆن دانبەوەدادەنێ کە لە کتێبەکەیدا چەند بابەتێك هەیە، بەتایبەتی ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە پەیوەندیی بە شیعرەکانی (هێربێرت)ەوە هەیە، بەهیچ جۆرێك لەگەڵ رێبازە رەخنەییە لۆجیکیەکەیدا یەکنایەتەوە. هەر لەبەر ئەو هۆیەش بوو لە کتێبی (بنیاتی وشە ئاڵۆزەکان)دا سەریکردە تیورەکەی دەربارەی مانای فرەئەدگار، ئەو تیورەی ئاستەمە ملکەچبکرێ بۆ هیچ جۆرە تەکنیکێکی شیکردنەوەی ئاینی یان نیمچە ئاینی.

لێرەدا دەرفەتی رانانێکی درێژی ئەو کتێبە نایابەمان نیە، کە هەرچەندە ئاڵۆزو گرفتئامێزە، بەڵام بێئەندازە رەسەن و قەناعەتئامێزیشە" دەکرێ کۆڵەکە سەرەکیەکانی میتۆدی رەخنەیی ئەو کتێبە لەم چەند خاڵەدا روونبکەینەوە:

1- باشترین تێگەیشتن بۆ "وشە ئاڵۆزەکان *Complex Word*" بەوە دەستدەخرێ کە وەك کۆمەڵێك "هاوکێشەی وتەیی *Equations*" تەماشابکرێن، یان وەك کۆمەڵێك ستراکتوری پێکهاتوو لە دەلالەتی لۆجیکی کە رەهەندەکانی سەرلەبەری بابەتێك چڕدەکەنەوە لە تاقە وشەیەکی بنەڕەتیدا کە دەبێتە "کلیلەوشە *Key-word*"، یان زنجیرەیەك لە وشەکلیلی بنەڕەتی لە ناو سیاقدا.

2- مانای زاراوەگەلێکی وەك "زرنگی *Wit*"(4) و "پەیبردن *Sense*"... بەو مانایەی کە لە وتارەکەی (پۆپ *Pope*) دەربارەی رەخنەدا هاتووە، یان *Sense* کە بەمانای هەستکردن یان چێژی گشتی لە کارە ئەدەبییەکانی وەك (*Measure for measure*)(5)، (*The Prelude*)(6) و (*Sense and Sensibilitiy*)(7)دا هاتووە، باشترین و بەسوودترین نمونەن بۆ "وشە ئاڵۆزەکان"، کە بەکارهێنانی دەوڵەمەند، ئاڵۆز، گرفتئامێزو فرەواتای زۆریان لێدەکەوێتەوە، بەجۆرێك لە ژماردن نایەن.

3- کاتێك ئەم میتۆدە رووبەڕووی کێشە دەبێتەوە، واتە کاتێك وشە بنەڕەتیەکە خۆی نادا بەدەستەوەو لەڕووی سیمانتیکی و لۆجیکییەوە

شیناکرێتەوە، ئیدی سیاقی لۆجیکی لەبەریەك هەڵدەوەشێ‌و رەخنەی ئایدۆلۆجیی ئاراستەکراو دزەدەکاتە نێو میتۆدە شیکاریەکە، یان شیکردنەوەیەکی نالۆجیکی بەسەر میتۆدەکەدا زاڵدەبێ‌و کە بنیاتی دەلالەتە راستەوخۆکان لەبەیندەباو رۆدەچێتە وێڵگاکانی حەقیقەتی گومڕاکارو نائەقڵانی.

ئەم میتۆدە زۆر بەباشی لە چامەکەی "پۆپ"دا کاردەکا (بڕوانە: وتارێك دەربارەی رەخنە)، کە شاعیر مانا گریمانەییەکانی هەردوو زاراوەی وریایی *Wit* و پەیبردن *sense* بەشێوازێکی هونەریی ورد دەخاتەڕوو، کە هاوتای میتۆدە شیکاریەکەی ئیمپسۆن_ە، کە لە کتێبی ناوبراویدا سەلماندوویەتی میتۆدێکی سەرکەوتووە" تەنها لە دوو نەسکیدا نەبێ کە دەربارەی ۆردزۆرس و میڵتۆن نوسیونی‌و بە ئیعترافی خۆیشی شکستی تیایاندا هێناوە، چونکە لە خوێندنەوەی شیعرەکانیاندا رووبەڕووی کێشەی ئەوتۆ بۆتەوە کە دەستەوسانی کردووە لە ئەنجامدانی شیکردنەوەیەکی لۆجیکی یان راڤەکردنێکی ئەقڵانی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیمپسۆن پێیوایە هۆکاری ئەو شکستە ناگەڕێتەوە بۆ خودی میتۆدەکە، هێندەی دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی شیعرەکانیان (بەتایبەتیش ئەوانەی ۆردزۆرس)، کە تیایاندا شاعیر ئارەزووی بەگەڕخستنی ئامرازگەلێکی بەلاغیی سەرنجڕاکێشی هەیە، بەجۆرێك خوێنەر یان رەخنەگر فریودەداو رێگەیان پێنادا گەڕانێکی لۆجیکی بەشوێن دەلالەتە شیعریەکاندا ئەنجامبدەن.

لێرەوە تێبینی دەکرێ ئیمپسۆن میتۆدی "یۆرگن هابرماس *J.Habrmas*"[8] پێڕەودەکا، کە پێیوایە هێزگەلێکی کۆمەڵایەتی‌و زمانەوانی ئەوتۆ هەن کۆسپ و تەگەرە دەخەنە رێی خواستی پەیوەندییە لۆجیکیەکان" لەهەمان کاتدا بڕوای وایە لە هەموو "هەڵوێستێکی زمانەوانی نمونەیی"دا میکانیزمێکی ئاڵتەرناتیڤ هەیە بۆ چارەسەرکردنی ئەو کۆسپ و تەگەرانەو رێخۆشکردن لەبەردەم هەڵقولانی زمان و گوزارشتی لۆجیکی‌و روون. بەڵام ئیمپسۆن لەو شوێنەدا لە هابرماس جیادەبێتەوە کە ئەم میکانیزمە ئاڵتەرناتیڤە زیاتر تایبەت دەکا بە شیعرو دەیکاتە خەسڵەتێکی زمانی ئەدەبی بەگشتی، نەك بەتەنها فۆرمەکانی گوتاری ئاسایی کە زۆر بایەخ بە بەهای ئێستاتیکی نادا. چونکە ئیمپسۆن، وەك پێشتر وتمان، بڕوای وایە شیعر دۆخێکی تایبەتی گوزارشتکردن نیە، بەڵکو پەنا بۆ لۆجیك دەباو هاوتای ئیدراکی ئاساییمانە، هەر کۆششێکیش بۆ بارکردنی ناوەرۆکی ئێستاتیکی ساختەو هەڵە لە شیعر، بەدڵنیاییەوە دەبێتەهۆی بەلاڕێدابردنی بەکارهێنانە ئاساییەکانی زمان بەشێوەیەکی ترسناك.

کەواتە لە دیدی ئەودا، بەپێچەوانەی هابرماسەوە، پێویست ناکا شیعر جیابکرێتەوەو بخرێتە ئاستێکی بەرزی بەهای ئێستاتیکییەوە کە پێوەرەکانی زمانی ئاسایی نایگەنێ" بەڵکو بەپێچەوانەوە پێویستە خوێندنەوەی رەخنەیی هەموو کۆششێك بخاتەگەڕ لەپێناو شیکردنەوەی مانای شیعر بەشێوازێکی لۆجیکی پێویست. بەڵام کاتێ میتۆدی لۆجیکیی رەخنەگر لە شیکردنەوەی شیعردا تووشی کۆسپ و تەگەرە دەبێتەوە، دەبێ ئەوە بزانێ کە چەندین بنیاتی واتایی هەن لێوانلێون بە ناوەرۆکی ئێستاتیکی‌و بەهای ساختە کە پرۆسەی بیرکردنەوەی لۆجیکی لەباردەبەن و دەستاوسانن لە رووبەڕووبوونەوەی زمانی شیعریدا. لەکاتێکی وادا دەبێ ئەمجۆرە شیعرە، ئیدی چەندە بەرزو جوان بێت، بخرێتە خانەی شیعرێکی ناوەرۆك

جوان كه تیایدا راست و درۆ، حەقیقەت و ساختەبوون... لێكجیاناكرێنەوە. واتە زیادەڕۆیی نیە گەر بووترێ لەدوای كتێبی "حەوت جۆر ئاڵۆزی"ەوە، ڕێچكەی ئیمپسۆن لە ڕەخنەدا ئەركی قەلاچۆكردنی شوێنەوارە زیانبەخشەكانی ئەو ڕێچكە ئێستاتیكییەی ڕەخنەی گرتەئەستۆ (واتە ئەو خوێندنەوە ڕەوانبێژییە شیكارییەی كە ڕەخنەگرە نوێكان پێڕەویانكرد).

چەند ڕەخنەگرێكی تر هەن هەمان دیدوبۆچونیان هەیە، گێراڵد گراف *Graff* یەكێكە لەوانە" كە بڕوایانوایە بێبەشكردنی شیعر لە خەسڵەتە لۆجیكیەكانی پەخشان، ڕەنگە ببێتەهۆی كەموكورتیەكی تەواو لە هزری كۆمەڵایەتیو سیاسیدا. لە كتێبی یەكەمیدا (ڕاگەیاندنی شیعریو بیروباوەڕی ڕەخنەیی *Poitic Statement and Critical dogma,1970*) گراف میتۆدی ڕەخنەگرە نوێیەكان تۆمەتباردەكا بەوەی بەهاكانی ڕاستگۆییو حەقیقەت لە ئەدەبدا پشتگوێدەخاو پەیامی شیعریی دەخاتە بازنەیەك لەسەروەستانی بێپاساو: ئاڵۆزی، هاودژی و دژەتەنز و... هتد، بەجۆریك پرسیاركردن دەربارەی شوناس و حەقیقەت و ڕاستگۆیی پەیامەكە دەبێتە هاواركردن لە دۆڵێكی چۆڵدا. لە كتێبەكەی دواتریدا (ئەدەب دژ بەخۆی *Litrerature Against Itself, 1979*) ڕەخنەكانی بەرفراوانتر دەكاو دژی ڕێچكەكانی بونیادگەری و پۆست مۆدێرنیزم و هەموو ئەو ڕێچكانەی كە دوای مۆدێلی دژایەتیكردنی ریالزم و پێڕەوی ڕابردوو كەوتوون" ئەو ڕێچكانەی هەمان ئەركی (ڕەخنەی نوێ)یان درێژەپێدا لە داماڵینی هەموو ڕەگەزێكی مەعریفی لە ئەدەب، یان ڕزگاركردنی لە پاشماوەكانی چاخی حەقیقەت و ڕۆشنگەریی ئەقڵانی ئەو ناونانەی كە لەم ڕۆژانەدا بەرگوێماندەكەوێ. گراف بەپێچەوانەی ئەوانەوە پێیوایە "ئەوەی كە تیۆری ڕەخنەیی دادەماڵێ لە پەیام زادەی سروشتی ئەدەب نیە، بەڵكو زادەی ئەو كۆتوبەندە ڕۆشنبیریانەیە كە دەكرێنە ئەستۆی تیورسازیی ڕەخنەییەوە" (بڕوانە: *Graff,1979,p.163*)، كەواتە مەسەلەكە بەپلەی یەكەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دۆخە كولتوریو سیاسیانەی كە لەكۆتاییەكانی سەدەی بیستەمدا سەریانهەڵدا، نەك پێداگرتنێكی ڕادیكاڵانە لەسەر نەیاریكردنی ڕێچكەكانی ریالیزمی بۆرجوازیی كلاسیكی.

كاریگەریی دوور لە واقیع و فریودەری ئەم ڕێچكانە كاریگەرییەكی پێچەوانەیە، چونكە ژیانمان بە مۆركێكی ساختە دادەپۆشێ، لەجیهانێكدا تەنراوە بە تەكنیكەكانی هۆكانی ڕاگەیاندن و دیاردە پەنهانەكانی فێڵ لەپشت دەمامكی حەقیقەت و ڕاستگۆییەوە، هەروەها هەڵمەتەكانی شێواندنی بەها باوەكان بەناوی سیاسەت و واقعی سیاسییەوە.بەوپێیەی سنورەكانی نێوان واقع و خەیاڵ، لەم پنتەدا، دەپوكێتەوە" ئیدی دیدی ئێمە بۆ واقع ڕێڕەوێكی پێچەوانە وەردەگرێ: بەو مانەیەی مەحاڵە واقع ، وەك لە بانگەشەی تیورسازەكانی ئەو ڕێچكانەدا هاتووە، بناسین تەنها لەڕێگای دەقی ئەدەبییەوە نەبێ. دەقی مۆدێرنیش، بەشێوەیەكی تایبەتی، باشترین سەنگی مەحەكە، چونكە تاوەكو ئێستا سروشتی خەیاڵئامێزی دووپاتدەكاتەوە، لەپێناو داماڵینی ئەو پەردەی واقیعیەتەی كە جیهانبینی ئێمە دادەپۆشێو دەمانكاتە كۆیلەی بیرۆكە ساختەكانی خۆی دەربارەی بابەتگەریو حەقیقەت و ڕاستگۆیی.

كەواتە سەیر نیە كە ئێستا تایبەتترین خەسڵەتی ئەم هەڵوێستە، ڕۆچۆتە نێو ڕێچكەكان و نمونەكانی گوتاری ئەدەبی، لە شوێنگەلێكدا كە پێشتر شتی لەمجۆرەیان نەناسیوە، ئەم مەسەلەیەش

دەبێتەهۆی لەدەستدانی گەرمیی ململانێکەو پچڕانی پەیوەندیی دیالیکتیکیی نێوان رۆشنبیری ئەدەبیو کۆمەڵگا بەگشتی (*Graff,1979,pp.1-2*). ئاشکراترین بەڵگەش بۆ ئەو پچڕانە لە زانستە مرۆییەکانی دیکەدا بەدیدەکرێ (بەتایبەتی فەلسەفەو نوسینەوەی مێژو)، کە بیریارە "پێشکەوتوخوازەکانی" بانگەشە بۆ پەسەندکردنی هەموو بەرهەمە مەعریفیەکانی ئەم زانستانە دەکەن لەناوخۆیانەوە بۆ خۆیان، بەدوور لە پەیوەندییانەوە بەسەر زەمینی واقیعەوە" چونکە "واقیع"و حەقیقەت ئەو دوو شتەن کە لە چرکەساتی ئێستادا ئەژماردەکرێن بەپێی پێوەرەکانی زمان و رەوتەکانیان لە گێڕانەوەدا، هەروەها بەپێی رێککەوتنی رۆشنبیرو خاوەن مەعریفەکان. لە بواری فەلسەفەدا، بۆ نمونە، ریچارد رۆرتی *Richard Rorty* فەلسەفە وێنادەکا بەوەی "جۆرێکی ترە لە نوسین" هاوتای شیعرو رەخنەی ئەدەبیو زانستە مرۆییەکانە بەگشتی (بڕوانە:*Rotrty,1982,1989*). لەبواری مێژوشدا، هایدن وایت *Hayden White,1978* داوادەکا مێژونوسەکان سۆراخی گەشەکردنی شێوازە شیعریەکان و فۆرمەکانی گوزارشتکردنی مەجازیی بکەن، کە لە بەرهەمهێنانی دەقە مێژوییەکاندا بەکارهێنراون، ئەگەر ویستیان لە میتۆدی میژویی پۆزەتیڤیستی نەریتپارێز دووربکەونەوە، ئەو نەریتەی زۆر ئیدعای ئەوەی کرد کە "واقیع وەك خۆی دەگێڕێتەوە". تەنها شتێك کە هەموو ئەو بۆچوونانە پێکەوە گرێدەدا بریتییە لە گەڕانەوە بۆ داڕشتنە ئەدەبیەکان، بەتایبەتی ئەوانەی هەڵگری مۆرکی پاش تازەگەریو پاش بونیادگەریین، لەپێناو داپڵۆسینی هەموو ئەو هزرانەی کە دەکەونە پێش گوتاری لۆجیکی یان ئەو گوتارەی هاوجووتی واقیعە. بۆیە گراف (هەروەکو هابرماس) هۆکاری لەدایکبوونی هزری پۆست مۆدێرنیزم (پاش تازەگەری) دەگەڕێنێتەوە بۆ لەدەستدانی "گەرمایی ململانێکان"، ئەو توخمە چالاکەی پەیوەندیی نێوان ئەدەب و زانستە مرۆییەکانی دیکەی جڵەوکرد. هەروەها پێیوایە لەدەستدانی ئەو گەرماییە بۆتەهۆی شکستخواردنی گەورەی نێوەندەکانی هەستیاریی رۆشنبیری، بەجۆرێك رەفتارو نمونە رەخنەییەکانی خۆیان دەسەپێنن بەسەر هەموو زانستە مرۆییەکاندا.

گراف ئاماژە بۆ خاڵێکی دیکەی هاوشێوە دەکا کاتێ وتەزایەکی کیرمۆد دەخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، لە کتێبێکیدا لەژێر ناونیشانی (هەستکردن بە کۆتایی *The sense of Ending, 1969*)، لەو کتێبەدا کیرمۆد وتوویەتی "کاری رۆماننوسین *fictions*" تاقە ئامرازێکە کە بەدەستمانەوەیە بۆ شیکردنەوەی واقع و روونکردنەوەی رووداوەکان، یان ئەو ئامرازەیە کە بڕێك لە مانا دەبەخشێ بە بابەتە مێژووییە هەڕەمەکی و بێسەروبەرەکان. گراف پێیوایە ئەم وتەزایەی کیرمۆد جیاوازی ناکا لەنێوان رەگەزی گێڕانەوە لە رۆماندا (کە زمانحاڵی ناخمانە لە فۆرمی گێڕانەوەدا بە هەناسەیەکی حیکایەتخوانیی پێکەوەگونجاو)و ئامانجگەلێکی دیکەی زانستی -مەعریفیو رەخنەیی- کە دەمانپارێزێ لەوەی بکەوینە داوی شیکردنەوەی گومڕاکەرو لەخشتەبەر. بەڵام دەکرێ سوود لە هەندێ نمونەی رۆمان وەربگیردرێ، کە نزیکایەتی یان دوورایەتییان لە چوارچێوەیەکی دەستنیشانکراودا لەگەڵ واقیعێکی دیاریکراودا هەیە (بۆ نمونە وەك هەندێ لەو ئەفسانانەی ئامانجێکی سیاسیی دیاریکراویان هەیە، لەپێناو بەرزکردنەوەی پێگەی رەگەزێکی دیاریکراو، یان بەهێزکردنی دۆخی دەسەڵاتێك)، چونکە لەکاتێکی

وادا ئـــەركی خـــۆی دەگەیـــەنێ لـــە دەرخســـتن و روونكردنەوەی وردەكاریەكانی ئەو واقیعە.

ئـــەم خاڵـــە بەســـەر میتۆدەكـــەی (كیرمـــۆد)دا جێبەجێ دەبێ سەبارەت بە بابەتی "خەیاڵ و واقع"، هـەروەها بەسـەر رێچكە زۆر و زەوەنـدەكانی قۆناغی پاش بونیادگەری، واتە ئەو رێچكانەی كە گرنگی بە پەرچـەكرداری وەرگـرو شـێوازی وەڵامدانەوەكـەی دەدەن reader-response، یـان تیـۆری راڤـەكاری كـە بایـەخ بـە مانـای فرەئـەدگار دەدا –واتـە فرەدەقـی–و دەیكاتە بنەمای بەهای ئێستاتیكی. شتێك كە هەموو ئـەم رێچـكانە پێكـەوە كۆدەكاتـەوە بریتییـە لـە بڕوابـوون بـەوەی كـە پشتبەسـتن بـە "واقـع" لـە شـیكردنەوەی دەقـی ئەدەبیـدا خـۆی لـە خۆیـدا هەڵەیەكی گەورەیە، چونكە چەند كۆتێكی بەرتەسك و نەشـیاوی "واقـع"ی بەسـەردا دەسـەپێنێ" ئیـدی هـیچ دەرەتانێـك لەبەردەممانـدا نامێنـێ جگـە لـە كرانەوەی "دەقەكان" بۆ هەموو مانا جیاوازو ئەگەرە سیمانتیكیەكان، تا رەخنە بتوانێ بەرەنگاری هـەموو كۆتەكان ببێتەوە و قفڵەكانی واقیع والاَبكا. باشترین كـەس كـە تـوانیبێتی بەشـێوەیەكی قەناعەتپێهێنـەر گوزارشـــت لـــەم میتـــۆدە بكـــا (رۆلان بـــارت)ە لەكتێبەكەیـــــدا (S/Z,1975) كـــــە زۆر بـــــەوردی روونیدەكاتـــەوە شـــیكردنەوەی رەخنـــەیی چـــۆن دەتوانـێ خـۆی لـەو پێـوەرو پێودانگـە بەرتەسـك و نەریتیانـــە رزگاربكـــا كـــە جڵـــەوی خویندنـــەوەی رەخنـــەیی دەكـــەن. هـــەروەها نوســـەرە شـــیتاڵگەرە ئەمریكیەكان (التفكیكیون الامریكیون) گوزارشت لەم خاڵە دەكەن، لەنێوانیانـدا جیفری هارتمـان( Geoffry Hartman,1980)، كە پێیانوایە سنوری جیاكـەرەوەی نێوان دەقی داهێنەرانـە (Creative)و دەقی رەخنـەیی (Critical) –لەباشـترین حاڵەتـدا– زادەی ئیعتیبـارە قوتابخانەییەكانـــە، یـــان جـــۆرە كۆششـــێكە بـــۆ لەباربردنی هەر فۆرمێك بۆ شیكردنەوە كە دژی ئەو دابەشكردنە كۆنەپارێزە بێت و سنوری جیاكەرەوەی نێـوان ناوچـەی دەقـی داهێنەرانـەو ناوچـەی دەقـی رەخنـەیی ببـەزێنێ (بڕوانـە:Hartman,1980)، پاشـان هیچ دەرەتانێك لەبـەردەم رەخنەگرانـدا نامێنـێ جگـە لـە پێڕەوكردنـی میتـۆدێكی رادیكـاڵ كـە هـەموو ئـەو جیاوازییە رەسمیانە بخاتەلاوە كە لەنێوان حەقیقەت و واقــع، دەق و شـــیكردنەوەو ئـــەدەب و رەخنـــەدا دانـراوە، یـان –وەك كیرمـۆد پێیوایـە– لـەنێوان كـارە خەیاڵیایـــەكانی رۆمـــان و میتـــۆدە جیاوازەكـــانی لێكۆڵینـەوەدا هەیـە، كـە كۆششـدەكەن بـۆ دانـانی پرۆسـەكانی گێڕانـەوەی رۆمـان لـە چوارچـێوەیەكی رەخنەیی تیۆریدا.

## پەراوێزەكان

(1)لانسۆلت ئەندرۆز (1555–1626) پیاوێكی ئایینی بووە، پۆستی ئەسقوفی لـە ناوچەكانی شیستـەر، ئیلیو وینشتتەر لـە ئینگلتـەرا وەرگرتـووە، بە نوسین و رێچكە ئایینیە كۆنـەپارێزەكانی ناسرابوو، یەكـەمین سەرلیستی ئـەو پیـاوە ئایینیانـە بـوو كـە هەڵبـژێردران بـۆ دانـانی گێڕانەوەیەكی باوەڕپێكراوی كتێبی پیرۆز.

(2)میـدراش شـیكردنەوەیەكی عیبرییـە بـۆ تـەورات، پشتئەسـتورە بـە دیـدێكی جولەكانـەی پـەتی، لـەنێوان سـالاَنی (400–1200ز) دانـراوە، بریتیـە لـە چـەند لێدوانێك كـە چـەندین شـیكەرەوەی جولەكـە دایاننـاوەو تێكـەڵبووە بـە چـەندین گێڕانـەوەو حەكایـەتی میللـی، هـەمان زاراوە بـەكاردێ بۆ حەكایەتـەكانی تـەورات كـە مەبەستێكی فێركاریان هەیەو یارمـەتی فێرخوازان دەدەن لە روونكردنـەوەی بابەتـە ئاینیەكانـدا، هـەروەها میدراش لە وێنەی ئەو گەنجینەیەدا بوو كە دەسەلاَتدارانی جولەكە رێنماییەكانیان لێوەرگرتبوو.

(3)چامەی "بۆ گوڵدانێکی گریکی On Grecian Urn" چامەیەکی شاعیری رۆمانسیی ئینگلیز (جۆن کیتس)ە، کە برۆکس لە کتێبی ناوبراویدا شیکردۆتەوە، ناونیشانی ئەو بابەتەش لە ناونیشانی چامەکەوە وەرگیراوە کە واتای سەربەخۆیی دەقی شیعریی دەگەیەنێ وەك ئەوەی گوڵدانێکی سەربەخۆ بێت بۆخۆی.

(4)شاعیری ئینگلیز ئەلکساندەر پۆپ (1688–1744) "زرنگی راست*true wit*" لە شیعردا پێناسە دەکا بەوەی کە دەڵێ: "شتێکە پێشتر ختورەی کردووە بە هزردا، بەلام هیچ گوزارشتکردنێکی لەوە باشتر بۆ نەدۆزراوەتەوە. ساموئیل جۆنسۆن (1709–1784) رەخنە لەم پێناسەیە دەگرێو دەڵێ: "پێناسەیەکە ساختەییو گەمژەیی پێکەوە کۆدەکاتەوە، چونکە شتێك کە پێشتر بە هزردا ختورەی کردبێ نابێتە بابەتی بلیمەتی، چونکە بلیمەتی لە گوزارشتکردندا دەبێ لەدایکبووی چرکەساتی خۆی بێ".

(5)کێشان بە کێشان، ناونیشانی شانۆگەرییەکی کۆمێدی ولیام شکسپیرە (1564–1616).

(6)پێشەکی یان گەشەکردنی ئەقڵی شاعیر، ناونیشانی چامەیەکی شاعیری رۆمانسی وۆردزۆرسە (1771–1855)، پێشکەشی کردووە بە (کۆلێردج)ی هاوڕێی، تیایدا ژیاننامەی خۆی باسدەکا لەقۆناغەکانی منداڵی، قوتابخانە، زانکۆ، ژیانی گشتیو سیاسەت و...هتد. هەرچەندە چامەکە لەڕووی زەمەنییەوە رۆتینئامێزە، بەلام لێوانلێوە بە چرکەساتی سۆزداریی گەرم و گوزارشتکردنی شیرین.

(7)رۆمانی هەستی ناسك، دانراوی جین ئۆستنە (1755–1817).

(8)یۆرگن هابرماس (لەدایکبووی 1929) زانایەکی کۆمەڵناسی ئەڵمانییە، گرنگترین پێشەنگی تیوری رەخنەییە کە پێیوایە مەعریفەی کاریگەر تەنها لە ڕێگای فۆرمەکانی گوتاری کراوەو ئازادەوە دێتەدی، کە بەبێ وەستان و بێسنور هەڵدەقوڵێ، هەروەها نەیارێکی سەرسەختی فەلسەفەی پۆزەتیفیزم و حەتمیەتی ئابوورییە.

# دیالەکتیکی ئەقڵانیبوون و ئەقڵانیەت

د. محەمەد جسوس

لە عەرەبییەوە: هەلکەوت عەبدوللا

سەرەتا پێموایە گرنگە مەسەلەی ئەقلانیبوونو ئەقلانیەت لە فیکری مرۆڤایەتیدا دەربخەین، چونکە یەکێکە لەو بنچینانەی ژیواری ئەورووپی بەشێوەیەکی گشتی لەسەری دامەزراوە، هەر لە سەردەمی ڕێنسانسو شۆڕشی پیشەسازییەوە بیگرە تاوەکو ئەو شۆڕشانەی لەسەر ئاستی سیاسی، کۆمەڵایەتیو کولتووری بەدوایاندا هاتوون، هەروەها لەبەر ئەوەی یەکێکە لە گرنگترین پێکهاتەکانی ئەو فیکرەی هاوشانی ئەو شۆڕشە بووەو هەوڵیداوە لایەنی کەمی شێلگیریو پێگەیشتنی پێ ببەخشێت.

لەم ڕوانگەیەوە دەشێت بڵێین، لە کاتی دەستپێکردنی سەردەمی ڕێنسانسەوە، بەتایبەتی هەنگاوهەڵهێنانی مەزن لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمو سەرەتای سەدەی هەژدەهەمداو لە کاتی شۆڕشە پیشەسازیو سیاسییەکانی ئینگلستانو فەڕەنساو ئەو گۆڕانکاریانەی لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی، کولتووریو فیکری هاتوونەتەئاراوە، مێژووی کۆمەڵگە خۆرئاواییەکان بەگشتی گرێدراوی هەندێك پرنسیپی نەگۆڕ بووەو هاوکات چەند سەلمێنەو ڕوانگەیەکی پێکهێناوە کە هەمیشە ئەو ئیجتیهادە فیکرییو هەڵوێستە ئایدیۆلۆژییانە پشتیان پێ بەستون کە میللەتە جۆربەجۆرەکانو چینە کۆمەڵایەتیە جیاجیاکان ناکۆك بوون لەسەریان. دەشێت ئەو پرنسیپە نەگۆڕانە لە پێنج دانەدا پوختەبکرێنەوە، لەو بڕوایەدام بێ پێداچوونەوەی بنچینەو ڕەگوڕیشەکانیان، هەموو گفتوگۆیەك دەربارەی ڕەخنەگرتن لە ژیواری خۆرئاوا یان فیکری خۆرئاوایی تەنیا بەرهەمهێنانەوەی هەندێك لە پێکهاتەکانی ئەو فیکرە دەبێت یاخود تەنیا بەکارهێنانی هەندێك ئیجتیهادی پێشکەوتووی دەبێت بۆ ڕەخنەگرتن لە ئیجتیهادەکانی پێشووی، بەبێ ئەوەی ئەمە دەرچوون بێت لە بازنەی فیکری خۆرئاوایی. پرنسیپە نەگۆڕەکان ئەمانەن:

1. **یەکگرتوویی مرۆڤایەتی** لەڕوی چییەتیو ئینجا کەرەستە پێویستەکانەوە بۆ ناسینی مرۆڤایەتی.
2. **پرنسیپی ماقووڵبوونی جیهان**، واتە جیهان ڕێکخستنێکی هەڕەمەکی نییە کە ملکەچی هێزە

ئەفسووناوی، غەیبی و ئەوانی تر بێت، بەڵکو خاوەن لۆژیك و بنچینەکانی خۆیەتی، هەرشتێك تیایدا ڕوودات، بەپێی زنجیرە پەیوەندییەك دەبێت کە خاوەن خەسڵەتی پێداویستبوون و حەتمیبوونە. بەو پێیەش هەر شتێك لە گەردووندا هەبێت شایانی تێگەیشتنە و ملکەچی دەسەڵاتی ئەقڵە، ئەوەش کە ئێستا شیاوی تێگەیشتن نییە، بەپێویست زادەی دنیای نهێنییەکان و ناماقووڵ نییە، بەڵکو بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هێشتا وەك پێویست نەخراوەتە بەر ئیجتیهادی فیکری و مەعریفی هەتا شایانی تێگەیشتن بێت. کەواتە ئەوەی ئیمڕۆ ناکرێ لێی تێبگەین، لە قۆناغێکی تردا لێی تێدەگەین.

3. **ئەقڵانیبوونی جیهان**، واتە گریمانەی ئەوەی ئەقڵ تەنیا ئامڕازێکی مرۆڤانە نییە کە یارمەتی خەڵك دەدات بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ واقیع، بەڵکو ئەقڵانیبوون نەشونماکردنێکی (صیرورة) مێژوویی بەکردەوەیە و کۆششێکی بەردەوام لەلایەن گروپ و میللەتەکانەوە لەئارادایە بۆ گەیشتنە ئەقڵانیترین چارەسەرەکان. چارەسەری ئەقڵانی بەوە جیاکارەدەکرێت کە بەتواناترینە بۆ چەکدارکردنی ئەوانەی پێیدەگەن بۆ زاڵبوون بەسەر گرفتەکان و بەدەستهێنانی بەربژێریی شارستانی و مێژوویی لەلایەن ئەو میللەتانەی لەم نەشونماکردنە گشتییەی ئەقڵانیبوون دواکەوتوون. کەواتە ئەقڵانیبوون پڕۆسەیەکی مێژوویی درێژخایانە پەی بە پێکهاتەکانی ژیان و بوارەکانی بەرهەمهێنان، بەڕێوەبردن، یاسا و مامەڵەکردنە سیاسییەکان دەبات، هەروەها کاریگەریدەخاتە سەر هەموو دامەزراوە کۆمەڵایەتی و پراکتیکە مەعریفی، زانستی و تەکنۆلۆژییە جۆربەجۆرەکان، بەڵکو دوائەنجام خۆی دەگەیەنێتە هەموو بوارە بەهاخواز یان ئایینیەکان یاخود مامەڵەکردنی مرۆڤ لەگەڵ پیرۆزییەکان و نموونە و بەها بەرزەکان. واتە ئەقڵانیبوون تەنانەت بواری ئەخلاق و بڕواکانیش دەگرێتەوە.

4. **پرنسیپی پێشکەوتن**، واتە هەرشتێك لە گەردووندا ڕوودات، لەبەر ملکەچیی بۆ ئەقڵانیبوون و نەشونماکردن و میکانیزمەکانی ئەقڵانیبوون (وەك تەوژم و هێز)، ئەوا پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بەدرێژایی ڕۆژگار پێشکەوتنی زیاتر بەدەستبێنێت بۆ: جڵەوکردنی دەستنیشانکارەکانی بوون، مامەڵەکردنی مرۆڤ لەگەڵ سروشت و سامانە سروشتییەکان، گەشەپێدانی تواناکانی مرۆڤ بۆ دابینکردنی پێداویستییە مادییەکانی خۆی، پەرەدان بە توانای مامەڵەکردنی مرۆڤ لەگەڵ خۆی و غەریزەکان و هەستی خۆی. کەواتە پێشکەوتن بەم واتایە مانای چوونە لە نزمەوە بۆ باڵا، لە سادەوە بۆ ئاڵۆز، لە بونیادێکەوە کە خاوەن چەندین فرمانە بۆ بونیادێك کە تایبەتکارە بە فرمانێکی دیاریکراو، بەو پێیەش کارامەبوون لە بواری بەئەنجامگەیاندنی ئەو فرمانانەی لەبواری شارەزایی ئەودان. ئەمەش یەکێکە لەو بنچینانەی تر کە مێژووی خۆرئاوا و مێژووی فیکری خۆرئاوایی بەگشتی پشتی پێ دەبەستن.

5. **پرنسیپی شوێنەواری ناوەندیی بنچینەیی** کە گریمانەی ئەوە دەکرێت مێژوو و سیستەمی خۆرئاوا ئیمڕۆ لەسەر ئاستی جیهان بەدەستیهێناوە. واتە خۆرئاوا لێرەدا تەنیا چەمکێك نییە، هەروەها تەنیا یەکێك لەلایەنەکان نییە لە گەردووندا، بەڵکو لەهەر قۆناغێکی مێژووییدا ژیوارێکی باڵادەست هەیە، ژیوارێك لەئارادایە کە شوێنەواری پێشەوەو پێشڕەوایەتی هەیە و پوختەی گرنگترین ئەو دەستکەوتانە لەخۆدەگرێت کە مرۆڤایەتی پێیان گەیشتوە. بەو پێیە خۆرئاوا لەم قۆناغەدا بەرزترین

پلەیە کە مرۆڤایەتی لەسەر ئاستی نەشونماکردنی ڕوەو ئەقلانیبوون، پێشکەوتن و دۆزینەوەی ماقوولبوونی واقیع و لۆژیکی واقیع و خستنەگەڕی ئەو لۆژیك و پێوانانە پێیگەیشتوە بۆ خزمەتکردنی خواست و پێداویستیەکانی مرۆڤ.

لێرەدا خۆرئاوا پێشڕەوە" پێشڕەوی بەرجەستەکاری نەشونماکردنی ئەقلانیبوون و پێشکەوتن. لەهەمان کاتدا خۆرئاوا بە چارەنووس یان مۆدێلێکی حەتمی و پێویست دادەنرێت، واتە پێویستە میللەتەکانی دیکە، ئەگەر بیانەوێ بکەونە ناو نەشونماکردنی گشتییەوە ڕوەو پێشکەوتن و ئەقلانیبوون، پێویستە لێی وەربگرن. بەو جۆرە، لێرەدا خۆرئاوا لە هێزێکی کاراوە دەگۆڕێت بۆ مۆدێلێك کە پێداویستیی مێژوویی لە قۆناغیکی دیاریکراودا بەرجەستەدەکات، بەلکو دەبێتە پێوانەیەك بۆ دیاریکردنی ڕادەی گەشەکردنی هەر میللەتێك و ئاستی پەرەسەندنی یەکێك لە بەرهەمهێنانە نوێکان. ئەم تیۆرە گەورەیە لەوەو پێش و تاکو ئێستاش یەکێك لە پرنسیپە نەگۆڕە مەزنەکان پێکدێنێ، ئەو پرنسیپە نەگۆڕانەش زەمینەیەکی هاوبەشن بۆ گشت بەرهەمە فیکرییەکان و ئەزموونە مێژووییەکان.

ئەم پرنسیپە نەگۆڕانە هەمیشە دووبارەدەبنەوە، وەك ئەوەی چەند بەردێکی بناغە یان بنچینەیەك بن کە بەهۆیانەوە واقیع پێکدێت و وێناکردنەکان سەبارەت بەواقیع پێکدێن، ئەمەش بە جۆرێك کە ئەو بنچینە یان گریمانانە بە خشتەی مەندەلیف دەچن، چونکە هەریەکێك لە توێژینەوەکان سەبارەت بە بنچینەکانی گەردوون (لە ڕووی دۆزینەوەوە) تەنیا بۆتە هۆی پڕکردنەوەی یەکێك لە خانەکانی خشتەکە. لێرەدا بەجۆرێك لە سەرچڵییەوە دەتوانین ئەو سەلمێنانە بشوبهێنین بە بنچینەکانی گەردوون، ئەمەش نەك بەواتا زانستی یان مەعریفیە ڕووتەکەی، بەلکو پەیوەست بە گشت ئەو ئیجتیهادانەی بواری فیکرو گەشەکردنانەی ئاستی کۆمەلایەتی و سیاسی کە ژیواری خۆرئاوا لە قۆناغێکدا پێیان ئاشنابوە، لەکاتێکدا کە پێگەی دەسەلاتدارێتی و بالادەستی ئەو ژیوارە لەسەر ئاستی جیهان بەدەستهێنابوو و تیایدا گەیشتبوە ئەو ئاستەی ئیشکالیەت و پرسیارەکانی خۆی بسەپێنێ. واتە پرسیارەکانی خۆی و تەنانەت وەرگرتنی هەلوێست بەرامبەر بەو پرسیارانە بسەپێنێ بەسەر کولتوورو ژیوارە جۆربەجۆرەکاندا. کەواتە لەم ڕوانگەیەوە بەشێوەیەکی گشتی بۆم دەردەکەوێت کە ئاخاوتنی نابەرپرسیارانەی زۆر دەربارەی دابڕان و ڕەتکردن لەئارادان. بەشێکی زۆری ئاخاوتنەکان باس لە دابڕان و ڕەتکردن دەکەن، بەلام ئەو دابڕان و ڕەتکردنەی باسیدەکەن یان هەولدەدەن لە یەکێك لە بوارەکانی ژیان یان فیکردا کاری پێ بکەن، پشتئەسورە بەهەمان پێکهاتە مەزنەکان، بەجۆرێك ئاخاوتن دەربارەی دابڕان و ڕەتکردنی هەموو بەرهەمەکانی ژیواری خۆرئاوایی بەناوی ئەقلانیەت یان پێویستیی پێشکەوتن یاخود یەکگرتنی مرۆڤایەتی و گرنگیی دابینکردنی لایەنی کەمی ماف و پێداویستیەکانی میللەتەکانی جیهانی سێیەمەوە ڕوودەدەن. سەرەنجامی ئەوە فیکری دابڕان ڕوودەکاتە سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی ئەو یەکە مەزنانەی ژیواری خۆرئاواو فیکری خۆرئاوا هەتاکو ئیمڕۆ پشتی پێ بەستوون. بەو جۆرە هەر گەڕانێك بەدوای دابڕاندا چاوخشاندنەوەیە بەو یەکەو بنچینانەدا کە ئیجتیهادە فیکرییە جۆربەجۆرەکان بەدرێژایی سەدەکان پشتیان پێ بەستوون و قۆناغە جۆراوجۆرەکانی گەشەکردنی مێژووی ژیواری خۆرئاوا بەکارلێککردن لەگەل میللەتەکانی جیهان

پێیــان گەیشــتوون. بــە دەربڕینێکــی تــر، دابــڕان شیاونییەو ڕەتکردنیش شیاونییە، ئەگەر دەربڕینی ئەقلانیـەتێکی ئەڵتـەرناتیڤ، وێنـاکردنێکی نـوێ بـۆ ئەقلانیــەت، هەڵوێســتێکی نــوێ بــۆ پێشــکەوتن‌و هەڵوێســتێکی نــوێ بەرامبــەر بــە یــەکگرتوویی مرۆڤایــەتی، مــاقووڵبوونی جیهــان، شــوێنەواری ناوەنـدیی خۆرئـاوا لەسـەر ئاسـتی جیهـان....تـاد شـیاونەبێت، مـادام ئـەو یەکانـە بـە ڕاسـتیی فیکـری دادەنرێن و هیچ کۆششێکی فیکری لـەم بوارەدا لـە بازنـەی ڕاکێشـانی خۆرئـاوا قوتـاری نابێـت. ئـەو پرســـیارەی لێـــرەدا دەردەبڕرێـــت" پرســـیاری پرسیارەکان یان چەقەپرسیار ئەمەیە: ئایا دەشێت ئـەو یەکـە مەزنانـە ڕەتکرێن‌و وێنـاکردنێکی نـوێ بـۆ گەردوونێکی دی بەدەستبێت؟.

پێدەچـێت بەشـێك لـەو ڕەخنانـەی لـەم بـوارەدا دەردەبڕرێن لە شوێنی خۆیاندا بن، کاتێك ڕەخنە لەو توێــژەرو بیریارانــەی جیهــانی ســێیەم دەگیرێــت‌و دەوتــرێ ئــەوەی بــەناوی دابــڕان یــان ڕەتکردنــەوە ئەنجامیدەدەن تەنیا گۆڕینی هەڵوێستی خۆرئاوایی ژمارە (1)ە بە هەڵوێستی خۆرئاوایی ژمارە (2)و ئەو گـۆڕان یـان شـتەی بـە ڕەتکـردن ناویدەبـەن زیـاتر بەکارهێنانی هەندێك ئیجتیهاد یان پێکهاتـەی نوێیە کە مامەڵە لەگـەڵ هـەمان پرنسیپگـەلی نـەگۆڕ دەکـەن‌و وەك ئامڕازێك بەکارهێنرێن بۆ ڕەخنەگرتن لە هەندێك پێکهاتــەی کــۆن، مانــای ئەوەیــە ئەوانــە لەهــەمان گۆڕەپانـدان‌و لەهــەمان بازنــەدا دەخولێنــەوەو لێــی دەرناچـن. ئــەوەی ئێســتا ڕەچـاویدەکەین: یەکــەم/ جیهـانی سـێیەم‌و هــەموو ئەوانــەی لەسـەر ئاسـتی ژێــواری قســە دەربــارەی تایبەتمەنـدی‌و تواناکــان دەکــەن، گشــت ئەوانــەی لەســەر ئاســتی ژێــواری‌و فیکـری باسـی دابـڕان‌و ڕەتکـردن دەکـەن شـتێکی نوێیان سەبارەت بەو پرنسیپە نەگۆڕانە نەهێناوەتە ئــاراوە، بــەڵکو زۆرجــار (بــۆ نموونــە) دەبیــنین گرتنــەخۆی مارکســیزم بــوە بــۆ ڕەخنــەگرتن لــە هەڵوێستی بنەماگەران یان لە هەڵوێستە فرمانیەکان یـاخود لــە هەنـدێك وێنـاکردنی گەشـەکردنخوازی پێویسـت....تـاد، بەچاوپۆشـین لـەوەی ئـەو تێزانـە لەسـەر ئاسـتی پێکهـاتن نـاکۆکن، نـەك لەسـەر ئـەو بنچینانەی پشتیان پێ دەبەستن. ئەوەی پشت بەم جۆرە تێزانەش دەبەستێت، لە چاکترین هەلومەرجدا ناتوانێت شتێك بەرهـەمبهێنێ جگـە لـە پێکهاتەیـەکی نـوێ لـەناو هـەمان سیسـتەمی گشـتیدا کـە پشـت بـە هــەمان بنچـینەکان دەبەسـتێ. ئەمـە لەکاتێکـدا کـە مەسەلەی ڕەتکردن‌و دابڕان مەسـەلەی ویسـت نییـە، بەڵکو مەسـەلەی تواناگـەلی مێژووییـە، چونکە لەسـەر ئاستی واقیع هەرگیز ماتماتیکێکی نـوێ، فیزیایـەکی نوێ یان ئایدیۆلۆژیایـەکی نـوێ بەدیناکـەین، لەسـەر ئاستی مەعریفیش (مەعریفی لێرەدا ڕۆڵی بنچینەیی دەبینـێ) توانـای گەشـەکردن لێـرەو ڕاسـتکردنەوەی ئـەو پێکهاتـە مەعریفیانـە لـەوێ بەدیـدەکرێت، بـەڵام هــیچ دابڕانێکــی مــەزن لەئارادانییــە. دوادابڕانــی مەعریفی مەزن کە جیهان بەخۆوەی دیبـێ، لەڕێگـەی بەشـداریکردنەکەی ئەنیشـتاینەوە بـوو لـە سـەرەتای سـەدەدا. لەسـەر ئاسـتی مـەعریفی دەشـێت باسـی پشــــێوی توێژینــــەوەی تیــــۆری لــــە زانســــتە سروشتییەکان‌و زانستە وردکارییەکان بکـەین، لەبـەر ئەوەی لە دەیان ساڵی پێشوودا ئیجتهادی گـەورەی نوێـێ وەهـا لەئارادانـەبوە کـە بـە دابـڕ یـان ڕەتکـەری سیسـتەمی مـەعریفی دابنرێـت. ڕەتکـردن مەسـەلەی ویســـــت‌و خواســـــت نییـــــە، گرێـــــدراوی بـــــوونی بلیمەتـەکانیش نییـە، وەك ئـەوەی نیشـتیمانەکەمان ئێسـتا پێویسـتی بـە کـارل مارکسـێکی نـوێ یـان بیریـارێکی بلیمـەتی نـوێ هـەبێت، بـەڵکو بلیمـەتی لـە مێژووەوە دێت.

مێژوو بلیمەت بەرهەمدێنێ. ئەگەر وزەو هێزگەلی نوێ لەگۆڕێ نەبوون، هەلومەرجی مێژوویی دەیسەپێنێ بەسەر ئەوانی تردا بکەونە ناو نەشونماکردنێکی پێکەوەگرێدراوی بەردەوامەوە. لەسەر ئاستی وزەو هیزەکان، ڕەچاوی ئەوە دەکرێت نیشتیمانەکەمان هەتاکو ئێستاش دەربارەی مەسەلەی دیاریکردنی پڕۆژەی خۆی بۆ داهاتووی ژیواریو کۆمەڵگەیی لە سەرسمداندایە، مەسەلەی هەڵبژاردنی ئاڕاستەی ژیواریو کۆمەڵگەییش هێشتا بەهەڵواسراوی ماوەتەوەو شوێن ململانێو ناکۆکیی گەورەیە.. داهاتوو هەیە، نەشونماکردنێکی داهاتووخوازی کۆمەڵگەیی لەئارادایەو نوێکردنەوە خۆڕسکانەیە. نەشونماکردنێك هەیە مێژوو و ئەو فشارانە دەیسەپێنن کە نیشتیمانەکەمان ڕووبەڕوویان بۆتەوە، ئەو نەشونماکردنە کە لە دۆخی بنیاتنانی سیستەمی کۆمەڵگەییو ژیواریی نوێدایە، دیارترین خەسڵەتەکانی ئەوەیە کۆڵەکە بنچینەییەکانی ژیواری عەرەبی ئیسلامی وردوخاشدەکات. ئیشکالیەت لەم ئاستەدا ئەوەیە چینە فەرمانڕەواکان، توێژە کاربەدەستەکانو توخمە خاوەن بیرەکانی لای ئێمە هێشتا نەگەیشتوونەتە لایەنی کەمی داناییو بیرکردنەوەو ڕوویانکرۆتە جۆرێك لە گرەوکردن کە جگە لە بنیاتنانەوەی ئەوەی مێژوو ڕەتیکردوە شتێکی دی نییە. وەك فیزیازانەکان دەڵێن، کات تاکە دیاردەی گەردوونیە یەك ئاڕاستەیەو لە گەردووندا دیاردەیەکی دی بەدیناکرێت یەك ئاڕاستە بێت، واتە ناکرێ ئاڕاستەکەی وەرچەرخێنرێ یاخود بگەڕێنرێتەوە. کات هەمیشە بەرەو پێشەوە دەچێتو بۆ چرکەیەکیش بۆ دواوە ناگەڕێتەوە. ئەگەر کات بەم شێوەیە بێت، ئەوا ژیانو کۆڵەکەکانی ژیان بەبێ پەیوەندیی لەگەڵ سروشتی ژیان بوونی نابێت. واتە تاکە ڕێگەیەك لەبەردەمی میللەتەکەماندا ئەو ڕێگەیەیە کە پێیوایە نوێکاریو لە مێژوودا توانەوە تاکە ڕیگەیەو هەڵبژاردنی هەر ڕێگەیەکی دیکە خۆکوشتن یان پەراوێزبوونە. لێرەشدا ڕێگە ڕاستەقینە دەربڕراوەکان ئەو جۆرانەی نوێکارین کە لەگەڵماندا دەگونجێن یان بەدەم پێداویستییەکانمانەوە دێن. بەدەربڕینێکی دی، لەبری بەردەوامبوون لەسەر ئاخاوتنی بێسوودی پاڵەوانبازی کە دەبێتە هۆی تێکەڵوپێکەڵکردن، پێویستە دان بەو واقیعەدا بنرێت کە نەشونمایەك هەیە ناکرێت خۆی لێ بپارێزرێتو ئەوەی ڕووبەڕووماندەبێتەوە چۆنێتی مامەڵەکردنمانە لەگەڵ نەشونماکردنەکەدا: ئایا ڕێگەبدەین خۆڕسك یان هەڕەمەکی بێت؟ ئایا لێگەڕێین دەسەڵاتی واقیع جڵەویبکات یاخود دەتوانین هەندێك دابینکاری، سنوور، ڕێگەو ئەولەویاتی بۆ دابنێین، بەشێوەیەك کە بتوانین چاکترین سوود لەو تەوژمە مێژووییە وەربگرینو لە بەرژەوەندیی خۆماندا بیخەینەگەڕ، نەك ڕێگەی بدەینێ بەرەو چارەنووسێك بمانبات کە نازانین ئەنجامەکەی چییە؟ بەبڕوای من لەم نەشونماکردنەدا، تێوەچوون تاقە هەڵوێستو چارەسەرە.

پێش ئەوەی باسی ئەقڵانیەتو ئەقڵانیبوون بکەم، دەمەوێ تەنیا هێما بۆ ئەوە بکەم کە دیاردەیەك هەیە پێویستە بیری لێبکرێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئیجتیهادگەلی زۆر لای هەندێك بیریار بەدیدەکرێن، بەلام بۆچی هەندێکیان بایەخێکی زۆری توێژەرو بیریارە هاوچەرخەکانمانیان بەدەستهێناوەو ئەوانی دیکە هەمان بایەخیان پێ نەدرا؟ لێرەدا دەمەوێ وێڕای مارکس ناوی دوانی تر بهێنم: ڤیبەر و فرۆید. بۆچی وێڕای زۆربوونی بایەخدان بە تێزە سۆسیۆلۆژییەکان ماوەیەکی درێژ

زیاتر جەغت لەسەر مارکس دەکرایەوە نەك ماکس ڤیبەر، لەسەر تێزە بنەماگەری یان فرمانیەکان دەکرایەوە نەك ماکس ڤیبەر؟ ئەمە لەکاتێکدا کە ماکس ڤیبەر یەکێکە لەو شیکارانەی وردکارانەو ڕوون باسی ئەو پێنج پرنسیپەی پێشووی کردوەو پێموایە هەموو گەشەکردنەکانی دوای بەرهەمهێنانی سۆسیۆلۆژیانە، مێژوو، ئابووریی سیاسیو بەشێکی گرنگی زانستە سیاسییەکانی ئێستا هەرگیز بێ گرێدانەوەیان بە بنچینەکانیان لای ماکس ڤیبەر تێگەیشتنیان مەیسەرنابێت.

لە ڕاستیدا ماکس ڤیبەر لەم بوارەدا بەسوودە، چونکە بەشداریکردنی لە مەسەلەی ئەقڵانیەتو ئەقڵانیبووندا، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە هەتاکو ئێستا، گرنگترین بەشداریکردنە. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە پێموایە هیچ بیانویەك نییە بۆ پیواری (غیابی) بایەخدان بە فرۆید، چونکە فرۆید بەهێزترینو گرنگترین هەڵوێستی هەیە بەرامبەر بەو ئیشکالیەتانەی لای خۆمان باسیان لێوە دەکرێت. لێرەدا باسی دوولایەنی هەر یەکێکیان دەکەم کە واتای گرنگیان هەیە بۆ شیکردنەوەی بارودۆخی ئێستای نیشتیمانەکەمان. لایەنی یەکەم/ سیگمۆنت فرۆید لە کۆتایی شیکردنەوەکانیدا دەگاتە ئەو سەرەنجامەی کە جومگەگیریو سنوورەکان لە نێوان تەندروستو ئەوەی نەخۆشە جۆمگەگیریی بەهێزی نەگۆڕ نییە، بەڵکو جیاوازیی نێوانیان چەندایەتییە نەك چۆنایەتی، جیاوازییەکە لە پێکهاتەدا نەك لە توخمەکاندا. هەر مرۆڤێك لە تایبەتمەندیی خۆیو خودی خۆیدا توخمگەلێك هەڵدەگرێت کە دەبنە هۆی خستنەوەی پشێویی زۆر، هەروەها توخمگەلی وەهاش لەخۆدەگرێت کە یارمەتیدەدەن بۆ گەیشتنە دۆخی هاوسەنگی. لەم ڕوانگەیەوە، فرۆید پێیوایە مرۆڤی نەخۆش بەگشتی ئەو مرۆڤەیە کە قەرزەکانی خۆی لەگەڵ ڕابردوودا پاك نەکردۆتەوە، ئەو مرۆڤەیە کە دیلی قۆناغەکانی پێشوە، چونکە نەیتوانیوە چاك مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، نەیزانیوە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو هەڕەشەو پاشماوانەی ڕابردوودا بکات یاخود ڕەتیان بکات. نەخۆش ئەو کەسەیە کە لە ڕابردووی خۆی ڕزگاری نەبوەو بەجۆرێك لە ئێستادا دەژی کە سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوە یان دووبارەکردنەوەی ڕووداوەکانی پێشوە، وەك وتمان ئەمە لەکاتێکدا کە کات بێبەزەییەو هەمیشە بەرەوپێشەوە دەڕواتو ناگەڕێتەوە. فرۆید پێیوایە چارەسەرکردنی نەخۆش بەوە دەبێت پاڵی پێوە بنرێت بۆ دانپیانانو تێگەیشتن لەوەی، ئەو شتەی سەرچاوەی پشێوییە شتێکە تەواوبوەو مردوە، لە ماوەیەکی دیاریکراودا ڕوویداوەو کۆتاییهاتوە. بێگومان سەرنەکەوتنی کەسەکە بەسەر کێشەکەیداو لەو کاتەدا مانای ئەوە نییە شکستەخواردن چارەنووسێتیو کەسێکی "بێبەخت"ە. کاتێك کەسەکە لە سەرچاوەکانی شڵەژانو سەرسمدان تێدەگاتو دەیگێڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی لە ڕابردوداو ئێستای خۆی لە دەستی ڕابردوو ڕزگاردەکات، ئەوا لەشساخ دەبێت. ئەمەش ئەو شتەیە کە فرۆید مەبەستێتیو دەڵێت: لە هەرشوێنێکدا "ئەو" هەبێت، دەبێت "من" جێگەی بگرێتەوە، واتە ئەو شتانەی بەشێوازی هێماکارو ناکردەیی یان جێبەجێکار چەپێنراون یاخود شاردراونەتەوە، پێویستە بگەڕێنرێنەوە بۆ شوێنو ڕەوتگەی خۆیان. خاڵی دوەم/ مەسەلەی شێوازی مامەڵەکردنی فرۆیدە لەگەڵ ماقووڵو ناماقووڵدا، چونکە دەشێت فرۆید یەکێك بێت لەو وزانەی ئەو نەشونمایەیان پێکهێناوە کە باسمکردوەو پشتی بەو پێنج بنچینەیە بەستوە. بەپێچەوانەی ئەوانەی پێیانوایە چەمکە

فرۆیدییەکان و سیستەمی فرۆیدی یەکێکن لە سەرچاوەکانی نائەقلانیەت یاخود بەدرۆخستنەوەی ئەقلانیەتی هاوچەرخ، لەو بڕوایەدام فرۆید و مارکس هیچ جیاوازییەکیان نییە. ئەگەر مارکس داکۆکیی لە سۆشیالیزم کردبێ، لەبەرئەوەی سەرمایەداری، کە ئامڕازی پێشکەوتن و ئەقلانیبوون بوو، گەیشتبوە قۆناغێك کە ئاستەنگ و ڕێگربوو بۆ گەشەکردن و ئەقلانیبوونی زیاترو بەناوی پێشکەوتن و ئەقلانیبوونەوە پێویستیی گوێزانەوەی بۆ سۆشیالیزم دەربڕیبێ (سۆشیالیزم بەلای مارکسەوە بەدرۆخستنەوەی توانای ئەقلانیەتی سەرمایەدارییە بۆ زیاتر دابینکردنی نەشونمای پێشکەوتن نەك بەدرۆخستنەوەی خودی پێشکەوتن)، ئەوا هەمان شت بۆ فرۆیدیش ڕاستە. فرۆید بە شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ نەست و گشت شێوازەکانی چەپاندن" چەپاندن و بێبەشی و بەدبەختیی مرۆڤانە پێشنیاری تاکە ڕێگەی ئازادبوون دەکات، ئەویش گەڕانە بەدوای ئامڕازی ئەقلانیدا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەوەی نائەقلانیە، گەڕانە بەدوای ئەقلانیەتێکی پێشکەوتووتر، پێکهاتەتر، جێبەجێکارتر یاخود بەتواناتر لە ئەقلانیەتەکانی پێشوو. پێدەچێت ئەوەی لەسەر ئاستی نیشتمانی ئێمە دەربڕاوە جیاوازنییە لەگەڵ ئەوەی مارکس یان فرۆید لەگەڵی ژیاون. واتە مەسەلەکە بەلای ئێمەوە ڕەخنەگرتن نییە لە ئەقلانیەت، بەڵکو گەڕانە بەدوای ئەقلانیەتێکی بەرزتردا. ئەو ئەقلانیەتە بەرزترە ئەوەیە کە هەوڵدەدەم لە ڕێگەی هەندێك ڕوونکردنەوەوە بیخەمەڕوو.

کەواتە لەم ڕوانگەیەوە هەندێك لە هۆکانی ئەو سەرسمدانە گەورانەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە مەسەلەی سەرهەڵدانی ئەقلانیەتێکی بەرزتر لای ئێمە بەخۆوەی دیون. سادەترین و گرنگترین هۆ پەیوەندیی بەوەوە هەیە کە دیارترین هەوڵدانەکانی ئەم بوارە، جا ئەوانە بن کە بایەخیانداوە بە ڕیفۆرم لەسەر ئاستی سەربازی، بەڕێوەبەری، دارایی یاخود یاسایی، وەك ئەوەی بزووتنەوە ڕیفۆرمیستیەکانی سەدەی هەژدەهەم یان ئەوانەی لەسەر ئاستی فیکری لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا بایەخیان بە تێزو هەڵوێستە ئەقلانیەکان داوە، لە زەمینەو پێکهاتەگەلێکەوە هەنگاویان هەڵهێناوە کە مێژووی کۆمەڵگە خۆرئاواییەکان بەرهەمیهێناون و ئەو پێکهاتانە گۆڕاون بۆ ڕاستیی زانستی و دەخوازن لە مێژوویەکی تردا بیانچەسپێنن. لەهەمان کاتدا، ئەگەر سەختیی لە نیشتەجێکردن یان نوێکردنەوەی ئەو تێزو وێناکردنە مەزنانەو ڕیفۆرمە ڕێکخراوەییە بەڕپوەبەری، تەکنۆلۆژی و مەعریفیانەدا بەدیبکرێت، ئەو سەرەنجامە بەدەستدێت کە ئەقلانیەت بەگشتی شکستەیخواردوە، لەکاتێکدا مەسەلەکە پەیوەندی نییە بە شکستەخواردنی ئەقلانیەتەوە بەگشتی، بەڵکو پەیوەندی بە شکستەخواردنی هەندێك دەرکەوتەی مێژوویی ئەو ئەقلانیەتەوە هەیە. وێڕای هەموو ئەوانە، بۆ ئەوەی بزووتنەوەیەکی ئەقلانی فراوان لە نیشتیمانەکەمان دەرکەوێت، بۆ ئەوەی ئەو بزووتنەوەیە هاوکات بریتی بێت لە ڕەفتار، مامەڵەو هەڵوێستەکان، گەرەکە مەرجگەلی پێویست لەئارادابن هەتا ئەو ئاڕاستە ئەقلانیە ببێتە پێداویستیەك لەناو کۆمەڵگەداو ببێتە ڕەفتارێکی ئاسایی و سروشتی، ڕەفتارێك کە خەڵکی دەیسەپێنن بەسەر خۆیان و ئەوانی دیکەداو پێکەوە لەگەڵ ئەوانی تر بەشداریدەکەن لە پەرەپێدانی و هاندانی ئەوەی چاکتر بەرجەستەیدەکات و بەرگریکردن و گەمارۆدانی ئەوەی دژی دەوەستێ یان ڕێگەی لێدەگرێت. ئەم جۆرە ژێرخانەی بزووتنەوەی

ئەقڵانی ئەو شتەیە کە لە نیشتیمانی ئێمەدا نییەو هەوڵدەدەم ڕوونیبکەمەوە.

ئەگەر بزووتنەوەی ئەقڵانیی ئەوروپیمان وەرگرتو لایەنێکی بەشداریکردنە تایبەتیەکانی هەندێك کەسایەتی فیکری یان سەرکردەی سیاسیی و ئەوانی ترمان خستە لاوە، دەبینین ئەقڵانیەت تەنیا گرێدراوی ئیجتیهادی تاکەکان نەبوە، بەڵکو بزووتنەوەیەکی فراوان بوەو پەی بە توێژە جۆربەجۆرەکانی هاوولاتی بردوەو کاریگەریی لەسەر لایەنە جیاجیاکانی ژیان هەبوە، ئەوەش لەبەرئەوەی پشتی بە هێزێکی پاڵنەری بنچینەییی و مەرجگەلێك بەستبوو کە دەرفەتی کارکردنیان بۆ ڕەخساندبوو تا هەموو پێکهاتەکانی واقیع ڕاپێچبکات. لێرەدا دەخوازم ئەم دوو خاڵە ڕوونکەمەوە:

**یەکەم:** ئەقڵانیەت پشتی بە مەرجگەلێك دەبەست، ئەویش هەرەسهێنانی دەرفەتەکانی پیرۆزی بوو، یان هەرەسهێنانی دەرکەوتە مێژوویی و کۆمەڵگەیی پیرۆزی کە جۆرێك بوو لەو دواسنوورەی سنووری دەسەپاند بەسەر هەر بزووتنەوەیەك لە واقیع یان فیکرداو ناچاریدەکرد بوارێکی دیاریکراو نەبەزێنێ. بزووتنەوەی ئەقڵانیی ئەوروپا لە بارودۆخێکدا دەرکەوت کە کڵێسا پەککەوتە بوو لەئاست جڵەوکردنی کۆمەڵگەو لەقاڵبدانی هەموو میکانیزمەکانو گشت ئەو چالاکییە نوێیانەی کۆمەڵگە دەیخستنەڕوو. پەککەوتەیی واقیعیی کڵێساش پێش گومانخستنە سەر بەکاریی تیۆریی کڵێسا دەرکەوت، یاخود دەشێ بڵێین ئەگەر پەککەوتەییەکە پێش نەکەوتبێ، ئەوا هەردوو پرۆسەکە هاوتەریبو هاوکات بوون. لەلایەکەوە پەککەوتەییەکی واقیعی هەبوو، بۆ نموونە پەککەوتەبوونی کڵێسا لەئاست بەڕێوەبردنی شارەکانو دابینکردنی جۆرێك لە یەکگرتوویی سیاسی کە توانای بەردەوامی و دەستەبەرکردنی پێداویستییە بنچینەییەکانی دانیشتوانی هەبێت. لەهەمان کاتدا بزووتنەوە پرۆتستانیەکان بە شێوە جیاجیاکانو تێزە جۆربەجۆرەکانیانەوە سەریانهەڵداو گومانیانخستە سەر توانای کڵێسا بۆ بەڕێوەبردنی ژیانو کۆمەڵگە. هاوکات پەککەوتەیی کڵێسا بوە هۆی دەرخستنی بێتوانایی سیستەمی فیودالیزمو ئەریستۆکراتی بۆ بەردەوامبوون لەسەر جڵەوکردنی ژیانو دیاریکردنی چارەنووسو داهاتووی میللەتەکانی لەژێر ئالایدا بوون. کەواتە مەرجی یەکەم بۆ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ئەقڵانی لە ئەوروپا خراپبوونو پاشەکشەکردنی نموونە گەورەکانی بوارەکانی پیرۆزی بوو، فیودالیزمو میرەکان کە دوو بەرجەستەکاری پیرۆزی بوون لە بواری کۆمەڵگەیی و کۆمەڵایەتیدا، ئەو توێژانەی بانگەشەی لێهاتوویی و توانایان بڵاودەکردەوەو ڕایاندەگەیاند خاوەن ڕەوایەتیەکن کە ڕەوایەتی توێژەکانی تر ڕەتدەکات. لەهەمان کاتدا ڕەچاوی دەرکەوتنی هێزگەلی نوێ دەکرێت کە لە بەرژەوەندیاندا بوو تا دواسنوور و دواهێز تەکان بە بزووتنەوەی ئەقڵانی بدەن، چونکە ئەم تەکانە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی خۆیانی دەکرد، هەروەها بۆشایی و هەرەسهێنانو تێکچوونی توێژە باڵادەستەکانی پێشوو فراوانتربکەن، ئەمەش ئەوەیە کە بۆرژوازیەت بەشێوەیەکی تایبەتی دەرکی پێ کرد. کەواتە گرنگترین هۆی دەرکەوتنی ئەقڵانیەت کەمبوونەوەی بواری پیرۆزی بوو لەناو کۆمەڵگەدا.

هۆی دوەم دەرکەوتنی هێزگەلی نوێ بوو کە توانای ڕامالینیان هەبوو و خاوەن پرۆژەیەکی چینایەتی یان ژیواری دوورمەودا بوونو ئەقڵانیەتیان وەك ئامرازێك بەکاردەهێنا بۆ

دارمانـــدنی پاشماوەكـــانی ڕژێمـــی پێشـــوو و لـەناوبردنی خڵتـەی پـیرۆزی كـە لـەناو كۆمەڵگـەدا مـابوو، بـۆ ئـەوەی دەسـەڵاتی خۆیـان لـە شـوێنیان دابنـێن و مێـژوو بـەجۆرێك بنیـاتبنێن كـە مەبەسـتیان بوو نەك مێژوو بەو شێوەیەی تێزە تەقلیدییەكان یان جۆرێـك لـە تێـزە كـەلپوورخوازەكان دەیانخسـتەوە. دەبێ هێما بۆ ئـەوە بكـەم كـە نـە تـوخمی یەكـەم و نـە تـوخمی دوەم هێشـتا وەك پێویسـت و ڕوون خۆیـان نەخســـــتۆتەڕوو و لـــــە نیشـــــتیمانەكەماندا بەرجەستەنەبوون.

سـەبارەت بـە تـوخمی یەكـەم، پێدەچـێت تێـزە كەلەپوورخوازەكان بەگرفتەكانیانەوە زۆرن. بـەبڕوای من ئەو شەپۆلە كەلەپوورخوازە بەهێزەی زاڵە بەسـەر بـوارە جۆربـەجۆرەكانی فیكـرو ڕەفتـاردا، خەریكـە جۆرێـك لـە پێشـینەبوون دەسـەپێنێ بەسـەر هـەموو هەوڵدانـەكانی ئیجتیهـادكردنی تـردا، بـەجۆرێك كـە هـیچ بیركردنـەوە و بەشـداریكردنێك قبوڵكراونییـە ئەگـەر هەڵوێسـتی نـەبێت بەرامبـەر بـە مەسـەلەی كەلـەپوور. ئەگـەر ئەمـە لایـەنی خراپـی زۆریشـی هـەبێت، ئـەوا دیـارترین دوو خـاڵی بنچـینەیی ئـەم دوانـــەن: دەشـــێت لـــە هەلومـــەرجی ئێســـتادا كۆمەڵگـــەكانی نیشـــتیمانەكەمان خـــاوەن هەنـــدێك خەسڵەت بن، گرنگترینـی ئـەو خەسڵەتانە زاڵبـوونی ڕابـردوە بەسـەر ئێسـتادا، چـونكە ڕابـردوو هێشـتا نەبۆتە ڕابردوو و تا ئێستا زیندوو و بەردەوامە. وەك مامۆسـتا جـابری لـە هەنـدێك تێـزدا دەڵێـت، كاتێـك موسـڵمانی هاوچـەرخ یـاخود عـەرەبی هاوچـەرخ مامەڵـە لەگـەڵ گـەلێك بەرهـەمی كەلـەپوورخوازدا دەكـات، هەسـت بـەهیچ جـۆرێكی غـەریبی یـان نـامۆبوون ناكـات، چـونكە ئەوانـە وەك دەربڕێكـی ماقووڵی بەشێكی گرنگی واقیعەكەی و خواستەكانی وان و هـیچ دووركەوتنەوەیـەكی ڕەهـا بەدیناكـەن كـە ئـەنجامی دابڕانـی ڕەهـا و ڕەتكردنێكـی قـووڵ دێنـە ئاراوە. ئەم بەردەوامیەی ڕابردوو و هێماو دەربڕین و پێكهاتـەكانی مانـای ئەوەیـە وەك زەمینـەو پێگـەی هەنگاوهـەڵهێنانێك پـیرۆزن و هێشـتا لـە كۆمەڵگـەی ئێمـــەدا ئامـــادەن، ئەمـــەش بەشـــێوەیەك ئەوانـــە ڕەتدەكەن كە لە كۆمەڵگە ئەوروپی و خۆرئاواییەكاندا ڕوویانـــداوە. بۆیـــە ئەمـــە یەكێكـــە لـــە ئاســـتەنگە بنەماییـەكانی گـۆڕانی ئەقڵانیـەت لـە بیرۆكەیـەكی ڕووتـــەوە بـــۆ بزووتنەوەیـــەكی كۆمەڵایـــەتی و نەشـــونماكردنێكی مێـــژوویی بـــەكردەوە. لێـــرەدا نموونەیـەكی سـەرەتایی دەربـارەی ئـەم بەردەوامیـە دەخەمـــەڕوو: ئیمـــڕۆ یـــەكێك لـــە گـــرنگترین خەســـڵەتەكانی بنـــەمای كۆمەڵایـــەتی لـــە نیشـــتیمانەكەماندا ئەوەیـــە كـــە كۆمـــەڵێك بـــوار بەشـێوەیەكی بـەهێز بەیەكداچـوون، وەك ئـەوەی كۆمەڵگـەكانمان هـەمان شـێوازی نەشـونماكردنی كۆمەڵگـە خۆرئاواییـەكان بگرنەبـەر. بـۆ نموونـە، لـە كۆمەڵگـە خۆرئاواییەكانـدا لەمێـژە جیابوونەوەیـەك ڕوویـداوەو بۆتـە هـۆی دەركـەوتنی چـەندین بـوار كـە هەریەكـەیان، وێڕای هاوكـاریكردن لەگـەڵ بوارەكانی تـر، خـاوەن تایبەتمەندییـەكی ڕێژەییـەو ملكەچـی لـۆژیكێكی ناوەكییـە. لـەو بوارانـەی سـەربەخۆیی ڕێـــژەییان بەدەســـتهێناوە، ئـــابووری، مەعریفـــە، زانسـتەكان، فەلسـەفە، ئـەخلاق، یاسـا و سیاسـەت. واتـە ئـیتر هەریـەكێك لـەم بوارانـە تـەنیا ئـەنجامێكی ڕووتی هەمان دەستپێكی پیرۆزو پایەبەرز نییە كە لە سـەدەكانی ناوەڕاسـتدا هـەبوون و چـیدی لـەژێر دەسـەڵاتی بـاڵای كڵێسـا و دەسـەڵاتی بـەرزی پیـاوە ئایینیەكانـدا نەماونەتـەوەو ناكەونـە ژێـر چاودێریی كەلـەپوورپارێزەكان و نـەریت پارێزەكانـەوە، بـەڵكو زۆربەی ئەو بوارانە هەندێك جار خاوەن سەربەخۆیی نیمچـەڕەها بـوون و هـەر سـەربەخۆ نـەبوون، بـەڵكو

گەلێك جار دەبوونە سەرچاوەی گومانكردن بە دەسەڵاتی هەندێك مەرجەعیەتی مەزنی تەقلیدیو هەندێك لەو بوارانە خۆیان دەبوونە سەرچاوەی دەربڕینی ڕووبەڕووبوونەوە مەزنو نوێكانو گومانكردن بە نەریتو دەسەڵاتی نەریتو ڕووبەڕووبوونەوەیان. واتە چیتر ئەو نەریتەی پێشتر بە بەهای بەهاكان، ئەو ئامڕازە دانەدەنرا كە ماقووڵبوونو ڕەوایەتی ڕاستەوخۆی دەبەخشیە هەر ڕەفتار یان هەڵوێستێك، بەڵكو چەمكی نەریت بوە چەمكێكی سوكایەتی پێكردن. ئەم ڕزگاربوونو سەربەخۆییە ڕێژەییە بووە هۆی تەقینەوەی زانستەكانو بەرپاكردنی شۆڕشێكی مەعریفیو فیكری كە مێژووی هاوچەرخ بەخۆوەی بینین. ئەمە شتێكی بنچینەییەو دەرفەتی زۆری ڕەخساند بۆ ئەقڵانیەت وەك هەڵوێستێكی فیكری، بزووتنەوەیەكی كۆمەڵایەتیو نەشونماكردنێكی مێژوویی لە كۆمەڵگە سەرمایەدارییەكاندا.

مەسەلەكان لە جیهانی ئێمەدا چۆن دەردەبڕرێن؟ نموونەیەك دێنمەوە: ئەگەر گەلێك لە ڕەفتار یان هەڵسوكەوت لە كۆمەڵگەكانی خۆماندا وەربگرین، وەك كوشتن یان خۆكوشتن، دەبینین هاوكات حەرامەو بەواتای یاسایی قەدەغەیە، بەواتای كۆمەڵناسیی وشەكەش عەیبە. بەو جۆرە دەبینین هەمان ڕەفتار هاوكات ملكەچە بۆ چەندین مەرجەعیەتی جۆربەجۆرو پێك ناكۆكو لەلایەن دابینكاریو دەسەڵاتی جۆربەجۆرو ناشێلگیرەوە كۆنترۆڵدەكرێت، هەمان شت هاوكات حەڵاڵە یان حەرام، واتە ڕووبەڕووی دەسەڵاتێكی مەرجەعی ئایینیمان دەكاتەوە كە ئیجتیهادكردن تەنیا لە لقەكاندا قبووڵدەكات، نەك لە بنەچەكاندا، ئەمەش تەنیا لە بواری جێبەجێكاریدا.

واتە هەمان شت ڕووبەڕووی بواری ئایینیو بواری فشارە كۆمەڵایەتیەكانو بواری یاسایی دەكرێتەوە، ڕووبەڕووی ئەوە دەكرێتەوە كە ڕێگەپێدراو یان یاساخكراوەو بە هەموو سەرەنجامەكانیەوە، هەروەها ڕووبەڕووی بوارە غەیبییەكان دەكرێتەوە. خەڵك هەستەكیو نەستەكیانە بڕوایان وایە كە لادان لە دابینكارییەكانو ڕەتكردنیان دەبێتە هۆی خستنەوەی سەرەنجامی ترسناك كە هەموو توێژەكانی جنۆكەو شێوازەكانی بوونەوەرە غەیبیەكان ڕوڵی تیادەبیننو تا ئێستاش خەڵك بڕوای پێیانەو ئەوانە بەشێك لەو توخمانە پێكدێنن كە چوارچێوە بۆ ژیان دادەنێنو ئاڕاستەو جڵەویدەكەن.

كەواتە، وەك دەبینین، هیچ دەركەوتنێكی بواری ئەخلاقی: چاكەو خراپەكاری، وەك بوارێكی سەربەخۆ لەئارادانییە، ئەمە گریمان توانای بنیاتنانی بوارێكی ئەقڵانی هەبێت كە دەخوازێ چاكە بەیەكێك لەو شتانە دابنێ كە لە بەرژەوەندیی باڵای توخمە پێكهێنەرەكانی مرۆڤدایەو كەمترین زیانی هەیە بۆ بەرژەوەندییە باڵاو هاوبەشەكانی نێوان مرۆڤەكان. بەدیناكەین ئەو بوارە ئەخلاقیە كە پشتبەستووە بە بنچینە ئەقڵانیەكان لە ژیانی كۆمەڵایەتی یان ئاستی فیكریدا بەرجەستەبێت. هەروەها دەبینین یاسا وەك یەكێك لە دابینكارییەكان، بەتایبەتی یاسای مرۆڤكرد، بەو شێوازە نوێیەی گرێدراوی بنیاتنانی دەوڵەتو گەشەكردنی مەعریفەكانە، بوارێك پێك ناهێنێ كە لایەنی كەمی سەربەخۆیی فرمانیی ڕەوا دەستەبەربكات. لێرەدا هێنانەوەی نموونەیەك بۆ ئەوە جێی خۆیەتی. هیچ وڵاتێكی عەرەبی نییە شەریعەتی ئیسلامی بەكردەوە تیایدا زاڵبێت بەسەر

گشت مامەڵەکان و بوارەکاندا، بەڵکو شەریعەتی ئیسلامی لە بواری کاروبارەکانی کەسێتیدا سنووردارەو یاساکانی تاوانکاری و بازرگانی، یاساکانی مامەڵەکردن و کۆمپانیاکان، یاساکانی تایبەت بە بازرگانی دەرەکی و یاساکانی دارایی، هەموو ئەوانە نەك دەکەونە دەرەوەی بواری شەریعەتی ئیسلامی، بەڵکو لە هەندێك دەوڵەتدا هەندێك هەڵسوکەوت لەخۆدەگرن کە سەربەخۆو ناکۆکن بە ڕێساکانی شەریعەتی ئیسلامی، وەك سووخواردن، ئەو قازانجەی لەبری قەرزی دیاریکراو دەدرێت، پشتبەستنی دەوڵەت لە داهاتی ساڵانەدا بە سەرچاوەکانی ڕەهنکردن و داهاتی قومارو میرانەی تایبەت بە باڕو شوێنەکانی سەرگەرمکردن....تاد.

کەواتە پێدەچێت ئاستەنگێکی سەرەتایی و بنچینەیی هەبێت، ئەویش: بۆ ئەوەی بزووتنەوەیەکی ئەقڵانیی فراوان لەئارادابێت، پێویستە سنوورەکان فراوانکرێن و ژمارەیەك بوار ئامادەو شیاوبن بۆ جێبەجێکردنی پرنسیپەکانی ئەقڵانیەت. نەشونماکردنی ئەقڵانیەت پێویستی بەوەیە ئەم پڕۆسێسە کە وا لە گروپ و تاکەکان دەکات لە کێبڕکێدابن و بەردەوام هەموو تواناکانی خۆیان تاقیبکەنەوە بۆ بەدەستهێنانی قایمکاریی نوێ یان کۆمەڵێك دابینکاری کە یارمەتیماندەدەن بۆ هێنانەدیی ئاستی بەرزتر لەوانەی پێشوو. سەبارەت بە ئامانج و خواست و بەهاکان، کە گرێدراوی هەر بوارێکن بە تەنیا، ئەگەر دابینکاریی هەتاهەتایی و نەگۆڕی وا لەئارادابن کە کەس نەتوانێت دەستکاریان بکات، چونکە هەتاهەتایین و دەستکاریکردنیان زەندەقەی، ئەوا ناتوانن پرۆسەیەکی فراوانی بەتەوژم پێکبێنن.

بێگومان مێژوو بەردەوام زەندەقە دەخاتەوەو گەشەکردنیش بڵاویدەکاتەوە. ئەوەی تاکو ئێستا بڵاونەبۆتەوە، بڕواهێنانە بەوەی نەشونماکردنی مێژوو بە پێویست کارێکی چەپەڵ نییە. ئێستا ئێمە لە دۆخێکداین کە دەشێت وەك ناکۆکی نێوان دیالەکتیکی واقیع و دیالەکتیکی هۆشیاری باسیبکەین، چونکە دیالەکتیکی واقیع لە زۆر بواردا دینامیکیترو گەشەکردوترو شیاوترە بۆ هەڵبژاردنی هەڵسوکەوتەکان، واتە شیاوترە لەوەی لە ئاستی کەرەستەگەلێکدا هەیە کە هۆشیاری و داوەری و هەڵوێستەکان لەقاڵبدەدەن و زیاتر گرێدراوی پیرۆزییەکان و ڕابردوون و کەلەپوور لە تەنیا میراتێکی مێژووییەوە دەگۆڕن بۆ بەهایەکی هەتاهەتایی و بێکۆتایی دابڕاو لە ڕەهەندە مێژووییەکەی. ئەم یەکەمین ئیشکالیەتە، واتە سەربەخۆنەبوونی زۆرێك لە بوارەکان و ناکۆکیی نێوان هۆشیاری و هەڵسوکەوت، ئێستا گرنگترین کۆسپە لەبەردەمی دەرکەوتنی بزووتنەوەیەکی ئەقڵانی ڕووندا.

توخمی دوەم کە دەمەوێ لێرەدا باسیبکەم پەیوەندیی بە بوونی بزووتنەوەیەکی پاڵپێوەنەرەوە هەیە. ئەقڵانیەت چەکێکە" چەکێکی مەترسیدارە. واتە ئەگەر پاڵ بە ئەقڵانیەتەوە بنرێ بۆ بەرزترین ئاستەکانی، ئەوا بە شێوازی فیکری ڕەخنەگرانە شۆڕشگێڕترین ئامراز پێکدێنێ، چونکە هیچ سنوورێك بۆ ڕەخنەگرتن و ئەقڵانیەت نییەو ناتوانین کۆتاییەك بۆ پڕۆسێسی ئەقڵانیبوون وێنابکەین. ئەقڵانیەت شێوازی پێکەوەگرێدانی جێبەجێکاریی و ئامرازە دەستەبەرکراوەکان و ئامانج یان بەها یاخود نموونە بەرزە دەستنیشانکراوەکانەو وێنای هیچ سیستەمێکی کۆمەڵایەتیش ناکرێت پشت بەجۆرێك لە ئەقڵانیەت نەبەستێ. ئەقڵانیەت، وەك بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی و فیکری و ئاقارو ئاڕاستەیەکی گشتی، لە هەندێك کۆمەڵگەدا هەیەو

لەوانی دیکەدا نییە. ئەوەی ئێستا پێی هەڵساوم هەوڵدانێکە بۆ لێکدانەوەی هەندێك هەلومەرج کە دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی بزووتنەوەی ئەقڵانیەت یان دەبنە ئاستەنگ لەبەردەم بڵاوبوونەوەیدا، چونکە ئەقڵانیەت پێکەوەگرێدانی ئامڕازەکان و ئەو ئامانجانەیە کە خواستەکان لەئامێزدەگرن. ئەم پێکەوەگرێدانە مانای ئەوەیە پێویستە هەستین بە ژماردنی ئەو پێداویستیانەی دەشێ بیانهێنێتە دی. چارەسەری ئەقڵانی ئەو چارەسەرەیە کە دەرفەت بۆ هێنانەدیی زۆرترین ئامانجی هەر جێبەجێکارییەك دەڕەخسێنێ، هەروەها ئەو چارەسەرەیە کە بەشداریدەکات لە هێنانەدیی خواست یان بەها بەرزەکاندا. کەواتە پێکەوەگرێدانەکە لەنێوان ئامڕازو ئامانجەکان لەلایەك و ئامڕازو خواستەکان لەلایەکی دیکەوە ڕوودەدات. ئەم پێکەوەگرێدانە شتێکی ڕووت نییە، بەڵکو لە ڕەوتگەو چوارچێوەیەکی دیاریکراودا ڕوودەدات و لە هەلومەرجێکی سروشتی، دیمۆگرافی، ئابووری، تەکنۆلۆژی، مەعریفی و پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی دیاریکراو و لەناو تەرازووی هێزی دیاریکراودا ڕوودەدات. ئەو هەلومەرجەش بێلایەن نییە، بەڵکو فشار و دابینکاری و سنورگەلمان بەسەردا دەسەپێنێ. بەو پێیە ئەقڵانیەت دەبێتە پڕۆسێسێکی بێکوتایی، چونکە گۆڕانی یەکێك لە توخمەکانی (سیستەمی ئامڕازەکان، سیستەمی ئامانجەکان، سیستەمی خواستەکان و سیستەمی ڕەوتگە) بەسە بۆ ئەوەی ئەو شتەی ئەقڵانی بووبێ کەمتر ئەقڵانی بێت، یان ئەوەی ئەقڵانی بووبێت شیاوی ڕەتکردن بێت. بۆ نموونە، هاتنەئارای گۆڕانکاریی مەعریفی نوێ یان ئامڕازی نوێ بەسە بۆ ئەوەی ئەو شتەی لە ڕەوتگەو هەلومەرجی پێشوودا ئەقڵانی بووبێت شایانی ڕەتکردن بێت. ئەمە بە نۆرە لە هەموو کۆمەڵگەکاندا ڕوودەدات. توخمی دوەم بۆ شیانی سەرکەوتنی ئەقڵانیەت، بوونی هێزێکی پاڵنەرە. ئەم هێزە پاڵنەرە هەمیشە بریتییە لە هێزێکی سیاسیی کۆمەڵایەتی کە بەرژەوەندیی زۆری لە ژێراوژوورکردن و گۆڕینی سیستەمی باڵادەستدا هەیە، لەبەرئەوەی وەك پێویست سوودی لێ وەرناگرێت یان لەو بڕوایەدایە دەتوانێت سیستەمێکی نوێ دامەزرێنێت. ئەم هێزە سیاسی و کۆمەڵایەتیە فشار بەکاردێنێ بۆ ئەقڵانیکردنی بوارە جۆربەجۆرەکان، ئەمەش وەك ئامڕازێك بۆ تێکشکاندنی چالاکییەکانی پێشوو و سەرکردەکانی ڕابردوو و ملکەچکردنی بوارەکانیان بۆ پڕۆژەکەی خۆی. ئەم هێزە فشارهێنەرە دەشێت لە چینێکی سەرکەوتوودا بەدەربکەوێت کە خاوەن بنچینەگەلی بەهێزەو توانای ڕامالینی هەیەو خواستی مەزنی هەیە بۆ پڕۆژەی داهاتوو و ژیواریی وا کە دەبێتە مەرجەعیەتێکی نوێ و بەپێی ئەو جێبەجێکارییەکان دەستنیشاندەکرێن. لێرەدا ئەوەی بەشداریدەکات لە بەرجەستەکردنی ئەم پڕۆژەیەدا ئەقڵانیەو ئەوەی ئاستەنگی بۆ دروستدەکات نائەقڵانییە.

دەشێت لە ڕوانگەیەکی خەلدونیەوە وێنای ئەم هێزە پاڵنەرە بکەین. ئیبن خەلدون پێیوابوو بۆ ڕووخاندنی سیستەمێك و بنیاتنانی یەکێکی نوێ دوو مەرج پێویستن: 1)مەرجی یەکەم بوونی پەیوەندێتی یان هاوپەیمانێتی یاخود هێزێکی کۆمەڵایەتیە دەتوانێ چەند لایەنێك کۆبکاتەوە کە بەرژەوەندیی هاوبەشیان هەیە، 2)شان بەشانی پەیوەندێتی، بانگەواز، واتە بوونی تێڕوانینێکی گشتی یان ئەوەی ئیمڕۆ پێیدەڵێن ئایدیۆلۆژیا، گرنگە بۆ ئەوەی ماقووڵبوون بداتە ئەو هێزەو ڕەوایەتیەکی بداتێ کە بتوانێ هەموو لایەنەکان گۆشبکات و بکارێ ڕەفتارەکانی خۆی پێکبێنێت و

بەرەنگاری دوژمن‌و نەیارەکانی خۆی ببێتەوە. کەواتە هێزی پاڵنەر بەلای منەوە بوونی پەیوەندێتی، واتە هێزێکی کۆمەڵایەتی سیاسییە لەگەڵ بوونی بانگەواز. کاتێك ئەم دوو مەرجە لەئارادادەبن‌و کاتێك دەردەکەوێت بوارگەلی جۆربەجۆر خۆیان لە دەسەلاّتی پیرۆزی‌و دەسەلاّتی نەگۆڕ و هەتاهەتایی قوتارکردوە، ئەقلاّنیبوون بریتی دەبێت لە ئەقلاّنیەت‌و ئەقلاّنیەتیش وەك نەشونماکردنێکی بەردەوام بریتی دەبێت لە بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی کە هاوکات واقیع‌و بەهاشە، واتە ئەقلاّنیبوون لە تەنیا واقیعێکەوە دەگۆڕێت بۆ واقیعێکی پێویست، واقیعێکی ڕەواو ماقووڵ.... لەو بارەدا دەشێت تا دواپلە پاڵی پێوە بنرێت. ئەم جیاکارەییە بۆ ئەوەی بەئاسانی بخەملێنرێ، دەشێت وەك جیاوازیی نێوان ئەقلاّنیبوون‌و ئەقلاّنیەت قسەی لەسەر بکرێ، بەلاّم دەشێت جیاوازی بکەین لە نێوان ئەقلاّنیەتی ڕژێمئاسا و ئەقلاّنیەتی ڕەوتگەردا. واتە کاتێك هەلومەرجەکان سەبارەت بە پێگەی پیرۆز لەناو کۆمەڵگەدا لەئارادادەبن‌و هێزێکی پاڵنەر لەگۆڕێدەبێت کە توانای ڕامالّین‌و فراوانکردنی گۆشکردن‌و هاوپەیمانیەکان‌و ئامڕازەکانی فشارهێنانی دەبێت‌و هاوکات خاوەن هێزێکی ئایدیۆلۆژی دەبێت کە توانای ئەوەی هەیە وەك ڕایەڵەیەکی بەهێز گشت توخمە جۆربەجۆرە هاوپەیمانەکان کۆبکاتەوەو ئەو بوارانە پێکەوە گرێبدات کە دەشێت شەڕەکان تیایانداو لەپێناو ئەقلاّنیەتدا هاوتەریب ڕووبدەن، ئەوا ئێمە لەبەردەم سەرهەڵدانی ئەقلاّنیەتێکی ڕەوتگەردا دەبین، واتە تەنیا مەبەستی ڕژێمی بالاّدەستی ناو ڕەوتگەکە نییە، بەڵکو سەرتاپای ڕەوتگەی کۆمەڵایەتیەو مەسەلەی مافی ئەو ڕەوتگە کۆمەڵایەتیە گشتییە بۆ بوون یان نەبوون دەردەبڕی.

## سەرچاوە


مجلة "الوحدة"، المجلس القومي للثقافة العربية، رباط/ المملكة المغربية،
العدد 51 ديسمبر1988، ص (32–39)

# جیهانێکی له رۆژئاوایی داماڵراو

ئالان فینکل کروت

له عەرەبییەوە: ڕێبین هەردی

له ساڵی 1945دا له لەندەن، بەڵکەی دامەزراندنی ڕێکخراوێك بۆ زانست و کلتوور سەر بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێکخراو و دامەزرا. لەکۆنفرانسە سەرەتایەکانیدا کە لەلایەن دەوڵەتانی فەرەنسا و بەریتانیا بۆ ئەم مەبەستە بەڕێخرا، نوێنەری چل دەوڵەت بەشدار بوون کە بەگشتی هەموویان هەمان سەرقاڵی فکریان هەبوو. مەسەلەکە بەپێی دەربڕینە جوانەکەی تۆریس بۆدەی نوێنەری ئەوکاتەی مەکسیك، بریتی بوو له "تاوتوێکردنی سەردەمێکی مێژووی مرۆڤ. جیاواز لەو، سەردەمەی کە کۆتایی پێهاتبوو". جۆرە سیستمێکی جیهانی کە تیاییدا هیچ دەوڵەتێك نەتوانێت دیوارێك بەدەوری خەڵکی خۆدا بکێشێ و "بەشێوەیەکی سیستیماتێك و بەیارمەتی چەند تیورەیەکی سوك و وەستاو، ڕێنماییان بکات بۆبیروڕایەکی دیاریکراو". سەردەمێك کە تیایدا "ڕۆحی واقعی ئاشتی". فەرمانڕەوا بێت. چونکە لەم سەردەمەدا تیورەکان ئازادانە لە نەتەوەیەکەوە بۆ نەتەوەیەکی دی دەگوێزرێتەوە و تاکەکان لەبری ئەوەی له ڕێگەی بزواندن و کارکردن لەسەر بناغەی کۆمەڵێ شێوازی تۆتالیتاریانە، بۆ ئاراستەیەکی دیاریکراو پاڵ پێوە بنرێن، فێردەبن کە عەقڵی خۆیان بەکاربهێنن.

لەراستیدا ئەزموونی بێ وێنەی نازیزم ئیلهام بەخشی دامەزرێنەرانی یۆنسکۆ بوو. ئەو ڕژێمە لەسەر بناغەی ستەمکاری، واتە سڕینەوەی ئازادیەکان و بە پاڵپشتی جەهل، واتە بە پاڵپشتی سودوەرگرتن لە بڕوا باوەکان و نەزانینەکان، دنیای بۆ جەنگ راکێشا و ئەم ڕێکخراوە جیهانیە تازەیە لە ئەستۆی بوو کە چاودێری ئازادی بیروباوەڕەکان بکات و هەوڵبدات ئەو بیرورا پوچ و سوکانە کە دامێنی رق و کینە دەگوێزنەوە بۆ سیستەمی فکری، یان دەبن بە تولەرێیەکی زانستی بۆ ئیرادە و ویستی دەسەڵات، لەناو ببات. لێرەوە دەبێ دەوری ئەم ڕێکخراوە پارێزگاریکردنی ئەندیشە بێت لە بەرامبەر خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتدا و ڕێنماکەری مرۆڤەکان بێت بە مەبەستی ڕێگەگرتن لە هەڵخەڵەتاندنی تر تا چیدی نەتوانن فکریان گومڕابکات.

ئەو بەرپرسیارانەی حکومەت و بیریارە مەزنانەی کە لە لەندەندا کۆبووبونەوە، بە دروستکردنی پەیوەندی لەنێوان پێشکەوتنی ئەخلاقی مرۆڤ لەگەڵ پێشکەوتنی فکریدا و بە هەڵوێستوەرگرتن لە هەردوو بواری سیاسی "بەرگری لەئازادیەکان" و رۆشنبیریی (سەقافە) "فێرکردنی تاکەکان"، خۆبەخۆ لەگەڵ سەردەمی رۆشنگەریدا پەیمانیان تازە دەکردەوە. ئەو سەردەمە تایبەتیەی کە ئەوان هیوادارببوون هاوکاری پەیدابوونی بکەن، لەرووی فەلسەفیەوە رەگی لە سەدەی هەژدەهەمدا هەبوو، ئەوانیش یۆنسکۆیان لەژێر پشتگیری و رێنمای شاراوەی دیدرۆ و کوندێریسە و ڤۆڵتێردا، وێنا دەکرد. لەراستیدا ئەم نوسەرانە فێریانکردووین کە ئەگەرچی ئازادی مافی هەموو کەسێکە، بەلام تەنها دەکرێ مرۆڤێکی رۆشنبین و و هوشیار بەئازاد ناوبنرێ. ئەوان لە بەرامبەر دەسەلاتی سیاسیدا، دوو خواستی لێکجیانەبوەیان دەهێنایە پێشێ: رێزگرتن لە سەربەخۆی تاکەکان و بەخشینی توانای سەربەخۆی راستەقینە پێیان لەرێگەی پەروەردەوە. بۆنمونە کۆندێریسە بەمشێوەیە دەینوسی "تەنانەت کاتێك ئازادی بە روکەش جێگەی رێزە و لە کتێبی یاساشدا نوسرابێت، ئایا پێشکەوتنی گشتی پێویستی بەوە نیە کە نەتەوە توانای ناسینی کەسانێکی هەبێت کە شایستەی پاراستنی ئازادین. ئایا مرۆڤێك کە لەبارەی ئەو شتانەوەی کە پەیوەندی بە ژیانی گشتیەوە هەیە، بەهۆی کەمی زانینەوە ناچار بەسترا بێت بە مرۆڤێکی دیەوە، دەکرێ بە راستی بەئازاد دابنرێ؟".

لە بەیانی سەرکەوتن بەسەر هیتلەردا وادەردەکەوت کە پشتگیری فەیلەسوفان لە بەڵگەی دامەزراندنی یۆنسکۆ، لەسەرەوە دەرکەوتووە و دەستەواژەکان بە رێکخەرانی رێکخراوەکە، دەنوسێتەوە. ئەم دەستەواژانە ئامانجی رێکخراوەکەیان بەمشێوەیە دەردەبڕی: "زامنکردنی دەستگەیشتن تەواو و یەکسان بە پەروەردە و فێرکردن، بەدواداچوونی ئازادانەی راستیە بەرجەستەکان، و ئالوگۆڕی ئازادی بیرەکان و هوشیاریەکان". واشچاوەڕوان دەکرا کە ئەم هاوکاریە رۆشنبیرییە ئامرازێکی سەقامگیر و سەرکەوتوانە لەبەرامبەر هەر هێرشێکدا بۆ حورمەتی مرۆڤ، دەستەبەر بکات.

بەلام کام مرۆڤ؟ ئەو وتەزا موجەرەدە هەمەکیەی راگەیاندنی مافی مرۆڤ و هاولاتی؟ ئەو واقعیەتە نادیارە، ئەو هەبوونە بێ بوونە، ئەو مەخلوقە بێ گوشت و بێ رەنگ و بێ خەسڵەتەی کە هەمەکی گۆیەکانی هیومانیستانە، لێوان لێوە لێی؟ ئەو تاکە، جگە لە هەموو خەسڵەتەکانی؟ هەر لەهەمان دانیشتنە سەرەتایەکانی یۆنسکۆدا، بەرنامەی کارەکەی بەئاشکرا دەگۆڕێت. رەخنە لە رۆشنگەری جێگەی رەخنە لە دەمارگیری دەگرێتەوە. خستنە ژێر پرسیاری مرۆڤخوازی موجەرەد، ئەو رامانە درێژە پێدەدات و توندی دەکات کە لەبواری زەمینەی ئامێرەکانی پاراستنی جیهان لە بەرامبەر ئەو تیورانەدا کە ئارەزووی نەفی یەکێتی رەگەزی مرۆڤ دەکەن، لە لەندەندا هاتبوە پێشێ. دوا بەدوای مافناسان و ئەدیبان، ئەنترۆپۆلۆگەکانیش هەم جەختیان دەکرد و هەم داوایان دەکرد کە قوتابخانەی هیومانیزم، هەولێکی زۆرتر بدات بۆئەوەی بەراستی مرۆڤانەتر بێت. بەو مانایەی کە حورمەت بۆ هەموو شێوازە بەرجەستەکانی بوونیان، دابنێ.

لەم روەوە ئەو دەقەی کە کلۆد لیڤی شتراوس لەساڵی 1951دا بە داواکاری یۆنسکۆ لەژێر ناونیشانی "رەگەز و مێژوو"دا نوسی، نمونەیە. لیڤی شتراوس لە سەرەتاوە هاودەنگ لەگەڵ ئەو ئاراستانەدا کە خەریك بوو دەبووە نەریت و رێبازێك،

چەمکی رەگەزی بە نەبوونی هیچ بەهایەکی زانستی کاریگەر دەناسێ. ئەو دەنوسێت کە ئەو جیاوازیانەی لە نێوان گروپە جیاوازەکاندا هەیە، "دەگەڕێتەوە بۆ فەزای جوگرافی و مێژووی و کۆمەڵایەتی، نەك بۆ توانایەکی تایبەت کە سەرچاوەی لە بایلۆجیایی رەشەکان، زەردەکان یان سپیەکاندا هەیە". بەڵام لیڤی شتراوس یەکسەر دوای ئەمە دەڵێت کە هەر ئەوەندە بەس نیە میراتی کۆمەڵایەتی لە شتە بۆماوەیەکان جیابکەینەوە، شێوازەکانی ژیان لە کاریگەری بێ چەند و چوونی وەراسەت ، دوربخەینەوە و جەنگ لەگەڵ بە زیندووی زانینی جیاوازی مرۆڤەکاندا بکەین، بەڵکو سەرەڕای ئەمە دەبێ بتوانین جەنگ دژی پۆلبەندی مرۆڤەکان بکەین. شێوە جیاوازەکانی کە مرۆڤ لە پانتایی شوێن و زەماندا بەخۆیەوە دەگرێت، ناتوانێت لەسەر بناغەی سیستەمێکی پەرەسەندووی روو لە پێشکەوتن، پۆلێن بکرێ: ئەم شێوازە جیاوازانەی ژیان، هەنگاوی یەك لەدوای یەکی رێپێوانێکی سەرکەوتوانە" یان قۆناغەکانی رەوتێکی پەرەسەندووی هاوئاهەنگ نین کە لە خاڵێکی دیاریکراوەوە دەستیپێکردووە و دەبێت مرۆڤەکان بە ئامانجێکی دیاریکراو بگەێنێت". مەیل بۆ ریزکردنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەپێی پایە و پلە لەسەر پەیژەیەك لە بەهاکان کە خۆمان لە بەرزترین پلەیدا راوەستاوین، لە رووی زانستیەوە هەر ئەوەندە هەڵەیە و لەرووی ئەخلاقیشەوە بەهەمان ئەندازە زیانبەخشە کە دابەشکردنی مرۆڤ بەسەر رەگەز و بایەلۆجیای جیاوازدا.

بە بڕوای لیڤی شتراوس، بیریارانی رۆشنگەر کەوتنە داوی ئەم وەسوەسەیەوە. ئەوان سەرخۆش لە گەشەکردنی زانینەکان، پێشکەوتنی تەکنیکی و بەرزبونەوەی ئەخلاقی کە ئەوروپای سەدەی هەژدەهەم بەخۆیەوە بینی، چەمکی شارستانێتیان داهێنا کە پێناسەکەری ئەو هەلومەرجە بوو. ئەمە بەو مانایە بوو کە ئەوان لە چارەنوسی ئەو رۆژگارەی خۆیان، نمونەیەك ، لە داب و نەریتی تایبەتی خۆیان توانای گشتگیربوون، لە بەهاکانی خۆیان، پێوەرێکی رەهای هەڵسەنگاندن و لە ئەوروپاییبوون ئاغا و خاوەنی سروشت و باشترین بونەوەریان، دروستکرد. ئەم خۆ بەزلزانینەی پێشکەوتنی بەردەوام و عەقڵێك کە بەردەوام پەرەدەستێنێ و رۆژئاواش بەشێوەیەك لە لوتکەیدا راوەستاوە، لەسەدەی دوایدا پاڵپشتی زانستی ئەنترۆپۆلۆگی، تازە دروستبووشی، بەدەستهێنا. بۆنمونە مۆرگان لە کتێبی کۆمەڵگای کۆندا نوسی "هەنوکە پشت ئەستور بە بەڵگەی گومانهەڵنەگر دەکرێ دڵنیا بین کە لەهەموو خێڵەکانی مرۆڤایەتیدا، قۆناغی وەحشیگەری لەپێش قۆناغی بەربەریەتەوە بووە و قۆناغی بەربەریەتیش لەپێش قۆناغی شارستانیەتەوە بووە. وەك دەزانین مێژووی مرۆڤایەتی چ لەرووی سەرچاوە و چ لە رووی ئەزمونەوە و چ لە رووی پێشکەوتنەوە، یەکێکە".

ئەوروپیەکان بەدڵنیابوون لەم مەسەلەیە گومانی تیا نیە کە لە کۆتای سەدەی نۆزدەدا کۆلۆنیالیکردنیان بەئەنجام گەیاند. ئەوروپای عاقڵ و تەکنیك سالار بەرجەستەی پێشکەوتن و پەرەسەندنە لەبەرامبەر بە کۆمەڵگاکانی تردا. لێرەوە داگیرکردنی کۆمەڵگاکانی تر لەلایەن ئەوەوە، وەك خێراترین و مەزنانەترین ئامرازێکە کە دواکەوتوەکان بۆ بواری شارستانێتی رادەکێشێ. نەتەوە پێشکەوتوەکان پەیامێکیان بۆ خۆیان دانا کە ئەویش خێراکردنی جوڵەی نائەوروپیەکان بوو بەرەو پەروەردە و خۆشگوزەرانی. دەبێ لەپێناوی خێر و بەرژەوەندی هەمان ئەو خەڵکە رەشوروتەدا، جیاوازیەکانی ئەوان واتە دواکەوتوەکان لەناو هەمەکی جیهانی رۆژئاوادا، بتوێنرێتەوە.

بەڵام ئەنترۆپۆلۆگەكان كاتێك ئاڵۆزی نەریتەكان و ریّ و رەسمی ژیانی كۆمەڵگا ناونراوەكان بە سەرەتاییان دۆزیەوە (بەشێكی بە یارمەتی ئەو هەلانەی كە گەشەكردنی كۆلۆنیالی رەخساندبووی) وەك لیڤی شتراوس جەختی لەسەر دەكات، ئیدی وازیان لەو روانگەیە هێنا. ئەوان پاش ئەوەی غروری ئەوروپایان وروژاند، هەنوكە بە ئەركی خۆیان دەزانی كە ویژدانی نائارامیان بەخەبەر بهێننەوە. وەحشی، بەربەر، سەرەتایی، هەموو ئەمانە نیشانەیەكی كینەئامێز بوون كە چیدی ئەنترۆپۆلۆگەكان هیچ بایەخێكی فكری بۆ دانانێن و ئەوەشی بە كەوتنی ئەم دەمامكانە بەهای نامێنیّ، هەمان تیورەی پەرەسەندنی مرۆڤە بەدرێژایی زەمان و جیاوازی نێوان نەتەوە دواكەوتوەكان و نەتەوە پێشكەوتوەكان. بەمشێوەیە هەرچی زیاتر رۆژئاوا، سەركەوتوی جیهانی خۆی سەقامگیرتر دەكات، گومانی ئەنترۆپۆلۆگانە لەبارەی رەوای ئەم سەركەوتویەوە، قوڵتر دەبێتەوە. كاتێكیش یۆنسكۆ دەیەوێت تاوتوێی وەرزێكی نویّ لە مێژووی مرۆڤایەتی بكات، لیڤی شتراوس بەناوی لقی پسپۆری خۆیەوە، بەبیرمان دەهێنێتەوە كە خەسڵەتی ئەو سەردەمەی دەبیّ لێی بچینە دەریّ، بریتیە لە: كۆلۆنیالیكردن، جەنگ، بڵندی رۆژئاوا كە نكوڵی لە شێوە مومكینەكانی تری مرۆڤایەتی دەكات و هەروەها بڕوای نازیەكان بە بوونی زنجیرە پلەیەكی سروشتی لەنێوان بونەوەرەكاندا، بە مەزن دانای پێشكەوتنەكان و دواجار وڕێنەی بایەلۆجی. ، پاشان بە سروشتی زانینی شێوازە جیاوازەكانی بوون یان تواندنەوەیان لەناو رەوتی هەمەكی گەشەكردنی هوشیاریەكان، ئازادیەكان و هونەرەكاندا، هەریەك شتە. لە هەردوو حاڵەتەكەدا بەپێی تێڕوانینی لیڤی شتراوس، دیسان پێی سەنەتەریزمی نەتەوەیی لەنێواندایە. ئەو دەڵێت: «ئەوەی وەك من نیە، چ رەگەزێكی سوكتر بێت چ شێوەیەكی رابردوو لە گۆڕانی كۆمەڵایەتی بێت، بە باشی من نیە". كەوابوو بۆرزگاربوون لە خۆپەسەندی مرۆڤی سپی پێست، گرنگ ئەوەیە رەخنە لە رەگەزپەرستی بە گومانكردن لە شارستانێتی، كامڵبكەین. مرۆڤەكان نە لەیەك دەچن و نە دابەشبوون بەسەر كۆمەڵێك گروپی لێك جیادا كە خاوەن خەسڵەتی بۆماوەیی هاوبەشن. بێگومان جیاوازی هەیە بەڵام پەیوەندی بە رەگەزەوە نیە. بێگومان شارستانێتی هەیە، بەڵام یەك شێوە نیە. لێرەوە ئەنترۆپۆلۆگیا باسی رۆشنبیریەكان بە رەگەزی كۆدەكات، بەمانای "شێوازە تایبەتیەكانی ژیان كە قابیلی گواستنەوە نیە، زۆرتر قابیلی تێگەیشتنە لە قاڵبی دەستكەوتە بەرجەستە، تەكنیكیەكان، ئەخلاقیات، فێركاریەكان و بیروڕاكاندا. تا لە قاڵبی توانا بەزەبریەكان و گونجاو لەگەڵ بەها دیار و بەرجەستەكاندا، نەك لەگەڵ ئەو هەقیقەتانەدا یان ئەوەی بەهەقیقەت دادەنرێت".

لیڤی شتراوس هوشیاركردنی مرۆڤایەتی بە مەبەستی رێگەگرتن لە گەڕانەوە بۆ بەربەریەت، واتە خواستی رەسمی دامەزرێنەرانی یۆنسكۆ قبوڵدەكات، بەڵام ئەم خواستە دژی ئەو فەلسەفەیەی كە ئەوان پەیڕەویان دەكرد، هەڵدەگێڕێتەوە. لە دادگایكردنی بەربەریەتدا، لێرە بەدواوە رۆشنگەران لەخانەی تاوانباراندا دادەنرێن، نەك لەو جێگا گونجاوەدا كە لیۆن بلوّم و كلیمنت ئاتلی – سەرەك وەزیرانی فەرانسا و بەریتانیای پاش جەنگی جیهانی دوهەم كە دەستیان لە دامەزراندنی رێكخراوی نەتەوە یەكگرتوەكاندا هەبوو– بۆیان دانابوون، واتە جێگای لێكۆڵەرەوەی یاسایی. ئامانج یەكێكە لەناوبردنی بیروڕا گشتیە كلاسیكیەكان، بەڵام بۆ گەیشتن بەمە نابێت كەسانی دی بهێنرێنەوە سەر عەقڵ، بەڵكو دەبێت خود رێگەیەك بۆ عەقڵی ئەوانی دی بدۆزێتەوە. نەزانین كاتێك شكست دەهێنیّ كە نەمانەوێت رۆشنبیری خۆمان بەسەر

هەموو مرۆڤەکاندا گشتگیر بکەین، بەڵکو لە پرسەی هەمەکی گەردونیانەی خۆماندا دابنیشین یان بە دەربڕینێکی تر مرۆڤە ناسراو بە شارستانیەکان لە بورجی عاجی خەیاڵی خۆیان بێنە دەرێ و بەخاکیبونێکی رۆشنبینانەوە قبوڵیبکەن کە ئەوانش جۆرێك مرۆڤن لە ریزی مرۆڤە سەرەتایەکاندا.. چونکە جاهلیەت، کە بەردەوام بە دوژمن دادەنرێت، لە "رەتکردنەوەی کوێرانەی هەموو ئەو شتانەدایە کە موڵکی ئێمە نیە"، نەك لە بەرگریەکدا کە لەبەرامبەر رەواجی بەهاکانی ئێمە و شێوازە تایبەتیەکانی هەڵسەنگاندن و داوەریکردنی ئێمەدا، لەجیهاندا پیشان دەدرێ. خراپی بەپێی روانگەی کۆندێریسە دەرئەنجامی دابەشکردنی مرۆڤە بەسەر دووچیندا: ئەوانەی کە بڕوایان هەیە و ئەوانەی کە ئیستیدلال دەکەن. فکری وەحشی یان فکری دانا، لۆگۆس یان عەقلی بەربەر، تێکەڵکردن یان قیاسکردنی لۆژیکی. لیڤی شتراوس لە وەڵامی ئەمانەدا دەڵێت کە هەموو مرۆڤەکان ئیستدلال دەکەن، بەڵام ساویلکانەترین و درێوترینیان ئەوانەن کە خۆیان بە تاکە خاوەنی عەقلانیەت دەزانن.

بەربەر شێوەی نیگەتیڤی شارستانێتی نیە "بەڵکو مرۆڤێکە کە بڕوای بە بەربەریەت هەبێت". ئەمەش تاوانی ئەندێشە رۆشنگەرەکانە کە ئەم باوەڕەی لەناو دڵی رۆژئاوادا چاندووە و پەیامی پڕ ئیدیعای بڵندانەی بیر و پێشکەوتنی رۆشنگەرانە، کۆی نەتەوەکانی سەر زەوی خستۆتە ئەستۆی نوێنەرانی خۆی.

## دوهەمین مەرگی مرۆڤ

لیڤی شتراوس لاسایکەرەوەی زۆر پەیدا دەکات. کۆی زانستە مرۆڤایەتیەکان، وەك مرۆڤناسی بونیادگەرانە، هەر یەك لەبواری خۆیاندا، ململانێ لەگەڵ سەنتەریزمی نەتەوەییدا دەکەن.

مێژوو لە هەموو کەسێك زوتر دەست بەم کارە دەکات و مێژووزانان بۆئەوەی زەمەنی ئێستا لە ئیمپریالیزمی رۆشنبیری دابماڵن، چیدی ریسی زەمەن ناکەنەوە بەڵکو دەیکەنەوە بە خوری و فێرمان دەکەن کە بۆ پرۆژە یان وێنەی خۆمان لە ئەژدادماندا نەگەڕێن. ئەوان بە پێچەوانەی پەیامی کلاسیکی خۆیانەوە کە بەخشینەوەی یادی رابردوەکانی ئێمەیە بە ئێمە، هەنوکە ئەو رابردووە لە ئێمە دەگرن، هێڵی جیابونەوەی ئێمە و رابردوەکان بەرجەستە دەکەن و پیشانی دەدەن کە لە بنەڕەتدا رابردووەکان لە رەگەزێکی دی بوون و بەمشێوەیە نکوڵی لە ئیدیعای یەکپارچەیی و بەردەوامی مرۆڤایەتی دەکەن. بە دەربڕینی میشل فۆکۆ ئەوان هەوڵدەدەن "هەموو ئەو شتانەی هۆی دڵخۆشبوونە لە ناسینەوەکان، پارچەپارچە بکەن". وە وشەی تەواو لەو رستەیەدا، واتە بەردەوامیبوون و هەروەها گۆڕانی رۆحی، سەقامگیریی سروشتی مرۆڤایەتی و هەروەها پرۆژەی هەمەکی هێڵێکی پەرەسەندن یان گەشەکردنی بەردەوام. بەمشێوەیەیە کە زانینی مێژووی مەسەلەی بە روکەش سەقامگیری وەك جنسیەت، هەستیاری، ژیانی خێزانی، شێوەکانی بوون، خواردن و مردن..هەر هەمویان دەخاتە ناو بواری خۆیەوە و لە دۆزینەوەی لێکنەچونە گومانهەڵنەگرەکان، لە هەموویاندا سەردەکەوێت. رەفتارە لێکنەچووەکان لەو جێگایانەدا کە پێدەچوو سەروکارمان لەگەڵ شتە نەگۆڕەکاندا هەیە، دەردەکەون. لەبری رەوتی روو لەسەرکردن کە بۆمێژوو دەماننناسی، فانوسێکی خەیاڵی لە جیاوازی لەپێش چاومان دادەنرێت. ئەو راستیانەی کە بە سروشتیمان دەزانی، هەموو لە شتە مێژووییەکان پێکهاتوون. بەڵام سەبارەت بە مێژوو روانگەی پیشکەوتن لەدەستدەدات. بەکورتی مێژووزانان لەبری ئەوەی بەسەرهاتەکانی مرۆڤ بەشێوەکی تاکانە بگێڕنەوە یان لەسەر هێڵێکی

گۆڕانی تاکانه دایبنێن و پۆلێنی بکەن، لە پانتای پەرشوبلاویدا بلاوی دەکەنەوە و بە پشتبەستن بە نابەردەوامی، بە وازهێنان لە دانانی رابردوو و حالْ و ئایندە لەیەك ئاراستەدا، بەم بیٚ ئاراستەکردنەی مێژوو بەشێوەیەکی بونیادی، بۆ هەمان ئەو مەبەستەی کە ئەنترۆپۆلۆگەکان لە شوێندا بۆی دەگەڕێن، ئەوان لە زەمەندا بەدوایدا دەگەڕێن و ئەو مەبەستەش بریتیە لە "لەناوبردنی ئەندێشەی خود سەنتەریزم سادەدلانەی کە بەهۆیەوە" مرۆڤەکان هەموویان لەیەکێك لە شێوە مێژووی یان جوگرافیەکانی بوونی خۆیاندا پەنایانگرتووە" (لیڤی شتراوس). لەکاتێکدا هەندێك کەس قایل نین هیچ جۆرە زنجیرە پلەیەك لەنێوان شێوە جیاوازەکانی هەنوکەی ژیانی کۆییدا، دابنێن، هەندێکی دی هەن بە توندی بەردەوامی زەمەنی مرۆڤایەتی بە هەڵخەڵەتێنەر دەزانن و هێرشی دەکەنە سەر.

بەمشێوەیە روبەروبونەوە لەگەلْ سەردەمانی رابردوودا هەمان ئەو دەورە وێرانکەرە درێژە پێدەدات کە لێکۆڵینەوەکانی پەیوەندیدار بە خێڵە دوردەستەکانی ئامازوونەوە دەیانبینی. بابەتەکە بەتەواوی روونە: ئێمە کە ئەوانی دین، ئێمەی ئەوروپی نیوەی سەدەی بیستەم، شارستانی نین، بەڵکو خەڵکێکین بە رۆشنبیرییێکی تایبەتەوە لەنێوان جۆرەکانی تری رۆشنبیریدا، جۆرێك لە مرۆڤی ناپایدار و قابیلی لەناوچوون.

کۆمەڵناسیش راستەوخۆ دانی پیا دەنێت کە ئەم رۆشنبیریە (ئەوروپاییە) خۆی تیکەڵێکە لە رۆشنبیریی جیاواز جیاواز. بەدەسەلاترین و نەترسترین کۆمەڵناسانی دەیەکانی شەست، لەژێر کاریگەری خەباتەکانی دژە کۆلۆنیالیزمدا، تیڕوانینی مارکسانە لەگەلْ تیڕوانینی ئەنترۆپۆلۆگانەدا، ئاوێتە دەکەن. ئەوان ئەوە دەدۆزنەوە کە کۆمەڵگا بەسەر چینەکاندا دابەش بووە و چینەکانیش هەریەکەیان جیهانی تایبەتی خۆیان هەیە. هاودەنگ لەگەلْ مارکسدا دەڵێن کە ئەم چینانە دژی یەك دەجەنگن و بە ئیلهام وەرگرتن لە لیڤی شتراوس دەڵێن کە جیهانی چینەکان، خاوەن بەهایەکی یەکسانن. "هەڵبژاردنی چەمکگەلێك کە بەشێوەیەکی بەرجەستە پێناسی رۆشنبیریی گروپێك یان چینێك، وەك سیستەمێکی رەمزی بێت، هەڵبژاردنێکە، چونکە بونیاد و بەکارهێنانی ئەو رۆشنبیریە کە هیچ پەیوەندیەکی بە "سروشتی شتەکان" یان بە "سروشتی مرۆییەوە" نیە، ناتوانیٚ دەرئەنجامی هیچ بنەمایەکی هەمەکی، فیزیایی، بایەلۆجی یان مەعنەوی بێت.

راستیەکەی ئەوەیە کە لەناو هەموو ئەم رۆشنبیریانەدا تەنها یەکێکیان بە رەوا ناسراوە، بەلام کۆمەڵناسان دەڵێن: »سەرنج بدەن! لە بەدیهیاتە زۆر ئاشناکان خۆتان بپارێزن! یەکەمێتی رۆشنبیریی رەوا، بەهۆی هەلومەرجی بالاتری چینێکە کە ئەم رۆشنبیریە موڵکی ئەوە و دەرخەری خەسلەتەکانێتی، نەك بەهۆی بالاتربوونی زاتی دەستکەوت یان بەهاکانی.چینە ژێر دەسەلاتەکان تەحەمولی سوکایەتی پێکردنێك دەکەن کە لەرووی بنەما و دەرئەنجامەوە، هاوشێوەی ئەو سوکایەتی پێکردنەیە کە ولاتە ئیسیعماریە گەورەکانی ئەوروپا، دەرهەق بە نەتەوە کۆلۆنیالیکراوەکان، ئەنجامی دەدەن: نەریتەکانیان لەرەگەوە هەڵکەنراوە، زەوقیان بۆتە جێگەی گاڵتەپیکردن، کۆی زانینەکانیان کە ناوەرۆك و سەقامگیری ئەزموونی خەڵکیك دروستدەکات . زانینی ئەو مەسەلەیەی کە با دەسوڕیٚ، زەوی پڕە لە ئاماژەی نهێنی ئامێز، هوشیاری بەرامبەر بەو کەرەسانەی قابیل یان ناقابیلی دەستکاری کردنن، ئەوەی کە لەدایکبوونی پشیلە، ئاماژەی زوو گەیشتنی وەرزی سەرمایە"ـ هەموو ئەمانە بەشێوەیەکی بیٚ بەزەییانە لە بواری

ڕۆشنبیریی ڕەوا دەکرێنە دەرێ . دەڵێن مەسەلەکە بریتییە لە زامنکردنی ئاڵوگۆڕی جیهانی هوشیاریەکان و گواستنەوەی ڕۆشنگەریە بۆ ئەوانەی مەحرومن لێی. پرۆژەیەکی جوانە، بەڵام لەروانگەی کۆمەڵناسانەوە ئەم پرۆژەیە دوو قۆناغی نەدرەوشاوەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە: یەکەم: لە ڕەگەوە دەرهێنان، بەمانای جیاکردنەوەی مرۆڤەکان لەو تۆڕی عادات و حاڵەتانەی کە شوناسی کۆییان پێکدەهێنێ. دوەهەم: پەروەردەکردن بەمانای تەلقینکردنی بەها باڵادەستەکان کە لەرووی پایە و پلەوە تا ئاستی چەمکە غاییەکان، بەرزکراونەتەوە. پەرەوەردەکردن و فێرکردنی عەوام وەك ئەوە وایە کە پڕیان بکەین لە کا، بوونی ڕەسەنیان لێبسێنین و لەبری ئەوە شوناسێکی دروستکراویان پێ ببەخشین، ڕێك وەك خێڵە ئەفریقیەکان کە بەهۆی کۆلۆنیالی کردنەوە بوونە خاوەن باوباپیرانی وەك قەومی گوێل (*gauIoIs*). ئەو شوێنەشی کە ئەم "توندوتیژیە ڕەمزیەی" تیا بەکاردەهێنرێ، هەمان ئەو جێگەیەیە کە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەر مەزنترین دەزگای ئازادی مرۆڤیان تیا بونیادنا: **قوتابخانە.**

نمونەیەك بهێنینەوە: لەو ژمارە زۆرەی قسە کە لە وڵاتی ئێمەدا دەکرێت، تەنها کەمێکیان گوتارێکن کە سەرنج ڕادەکێشن و دەبنە بابەتێك بۆ فێرکردن و پەروەردە. ئەم بەشەی گوتارەکان ناودەنێن ئەدەبی. بەڵام بۆچی تەنها ئەمانە ئەدەبین و ئەوانی دی نین؟ ئایا لەبەرئەوەیە کە ئەمانە خەسڵەتی تایبەتیان هەیە، یان سیفەتێکیان هەیە کە لەلایەن هەمووانەوە دەناسرێتەوە و هەستی پێدەکرێ. یان ئەوەندە جوانیان تێدایە کە بەزەرورەت لە ئاستی قسەی ئاسایی جیایان دەکاتەوە؟ شیکردنەوە و تاوتوێکردنی بونیادگەرانە دەریدەخات (یان لانیکەم وای دادەنێت) کە هەرگیز وانیە و کۆی چیرۆکەکانی دنیا، چ مۆری ئەدەبیاتیان لێنرا بێت و چ نەء. پەیڕەوی لە دیسپلین و ڕێسایەکی یەکسان دەکەن.

لەچاوی یەکسانکەری زانستەکانەوە، هەموو زنجیرە پلەکان هەڵەن. دەبێ قبوڵبکرێت کە هەر پێوەرێك کە دەبێتە هۆی ڕەگەزپەرستی، بێ بناغەیە.چیدی هیچ ڕێگرێك شاکارە ئەدەبیەکان لە قسە ناشرینەکان جیا ناکاتەوە. بونیادی سەرەکی و هێڵی هەمەکی بنەڕەتی ڕۆمانە مەزنەکان (کە لێرە بەدواوە مەزنێتیان لەنیوان دوو کەوانەدا دادەنرێت...) لەگەڵ شێوازە جیاوازەکانی گێڕانەوەی عامیانەدا، هەر یەك شتە. ئەمە وانەی ئەنترۆپۆلۆگیە: "کۆمەڵگا مرۆڤایەتیەکان وەك تاکەکان. لە گەمەکردنەکان و لە خەو و خەیاڵەکانیاندا. هەرگیز شتێك بە مانای ڕەها داناهێنن، بەڵکو تەنها ئەو تەرکیبانەی کە قابیلی بونیادنانەوەن، لەو کۆمەڵە ئایدیالیەی کە هەیە، هەڵدەبژێرن". بونیادگەران جەخت لەوە دەکەنەوە کە دوو ئەفسانەی لێکچوو، دوو خەوی لێکچوو، دوو خەیاڵی لێکچوو، یان دوو بڕوای لێکچوو، بوونی نیە. بەڵام ئەم جیاوازیانە مافی داوەریکردنێکی بەهایی دروست ناکات چونکە هەموو ئەمانە دەرئەنجامی کارێکی تەرکیبی یەکسانن. لە دەرئەنجامدا پێناسی هونەر دەبێت بە "بابەتی ململانێی چینایەتی". ئەگەر فلان نوسین پیرۆزیەکی وەرگرتووە و بۆ لیکۆڵینەوە و توێژینەوە پێشنیار کراوە، لەبەرئەوەیە کە گروپی باڵادەست بەسەر کۆمەڵگادا، لە ڕێگەی ئەو نوسینەوە، دیدی خۆی بۆجیهان بەسەر کۆی کۆمەڵگادا دەسەپێنێ. لە قوڵایی هەر داوریکردنێکی بەهاییدا، دەستدرێژیەك هەیە.

بەمشێوەیە گریمانەی کۆمەڵناسی، ئەو شانۆیەی کە ئەنترۆپۆلۆگیا لە ڕونکردنەوەی پەیوەندی ڕۆژئاوا بە نەتەوە نائەوروپیەکاندا، ڕێکیخستبوو، دەگوێزێتەوە بۆ ناو خودی کۆمەڵگا ئەوروپیەکان. لەڕاستیدا شێوازە جیاوازەکانی بیرکردنەوە و هونەری ژیانێك کە مۆڵکی ئەو نیە، بێ بەها دەکات و

هەموویان تورهەڵدەدات بۆناو تاریکی جاهلیەت و بەربەریەت.

هەموو دەزانن کە دۆزینەوەی دنیای نوێ، سەرچاوەی قوتابخانەی هیومانیزمە. بەهۆی پەیوەندیکردنی بەخەڵکی سەرزەمینەکانی ترەوە بوو کە ئەندیشەی بەراوردکردن هاتە ناو سنوری مەزهەبەوە و هێواش هێواش لە دەسەڵاتی رۆحی کەمکردەوە. ئەوروپیەکان بە تێپەڕین لە سنورەکانی خۆیان، وەك لابرۆیر لە بەشی "ئازاد ئەندێشان"دا دەڵێت بە بینینی "ئاینی نوێ، ئەخلاق و عاداتی جیاواز و نەریتی تەشریفاتی جیاواز" تێگەیشتن کە بەهای بیروڕاکانیان رێژەییە و مرۆڤ دەتوانێت بێ نوری باوەڕیش بەسەر پێوە بوەستێت، کار بکات، بیربکاتەوە و باش و خراپ لەیەك جیا بکاتەوە.

لە سەدەی بیستەمدا، دۆزینەوەی سەرلەنوێی کۆمەڵگا بێ نوسینەکان، چیدی نەك خودا، بەڵکو خودی مرۆڤی خستە ژێرپرسیارەوە. ئەنترۆپۆلۆگەکان لەراستیدا درۆی دووجۆری مرۆڤ بوونیان، واتە مرۆڤی پێشکەوتوو و مرۆڤی راوەستاویان، ئاشکرا کرد. لە دیدی جیهانگەردە وردبینەکانەوە، ئەوروپیەکان تا ئێستا هیچیان نەکردووە جگە لە سەپاندنی خەونەکان، خۆپەرستیەکان و تیورەی تایبەتی خۆیان لەبارەی عەقڵەوە، بەسەر خەڵکی تردا. ئەم ئەوروپیانە کاتێك کە سوکایەتی بەم خەڵکە لەبەر دواکەوتنیان ناکەن، ناویان دەنێن وەحشیە باشەکان. ئەمەش بەهەرشێوەیەك بێت، زەوتکردنی خەسڵەتە بنەڕەتیەکانی ئەو خەڵکەیە و بە خزمەتگرتنیانە بە بەخشینی دەوری ئەفسانەئاسای خۆماڵیکردنی رۆشنبیریی رۆژئاوا لە سەرزەمینەکانیاندا. بە وتنی "مرۆڤ، منم" کەسێك دەتوانێت بە ویژدانێکی تەواو ئارامەوە هەموو شوێنەکانی دی دنیا هەڵلوشێ. ئەگەر بمانەوێت ئەوەی نەهەنگی رۆژئاوا قوتی داوە، بدرێتەوە، هەر ئەوەندە بەس نیە کە **سەربەخۆیی** بەو گەلانەی لەژێر دەسەڵاتدان بدەین، بەڵکو دەبێت **یەکسانی** کۆی رۆشنبیریەکانیش رابگەیێنین.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم یەکسانیەش دوو رێگە هەیە: هەندێك هەوڵدەدەن دەریبخەن شێوازە جیاوازەکانی مرۆڤ، بەشێوەی ناهوشیارانە، سنوردار نین بە زەمەن و بێ ناو دروست دەبن کە "شێوازە جیاوازەکانی، لەبارەی هەموانەوە، چ کۆن چ تازە، چ سەرەتایی و چ مۆدێرن، لە قولاییدا هەریەك شتە". هەندێکی دی کە رادیکالترن گریمانەی رێگای هاوبەش بۆهەمووان قبوڵناکەن و و وەك میشل فۆکۆ بڕوایان بە "پەرشوبڵاوی رەهای" شێوازەکانی بیرکردنەوە و رەفتارە کۆمەڵایەتیەکانە. بەڵام لە هەردوو ئەم حاڵەتەدا مرۆڤ وەك بکەرێکی خودموختار لەناو دەچێت و دەکەوێتە بواری چالاکی هێزگەلێکەوە کە لە روبەروی هوشیاری مرۆڤ، رادەکەن. میشل فۆکۆ تەواو راست گوتویێتی: "لەوشوێنەدا کە قسە لە ناخودئاگا دەکرێت، چیدی مرۆڤ بوونی نیە".

دەرئەنجامی سیاسی داماڵینی کۆلۆنیالیکردن، هاوڕێبوو لەگەڵ شۆڕشێك لە سیستەمی فکریدا. مرۆڤ ئەم "چەمکە تاکانەیە لە سەرتاسەری جیهاندا" جێگەی خۆی دا بە جیاوازی بێ زنجیرە پلەی کەسایەتیە رۆشنبیرییەکان (کلتوریەکان).

بەڵام ئەمە یەکەمجار نیە کە شتێکی وا رودەدات: شپلینگەریش شانازی بەخۆیەوە دەکرد کە شۆڕشێکی وای بەرپا کردووە و لەبیرمانە کە هێردەر پێش شپلینگەریش، سەرزەنشتی ڤۆڵتێر و جێگرە نارەسەنەکانی کردبوو کە بەهاکانی خۆیان بە چرای رێنماییەك دادەنێن و جیهانێکیان بە بەهانەی رونکردنەوەی بیرەکان،دەوێت کە یەك شکڵی هەبێت. ئەو لەبەرامبەر مرۆڤی رەهادا، ئەم دەمامکەی فەرانسا، گروپی مرۆییە بێ سنور جیاوازەکان دادەنێ. **فەلسەفەی داماڵینی کۆلۆنیالیکردن** بە راگەیاندنی نامرۆڤایەتی بوونی

قوتابخانەی هیومانیزم، بەپەنجە خستنە سەر کۆی شتە گروهی و مێژووی و ناوچەیی کە بە روکەش گەردونین، لەگەڵ هەردوکیاندا (واتە شپلینگەر و هێردر) هاودەنگ دەبێت، بەڵام هەمان یاری ئەمجارە بە پێوەرێکی دی، دەکەوێتە رێ. هەنوکە چیدی تەنها فەرانسا جێگەی باس نیە، بەڵکو کۆی رۆژئاوایە کە هەم لە پەیوەندیدا بە دەرەوە و هەم لە سیستەمی کارکردنی ناوخۆیدا، دەکەوێتە ژێر پرسیار. بەڵام دیسان هەردوو لایەنی مەسەلەکە هەر هەمان ئەو شتەیە کە کاتی خۆی بوو : واتە **مرۆڤ** یان **جیاوازیەکان** فەلسەفەی داماڵینی کۆلۆنیالیکردن، قوتابخانەی نەتەوەگەری بەهەمان ئەو بەڵگانە مەحکوم دەکات کە ئایدیالگەری ئەڵمانی لە خەبات دژی رۆشنگەراندا، بەکاریدەهێنا.

قبوڵی دەکەین کە ئەم گەڕانەوەیە بۆ تیورەی ئایدیالگەری رۆشنبیریی، ئیلهامی لە مەبەستی ئەنقەستی پاکانەکردنەوە وەرگرتووە، نەك دەرئەنجامی دەرکەوتنی لەناکاوی غروری خێڵەکی. هەموو نەیارە هاوچەرخەکانی قوتابخانەی هیومانیزم، وەکو هێردەر دەڵێن کە مرۆڤی رەها بونەوەرێکی جوانی ئایدیال نیە، بەڵکو خەیالێکی سودمەند و بەڵگەیەکە کە لەلایەن شارستانیەتێکی تایبەتەوە، تەنها بە مەبەستی سەپاندنی یاساکانی خود بەسەر ئەوانی دیدا، دامەزراوە. هەروەها ئەوانیش وەك هێردەر لەپشت سێبەری میتافیزیکیای جێی ستایشی ئەندێشەی رۆشنگەری، بونەوەرێکی سەرتاپا مادی دەهێننە دەرێ، بونەوەرێکی مرۆیی کە بە هۆی رۆژئاواوە براوەتە سەرو شوێن و زەمەنەوە، لەراستیدا جەستەیەك و شوناسێك و مێژوویەکی هەیە. دواجار ئەوان وەك هیردەر بڕوایان وایە کە: "کارەکانی مرۆڤ وەك ئەندامی کۆمەڵگایەك، گونجاوە لەگەڵ ئەو شتەدا کە هەرکەس بەشێوەیەکی فەردی هەستی پێدەکات، بەڵکو هەستی هەر مرۆڤێك گونجاوە لەگەڵ شێوە رەفتارێکدا کە شیاوە یان ناچار بەئەنجامدانێتی. دابو نەریتەکان بەرلەوەی دەرئەنجامی هەستە دەرونیەکان بن، دەرکەوتی رێسا دەرەکیەکانن. ئەم رێسا هەستپێنەکراوانەش، هەم هەستە فەردیەکان دروستدەکەن و هەم دەبنە هۆی فەزا و هەلومەرجێك کە هەستەکان دەتوانن یان دەبێت لەناویدا خۆیان دەربخەن". بەڵام هێردەر بەر لە هەموو شتێك قسەی بۆ **خودیەکان** دەکرد، لەکاتێکدا فەیلەسوفانی قوتابخانەی داماڵینی کۆلۆنیالیکردن، **قسە بۆ ئەویدی دەکەن.** ئەمانە بە حسابی نەریتەکانی خۆیان هەوڵدەدەن وەهمی باڵادەستی کامڵ کە ئەوروپا سەردەمێکی زۆرە دڵی خۆی پێ خۆشکردووە، لەناوبەرن. دژی منی دەستەجەمعی، بێ هیچ رامانێك لایەنی دەرکراو، نکوڵی لێکراو و مرۆڤی دەرەوە دەگرن. دەیانەوێت هەیبەت بۆ بێگانە بگەڕێننەوە و هەر لەبەرئەمەش هەموو هاوبەشیەکی هوشیاری لە نێوان مرۆڤەکاندا رەت دەکەنەوە. ئەگەر خۆیان لە هەلومەرجێکدا دەوەستن کە لە رۆشنبیریەکانی دی جیاوازتر بێت، لەبەرئەوەیە کە شایستەگی ئەو رۆشنبیریانەی کە ئیمپریالیزم داگیری کردووە، بگەڕێنەوە بۆیان. ئەگەر جیاوازیەکان دەژمێرن، بۆ پاسەدانی هەڵەکانی شارستانێتی، بۆ بێلایەنکردنی ئیرادەی روو لە دەسەڵاتی کۆمەڵگایەکە کە چاودێری ئەو تاوانانە بووە، هەروەها بۆ تیمارکردنی نەخۆشی هەمیشەییەکەی فەلسەفە بووە: واتە تەعبیر کردنی ئەوانی دی بەزمانی خۆیان. ئەگەر رێز لە فرەیی عەقلە تایبەتیەکان دەگرن، بۆئەوەیە کە عەقڵی تایبەتی خۆیان بۆ قبوڵکردنی زیاتر و لێبوردن و هەڵکردنی زیاتر، رێنمایی بکەن. ئەوان بێگانە دۆستن، ئایدیالی کەوتووەکان و مەحرومەکان بە ئایدیالی خۆیان دەزانن و بەناوی مرۆڤ جیاوازەوە، مەرگی مرۆڤ رادەگەیێنن و ئەنگیزە گەلێکی تەواو پێچەوانەی ئەوەی ژۆلیان بندا لەکتێبی "خیانەتی

ڕۆشنبیراندا" هێرشی دەکاتە سەر، وایان لێدەکات کە بە سەرەی خۆیان ڕمانی بەها گەردونیەکان رابگەیێنن.

## سیمای ڕزگاربووان لە کۆلۆنیالیەت

فەلسەفەی دامالینی کۆلۆنیالیکردن بێگومان یارمەتی گەلانی جیهانی سێهەمی دا بۆئەوەی لە کۆتی ئەو بەهایانەی کە بەناویانەوە دیلکرابوون، ڕزگاریان بێت. نوخبەکانی ئەفریقا و ئاسیا کە دیدی کۆلۆنیالیکەریان خواردبۆوە، ڕێگای ڕزگاربوونیان لە نامۆبوون لەو تیورەیەدا دۆزیەوە کە هەموو ڕۆشنبیرییەکان بەهایەکی یەکسانیان هەیە و هەریەکەیان بەپێی هەلومەرج و فەزای تایبەتی خۆیان، قابیلی ئاراستەکردنن. زانستە مرۆییەکان پێوەرگەلێکی جیاواز لە شێوازە باوەکانی، بۆ هەلسەنگاندنی پلەی پێشکەوتنی نەتەوەیەك بەراست دانا و بەمەش دوا بەلگەی بڵندتربوونی ئەوروپا لەناوچوو، ئیدی ڕۆژئاوا بەشێوەیەکی بڕاوە، جازبیەتی خۆی بۆ قوربانیەکانی لەدەستدا. "چەند کیلۆمەتر ڕێگاکان، ئاوەڕیەکان و هێلە ئاسنینەکان" "چەند تەن لۆکە، و کاکاوی سادراتی، چەند هیکتار درەختی زەیتوون یان ترێی کەچێنراوە" "نەخۆشیە چارەسەرکراوەکان، ئاستی بەرزبووەی، ژیان"، ئەم ئامارە کلاسیکیانە کە بەرهەمی کۆلۆنیالیکردنی ئەوی دی بوو، چیدی بێ کاریگەری بوو، هەروەك چۆن تیورەی دەروونناسی خەلکی سەرەتایش، بەهای خۆی لەدەستدا. ئەو داب و نەریتانەی کە بەهۆی دیدی ساوێلکانەوە بۆ پیشکەوتن و گەشەکردن، سوکایەتی پێدەکرا، ڕەوایەتی خۆی بەدەست دەهێنایەوە. ئەو ڕابردوانەی کە فەرامۆشکرابوون یان بایەخی خۆیان لەدەستدابوو، لەبەرئەوەی کە لەگەڵ ڕەوتی ناچاری وێنەکێشانی ڕۆژئاواییدا نەدەگونجا، هەموویان لە تاریکیەوە دەردەکەوتنەوە. "مەلاینها مرۆڤ کە خوداکانیان، زەویەکانیان، دابونەریتەکانیان، ژیانیان، سەما و عەقڵ جیا بووبونەوە"، خۆیان دەدۆزیەوە.چیدی ئەوان ئەو وەحشی و بەربەیانە نەبوون کە چاوەڕێی ڕزگاری و تەندروستیان دەکرد، بەڵکو خەڵکانێك بوون کە خاوەن نەریتگەلێك کە شایستەی ستایشکردنیشە.

چەمکی ڕۆشنبیری کە دەرکەوتی ڕۆژئاوای ئیمپریالیستیە، بە پشتگیری فەلسەفەی دامالینی کۆلۆنیالیکردن، بوو بە دژی (واتە دژی ڕۆژئاوا) و بە وردی بوو بە پێناسی خەسڵەتی کۆمەڵگاگەلێك کە لەژێر دەسەلاتیدا بوون. کەوابوو بابەتی شوناسی ڕۆشنبیریی ڕێگەی بە کۆلۆنیالیکراوەکان دا بێدەنگی بشکێنن و قبوڵ و سەلماندنی جۆرێکی تر بوونی خۆیان، بکەنە جێنشینی لاسایکردنەوەی دزێوانەی دەسەلاتگەر و ئەو وێنەی بوونەی کە دەسەلاتداران دەیانویست بیکەن بە نەنگیەك بۆیان، بکەن بە هۆکارێکی غرور. بەلام هەر ئەم ئەندێشەیە توانای ئەم نوخبانەی لەبەرامبەر کۆمەڵگای خۆیاندا، زەوت کرد. ئەوان چیدی نەیاندەتوانی ئیدیعای ئەوە بکەن کە لە دەرەوەی کۆمەڵگای خۆیانن و دورن لە ناچاریەکانیەوە و کاریان بە داب و نەریتەکانیانەوە نیە. چونکە ئەوان خۆیان بۆ ڕزگاربوون لە دەستی کۆلۆنیالیکردن، ڕاستەوخۆ دەیانویست کە لەم بەدبەختیانە ڕزگاریان بێت. گەیشتن بە سەربەخۆیی لە پلەی یەکەمدا بریتی بوو لە دۆزینەوەی ڕۆشنبیریی خودی. لۆژیکیە کە زۆرینەی ئەو دەوڵەتانەی کە بە پشتیوانی ئەوانە دروستبووبوون، ئامانجی خۆیان بە جێبەجێکردنی ئەم دۆزراوانە، دابنێن. بەو مانایەی کە تاکەکان بەتوندی لەگەڵ کۆمەڵگادا هەماهەنگ بکەن، یەکێتی نەتەوەیی پتەو بکەن، بۆ زامنکردنی سەرجەمێتی و چونیەکی کۆی کۆمەڵگا، هەرگیز کەمتەرخەمی پیشان نەدەن، بەناوی ڕۆشنبیرییەوە چاودێری ئەوە بکەن کە هیچ ڕەخنەیەکی بێ جێ ڕێ و ڕەسمی

**ستایشی بیروباوەڕە گشتیەکانی سەدەکان و** سەردەمەکان، نەلەرزێنیّ و بەکورتی سەرکەوتنی بڕاوەی رۆحیەتی رەمگی بەسەر جۆرەکانی تری دەرکەوتنی رۆحدا، زامن ببیّ.

وەك چۆن "هێلە بڕژی" لە "دڵساردی نەتەوەییدا" کە کتێبێکی شایستە و نەناسراوە، دەریدەخات ئەو هێزی بەرگریەی کە لە سەردەمی کۆلۆنیالیکردندا پێناسی شوناسی رۆشنبیریی بوو، راستەوخۆ پاش رۆیشتنی ئیستیعمار، خۆیانبوون بە ئامێرێکی دەسەڵات: "تا ئەوکاتەی مەسەلەکە بریتیە لە بەرگریکردن لە خۆمان لە بەرامبەر ئامادەیی نەتەوەیی داگیرکەردا، هێزی شوناس ئەفسونم دەکات و هێزم دەداتیّ، بەڵام هەر ئەوەندەی ئەم شوناسە یان بە دەربڕینێکی باشتر ئەم سیما نەتەوەییەی خۆم، جێگەی داگیرکەری گرتەوە و جێگەی دەسەڵاتی گرت، من بەتوندی دەخاتە ژێر چاودێریەوە و من بەهیچ شێوەیەك مافی ئەوەم نیە رەخنەی لێبگرم" مرۆڤ خۆدژی خۆی شۆڕش ناکات. سەربەخۆی، ئەو کەسانەی کە سودمەندن لێی لە جۆریك یەکێتی وشەدا کە راستەوخۆ جێگەی دەسەڵاتی بێگانە دەگرێتەوە، لەناو خۆیدا زیندانی دەکات. کۆلۆنیالیکراوەکانی پێشوو کە ئیدی بۆخۆیان رەهابوون، خۆیان لە دیلی ملکەچی و راوەستاوی لەو رۆشنبیریە دەستەجەمعیەدا دەدۆزنەوە کە بووبووە هۆی ئەوەی لە دەسەڵاتی داگیرکەرانە و بەها ئەوروپیەکان رزگاریان بێت. تازە رستەی "ئێمە سەرکەوتین" یان لەدەم هاتۆتە دەریّ کە مافی دەربڕینی هەر بیروڕایەك، جگە لە راناوی کەسی یەکەمی کۆ، لەدەستدەدەن. "ئێمە" کە تەنها راناوێك بوو بۆدەرخستنی رەسەنایەتی دۆزراوە، هەنوکە تەنها راناوێکە بۆچونیەککردنێکی ناچاری. فەزای گەرمی برایەتی خەباتگێڕان، هەنوکە هەڵدێرێکی بەستووە کە ژیانی گشتی لەناویدا رەنگی خۆی لەدەست دەدات و روو لە راوەستان و جمود دەکات. لەدایکبوونی کۆمەڵگایەك هەنوکە لەناوچونی ماوە فەردیەکانە و لە دەرئەنجامدا لەناوچوونی ئەگەر پێکدادانی بیروڕاکانیانە. هاواری راپەڕینێك، هەنوکە مەنەلۆگی دەسەڵاتە. لە لۆژیکی کۆلۆنیالدا جێگەیەکی بۆ بوونی کۆمەڵایەتی نەبوو، لە لۆژیکی شوناسی رۆشنبیرییدا جێگایەك بۆ تاك نیە.

حکومەتی تاکانە حیزب،گونجاوترین وەرگێڕانی سیاسی چەمکی شوناسی رۆشنبیرییە. ئەگەر سەربەخۆی کۆلۆنەکانی پێشوو،گەشانەوەی مافەکانی بەدوادا نەهاتووە، بەڵکو یەکسانکردنی هوشیاریەکان، گەورەبوونی دەزگاکانی حکومەتی و تاکانە حیزبی بەدوادا هاتووە، ئەمە دەرئەنجامی هەمان بەهاکانی خەبات دژی کۆلۆنیالیکردنە، نەك بەرهەمی خیانەت لەو بەهایانە لەلایەن بورژوازی ناوچەییەوە، یان دەستبەسەراگرتنی ئەو بەهایانە بە قازانجی دەسەڵاتە ئەوروپیەکان. تێپەڕین لە گەرمی شۆڕشگێڕانەوە بۆ ساردی بیرۆکراتیانە، خۆبەخۆ و بیّ هیچ دەستتێوردانی سێهەمێکی بەدخواست رویداوە و دڵساردی نەتەوەیی کە بەو رونیە لەلایەن "**هێلەبڕژی**"ەوە شیکراوەتەوە، بەر لەهەرشتێك بەرهەمی هەمان ئەو تیورەیەیە سەبارەت بە نەتەوە، کە لە خەبات دژی ئیمپریالیزمی رۆژئاواییدا، دەستی باڵای هەبووە.

بۆئەوەی کە قانع بین، ئەوەندە بەسە جارێکی دی کتێبی "دۆزەخیانی سەر زەوی" جارێکی دی بخوێنینەوە. فرانتس فانون لەم کتێبەدا کە لەکاتی حاڵ و هەوای راپەرینی دژ بە کۆلۆنیالیکردندا نوسراوە، تاکگەری لە ریزی یەکەمی بەها دوژمنەکاندا دادەنێت. "رۆشنبیری کۆلۆنیالزەدە لە سەروەرانی خۆیەوە فێر بوو بوو تاك دەبیّ بەهێز و سەقامگیر بکریّ. بۆرژوازی کۆلۆنیالیکەر بە زۆری کوتەك، خستبویە مێشکی داگیرکراوەوە کە کۆمەڵگا دەتوانیّ لە کۆمەڵیّ تاك پێك بێت کە هەریەکەیان

خۆی لە جیهانی زیهنیاتدا زیندانی بکات و سامان تیایدا، سامانی ئەندێشە بێت، بەڵام کۆلۆنیالیکراوێك کە ئەو بەختە پەیدا بکات لەکاتی خەبات لەپێناوی ئازادیدا تیکەڵی خەڵك بێت، هەڵەبوونی ئەم گریمانەیە ئاشکرا دەکات". کۆلۆنیالیکراوەکان کە بەهۆی ستەمکارانەوە لەیەك جیاکراونەتەوە، پارچە پارچە کراوون، مەحکوم کراوون بە سیفەتی خۆپەرستی "هەرکەس بیر لەخۆی بکاتەوە"، لەکاتی خەباتدا حاڵەتی سۆز و جازبیەتی جیاوازنەبوون لەگەڵ ئەوانی دیدا تاقیدەکاتەوە. دنیای خەیاڵی و نەخۆشئاسای پەرش و بڵاوی ئیرادەکان، جێگەی خۆی بە یەکێتی تەواو دەدات. لەبری ئارەزووی ئەنقەستانە بۆسەپاندنی خود، یان پەروەردەکردنی بێ بەرهەمی خەسڵەتی فەردی خود، مرۆڤەکان لە "شەپۆلی جەماوەریدا غەرقدەبن". بە وەلاوەخستنی بیروڕای تایبەتی، دەگەڕێنەوە بۆ باوەشی کۆمەڵگا. نیمچە واقعیەتی فەردی لەناودەچێت. هەموو تێدەگەن کە وەك یەکن و خاوەن یەك شوناسن. کۆمەڵەی نهێنی ئامێزی نەتەوە، رۆحی تاکەکان لەناوخۆیدا جەزب دەکات و هیچ هۆیەك نیە کاتێك کە دەسەڵاتدارێتی نەتەوە راگەیەنرا، ئەو دەسەڵاتدارێتیە بۆ خاوەنەکانی بگەڕێنرێتەوە. لەپێناو چ شتێکدا فەردانیەت کە بەدرێژایی سەردەمی خەبات لەپێناوی ئازادیدا، بە نەخۆشی بوون دەناسرا، هەنوکە پاش سەرکەوتن بە بنەمایەکی پۆزەتیڤ بناسرێ؟ چۆن ئەو یەکە چونیەکەی کە کاتی خەبات ئەوەندە بەپیرۆز دادەنرا، کاتێك چەکەکان دانران، گۆڕا بۆ کۆمەڵگایەك کە پێکهاتووە لەکۆمەڵێ تاکی ئازاد؟ نەتەوەیەك کە ئامانجی یەکەمی لەناوبردنی تاکانەیی هاوڵاتیان بوو، ناتوانێ ببێ بە دەوڵەتێکی یاسایی .

فرانتس فانون گوتبووی- بەچ توندیەکیش گوتبووی-کە دەبێ ئەوروپا رزگاربکرێت ئەو لە نێوان دوو تیورەدا سەبارەت بە نەتەوە، کە پاش بەیانی شۆڕشی فەرەنسی، ویژدانی ئەوروپای لەت کردبوو، لایەنی یەکیان دەگرێت. لەراستیدا (*volk*) رۆحی نەتەوەیی لە کۆمەڵگایەکی پێکهاتوو لە تاکی سەربەخۆ پێ باشترە و دەیەوێت (رۆحی نەتەوەیی) بکاتە جێ نشینی ئیستیعمار. ئەو دەتوانێت رۆشنبیریی ستەمکاری "بهێنێتەوە". بە شادیەوە گەواهی دەدات کە هەرکاتێك مەسەلەی بەها پەتیەکان بێتە ئاراوە "ئیستیعمار زەدە، قەمەکەی دەهێنێتە دەرێ یان لایەنیکەم دڵنیا دەبێت کە لەبەردەستیدایە". کتێبەکەی فانون رێك لە ئاراستەی ناسیۆنالیزمی ئەوروپیدایە و زۆرینەی بزوتنەوە ئازادیخوازە نەتەوەییەکانیش هەر بەدوای ئەم هێڵەدا رۆیشتوون. ئەم بزوتنەوەیە لەگەڵ فانوندا کە وەك پێغەمبەریان وابوو، گریمانەی ناسیۆنالیزمی نەتەوەییان لەبەرامبەر گریمانەی هەڵبژاردندا، هەڵبژارد و شوناسی رۆشنبیریی . وەرگێرانێکی تازەی رۆحی نەتەوەیی. یان بەسەر "رای رۆژانەی راستەوخۆی خەڵکیدا" یان "تیورەی هاوبەشی بەرهەمی سەدەکانیان" پێ باشتر بوو. ئەگەر لەم بزوتنەوە رزگاریخوازانەوە، بە شێوەیەکی سیستەماتیك، رژێمە ستەمکارەکان دروستبوون، لەبەرئەوەیە ئەم بزوتنەوانە، وەك ئایدیالگەری سیاسی، پەیوەندی مرۆڤەکانیان لەسەر بناغەی نمونەیەکی رەمزئامێزی ئاڵۆزی پێکەوەگرێدان، دامەزراندبوو، نەك لەسەر بناغەی نمونەی "مافەکانی" پەیمانی کۆمەڵایەتی، ئازادیشیان وەك مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتی تەماشا دەکرد، نەك وەك مافێکی فەردی.

راستیەکەی ئەوەیە کە زۆرینەی ئەم دەوڵەتە تازە دروستبوانە، لە سەرەتای دروستبونیاندا، مەیل بۆ نوێکردنەوەی وڵاتیان تێکەڵ بە تەماعی شۆڕشگێڕانە دەکرد. ئەوانەی کە ناسیۆنالیزمی توند و تیژ بوون، هەر لەو کاتەوە، نێو نەتەوەیەکی تازەی ئیستیسمارکراوەکانیان دروستکرد و لە

یەککاتدا لە هەردوو شانۆی ناسیۆنالیزم و ململانێی چینایەتیدا، یاریان دەکرد. بە نۆبەت ناوی نەتەوەی جیاواز یان نەتەوەی پرۆلیتاریان بەخۆوە دەگرت. لەکاتێکدا کە ئارەزویان دەکرد بگەڕێنەوە بۆ رەسەنایەتی خۆیان و بۆ ئەسڵی خۆیان، دەیانویست لەدایکبوونی مرۆڤی نوێ، خێراتر بکەن. لەلایەکەوە دژایەتی جیهانگیریان دەکرد بە پشتبەستن بە جیاوازی رۆشنبیریەکان، لەلایەکی دیەوە بەناوی شۆڕشەوە خۆیان باری جیهانگیریان دەگرتە ئەستۆ. بە دەربڕینێکی تر، دەوڵەتەکانی پاش کۆلۆنیال، بێ ئەوەی خۆیان ئاگایان لێبێت، **مارکس و ژۆزێف دۆمستەریان** پێکەوە ئاشت دەکردەوە. هاودەنگ لەگەڵ ژۆزێف دۆمستەردا دەیانگوت "نمونەی هاوبەشی رۆشنبیریی بۆ هەموو مرۆڤایەتی بوونی نیە، تەنها نەریتە جیاوازەکانە کە واقعیەت و بایەخی هەیە"، بەڵام وەك مارکسیش دەیانگوت: "مرۆڤ هێشتا بوونی نیە و لە ئەستۆی نەفرینکراوەکانی سەر زەویە کە دەرکەوتنی، بهێننە دی".

بێگومان خودی مارکس لەم تێهەڵکێشکردنە ناسروشتیەدا لەگەڵ ناسیۆنالیزمدا، بەتوندی توڕە دەبوو. لەدیدی نوسەری مانیفێستدا، مەسەلەکە ئاشکرابوو: رەنجبەران وڵاتیان نیە و بۆنمونە وای دەنوسی "نەتەوەی کرێکار ئینگلیزی یان فەرەنسی یان ئەڵمانی نیە، **بەڵکو کار و کۆیلەیەتی ئازاد و رەخنەکردنی خۆیەتی**. حکومەتی کرێکار، ئینگلیزی یان فەرەنسی یان ئەڵمانی نیە، بەڵکو **سەرمایەیە**. ئەو هەوایەی کە کرێکار لەوڵاتی خۆیدا هەڵیدەمژێ، هەوای فەرەنسا یان ئینگلیز یان ئەڵمانیا نیە، بەڵکو هەوای **کارخانەکانە**". مارکس وەڵامی میراتگرانی رۆشنگەری. کەپێیانوایە دەکرێت نەتەوەیەك لەسەر بناغەی پەیمان دروستبکرێ. وا دەداتەوە کە کۆمەڵگاکان لەسەر بناغەی ململانێی بۆرژوازی و چینی کرێکار راوەستاون. وەڵامی ئەو رۆمانسیانەی کە دەیانویست رۆحی نەتەوەی زیندوو بکەنەوە، بەوە دەدایەوە کە بۆرژوازی بەبێ شەرمیەکی بێ سنورەوە، هەموو پەیوەندیەکانی رابردووی هەڵوەشانۆتەوە، دڵبەستنە کۆنەکانی لەناوبردووە و مۆری هەڵەبوونی لە خەسڵەتە تایبەتیەکانی نەتەوە جیاوازەکان داوە. دابەشبوونی چینایەتی جێگەی پەیمانی کۆمەڵایەتی و بازاڕی جیهانی و پەیوەندیە نێو نەتەوەییەکان جێگەی خەسڵەتە نەتەوەییەکانی گرتۆتەوە. نەتەوە لە روانگەی مارکسدا، چ بە هاوبەشی رۆشنبیریی دابنرێ و چ بە دەرئەنجامی ئیرادەی تاکەکان، شێوەیەکی کۆمەڵایەتی، مەحکومکراوە. شێوازی نوسینی مارکس، تەنانەت کاتێك باسی یەکێتی جیهان و لەناوچوونی رۆحی شەیدابوونی ناوچەیەکی دیاریکراوی دەکرد، پڕبوو لە هەست و سۆزی شاعیرانە.

لەو روەوە کە بایەخی ئەم پێشبینیە لە نیوەی دوهەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە، زیاتر لەرزا، جێگرەکانی مارکس ناچار بوون بە مەسەلەی ناسیۆنالیزمدا بچنەوە. پاش وتوێژێکی زۆر لەنێوان سترۆمارکسیەکان، بۆندیستەکان، بەلشەفیکەکان و لۆکسۆمبرگیستەکاندا، دواجار پێناسەکەی چۆزیف ستالین بۆ نەتەوە، بەسەر دیدەکانی تردا زاڵ بوو. "نەتەوە کۆمەڵگایەکی مرۆیی سەقامگیر و فۆرمەلەبووی مێژووییە کە لەسەر بناغەی هاوبەشی زمان، زەوی، ژیانی ئابوری و بونیادی دەروونی کە بە هاوبەشی رۆشنبیریی تەعبیری لێدەکرێ، دروستبووە" نەتەوەکان سەرسەختن، ستالین لەبەرامبەر سەرسەختی ئەم دیاردە کۆمەڵایەتیەدا تەسلیم دەبێت، بەڵام ئەم ئاراستە گۆڕینە تیوریە تا ئەو شوێنە ناچێتە پێشێ کە ببێ بە حاشالێکردنی تەواو. نەتەوە لەبەرامبەر نەتەوەدا، ستالین لەنێوان ئەم دوو خراپەیەدا، ئەوەی هەڵبژارد کە کەمتر خراپە و دژی گریمانەی پەیمانی کۆمەڵایەتی، پرۆژەیەکی نەتەوەیی خستە ناو بیری شۆڕشگێڕانەوە، چونکە ئەو دەیتوانی لەپاڵ جەبرگەری ئابوریدا،

بەســـــتنەوەی مرۆڤـــەكان بـــە زەمـــان و زەوی و رۆشـنبیریەوە قبوڵبكـات. بـەڵام بەتـەواوی بـۆ ئـەو قبوڵنــەدەكرا پەیوەنــدی نەتــەوەیی بــە بەرهــەمی پێكەوەبەستنی عەقلانیانە یان رازیبوونی ئازادانەی مرۆڤـەكان دابنێـت. لەراسـتیدا ئـەم گریمانەیـە لـە دژایەتیــەكی تەواودایــە لەگــەڵ بنــەمای ســەرەكی ماتریــــــالیزمی مێژوویــــــدا: "هوشــــــیاری دەستنیشــانكەری ژیــان نیــە، ژیــان هوشــیاری دەستنیشان دەكات".

مــــارەكردنی ماركســــیزم لــــە ئایدیالگــــەری رۆمانسـیزمی سیاسـی، كـە لـە بەرەبـەیانی شۆڕشـی فەرەنسـادا جـەژنی بۆگیرابـوو، وە لـەكاتی خـەباتی دژی بەكۆلۆنیالیزمـدا بـە چـونە نـاو ئـەو رۆشـنبیریە نەتەوەییانـەی كـە لـەدەرەوەی فـەزای شارسـتانێتی ئەوروپابوون، فعلیەتی وەرگرتبوو، ئەمڕۆ لە حاڵـەتی لیكترازاندایە. لەو رووە كە ئیمپریالیزمی سوڤیەتی، تینوێتیەكی لایەنیكەم هاوچەشنی بە ئیمپریالیزمی رۆژئــاوایی لــەخۆی پیشــاندەدات، دەوڵەتــەكانی جیهــــانی ســــێهەم و بزوتنــــەوە ئــــازادیخوازە نەتەوەییـەكان كـە هێشتاچالاكن، زیـاد لەپێشـوو واز لـە سۆشـیالیزم بـەقازانجی رەسـەنەیەتی نەتـەوەیی دەهێـنن. شوناسـی رۆشـنبیریی خـۆی بـە تـەنیا ئاراستەكەری خۆیەتی: فەندەمینتالیزم، زاراوەسازی پێشــــكەوتوخوازانە رادەمـــاڵێ و لێـــرە بــــەدواوە بەتەواوی واز لە یەكسانی كۆمەڵایەتی لە گەڕانەوەدا بۆ شۆڕشی نێونەتەوەیی رەنجبەران، دەهێنێ.

لێـرەوە كۆمـۆنیزم توشـی دارمانێـك بـووە كـە پێدەچێت چارەسەرهەڵنەگر بێت. بەڵام ئەوەی لەگەڵ كۆمۆینیزمـدا دەمرێـت، ئەندێشـەی دیكتـاتۆری نیـە، بەڵكو تیورەی دنیایی هاوبەشە بۆ هەموو مرۆڤەكان. ئەڵبەتە ماركس شكستی خواردووە، بەڵام لـە ژۆزێـف دۆمستەر. بەمشێوەیە نابێ سەرمان بسوڕمێ لەوەی كـە وەك ئۆكتاڤیۆپــاز دەڵێــت "لــەو جێگەیــەدا كــە بەجیهانی سێ ناودەبرێت، كالیگوڵە هەزار سیماكان، لەژێر ناو و ناونیشانی جۆراوجۆردا، فەرمانڕەوان".

لـەنێوان دوو نمونـەی ئـەوروپایی نەتـەوەدا، جیهـانی سێهەم بەشێوەیەكی بەربلاو ئەوەی هەڵبـژاردووە كـە خراپترە و ئەمەش بە پشتگیری كاریگەر و كردەوەیی رۆشنبیرانی رۆژئاوا، ئەنجامدراوە. ئـەنترۆپۆلۆگیا و لەگەڵیـدا كـۆی زانسـتە كۆمەڵایەتیـەكان، بەمەبەسـتی بــەدیهێنانی حورمــەتی مرۆیــی لەرێگــەی ناســینی كاریگـەرەوە، ئـەوە بـوو كـە رەخنـەی لـە رۆشـنگەری گرتووە. بە مەبەستی رزگاركردنی بنەما گرنگەكانی مرۆڤایەتی لەدەست بێ توانایی و ئەبەستراكتبوونە كــە "ئەنجومــەنی مرۆڤناســی ئەمــەریكا" لــە ســاڵی 1947دا پــرۆژەی راگەیانــدنی مافــەكانی مرۆڤــی پێشكەش بە رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان كرد كە لە مادەی یەكەمیدا گوترا بوو: "تاك، كەسایەتی خۆی لەرێگەی رۆشنبیریەوە بەدی دێنێ، رێزگرتن لە جیــاوازی تاكــەكان هاوكاتــە لەگــەڵ رێزگــرتن لـــە جیاوازیـــــە رۆشـــــنبیرییەكان". ئەمـــــە هـــــەوڵێكی جوامێرانە بوو بەڵام وەك جوامێری ئەو ورچەی كە سیمای باخەوانەكەی خوارد و وردی كرد بۆئەوەی ئەو مێشە دەربكات كە خەوی لێ تێكدابوو، ناشیانە بــوو. لەراسـتیدا رێـك ئەوكاتـەی كـە رۆشـنبیریی مرۆڤەكـەی تریـان بـۆ دەگەڕانـەوە، ئـازادی ئـەویان زەوت دەكـرد. نـاوی تایبــەتی ئـەو لــەناو نــاوی كۆمەڵگاكەیدا وون دەبوو و ئیدی جگە لە نمونەیەكی بچوك. كە قابیلی گۆڕینەوەیـە لەگـەل كەسـانی دیـدا هیچی دی نیە كە تەنها پێناسی چینێكی تایبەتی بونەوەرەكانە. بە بەهانـەی قبـوڵكردنی بێ شـەرت و مەرجی ئەو، هەلی هـەموو دینامیكیـەتێك و هـەروەها پەناگەیـەكی لـێ دەسـتێنن. رەسـانەیەتی فـەردی لـێ قەدەغـــە دەكـــەن، و فێڵبازانـــە دەیخەنـــە داوی جیاوازیەوە لەگەڵ ئەوانی دیدا. بە تەسـەوری ئـەوەی لــە مرۆڤـی موجـەرەدەوە بگـەن بـە مرۆڤـی واقعـی، بەرخوردی تەندروستانەی نێوان فەرد و كۆمەڵگا، كە ئـەنترۆپۆلۆگی رۆشـنگەری جێبـەجێی كردبـوو، وە

تەنانەت هەوڵی بۆ بەهێزکردنی دابوو، لەناو دەبەن. بە "ئەویدی دۆستی" خۆیان، لەویدی هەمەکیەکی پەکپارچە دروستدەکەن و واقعیەتی فەردی ئەوانی دی لەپێناو ئەم هەمەکیەدا، قوربانی دەکەن. ئەمجۆرە بێگانە دۆستیە، دەبێتە هۆی مەحرومبوونی مەمالیکەکانی رابردوو، لە ئەزمونی دیموکراسی ئەوروپا.

## رەگەز و رۆشنبیری

شوناسی رۆشنبیری دوو دوژمنی هەیە: تاکگەری و جیهان نیشتیمانی. دیسان با گوێ لە فرانتس فانون بگرین: "بێ توانای باو و بۆماوەیی (وراسی) ویژدانی نەتەوەیی لە وڵاتە گەشەنەکردوەکاندا، تەنها دەرئەنجامی برینی دەسەڵاتی ئیستیعمار نیە بەسەر مرۆڤی کۆلۆنیالکراودا، ئەم بێ تواناییە هەروەها دەرئەنجامی لاوازی بۆرژوازی نەتەوەیی، کەم مایەیی و پەروەردەکردنی **قوڵی جیهان نیشتیمانی دەرونی ئەوە**".

لێرەوە کارەکە بەهۆی سەربەخۆییەوەچاك نابێت. سەرەڕای مەترسی رمان لەناوەوە، مەترسی گەڕانەوەی فیڵبازانەی بێگانەش هەیە و دەوڵەتی نەتەوەیی هێشتا لەدایك نەبووە، دەبێ لە دوو بەرەدا بجەنگێ: یەکەم ئەوەی بەچاودێریەکی هوشیارانەوە گونجانی ئیرادە فەردیەکان مسۆگەر بکات و دوهەم ئەوەی کە کۆمەڵگاکەی خۆی لەهەموو گۆڕانی ماهیەتێك بپارێزێ. رۆمانسیە ئەڵمانیەکان پێشتر دەیانگووت "هەموو ئەو شتانەی بێگانەیە، هەموو ئەو شتانەی بێ هیچ هۆیەکی بنەڕەتی هاتۆتە ناو ژیانی نەتەوەیەکەوە، دەبێتە هۆی نەخۆشی نەتەوە و ئەو نەتەوەیە گەر بیەوێت تەندروست بمێنێتەوە، دەبێ ئەوانە توڕهەڵدات". بەمشێوەیە شوناسی رۆشنبیریی، ترس لە تیکەڵبوون، وەسوەسەی خەیاڵ بۆ مانەوە بە رەسەنی، وەسواسی ئالودە نەبوون دەکاتە جێگری خۆپەرستی ئیستیعماری.

مرۆڤی سپی کە پشتی بە جیهانیبوونی شارستانێتی خۆی بەستبوو، وە بە هیمەتی خۆی لەناو چەقی مێژوودا راوەستابوو، سوکایەتی بەو نەتەوە کۆنانە دەکرد کە لە ناو تایبەتمەندیەکانی خۆیاندا بە سەختی دەژیان. ناسیۆنالیزمی جیهانی سێهەمی، غەرق لە خۆشی سەرلەنوێ دۆزینەوەی تایبەتمەندی کۆمەڵایەتی خۆیدا، لە بەرامبەر ئیغواکردنەکانی بێگانەدا، بەرگری لێدەکات. بێگانە دەردەکرێت، چونکە "ئەوی دیە" نەك لەبەرئەوەی کە دواکەوتووە. رونتر بڵێم جۆریك رەگەزپەرستی کە لەسەر بناغەی جیاوازی مرۆڤەکانە، رەگەزپەرستی کۆلۆنیالکەران کە پشتی بە نایەکسانی مرۆڤەکان بەستبوو، لە مەیدان دەکاتەدەرێ.

لەڕاستیدا وشەی رەگەزپەرستی گومڕاهکەرە: ئەم وشەیە یەك بەرچەسپ لە دوو شێوە رەفتار کە پەیدابوونی و لۆژیك و ئەنگێزەیەکی تەواو جیاوازیان هەیە، دەدات. یەکەمیان هەموو نەتەوەکانی سەر زەوی لەیەك پلەی نرخ و بەهادا دادەنێت، دوهەمیان بێ شوماری وێنەی بوونی مرۆڤ رادەگەیێنێت. یەکەمیان پۆلینی شێوازەکانی بیرکردنەوە دەکات، دوهەمیان یەکێتی رەگەزی مرۆڤ هەڵدەوەشێنێتەوە. یەکەمیان هەر جیاوازیەك بە ئاماژەی نزمتربوونی یەکێك دادەنێ، دوهەمیان جیاوازیەکان بە خەسڵەتی رەها و نەگۆڕ و ناچاری دادەنێت. یەکەمیان پۆلێن دەکات، دوهەمیان تەفکیك. لە دیدی یەکەمدا ناکرێ ئێرانی بین، لە دیدی دوهەمدا ناکرێ بەشێوەی رەها مرۆڤ بین، چونکە لەنێوان ئەوروپیەك و ئێرانیەکدا هیچ جۆرە هاوبەشیەك نیە. یەکەمیان رایدەگەیێنێت کە شارستانیەت هەر یەکێکە، دوهەمیان بڕوای وایە کە نەتەوەکان زۆرن و بەراورد ناکرێن. ئەگەر

کۆلۆنیالیکردن کۆتایی یەکەمیانە، دوهەمیان بە هیتلەریزم دەگاتە لوتکەی خۆی.

هەنوکە عەیبی فەلسەفەی دامالینی کۆلۆنیالیکردن باشتر دەبینرێ. ئەم فەلسەفەیە دوو دیاردەی میژووی جیاواز بەیەکەوە گرێدەدات، نازیزم بەجۆرێك رەگەزپەرستی رۆژئاوایی دەزانێت...کە لەناوخۆدا سەرف دەکرێ و بڕوای وایە کە ئەم روداوە تەنها "هەنگاوەکانی ئیستیعمار کە تا ئێستا تەنها لەناو عەرەبەکانی جەزائیر و کرێکارانی هیندی و رەشەکانی ئەفریقادا ئەنجامدەدرا، لە خودی ئەوروپادا بەکار دەهێنیٚ". دەرئەنجام: ئەم فەلسەفەیە بەهۆی چەکی رۆحی نەتەوەییەوە دژایەتی لەگەڵ زیانەکانی سەنتەریزمی نەتەوەییدا کرد، بە سەربەرزیەوە بووە پشتیوانی فرانتس فانون کە دەیگووت "هەقیقەت ئەو شتەیە کە پارێزگاری لە سەرەتاییەکان دەکات و بێگانەکان لەناو دەبات.. باشیش ئەوەیە کە سوك و ئاسان زیانیان پیٚ بگەیێنێت". وەلحاڵ کاتێك نوسەری دۆزەخیان سەر زەوی ئەم تێڕوانینانەی دەگوت، بەگشتی وشە بە وشە رەخنەکانی بارسی لە خود، لە هەقیقەت و لە شتی رەها، دوبارە دەکردەوە. بۆنمونە لە "لە رەگەوە دەرهێنراوان"دا دەخوێنینەوە: "هەقیقەت ئەوەیە کە پێداویستیە رۆحیەکانمان، دابین دەکات". و لە "دەفتەرەکانی من"دا بەمشێوەیە: "دەبیٚ فێری هەقیقەتی فەرەنسی بین، واتە ئەو هەقیقەتەی کە بۆ نەتەوەی فەرەنسا سودمەندە".

بێگومان چەمکی رەگەز، بە کارکردنی هاوئاهەنگی زانستە کۆمەلایەتی و سروشتیەکان، لەناوچوو. لە رۆژگاری ئێمەدا، ریسککردن و دۆزینەوەی بناغەیەکی سروشتی بۆ جیاوازی نێوان کۆمەڵگاکان، مەترسی ئەوەی تێدایە خۆمان لە بواری دانایی بکەینەدەرێ. دۆزینەوە گومان هەڵنەگرەکانی بایەلۆجیستەکان و ئەنترپۆلۆگیا، چیدی رێگەمان نادات کە رەگەزی مرۆڤ بۆکۆمەڵیٚ گروپی نەتەوەیی بە سنوری دیاریکراوەوە، کە هەریەکەیان زیهنیەتی تایبەتی بۆماوەیی خۆیان هەیە، دابەش بکەین. ئێمە فێربووین کە جیاوازی لەنێوان شتە بۆماوەییەکان و شتە وەرگیراوەکاندا بکەین، چیدی ئەوەی لەراستیدا پەیوەندی بە نەریت و مێژووەوە هەیە، نەخەینە ناو دراوە بۆماوەییەکانەوە. ئێمە وەك نیشانەی دیاری پێشکەوتنی فکری و ئەخلاقی، خەسڵەتی ریژەیی و کاتیبوونی خەسڵەتەکان کە پێشتر بە دراوە ئەبەدیەکانی مرۆڤایەتی دادەنرا، دەناسینەوە. بەکورتی چیدی هەڵمان ناخەڵەتێنن: بەڵگەی بایەلۆجی ئیدی بایەخی خۆی لەدەستداوە، هەنوکە دەزانین لە عیبادەتی مەزهەبیەوە تا تەکنیکی پیشەسازی، لە نانخواردنەوە تا شێوەی جل لەبەرکردن و لە ئەدەبیاتەوە تا وەرزشە دەستەجەمعیەکان، هەر هەموویان رۆشنبیریین.

بەلام داهێنەرانی رەسەنایەتی نەتەوەیی ئەمەیان دەزانی. ئەوان یەکەم کەسانێك بوون کە جیاوازی سازش نەکەری رۆشنبیریەکانیان لەبەرامبەر سروشتی مرۆڤدا دانا و روانگەی پایەداری فەیلەسوفانیان گۆڕی بۆ روانگەی درەوشاوەی هاوسێیەتی جەوهەرە دەستەجەمعیەکان. گریمانەی چەوساندنەوەی رەگەزی کە پاشان و سەرەرای ئەو دروستبوو، تەنها ئەم **ئینکاری سروشتی مرۆییە** و بەشێوەیەکی گشتی تر ئینکاری هەموو ئەو شتانەی کە رەنگە جیاوازی داب و نەریتەکان بڵند بکاتەوە، کردە ملکەچی نەتەوەیی. خەسڵەتە تایبەتیەکانی هەر نەتەوەیەك لە جینەکانیدا نوسراوە، روحە نەتەوەییەکان، بوون بە خێوئاسایەك کە هەریەکەیان خەسڵەتی بۆماوەی نەمر و نەگۆڕیان هەیە. هەنوکە ئەم گریمانەیە لەناوچووە، بەلام چ پێشکەوتنێك بەدەستهاتووە؟ دەمارگیریە هاوچەرخەکانی شوناسی کلتوری، وەك ستایشکەرانی دوێنێی

ڕەگەز، مرۆڤ دەکەنە زیندانی پێویستیە ڕۆشنبیرییەکانی و وەکو ئەوان لە جیاوازیە ڕۆشنبیرییەکان، مەسەلەیەکی ڕەها دروستدەکەن و بەناوی فرەیی هۆکاری تایبەتمەندیەکان، هەموو جۆرە هاوبەشیەکی سروشتی یان ڕۆشنبیری نێوان مرۆڤەکان لەناو دەبەن. لە وەڵامی ڕۆناندا کە دەیگووت "مرۆڤ نە دەگەڕێتەوە بۆ زمانی و نە بۆ ڕەگەزی، مرۆڤ تەنها دەگەڕێتەوە بۆ خۆی، چونکە بونەوەرێکی ئازادە، واتە بونەوەرێکی ئەخلاقیە". بارس دەیگوت "ئەخلاقیبوون ئەوەیە کە مرۆڤ نەیەوێت لە نەژادی خۆی ئازاد بێت". ئایا هیچ کەس بڕوا دەکات کە بۆ ڕەدکردنەوەی بارس تەنها ئەوەندە بەسە کە وڕێنە بایەلۆجیەکانی بگۆڕینە سەر دەستەواژەی جیاوازیە ڕۆشنبیرییەکان و ڕایبگەیێنین کە ئەخلاقیبوون ئەوەیە کە مرۆڤ نەیەوێت لە ڕۆشنبیریی خۆی ئازاد بێت و دەبێ بەهەر نرخێك بووە لەبەرامبەر دەسەڵاتی ڕۆشنبیریی بێگانەدا ڕاوەستێت، ئەگەر وابکەین، ئەوا درێژەمان بە ڕێبازی ڕۆحی هاوبەشی کۆمەڵگا داوە کە بە ئەندێشەی ڕۆحی ملی دەرکەوت و چەوساندنەوەی ڕەگەزی ڕیوایەتی پەرەسەندوو و تێپەڕی بوو، ڕەگەزپەرستی بە گۆڕینی بەڵگەی بایەلۆجی بۆ بەڵگەی ڕۆشنبیریی لەناو نەچووە، بەڵکو گەڕاوەتەوە بۆ خاڵی دەستپێکردنی.

## زمانی دوولایەنەی یۆنسکۆ

یۆنسکۆ لە ساڵی 1971دا بیست ساڵ پاش بڵاوبونەوەی کتێبی ڕەگەز و مێژوو، کلۆد لیڤی شتراوسیان بانگهێشتکرد بۆئەوەی لە کۆڕێکی وتار خوێندنەوەی گەورەدا، ساڵی نێونەتەوەی خەبات دژی ڕەگەزپەرستی، بکاتەوە. هەمووان چاوەڕێ بوون کە ئەم ئەنترۆپۆلۆگە مەزنە جارێکی دی پوچی زانستی چەمکی ڕەگەز، ڕابگەیێنێت. بەڵام بە پێچەوانەی پێشبینیەکانەوە، لیڤی شتراوس پێی باش بوو کە چەمکی ڕەگەز بە جدی وەربگرێت و بگەڕێتەوە بۆ مەسەلەی کۆنی پەیوەندی نێوان ڕەگەز و ڕۆشنبیری. ئەو بە یارمەتی کارە زۆر تازەکان لەبارەی جینی خەڵکیەوە، ڕێگەچارەیەکی پێشنیار کرد کە ڕێك پێچەوانەی ڕێگەچارەی زانایانی ئەوروپی سەدەی نۆزدە و بەشی سەرەتای سەدەی بیستەم بوو بۆ ئەم مەسەلەیە. "شێوازە ڕۆشنبیرییەکان کە مرۆڤەکان لێرە و لەوێ بەخۆیانەوە دەگرن، شێوازی ژیانیان، بەو شێوەیەی کە لە ڕابردودا پێیان باشتر بووە یان هەنوکە پێیان باشترە، ئەمانەن بەشێوەیەکی بەربڵاو شێوەی گۆڕانکاریە بایەلۆجیەکانی مرۆڤەکان و ئاراستەی ئەم گۆڕانانە، دەستنیشاندەکات.پێویست ناکات لەخۆمان بپرسین کە ئایا کلتور پێداویستی کارکردنی ڕەگەزە یان نا. ئێمە دۆزیومانەتەوە کە ڕەگەز. یان ئەو شتەی کە لەم وشەیە مەبەستمانە. یەکێك لە پێداویستیەکانی کارکردنی کلتورە".

سەرەڕای ئەم هەڵگێڕانەوەیە، مەسەلەکە هەراو هوریا بەرپا دەکات. لیڤی شتراوس،گوێگرانی توڕە دەکات. ئەو کە بە کتێبی ڕەگەز و مێژوو بە دەربڕینێك دوهەین بەڵگەی سەرەکی یۆنسکۆی نوسیبوو، هەنوکە بە هەڵگەڕانەوە، تاوانبار دەکرێت. ئەو تاوانەی ئەنجامی داوە گێڕانەوەی بەشێك لە ڕەوایەتیە بۆ چەمکی ڕەگەز. ئەمەش خۆی "کردنە ژورەوەی گورگ بوو بۆ ناو مێگەل". لە بەرامبەر جەختکردنی ڕێکخراوی یۆنسکۆ کە ئەندێشەی ڕەگەزی تا ئەو جێگەیە ڕەد کردبوو‌ە کە تەنانەت هەر ڕامانێك لە وشەی ڕەگەز لەپێشەوە نەفی بکات، لەگەڵ ئەوەشدا کە پێشتر خۆی زانستی بۆ هاوکاریکردنی، داواکردبوو، بەڵام هەنوکە ئەو بەشە لە دەستکەوتەکانی زانین کە لە ڕوایەتیەکانی یاخی دەبن، تەکفیر دەکات، ڕەنگە مرۆڤ گاڵتەی پێ بێت. بەڵام لێرەدا گاڵتەکردن بەس نیە. لەڕاستیدا هەر لەو کاتەدا کە وشەی ڕەگەز لە ڕێکخراوی یۆنسکۆدا

تابۆدەکرێت، ئەندێشەی رەگەز ناسی و بە بتکردنی جیاوازیەکان، لەپاڵ چەمکی دور لە رەخنەی رۆشنبیریدا، دوبارە دروست دەبێتەوە. لە بڕیارنامەکانی هەنوکەی یۆنسکۆدا هاتووە کە مرۆڤ هەموو جەوهەری خۆی لەو کۆمەڵگایەوە وەرگرتووە کە سەر بەوە و شوناسی کەسێتی تاکەکان لەگەڵ شوناسی کۆییاندا، تێکەڵە. هەموو شتێکیش. بیروڕاکان، بەهاکان، هوشیاری و هەستەکان. لە مرۆڤەکاندا بەرهەمی کۆمەڵێکی پێکهاتوو لە ئاو و هەوا، شێوەی ژیان و زمانە کەپێشتر ناوی رەسەنایەتی نەتەوەییان لێدەنا و هەنوکە ناوی دەنێن رۆشنبیری گرنگ تەواوێتی گروپە، نەك موختاربوونی تاکەکان. ئامانج لە فێربوون ئەوە نیە کە بە تاکی مرۆڤەکان ئامێرگەلێك بدرێ بۆئەوەی جیاکاری لەنێوان ژمارەی زۆری بیروڕاکان و باوەڕەکان و مەسەلەکانی ژیانی رۆژانە و تیورە وەرگیراوەکان کە میراتی ئەوانە، بکات ، بەڵکو بە پێچەوانەوە مەبەستی فێرکردن ئەوەیە کە تاك لەم ئۆقیانوسەدا غەرق بکات، ئەڵبەتە سەرەتا سەری: "رۆشنبیری وپەروەردە، دوو بواری هاوتەریب نین، بەڵکو کار لەیەك دەکەن و دەبێ وەك دوانەیەك گەشە بکەن، جگە لەوەی کە رۆشنبیری پەروەدەکردن کە بێگومان باشترین هۆکاری گواستنەوەی رۆشنبیریە و لەمڕووەوە باشترین ئامێری بڵندبونەوە و بەهێزبوونی شوناسی رۆشنبیرییە، دەوڵەمەند دەکات".

بونیادنەرانی یۆنسکۆ لە نازیەکانەوە ئەو وانەیەیان وەرگرتبوو کە لەنێوان بەربەریەت و نەبوونی ئەندێشەدا پەیوەندیەك هەیە و ویستبوویان ئامێرێك لە ئاستی نێو نەتەوەیدا دروستبکەن کە لەرێگەیەوە رۆشنبیری بۆ زۆرینەی مرۆڤەکان بگوێزێتەوە. جێگرەکانیان هەمان وشە بەکار دەهێنن، بەڵام مانایەکی تەواو جیاوازی پێدەبەخشن. بەهەمان شێوە بە هەرا و هوریاوە باسی رۆشنبیری و پەروەردە کردن دەکەن، بەڵام لەبری رۆشنبیری وەك ئەرکێك (وەك *Bildung*) رۆشنبیری وەك سەرچاوەیەك دادەنێن و پرۆسەی پەروەردە هەڵدەگێڕنەوە. لەهەر کوێیەك "من هەبوو، دەبێ ببێ بە ئێمە". لەبری رۆشنبیری بوون (و لەم رێگەیەشەوە هاتنە دەرەوە لە دنیای بچوکی خود) لێرە بەدواوە دەبێت رۆشنبیری خود بدۆزرێتەوە کە مەبەست لێی "کوێ ئەو ناسین و بەهایانەیە کە بابەتی پەروەردەیەکی تایبەت نین، بەڵام هەر ئەندامێکی کۆمەڵ دەیزانێت". ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە ئەندێشەی رۆشنگەری ناوی نابوو بێ رۆشنبیری یان باوەڕە کلاسیکیەکان. کەوابوو لیختن بێرگ رۆشنبینیەکی شومی لەخۆی پیشان دابوو کاتێك دوو سەد ساڵ پێش نوسی "ئەمڕۆ لە هەموو شوێنێك هەوڵدەدەن تا پەرە بە زانین بدەن، چ کەسێك دەزانێت، رەنگە چەند سەدەیەکی دی زانکۆگەلێك بۆ هێنانەوەی سەرلەنوێی نەزانینەکانی پێشوو دروستبکرێ".

لە بیستەمین دانیشتنی کۆنفرانسی گشتی یۆنسکۆدا، هەر بەم دیدەوە، بڕیارنامەگەلێك لەبارەی بەشداری رێکخراوە خەبەریەکانەوە بۆ بەهێزکردنی ئاشتی و لێك تێگەیشتنی نێونەتەوەیی، بڵندبونەوەی مافەکانی مرۆڤ و خەبات دژی رەگەزپەرستی وچەوساندنەوەی رەگەزی و جەنگ بە "هەلهەلە و چەپڵە لێدانی ئامادەبوانەوە"، سەلمێنرا. مەسەلەکە بریتی بوو لە بونیادنانی سیستەمێکی تازەی هەواڵناردن و پەیوەندی، بۆهاوسەنگکردن لەبەرامبەر چوار دەزگای هەواڵی رۆژئاواییدا. یۆنایتدپریس، ئاسوشیتدپریس، رۆیتەر و هەواڵگری فەرەنسە. لە رێگەی بڵاوبونەوە و رێزگرتن لە هەواڵگری و دەزگا پەیوەندیە گشتیەکانی جیهانی سێهەم. "دابینکردنی هاوسەنگی تازە و بەرابەری باشتر لە بڵاوبونەوەی هەواڵدا دەبوو رێگە بدات کە "تێروانین و ئارەزوەکانی نەوەی گەنج" (مادەی4) و "دیدی کەسانیك کە پێیان وایە هەواڵە بڵاوکراوەکان

بەتوندی زیان لەکارێك دەدات کە ئەوان لەپێناوی بەهێزکردنی ئاشتی و لێکتێگەیشتنی نێونەتەوەیی و بڵندبونەوەی مافەکانی مرۆڤ یان دژایەتی رەگەزپەرستی و چەوساندنەوەی رەگەزیدا، ئەنجامیدەن" (مادەی5) ببیستریٚ.

رەخنەیان لەو هەواڵگرانەی کە پاوانی بڵاوکردنەوەی هەواڵیان کردووە، دەگرت کە بەم پاوانکردنە و سەپاندنی ئاراستەیەکی یەکلایەنە بە پەیوەندی مرۆڤەکان، ئازادیان توشی خنکاندن کردووە.چونکە لە دیدی داڕێژەرانی سیستەمی جیهانی تازەی هەواڵ و زانیاریەوە، رۆژنامەنوسی رۆژئاوایی لەهەرحاڵەتیکدا و بەرلەوەی مرۆڤێك بێت **رۆژئاوییە**. تێڕوانینەکانی لایەنگرانەیە، رۆشنبیرییەکەی هەرگیز لێی جیا نابێتەوە، بۆهەر کوێیەك بڕوات لەگەڵیدایە، وا دەزانیٚ روداوەکانی کۆمەڵگاکانی دی تەعبیر و تەفسیر دەکات یان تەنها دەیانناسێنیٚ، بەڵام لەڕاستیدا جگە لە رەنگدانەوەی بیڕورا لەپێشەوە دروستکراوەکان، هیچ کارێکی دی ناکات.چەند خۆی بە ئازاد بزانێت. چەند بیەوێت واقعبین بێت، هەر دیسان بەستراوە بە بەهاکانی دنیای زیهنی خۆیەوە. رۆژنامەنووس کاتێکیش کە راستەوخۆ لە خزمەت رۆژئاوادا نیە، پەیڕەوی لە پێداویستی و رێنماییەکانی شوناسی کلتوری خۆی دەکات. بەکورتی لە خراپترین حاڵەتدا هۆکارە و لە باشترین حاڵەتدا دەرخەر و لە هەموو حاڵەتێکدا کارمەند. بۆبەرگریکردن لە ئازادی هەواڵ، نابیٚ رێگەی پێبدریٚ کە شۆك دروست بکات و ئەمەش لە دوو رێگەوە دەکرێت: یەکەم دورخستنەوەی خەڵکی لە بواری پڕوپاگەندەکانی و دوهەم روبەروبوەنەوە لەگەڵ دەنگی رۆژئاوادا بەهۆی دەنگی باقی دنیاوە کە ئەم دەنگە ئەرکی ئەوە دەبێت وەفادارانە "خواستەکانی" رۆشنبیریی باقی جیهان دەربڕیٚ. ئەمەش بە روونی واتە دەست لەهەر داهێنان و رەسەنایەتیەکی شەخسی هەڵبگریٚ.

پرۆژەی سیستەمی تازەی جیهانی هەواڵ و زانیاری، سیاسەتەکانی پەروەردەکردن و چاودێری کۆمەڵایەتی و بەدبینی بەرامبەر بە بێگانە، هەموو ئەمانە بەهەمان وشەی رۆشنبیری (کلتور) ئاراستە دەکرێن. یۆنسکۆ لەژێر ئاڵای نەگۆڕی وشەیەکدا کە چەند و چونی تیا نیە، چاو و گویٚ بەستراو، لێرە بەدواوە بەهاگەلێك بڵاو دەکاتەوە کە یەکەم پەیامی خەباتکردن بوو دژیان. وە هەرچەند دژایەتی رەگەزپەرستی ئەمڕۆ زیاتر لە رەگەزپەرستی دوێنیٚ بچێت، وشەی رەگەز زیاتر تەکفیر دەکرێت. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە لیڤی شتراوس کە خۆی ئیلهامبەخشی هەڵگێڕانەوەی کاملی چەمکی رۆشنبیری بوو، چۆن توانی تورەبونەکان بوروژێنیٚ، ئەڵبەتە بیٚ ئەوەی لەبەرئەمە گۆڕانێك لە قسەکانیدا بکات. بەڵام ئەو هەرا و هوریایەی کە وتارەکەی لیڤی شتراوس نایەوە، دەرئەنجامی ئەوەبوو کە ئەو بڕوای بەوە نەبوو "شێوەی رەفتاری تاکەکان یان گروپەکان کە وەفاداریان بۆ هەندێك بەها، بە رێژە یان بە تەواوی سەبارەت بە بەهاکانی تر بێهودەیان دەکات"، لە ریزی رەگەزپەرستیدایە. ئەم گێڕانەوەی حەیسیەتە بۆ هەندێك وێنەی لێکنەبوردن، بۆ ئەنداماني رێکخراوێك کە لە سەرەتای دروستبونیەوە ئەرکی هاوکاریکردن بۆ لێکتێگەیشتن و برایەتی نەتەوەکانی لە ئەستۆگرتبوو، بە ئاسانی نەدەبەخشرا. چونکە گەر "بەربەرەکانی پروپاگەندەکەر بۆ خەسڵەتە نەتەوەییەکان" بەر لە ئێستا بە قسەی کێنەئامیزانە و هەروەها بە ستایشکردن لە ژیانی جەنگاوەرانەوە، دەهاتنە مەیدان، راگەیەندنەکانی هەنوکەیی یۆنسکۆ بەڕاستی شاعیرانەن و لەناویاندا جگە لە باسی ئاشتی و عەشق و سازشکردن، هیچیدی نیە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەدەبوو لیڤی شتراوس لەو روەوە کە هەڵنەسەنگێنراو قسەی کردبوو، سەرزەنشت بکریٚ. روون نیە کەسانیك کە

هەریەکێکیان لە رۆشنبیری و کلتوری خۆیدا غەرق بووە، بە چ ئەفسونێکەوە لەناکاو مەجزوبی بەشە جیاوازەکانی ژیان یان وێنەی ئەندێشەی دور لە نەریتەکانی خۆی بووبێت.پاشان گەر دەوڵەمەندی مرۆڤایەتی لە جیاوازی شێوەکانی بوونی مرۆڤدایە، ئەگەر "شانازی داهێنانی بەهای مەعنەوی و ستاتیکی کە نرخ و بەها بە ژیان دەدات" وەك لیڤی شتراوس دەنوسێت، وەك تێوریەزەنە گەورەکانی یۆنسکۆش بە زمانێکی دی دەیڵێن، پەیوەندی بە هەمەڕەنگیەوە هەیە، لەم حاڵەتەدا دژایەتی دولایەنەی رۆشنبیریەکان، نەك هەر سروشتی، بەڵکو ناچاریە. ئەم ململانێی رۆشنبیریەکان دەرخەری "بەهایەکە کە دەبێ بدرێت بۆئەوەی سیستەمی بەهای هەر خێزانێکی مەعنەوی یان کۆمەڵایەتی بپارێزرێ و سەرچاوەی پێویست بۆ ژیاندنەوەی خۆی لە قولایی خۆیدا بدۆزێتەوە".

بەڵام هەڵەی لیڤی شتراوس ئەوەبوو کە بێ پەردە قسەی کرد و تێڕوانینی خۆی بۆ رۆشنبیری لەگەڵ ستایشێکی ناسکدا بۆ دژایەتی بێگانە، تێکئالان. یۆنسکۆ و لەگەڵیدا فەلسەفەی داماڵینی کۆلۆنیالیکردن، بەگشتی پێی باشتربووە کە لۆژیکی خۆی نەگەیێنێتە کۆتایی: رۆحی جەنگ، لەوێ هەمیشە وەك ستایشێکی نەرم بۆ لێك تێگەیشتنی نێونەتەویی، دەردەکەوێت. وتوێژ لەوێ بەناوی مەزهەبی جیاوازیەوە، پشتی پێ دەبەسترێ، مەزهەبێك کە هەموو وتوێژێك نەفی دەکات. لەناوبردنی تاك لەوێ، ناوی ئازادی وەردەگرێ و وشەی کلتور لەوێ (واتە لە یۆنسکۆ) ئالایەکی هیومانیستیە بۆ دابەشکردنی مرۆڤایەتی بەسەر هەمەکیەکی کۆمەڵایەتی سەربەخۆدا کە نەدەکرێت بەسەریدا سەربکەوین و نەدەکرێت وەلاوەی بنێین.

## سەرچاوە


وەرگێڕانی فەسڵێکی ئەم کتێبەی خوارەوەیە:

الن فینکل کروت: شکس تاندیشه. ت. دکتر عەباس باقری. مجموعه سپهر اندیشه. تهران/چاپ اول1375.

# ڕەخنە لە ئەقڵانییەت
# (نیچە، هۆسێرل، دێریدا)

د. جۆرج زیناتی
لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

**سەرەتایەك**

فەلسەفە و ئەقلآنییەت دوو هاوڕێی یەك ڕێگان، ئەگەر ئەقلآنییەت نەبوایە فەلسەفەش نەدەبوو، تەنانەت ئەرستۆش پێی وایە فەلسەفە لە (تالیس)ەوە دەست پێدەكات، واتە لەو ڕۆژەوەی مرۆڤ وازی لە تەفسیری میتۆلۆجی – ئەفسانەیی دیاردە سروشتییەكان هێناو هەوڵیدا بەشێوەیەكی زانستی – واتە ئەقلآنی – تەفسیری دیاردە سروشتییەكان بكات. بەلآم ئەم هاوڕێیەتییە دوورودرێژەی نێوان فەلسەفە و ئەقلآنییەت بەبێ كۆمەڵێ قەیرانی توندوتیژ تێنەپەڕی، كە ئەوەندەی نەمابوو فەلسەفە و ئەقلآنییەتیش لەناوبەرێت. لە چەرخە دێرینەكاندا سۆفیستەكان جەنگێكی بێئامانیان لە دژی ئەقلآنییەت بەرپا كرد و بانگەشەی ڕێژەگەراییەكی ڕەهایان دەكرد، ئەمەش هەڕەشەی لەو ناوەند و لەو قەوارەیە دەكرد كە زانست پشتی پێبەستبوو. دەتوانین بڵێین سەرانسەری فەلسەفەی ئەفلاتون بریتی بوو لە ململانێیەكی بەردەوام لەگەڵ سۆفیستەكاندا لە پێناوی چەسپاندنی چەند بنچینەیەكی جێگیر تا ببێت بە سەرەتایەكی توندو تۆڵ بۆ هەموو زانستێكی مرۆیی داهاتوو. هێشتا جەنگی ئەفلاتون لەگەڵ سۆفیستەكاندا خامۆش نەببوو لە پڕ قوتابخانەی گومانكاری *Scepticisme* سەریهەڵدا و جیاوازیی بیروڕاو بۆچوونی خەڵكی كرد بە پاساوێك بۆ تێكشكاندنی هەموو بەهایەكی ڕەهای ئەقڵ و جەختی لەسەر ئەوە كرد كە هەموو سەلماندنێكی عەقڵی پێویستی بە سەلماندنێكی تر هەیە و بەمجۆرە ئەم مەسەلەیە تا بێكۆتایی درێژ دەبێتەوە. ئەگەر چی ئەم قوتابخانەیە لە سەدەی سێیەمی پێش زایین دروست بووە، بەلآم لە سەدەی دووەمی زایینی و لە ڕۆژگاری ئیمپراتۆریەتی

رۆمانیدا گەشەی کردووە، لەو دەمانەدا ئۆگستین جەنگێکی گەورەی لە دژی لایەنگرانیدا بەرپاکرد. لە کەلەپووری عەرەبیدا جەنگ لە دژی دەسەڵاتی ئەقڵ و بەها رەهاکانی عەقڵدا بریتی بوو لە جەنگی ململانێی نێوان ئەقڵ و نەقڵ، جەنگی رەتکردنەوەی هەموو شتێکی هاتوو لەلایەن میللەت و نەتەوەکانی ترەوە و سەدای ئەم جەنگەش لەلای فەیلەسووفی عەرەب (کندی)دا دەبینین کاتێ دەڵێت: "دەبێ شەرم نەکەین لە هەموو ئەو شتە چاکانەی لە شوێنە دوورەکانەوە بۆمان دێن".

ئەگەر بگوازینەوە بۆ خۆرئاوا دەبینین سەدەی حەڤدەهەم لەگەڵ دیکارت و دیکارتیستەکاندا و لە سەرووی هەموویانەوە سپینۆزا، دەبێتە لوتکەی سەرکەوتنی ئەقڵانییەت. بەڵام لە ساڵی 1781 دا کانت لە کتێبە ناودارەکەیدا "رەخنە لە ئەقڵی پەتی" ئەقڵمان لە هەموو دژایەتییەکانی خۆیدا پێنیشاندەدات، واتە لە هەموو تواناکانی ئەقڵ بۆ سەلماندنی شتێك و دژەکەی لە هەمان کاتدا، بێگومان ئەمە لە مەسەلە سەرەتاییەکانی فەلسەفەدا.

بەمجۆرە رێگە لە هەموو میتافیزیکیای تیۆریی لێوردبوونەوەیی دەگرێت. ویستمان لەم پێشەکییە کورتەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەقڵ و ئەقڵانییەت لە بەهاکانی خۆیاندا بەردەوام رووبەڕووی رەخنە و بریندارکردن و گومان بوونەتەوە لەو کاتەوەی مرۆڤ بە شێوەیەکی زانستیی دروست بیری کردۆتەوە. ئەم جەنگە لەم چەرخەی ئەمڕۆماندا نەوەستاوە بەڵکو مۆرکێکی توندتری بەخۆوە گرتووە کە هەڕەشە لە بنچینەکانی هەموو بیرکردنەوەیەکی مرۆیی دەکات بەمانای بوونی بەشەری و ئامانجە کۆتاییەکەی. ئێمە لێرەدا و لە کەلەپووری فەلسەفیی خۆرئاواییدا لە تەك سێ فەیلەسووف و بیرمەنددا دەوەستین کە ئەم گرفتە سەرقاڵی کردوون و بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ بەشداربوونە لە هەڵگیرسانیدا. دواتر هەوڵدەدەین ئەو مانا شاراوەیە ببینین کە لە پشتی ئەم چەشنە ململانێیانەدا حەشاردراون هەروەها ئاسۆی ئەو ئایندەیەی زۆرجار وا دەردەکەوێ ئاسۆیەکی داخراو بێت. بەمجۆرە، لە میانی خوێندنەوەی قەیرانەکانی خودی ئەقڵانییەتدا، هەوڵدەدەین وەڵامی ئەم پرسیارە دڵەڕاوکێئامێزە بدەینەوە: ئەمڕۆ ئەقڵ چی دەگەیەنێت؟ ئەم پرسیارە ترسێکی گەورە لە بێتوانایی ئەقڵ دەوروژێنێ لە چارەسەرکردنی رستێك لەو گیروگرفتانەی چارەنووسی بەشەرییەتی هاوچەرخ دەیانخاتەڕوو، هەروەها وەڵامدانەوەی پرسیارە بەردەوامەکانی مرۆڤ لەم زەمەنە سەرسوڕهێنەرەی ئەمڕۆدا، واتە زەمەنی سەرسوڕهێنەر و ترسێنەر لەیەك کاتدا. ئەو سێ فەیلەسووفەی لەم باسەدا لێیان دەدوێین، بریتین لە: نیچە و هۆسێرل و دێریدا.

## نیچە و رەخنە لە ئەقڵانییەت

رەخنەی نیچە لە ئەقڵانییەت لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا رەخنەیەکی رەگوڕیشەیی بوو، ئەم رەخنەیە درێژ دەبێتەوە و دەگاتە ئەو بنچینانەی کە هەموو کەلەپووری فەلسەفیی مرۆڤایەتی لەسەر دامەزراوە، تەنانەت زانستەکانی پۆزەتیڤیزمیش لە رەخنە بریندارکەر و گاڵتەئامێزەکانی نیچە دەرباز نەبوو. نیچە ئەوە رەتدەکاتەوە کە ژیان و سروشت بە هەموو دیاردەکانیەوە لە چەند داڕشتەو فۆرمیولایەکی زانستیدا کورت بکرێتەوە و قوتابیان و زانایان لە نێوان خۆیاندا لێی بدوێن، ئەمە چونکە هەر دیاردەیەك کە هەموو مەستییەکی ژیان دەشارێتەوە، هیچ فۆرمیولایەکی زانستی هەرچەندێ ورد بێ ناتوانێت لە هەموو لایەنێکی ئەو دیاردەیە

شارەزا بێت. لە ئاستی فەلسەفیشدا ئەو رەخنەیەی نیچە دایدەمەزرێنێ لە چاو زۆربەی فەلسەفەکانی ئەمڕۆماندا کاریگەرییەکی گەورەتر و پتری هەیە. سەیر ئەوەیە فەلسەفەی نیچە لە سەرەتادا لەلایەن ئەوپەڕی راستەوە وەك (فەلسەفەی هێز) وەرگیرا، نیچەش ناونیشانی دوا کتێبی "ئیرادەی هێز"ی لەوێوە وەرگرتووە. کەچی لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی نیچە بوو بە رابەری ئەو شۆڕشگێڕانەی هەموو دابونەریتێکیان رەتدەکردەوە. پۆل ریکۆر دان بەوەدا دەنێت کە نیچە ئەو فەیلەسووفەیە سەرتاپا هەژاندوویەتی و بەشێکی گەورەی نووسینە فەلسەفییەکانی تەرخان کردبوو بۆ وەڵامدانەوەی نیچە. لە کاتێکدا شیکردنەوەکانی جاك دێریدا دواجار دەگەنە نیچەی تیۆریستی چەرخی نوێ. دیسان فەلسەفەی نیچە لە پتر لە ئاستێك و لە پتر لە بوارێك مارتن هایدگەری سەرقاڵ کردبوو. هەروەها فەیلەسووفی گەورەی ئەڵمانی کارل یاسپێرس کتێبێکی تەرخان کرد بۆ نووسین لە بارەی نیچە وەك دەروازەیەك بۆ فەلسەفەکەی خۆی.

نیچە لە کتێبی "جینالۆجیای رەوشت" کە لە ساڵی 1887 بڵاوکراوەتەوە، بەم دەستەواژەیە دەست پێدەکات: "ئێمە خۆمان ناناسین، ئێمەین بە دوای مەعریفەدا دەگەڕێین. لە واقیعدا ئێمە رۆژێك بە دوای خۆماندا نەگەڕاوین، ئیتر چۆن دەشێت رۆژێ لە رۆژان خودی خۆمان کەشف بکەین؟ راستیان وتووە لە کوێدا کەنزی تۆ هەبێت دڵیشت لەوێدایە، کەنزی ئێمە لەو شوێنەدایە کە خانەکانی مەعریفەمان دەنگی نەغمەی لێوە دێت. ئێمە بەردەوام بەرەو خانەکانی هەنگ دەڕۆین". ئەم تێکستە سەرجەمی رەخنەی نیچە نەك تەنها لە فەلسەفە بەڵکو لە هەموو زانستیش کورت دەکاتەوە. ئێمە، لە دیدی نیچەدا، خانە و ماڵ و هێلانەی هەنگ بنیات دەنێین و باوەڕمان وایە کە سەرانسەری زانست و سەرانسەری فەلسەفە، واتە ژیان بە هەموو فراوانییەکیەوە، دەشێت لەو ماڵۆچکە ناچیزانەدا نیشتەجێ بن کە جگە لە مەرگێکی زەرد هیچ شتێکی تر هێلانەی تیادا ناکات. لە راستیدا نیچە تەنها رەخنە لەو فەلسەفەیە ناگرێت کە بە شێوەیەکی بنچینەیی لە میتافیزیکیادا نوێنراوە، ئەم چەشنە رەخنەیە جگە لە نووسینەوەی میتافیزیکیایەکی نوێ شتێکی تر نییە. ئەوەی نیچە لەم کتێبەیدا و لە کتێبەکانی دیکەشیدا هەوڵی بۆ دەدات، بریتییە لە پرۆسەی لابردنی دەمامکی سەر روخساری گوتاری فەلسەفی و زانستی، ئاخۆ لە پشتی دەمامکەکانەوە چ شتێك ئاشکرا دەکەین؟

کاتێك دەمامکەکان لادەبرێن دەبینین میتافۆر رۆڵێکی بنچینەیی لە سەرجەمی گوتاری فەلسەفیدا دەبینێ، بە تایبەتی لە گرفتی کەینونە و بووندا، ئەوسا بۆمان دەردەکەوێ بزاوتی بەردەوامی هێرمینۆتیکا تەنها هەوڵێك بووە بۆ پاسادان و گەڕاندنەوەی هەموو دامەزراوە ئایینی و ئەخلاقی و مافەکان. لێرەوە دەبینین سیستمە فەلسەفییە جیاواز و دژ بە یەکەکان کە گوایە سیستمی ئەقڵین و لەسەر پاساوی لۆجیکی وەستاون، لە واقیعدا جگە لە چەند پرۆسەیەکی چەشناوچەشنی میتافۆرە کەڵەکەکراوەکان کە لە دامەزراوە تەقلیدییەکانەوە وەرگیراون، شتێکی تر نین، ئەمەش لە پێناوی پاسادانی بوونی ئەو دەزگا و دامەزراوانەیە.

بۆ نموونە سیستمی ئایدیالی لە فەلسەفەدا، ئیستاتیکای گوتار و زمان هەڵیخزاندووە یان فریوی داوە، ئەو ئیستاتیکایەی لە سەقامگیربوونی مۆرفۆلۆجی (وشەسازی – صرف) و سینتاکس (رستەسازی – نحو) و تەجریدکردنیاندا دەنوێنرێت. کاتێ سینتاکس رێسایەکی جێگیر لە زمانی

شیعریی ئەفلاتوندا دەچەسپێنێ وەك پێداویستییەك بۆ دامەزراندنی سیستمێكی فەلسەفیی جێگیر، ئەمە دەبێتە كۆی ڕێسای مۆرفۆلۆجی و سینتاكس سەبارەت بە زمانێكی دینامیكی و بزۆك، لێرەوە جیهانی بێجووڵە و سەقامگیری ئەفلاتون دەبێتە جیهانی نموونەیی كە گۆڕانكاری بەسەردا نایەت بەڵكو هەموو گۆڕانێكی كتوپڕ لە جیهانی هەستیدا ڕاڤە دەكات.

لەگەڵ گریمانەی بوونی جیهانێكی جێگیر و ستاتیك و نەگۆڕدا، پرۆسەی لەدایكبوونی بەهاكان دەست پێدەكات لەسەرووی هەموویانەوە بوونێكی جێگیر، واتە چاكەیەكی بڵند و جووڵێنەر كە خۆی نابزوێت بەڵام بەهایەك بە هەموو شتێكی جووڵێنەر دەبەخشێت لە دنیای گەردوون و خراپەكاریدا. چەمكی بوون یان چەمكی كەینونەیەكی جێگیر و بێجووڵە كە بێ ئەو نە زانست بوونی هەیە نە فەلسەفە، چەمكێكە لە بەرامبەر شیكرنەوەدا زۆر بە خێرایی هەڵدەوەشێتەوە و پاشان نامێنێ و تەنها دەبێ بە میتافۆرێكی مردوو كە لە زانستی سینتاكسەوە وەرمانگرتووە. میتافیزیكا لە پاش گرفتی بوون یان كەینونە گوتەزاكانی تر بەرهەمدەهێنێ وەكو گوتەزای خود و بكەر و بابەت و چۆنێتی. ئەم گوتەزایانە لە سیستمە فەلسەفییە جیاجیاكاندا – نەك تەنها لە فەلسەفەی ئایدیالیزمدا – دەردەكەوێ. بۆ نموونە كاتێك بە پشكنینەوە دەڕوانینە فەلسەفەی هیگڵ، دەبینین هەموو خەمی ئەو فەلسەفەیە بریتییە لە بە مێژوویيكردنی گوتەزاكان (واتە هەوڵی ڕاڤەكردن لە ڕێگەی پێشكەوتن و بەرەو پێشچوونی بەردەوامی مێژوو)، واتە مێژووی لەدایكبوونی هەموو گوتەزایەكی فەلسەفی لە بابەتەوە بەرەو خود و بەرەو ئاگایی و بەرەو ئازادی ببەیت. بە دەستەواژەیەكی تر هیگڵ میتافۆرە مردووەكان دەخوازێت تا جەخت لەوە بكات كە ئەمانە چەمكگەلی ئەقڵین و لە ئەنجامی بەرەو پێشچوونی بەردەوامی مێژوو و كاروانی بەشەریەت بەرەو ئاگایی لە خودەوە هاتوون. بە مانایەكی تر لێرەدا ڕەخنەی نیچە دەگاتە ئەوپەڕی ڕادیكالییەتی خۆی و ئەو ئەقڵانیەتەش ڕەتدەكاتەوە كە هەموو فەلسەفەی لەسەر دامەزراوە. فەلسەفە قوربانی درۆیەكی گەورەیە، فەلسەفە لەسەر چەمكگەلێك وەستاوە و پێی وایە ئەو چەمكانە بەرهەمی ئەقڵن، كەچی لە ڕاستیدا ئەمانە جگە لە كۆمەڵێ میتافۆری مردووی فریودەر شتێكی تر نین و خەمی سەرەكیی ئەو چەمكانە بریتییە لە پاساودانی ئەو واقیعەی كە هەیە و هەروەها هەموو شتێكی نوێ سەركوتدەكا. هەموو چەمكێكی فەلسەفی بریتییە لە میتافۆر، بنیاتی فەلسەفی و بگرە زانستیش بریتییە لە ڕستێك میتافۆری مردوو.

## ئیدمۆند هۆسێرل و قەیرانی ئەقڵانییەتی ئەوروپی

كاتێك نازیستەكان لە ئەوروپادا گەیشتنە سەر حوكم، تەمەنی هۆسێرل حەفتاو چوار ساڵ بوو، هەموو كۆششی عەقڵیی خۆی تەرخان كردبوو بۆ داكۆكیكردن لە میتۆدەكەی خۆی (واتە فینۆمینۆلۆژیا – دیاردەناسی). بەڵام لەپڕ و لەگەڵ گۆڕانكارییە ڕیشەییە سیاسییەكاندا هەستی كرد پێویستی بە شتێكی تر هەیە غەیری داكۆكیكردن لە "ئیگۆ – من" و وەسفكردن و كەشفكردنی ماناكەی. هەستی كرد قەیرانێكی خنكێنەر سەرانسەری خۆرئاوای تەنیوەو بەربەریەت هەڕەشەی لێدەكات. كەواتە دەبێ بە قووڵی ئەو قەیرانە بخرێتە ڕوو و هۆكارەكانی بزانرێن، ئەمە بەرەو جۆرێك لە فەلسەفەی مێژووی برد، بەرەو جۆرێك لە ڕامان لە

ئەقڵانییەت و لە سەرانسەری ژیاری خۆرئاوا. هۆسێرل تاساڵی مردنی (1938) لە بارەی قەیرانی ئەقڵانییەتی خۆرئاوا موحازەرەی وتۆتەوە و بابەتی نووسیوە، بەڵام مەرگ نەیهێشت بەردەوام بێت لە داکۆکیکردن لە فەلسەفە و لە ئەقڵانییەت. وتار و موحازەرەکانی لە کتێبێکدا کۆکرایەوە بە ناوی "کریسیس" واتە قەیران، قەیرانی زانستی ئەوروپی و هیومانیزمی ئەوروپی. دەتوانین هەڵوێستی هۆسیرل بەم شێوەیە کورت بکەینەوە:

–ئەم قەیرانەی ئێستا لە قووڵاییدا بریتییە لە قەیرانی زانستەکان و قەیرانی شارستانی، واتە قەیرانێکی ئەقڵانی، کە ناتوانین چارەسەری بکەین ئەو کاتە نەبێ کە بزانین مەبەست لە هەموو مێژووی ئەوروپا چییە، واتە ئەوکاتەی چەمکی ئەوروپا و وێنەی رۆحیی ئەوروپا دیاری دەکەین.

–کاتێ بە دوای دوامانای مێژووی فیکریی ئەوروپادا دەگەڕێین، خۆمان لە بەرامبەر پێویستی دیاریکردنی کات و شوێنی لەدایکبوونی ئەوروپادا دەبینینەوە، ئەوروپا لەگەڵ لەدایکبوونی فەلسەفە لە سەدەی حەوتەم و شەشەمی پێش زایین، لە یۆناندا لەدایکبووە. چارەنووسی ئەوروپا بە چارەنووسی فەلسەفە – واتە بە رۆحی فەلسەفە–وە بەراوردکراوە. کەواتە لێرەدا بەردەوامبوونێکی ژیاریی رۆحی هەیە لە نێوان شارستانیەتی دێرینی یۆنانی و شارستانیەتی هاوچەرخی خۆرئاوایی. وێنەی رۆحیی ئەوروپاش لە ژیانی ناوخۆیی و رۆحیدایە، لە ئەرکی بێکۆتایی ئەقڵدایە. زانستی ئەوروپی لەو بیرانەوە لەدایکبووە کە ئەقڵ –واتە رۆحی فەلسەفە– بەرهەمی هێناون.

–ئەو قەیرانەی ئەمڕۆ ئەوروپا تێیدەپەڕێنێ، قەیرانی چارەنووسە، ئەوروپا بە قەیرانی بووندا تێدەپەڕێ ئەمەش مەترسییەکی گەورە پێکدەهێنێ. لێرەدا تەنها دوو چارەسەر هەیە: یان ئەوروپا پەرت ببێ و پتر لە مانا ئەقڵییەکەی دووربکەوێتەوە تا دواجار بکەوێتە ناو دەریای رق لێبوونەوە لە رۆح و زۆنگاوی بەربەرییەتەوە. یان حەقیقەتی راستەقینەی خۆی بزانێت و بەسەر هەموو گومانێکدا سەرکەوێ و گومان لە ئەرکە شارستانیەکەی خۆی بسڕێتەوە و جارێکی تر لە ناو قەیرانەکانی خۆیدا لەدایك ببێتەوە و بەهۆی توانا و پاڵەوانێتی ئەقڵەوە خۆری ئایندەیەکی مەزن و هەمیشەیی بۆ هەموو مرۆڤایەتی بخوڵقێنێت.

–ئەم قەیرانەی ئەمڕۆ، ئەگەرچی قەیرانێکە لە ناو ئەقڵانیەتی ئەوروپی و قەیرانێکی چارەنووسسازە، بەڵام لە هەمان کاتدا قەیرانێکی کاتی و لابەلاییە، واتە قەیرانێکە تێدەپەڕێ و تەواو دەبێت و ناشگاتە جەوهەری ئەقڵانییەت، واتە ئەمە تەنها لە رواڵەتدا شکستی ئەقڵانییەت دەردەخات، چونکە جەوهەری ئەقڵانییەت هیچ قەیران و هیچ رەشەبایەك نایگرێتەوە، ئەوەی روویدا تەنها بریتی بوو لەوەی کە ئەم ئەقڵانییەتە بوو بە قوربانیی زەوتکاری و چووە نێو رەوتی سروشتگەرایی و بابەتگەراییەوە. کەواتە دواجار ئەم ئەقڵانییەتە لە ماوەیەکی مێژوویی دیاریکراودا دووچاری قەیران بووە، هەر ئەم ئەقڵەش چەندین زانستی رێژەیی بەرهەمهێناوە وەکو زانستی سایکۆلۆجیا و ناتوالیزم و پۆزەتیڤیزم.

–لێرەدا مەترسییەکی راستەقینە هەیە کە خۆی لە هیومانیزمی خۆرئاواییدا مەڵاس داوە، ئەویش مەترسی گومانکردنە لە هەموو شتێ، هەروەها مەترسی باڵادەستیی رەوتە بابەتگەراییەکان و خۆدانەدەست رەوتی "گومان" و "نازانم"ەکان. هەروەها مەترسی ئەوەی ئەوروپا بەتەواوی تەسلیمی قوتابخانە و رەوتە جیاجیاکانی

پۆزەتیڤیزم و ڕێژەگەرایی بێت و بکەوێتە نێو دەریای گومانەوە و خۆی بیر بچێتەوە و لەوێوە ئەقڵیش لە کاری ئیبداعی و ڕۆحی بکەوێت و خۆری نائومێدی دەربکەوێت و ئەقڵانییەتێکی ساختە سەرهەڵبدات. لێرەدا هۆسێرل ئەقڵ و ئەقڵانییەت رەت ناکاتەوە بەڵام رەخنە لەو ئەقڵانییەتە ماتریالییە دەگرێت کە تەنها بە دوای سوود و خۆشگوزەرانیی مادیدا دەگەڕێت.

## جاك دێریدا و هەڵوەشاندنەوەی سێنتەریزمی ئەقڵ

ئێمە لێرەدا لەسەر یەکێك لە کتێبەکانی دێریدا دەوەستین کە تیایدا هەوڵدەدا گرنگیی زانستی نووسین بخاتە ڕوو وەك زانستێکی سەربەخۆ لە بیرە فەلسەفییە پێشوەختەکان و تیایدا رەخنە لە گشت کەلەپووری فەلسەفی و بگرە رەخنە لە سەرانسەری کەلەپووری عەقڵی لە خۆرئاوادا دەگرێ، ئەم کتێبە لە ساڵی 1967 بە ناوی "لەبارەی گراماتۆلۆجیا" واتە لە بارەی زانستی نووسین، چاپکراوە. گرفتی بنچینەیی لەم کتێبەدا بریتییە لە ئازادکردنی زانستی نووسین لە هەموو ئەو شتانەی تەحەکوم بە "نوسین"ەوە دەکەن و ناهێڵن نووسین بە ئەندازەیەکی گەورە سەربەخۆیی وەربگرێ و ناهێڵن نووسین جگە لە ڕێگەی میتافیزیکی بە ڕێگەیەکی تر بیربکاتەوە. ئەمەش نووسەر بەرەو گەڕان بەدوای ئەسڵی حەقیقەتدا دەبات، لەسەرەتادا واقیعێك دەدۆزێتەوە لەو واقیعەدا سەرجەمی مێژووی فەلسەفە، سەرباری هەموو جیاوازییەکان، نەك تەنها لە ئەفلاتونەوە تا ئەقڵانییەتی هیگڵ، بەڵکو لەو فەیلەسوفانەی بەر لە سوکراتیشەوە هەبوون هەتا دوا فەیلەسووفی گەورەی هاوچەرخی ئەڵمانی هایدگەر، هەموو حەقیقەتێکیان دەخستە پاڵ ئەقڵ یان لۆگۆس. ئەقڵ سێنتەری سەرەکی و بنچینەیی بوو، ئەم سێنتەریزمەش جۆرێك لە ئیمپریالیزمی پێکهێنا کە وردە وردە هەموو بەشەرییەتی گرتەوە. کەواتە لێرەدا سێنتەریزمی یەکەم هەیە کە بریتییە لە سێنتەریزمی ئەقڵ و بوو بە سێنتەریزمێکی ئیتنیکی و رەگەزپەرست، بوو بە سێنتەریزمی خۆرئاوا. گراماتۆلۆجیا یان زانستی نووسین یەکەمین قوربانیی ئەو سێنتەریزمە بوو. لە جیاتی ئەوەی وەکو خۆی و وەکو ئەوەی هەیە سەیری نووسین بکرێ، دەبینین لە ژێر ڕۆشنایی بیرە پێشوەختەکانەوە سەیری دەکرا. نووسینیش یەکێ لە گرفتە سەرەکییەکانی بە فەلسەفە بەخشی کە بریتییە لە ئیزدیواجیەتی مرۆڤ" واتە پێکهاتێك لە: دەروون و جەستە. نووسین ئەم گرفتەی بە هەموو میتافۆرەکانیەوە دەرخست "نووسین و پیت و تۆمارکردنی هەستی، ئەمانە لە تەقلیدی خۆرئاوادا – بە بەردەوامبوونی جەستە – بریتین لە ماتریالی دەرەکیی ڕۆح و دەروون و کردار و وشە". کەواتە زانستی نووسین یەکەمین قوربانی میتافیزیکای سێنتەریزمی ئەقڵە، ئەو سێنتەریزمەی کە بنەمایەکی ناراستەقینەی حەقیقەتمان پێنیشان دەدات. باشە حەقیقەت چییە کاتێك بە تەنها تەماشای گراماتۆلۆجیا دەکەین، "رەگەزی دەنگی و موفرەدە و ئەو شتەی بە هەستی ناودەبرێ، بەبێ بوونی جیاوازی، مومکین نییە وەکو خۆی دەربکەوێ"، لێرەدا دێریدا ئەسڵێك کەشف دەکات کە بەبێ ئەو هیچ ئەسڵێکی تر نییە، واتە ئەو ئەسڵەی هەموو ئەسڵێکی تر لە پرۆسەی جیاوازیی زماندا دادەمەزرێنێ، ئەم جیاوازییە هەموو شتێ دادەمەزرێنێ، نە هەستییە و نە ئەقڵی، نە لە ماتریالیش دەچێ نە لە ڕۆحی، بەڵکو هەر ئەو شتەیە کە هەموو گوتەزاکان بنیات دەنێت سەرباری

گوتەزای خود و بابەت، بنیات و مانا، رواڵەت و دەلالەت. لێرەوە دێریدا پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەی هەموو کەلەپووری ئەقڵیی خۆرئاوایی دەستپێدەکات.

لەبەرئەوە فەلسەفەی دێریدا فەلسەفەیەکی بێسێنتەرە و لە شیکردنەوەدا زۆرتر دەڕواو دەگاتە هەڵوەشاندنەوەی ئەو بنچینەیەی ئەقڵانیەتی خۆرئاوایی لەسەر دامەزراوە و ئیدی فەلسەفە و ئەخلاق هەرەس دەهێنن، لێرەدا دێریدا لە بەرائەتی گۆڕاندا دەگاتە نیچە.

## تێبینییەکی میتۆدی

لەلای دێریدا هەوڵێکی جیدی هەیە بۆ دەرچوون لە هەموو کەلەپووری فەلسەفی، خۆیشی ئەمە ناشارێتەوە بەڵکو کار بۆ ئەوە دەکات لە بازنەی ئیمپریالیزمی ئەقڵ و ئیمپراتۆریەتی سێنتەریزمی لۆگۆس دەربچێت، بگرە ئەو زمانی عەرافەکان بەکاردێنێ کاتێ ئاگادارمان دەکاتەوە لە نزیکبوونەوەی لەنێوچوونی میتافیزیکای سێنتەریزمی ئەقڵ و لەنێوچوونی شارستانیەتی وشە، بەڵام لێرەدا پرسیارێك خۆی دەسەپێنێ: ئاخۆ فەیلەسووف مافی ئەوەی هەیە حەقیقەتێك لە یەکێ لە زانستەکانەوە بهێنێت و بەسەر هەموو فیکری بەشەریدا بیسەپێنێ؟ سەرجەمی زانایانی زمانەوانی دەزانن کە لە زماندا رستێك جیاوازی هەیە و ئەگەر ئەم جیاوازییە لە دال و مەدلولدا نەبوایە ئەوا هیچ زمانێکیش نەدەبوو. بەڵام ئایا دەشێت ئەم حەقیقەتە بگوازرێتەوە بەو شێوەیەی دێریدا کردوویەتی و ئەو حەقیقەتەی کردووە بە خاڵی دەستپێك بۆ گەڕان بە دوای ئەسڵی حەقیقەت، واتە هەموو حەقیقەت؟ گەورەزانای زمانەوانیی ئەم چەرخەمان فێردیناند دی سوسێر دەڵێ: گرفتی ئەسڵ گرفتێکی زمانەوانی نییە، چونکە زمانەوانی هەمیشە لە زمانێکەوە دێتە دەرێ کە هەیە و شکڵی گرتووە. بە کورتی ئەم گرفتە بە هیچ جۆرێ مانای نییە و لە راستیدا ئەمە دزەی کردۆتە ناو سەرجەمی زانستەکانی زمانەوە.

## کۆتایی

ماوەیەکی زۆرە ئەقڵانییەت رووبەڕووی هێرش و پەلامار و رەخنەی بریندارکەر دەبێتەوە، بەڵام هەموو جارێکیش بەسەلامەتی دەردەچێ و ژیانێکی تر لە خۆدەگرێ ئەگەرچی لە هەندێ سەردەمی مێژوویی دوورودرێژدا دوچاری شکست بۆتەوە و رەشەبایەکی توند هەڵیکردووە و ویستوویەتی بنچینەکانی ئەقڵ لە ریشەوە دەربهێنێ. هەندێ جار و لە هەندێ قۆناغی مێژووی کۆن و نوێی بەشەریدا ئەقڵ دوچاری سڕبوون و شکستێکی درێژ بووە، بەڵام هەموو جارێ بەهۆی کۆششێکی رەخنەیی شێلگیرەوە توانیویەتی گورجتر و دینامیکیتر هەستێتەوە، ئەمە لەبەرئەوەی ئەقڵانییەت هەروەکو دیموکراسییەت (کە دیموکراسییەت لەدایکبووی ئەقڵانییەتە) زۆر کەس حەز دەکەن خەوش و خاڵە لاوازەکانی دەربخەن، بەڵام ئەقڵانیەت سەرباری کەموکورتییەکانی وەك باشترین سیستم دەمێنێتەوە و تەنها رێچکەیەکە بۆ خۆلادان لە خزینی بەشەرییەت بەرەو بەربەرییەت و دڕندەیی.

وتمان هۆسێرل خەوشی ئەوە لە ئەقڵانییەت دەگرێ کە پتر شۆڕدەبێتەوە نێو کاری پراکتیکی و بەدەستهێنانی سەرکەوتن و پۆزەتیڤیزم، بەڵام ئەم چەشنە رەخنەیە دروست نییە، ئێمە ئەمڕۆ لە چەرخی گەشەکردنی کاری پراکتیکی و پیشەسازیدا دەژین و هیچ شتێکیش ناتوانێت رێگە لە پێشکەوتنی تەکنیکی و تێکنۆلۆژی بگرێت. ئەقڵ چۆنی بوێت دەتوانێت رابمێنێ و بیر بکاتەوە، هیچ

شتێ ناتوانێ کۆتی بکات تەنها ئەو ئازادییە نەبێت کە بریتییە لە داهێنان و هەروەها بریتییە لە کرانەوەیەکی فراوان لە بەرامبەر بێکۆتابوونی رۆحێکی خوڵقێنەر. کاتێکیش ئەقڵانیەت دەبێت بە سیستمێکی فیکریی داخراو، دەگۆڕێ و دەبێ بە سیستمێکی ئەندازەیی وەك سپینۆزا ئەمەی کرد، یان دەگۆڕێ و دەبێ بە کاروانێکی مێژوویی ترسناك و هەموو شتێ لەسەر رێگەی خۆیدا دادەپڵۆسێ وەك ئەو سیستمەی لەلای هیگڵدا هەیە. واتە ئەقڵانییەت دواجار دەگۆڕێ و دەبێ بە حەتمیەتێك هەموو شتێك لە گەردووندا دەگرێتەوە تەنانەت بوون و کەینونەش.

هەموو ئەو رەشەبایانەی لە دژی ئەقڵانییەت هەڵیانکردووە، نەیانتوانیوە دەنگی ئەقڵ بێدەنگ بکەن و ئەقڵانییەت لاڵ بکەن، بەڵام مەترسی گەورە لەوێدایە ئەگەر ئەقڵ لە ناو خۆیدا و لە خودی خۆیدا دابخرێ بەتایبەتی لە شارستانیەتی تەکنیکی و ئامێری و زەوتکردنی ئازادیی تاکەکەس لە بەرامبەر دابینکردنی خۆشگوزەرانیدا. ئەقڵ بریتییە لە ئازادی و ئازادیش هیچ شتێ کۆتی ناکات تەنها ئاسۆی رەهەندە بێکۆتاییەکان نەبێ.

## تێبینی

ناونیشان و هەندێ بەشی ئەم وتارەم کورت کردۆتەوە.

## سەرچاوە

گۆڤاری (الفكر العربی المعاصر)، ژمارە (64-65) ساڵی 1989.

# "میشیل فۆکۆ"

# و

# رەخنەگرتن لە ئەقڵی خۆرئاوا

**هاشم سالّح**

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

سەروەختێك نێو و نێوبانگی "میشێل فۆکۆ" دنیای گرتبووەوە، بەڵام لەم چەند ساڵانەی دوایدا کاریگەری کەم بووەوە.. سەرەڕای ئەوەش بیرو بۆچونی ئەم پیاوە تا هەنوکە جێگای سەرنج و تێڕامانە و لە کایەی زانستە مرۆڤایەتیەکاندا و بە تایبەتی بواری مێژوناسی و دەروونناسی و سیاسەتناسی، مشتومڕی لە بارەوە دەکرێت.

لەم کتێبە نوێیەدا کە سەبارەت بە "میشێل فۆکۆ"یەو "دیدییە ئەریبۆن"ی هاوڕێی نوسیویەتی، زانیاریەکی زۆری دەربارەی ئەو فەیلەسوفانە تێدایە کە هاوسەردەمی "فۆکۆ" بوون، یاخود مشتومڕی فەلسەفی توندیان لەگەڵیدا هەبووە. نمونەکانیان وەك: (ژان پۆڵ سارتەر، جۆرج دیمۆزیل، لوی ئالّتۆسێر، یۆرگن هاپرماس، لۆك ڤێری وەزیری خوێندنی باڵا لە فەرەنسا و.. هتد).

وەکو دەزانرێت "دیدییە ئەریبۆن" رۆژنامەنوسێکی بەناوبانگی گۆڤاری (نۆڤێل ئۆسبر ڤاتور)ە و لەوێدا بەرپرسیاری بەشی رۆشنبیرییە و خاوەنی چەندین کتێبە، لەوانە: (گفتوگۆ لەگەڵ کلۆدلیڤی شتراوس، جۆرج دیمۆ زیل و ژیاننامەی میشیل فۆکۆ).

بەمجۆرە دەکرێت بڵێین "دیدییە ئەریبۆن" زیاد لە هەر کەسێکی تر ئاگاداری بارودۆخی رۆشنبیری فەرەنسایە. رەنگە نەتوانم تەواوی بەشەکانی ئەم کتێبە بەسەربکەمەوە، بەڵام ئاوڕ لە چەند وێستگەیەکی گرنگ دەدەمەوە، لەوانە پەیوەندی "فۆکۆ" بە "یۆرگن هاپرماس"ی فەیلەسوفی بەناوبانگی ئەڵمانیاوە.

وەکو ئاشکرایە رۆشنبیرانی ئەوروپا و ئەمریکا خوازیاری ئەوە بوون مێزگردێکی فەلسەفی گەورە لە نێوان ئەو دوو مەزنە بیریارەدا ببەسترێت و تەنانەت

هەندێك پێیان وایە کە ئەو شتە بە ناڕاستەوخۆیی رویداوە. ئەو مەسەلەیەی ئەم دوو بیریارە لە سەری ناکۆکن مەسەلەیەکی شەخسی نییە، هێندەی مەسەلەیەکی گشتییە و پەیوەندی بە پێگەی ئەقڵ و ئەقڵانیەتەوە هەیە لە کلتوری خۆرئاوادا.

رۆشنبیرانی ئەوروپا "فۆکۆ" دەخەنە بەرەی "نیچە"وە، واتە سەربە بەرەی نائەقڵانیەکانە و "هاپرماس"یش لەو بەرەیەدا ئەژماردەکەن کە دوو سەرسەخترین نەیاری "نیچە"ی تێدایە، واتە "کانت و هیگڵ". ئەم دوو بیریارە بە ترۆپکی ئەقڵانیەتی ئەوروپی دادەنرێن، بەڵام فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرن و لەوانەش "میشێل فۆکۆ" دەیانەوێت ئەو ئەقڵانیەتە دەگمەنە لەبەریەك هەڵبوەشێنن. لەم مشتومڕە فەلسەفیەدا، نوسەری ئەم کتێبە بەلای "فۆکۆ"دا دەیشکێنێتەوە و بەرامبەر "هاپرماس" و شاڵاوە توند و تیژەکانی بۆ سەر فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرنە، بەرگری لە "فۆکۆ" و هاوڕێکانی دەکات.

"هاپرماس" پێیوایە فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرن دەیانەوێت، مۆدێرنە و رۆشنگەری و دەسکەوتەکانیان تێکوپێك بدەن.

ئەوە بوو کاتێك بانگهێشتی پاریس کرا تا لە کۆلێژدی فرانس لێکچەرێك دەربارەی مۆدێرنە پێشکەش بکات، شاڵاوێکی توندی کردە سەر هەندێك لە فەیلەسوفانی فەرەنسایی لە نێو ماڵی خۆیاندا!

"هاپرماس" دەڵێت: (ئەوانە بە بیانوی تێپەڕاندنی مۆدێرنە دەیانەوێت دەسکەوتە باشەکانیش لەناوبەرن. کە دەشڵێم مۆدێرنە مەبەستم ئەو ئەقڵانیەتەیە کە لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم، سەدەی رۆشنگەری، لە خۆرئاوادا هاتە ئاراو مەزنی خۆرئاوا نیشاندەدات و بواری ئەوەشی سازدا تا ئەوروپایەکان بۆڕی تەواوی میللەتانی دنیا بدەنەوە.. بۆیە دەکرێت بڵێم فەیلەسوفانی فەرەنسا، کەسانێکی عەدەمی و نیچەوین و هەست بە بەرپرسیارێتی ناکەن). تەنانەت کار دەگاتە ئەوەشی بە کەسانی ئانارشیزم ناوزەدیان بکات، چونکە ئەوانە دەخوازن رەخنەیەکی ریشەیی توند لە ئەقڵانیەت بگرن تا پایە و دیوارە ئاسنینەکانی لەق بکەن، لەبەرئەوەی ئەقڵ بۆ ئەوان بۆتە زیندان و گۆڕستانێك. من لای خۆمەوە زیاد لە نوسینێکمدا وتومە: (تێگەیشتن لەم مەسەلانە، لە دەرەوەی چوارچێوەی کلتوری خۆرئاوا کارێکی ئەستەم و گرانە).

دەبێت رەخنەگرتن لە ئەقڵ بۆ ئەو کۆمەڵگایانەی پێویستی زۆریان بە ئەقڵ و ئەقڵانیەت هەیە (وەکو کۆمەڵگەی ئیسلامی)، چ مانایەکی هەبێت؟ بێگومان هیچ مانایەکی نیە و بگرە زۆر ترسناکیشە. بەڵام مەسەلەیەکی وا بۆ رۆشنبیری خۆرئاوا کە زیاد لە دوو سەدەیە ئەقڵی زانستی و فەلسەفی بەڕێوەی دەبات، رەوایە و تێگەیشتنیشی ئاساییە. ئەم ئەقڵە زانستیەی خۆرئاوا بە هۆی چاوبرسیەتی و پاوانخوازی زۆر و زەوەندیەوە لەگەڵ تێپەڕبونی کاتدا وەرگۆڕاوە بۆ (ئەقڵێکی تەکنۆلۆژی، سەرمایەداری، ماتماتیکی ساردو سڕ).

کەواتە ئەوەی پێویستە رەخنە بکرێت و لەبەریەك هەڵبوەشێنرێت خودی ئەقڵ خۆی نییە، بەڵکو شێواز و چۆنیەتی بەکارهێنانیەتی. چونکە مرۆڤایەتی ناتوانێت بێ ئەقڵ یان لە دەرەوەی ئەقڵدا بژی. رەنگە شاعیر حەز بکات بۆ چرکەساتێك لە دەرەوەی زەبر و سانسۆرەکانی ئەقڵدا بگوزەرێنێ تا چامەیەکی شیعری بنوسێت، بەڵام ئەمە بۆ فەیلەسوف زەحمەتە.

سەبارەت بەو رەخنانەی "دێریدا و فۆکۆ و لیوتارد" لە مۆدێرنە و ئەقڵانیەتی دەگرن، "هاپرماس" پێیان دەڵێت: (بەرپرسیارێتی لە رێ لادانی ئەقڵ ناکەوێتە ئەستۆی نوێگەری کلتوری یان فەلسەفی، بەڵکو لە ئەستۆی نوێگەری کۆمەڵایەتی و فشار و زەبر و زۆری ئابوری و دەوڵەتی سەرمایەداریدایە). ئەو پێی وایە کە دابڕانێك لە نێوان هونەر و ژیان یاخود لە نێوان فەلسەفە و واقیعدا دروست بووە، هەر لەبەر ئەوەش فەلسەفە دووچاری قەیران بووە.

لەسەروەختی "کانت و هیگڵ"دا، فەلسەفە ئەستێرەی بەختی لە درەوشاندنەوەدا بوو، بەڵام کاتێك لەوە کەوت شانبەشانی ژیان رێ بکات و توخنی کێشەکانی واقیع بکەوێت، وشکهەڵاتوو مرد. بۆیە ئەو ئەرکە فەلسەفیەی لەسەرشانی رۆشنبیری ئەوروپییە لەمڕۆدا، ئەوەیە کە ئاراستەی نوێگەری کۆمەڵایەتی بەرەو لایەك بەرێت، پێچەوانەی ئەو ئاراستە سەرمایەداریە پاوانخوازیە بێت کە لە ئارادایە. ئەمەش لەیەك کاتدا ئەرکێکی هەم سیاسی و هەم فەلسەفیشە.

"هاپرماس" لەو لێکچەرەیدا سەرکۆنەیەکی زۆری "نیچە" و نیچەوییە هاوچەرخەکان دەکات و پێی وایە ئەوانە بەرەو لەناوچونمان دەبەن. وەکو چۆن فیکری "نیچە" بە ماوەیەکی کەم پێش دەرکەوتنی "هتلەر" کەوت، ئەوا رەنگە فیکری فەیلەسوفانی نەیاری مۆدێرنە (نەك پۆست مۆدێرنە) هەمان دەرەنجامی لێبکەوێتەوە، چونکە فاشیزم تا هەنوکەش لە ئەوروپادا هەیە و بەیەکجاری نەمردووە. ئەم شتانەی "هاپرماس" دەیڵێت بەجێیە، بەڵام پێویستی بە راستکردنەوە هەیە یان پێویستی بەوەیە بخرێتە سیاقی خۆی، بۆ ئەوەی زیاد لە پێویست ناهەقی دەرهەق بە "فۆکۆ و نیچە" نەکەین.

خوێنەری بەرێز دەبێت ئاگای لەوە بێت کە "هاپرماس" وەکو هەر رۆشنبیرێکی ئەڵەمانی، تارمایی "هتلەر" و نازیزمی بەسەرسەرەوەیە. لەبەرئەوە ناتوانێت بەشێوەیەکی بابەتی باس لە "نیچە و هایدگەر" بکات، بەڵام "فۆکۆ" وەکو رۆشنبیرێکی فەرەنسایی دەتوانێت ئەوە بکات، لەبەرئەوەی گرێی نازیزمی نییە.. هەرچی "هاپرماس"ە پێی وایە نازیزم نێوبانگی گەل و مێژووی ئەڵەمانیای لەکەدار کردووە، ئەمەش ئەرکێکی قورسی خستۆتە سەر شانی گەلی ئەڵەمانی و نەوەکانی داهاتوی. لەبەرئەوە ئەو ترسێکی زۆری لە ئاقاری نائەقڵانیەت هەیە، چ لە رۆشنبیری ئەڵەمانیدا بێت یان ئەوروپی. هەر لە پای ئەمەش کە بە توندی دەرگیری ئەو ئاقاری ئەقڵانیەتەیە کە سەردەمی رۆشنگەری بەرجەستەی کردوو، لەسەر دەستی "کانت و هیگڵ" گەیشتە ترۆپك.

کەواتە بەدحاڵیبوون لە نێوان فەیلەسوفی ئەڵمانی "هاپرماس" و فەیلەسوفی فەرەنسایی "فۆکۆ"، شتێکی ناچاری بوو.. کەسانی وەکو "فۆکۆ و دێریدا و دۆلۆز" تەنها بە "نیچە و هایدگەر" سەرسام بوون، دوو کەسێك کە "هاپرماس" زۆر بە توندی رەخنەیان لێدەگرێت.. فەیلەسوفانی فەرەنسا بۆیە بە "نیچە و هایدگەر" سەرسام بوون، چونکە لەو ئەقڵانیەتە چاوچنۆکەی خۆرئاوا وەڕس بوو بوون. ئەوان سەرشێت بوون لەوەی چۆن چۆنی ئەم ئەقڵانیەتە بەشدار بوو لەو شاڵاوە کۆلۆنیالیە خوێناویەدا!! بۆیە دەبێت "هاپرماس" لە رەخنەکردنی ئەمانەدا، کەمێك پشوو درێژتر بێت. چونکە ئەو ئەقڵانیەتەی ئەو بەرگری لێدەکات، بەو رادەیە بێ گوناه و دەست سپی نییە.

"میشیل فۆکۆ" کاتێك کتێبە بەناوبانگەکەی (مێژووی دێوانەیی لەسەردەمی کلاسیك)دا بڵاوکردەوە، جەنگی کۆلۆنیالیزمی فەرەنسی لە جەزائیر لە لوتکەدا بوو (1961). رەنگە ئەمە تەنها کاری رێکەوت نەبوبێت، لەبەرئەوەی ئەقڵی خۆرئاوا گەشتبووە ئاستێك پێویستی بە رەخنە و لێپرسینەوەیەکی توند هەبوو. "فۆکۆ"ش ئەم کارەی کرد کاتێك کەوتە ستایشکردنێکی زۆری دێوانەیی، بەڵام دێوانەیی ئاسایی نا، بەڵکو دێوانەیی بلیمەتە ناودارەکانی وەك: "نیچە، هۆڵدەرلین، ئەنتۆنین ئارتۆ، جێرار دی نێرڤال". "فۆکۆ" لە رێی ئەمانەوە دەیویست بڵێت: (پێویستە دێوانەیی ئەمان ئەقڵی خۆرئاوایی دادگایی بکات، نەك ئەم ئەقڵە دێوانەیی ئەوان دادگایی بکات!).

"دیدییە ئەریبۆن" لە کتێبەکەیدا دەڵێت: (هاتنی هاپرماس بۆ پاریس و کۆلیژدی فرانس، بۆ فۆکۆ قورس و گران بوو، بۆیە بەناچاری و بۆ ماوەی چەند دەقەیەك ئامادەی بەشێکی یەکەمین لێکچەری هاپرماس بوو، دوای ئەوە لە دەرگای پشتەوە هۆڵەکەی جێهێشت بۆ ئەو جەماوەرە زۆرەی هاتبوون هاپرماس ببینن). "فۆکۆ" چووە ئۆفیسەکەی خۆی کە لە هەمان جێگادا بوو، چونکە پێشوەخت دەیزانی "هاپرماس" چی دەڵێت و باسی چی دەکات.. بەڵام هەر ناچار بوو بەوەی داوەتی ئێوارە خوانێکی بکات، بەتایبەت کە ئەو دوای مردنی "ژان پۆڵ سارتەر" بەناوبانگترین فەیلەسوفی ئەو وەختەی فەرەنسا بوو. بۆیە نەدەکرا لە پێشوازیکردنی بەنێوبانگترین فەیلەسوفی هاوچەرخی ئەڵمانیا هەڵبێت.

سەبارەت بەو ئێوارە خوانەی لە یەکێك لە چێشتخانەکانی (الحی اللاتینی)دا بوو، "پۆل ڤینی" مێژوونوس وەك شایەتحاڵێك و یەکێك لە ئامادەبووان دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (مشتومڕی نێوان فۆکۆ و هاپرماس بە زمانی ئینگلیزی دەستی پێکرد، مشتومڕەکەیان بە ئەتەکێت و ساردوسڕ بوو. سەرەتا هاپرماس بە رەخنەکردنی هەندێك دەستپێشخەری فرانسوا مێترانی سەرۆکی ئەوسای فەرەنسا دەستی پێکرد و پاشان هاتە سەر فەلسەفە. پێشبینی دەکرا بەریەککەوتن روبدات، لەبەرئەوەی هەردوولایان گەرم بووبوون. بەڵام بەر لەوەی بگاتە ئەوە فۆکۆ بە ڕستەیەك کۆتایی بە قسەکانی هاپرماس هێنا و وتی: بەرێز رەنگە من ئانارشیست بووبم!). وەکو ئاشکرایە "هاپرماس" "فۆکۆ" بە کەسێکی ئانارشیست و عەدەمی و رەشبینی وەك "نیچە" دەداتە قەڵەم.

گفتوگۆی نێوان ئەو دوو بیریارە بەمە کۆتایی پێهات.

پرسیارێك لێرەدا دێتە ئارا ئەوەیە: ئایا ئەو ئەقڵانیەتەی خۆرئاوا کە لەمڕۆدا کۆنترۆڵی دنیای کردووە، پێویستی بە پێداچونەوە و دەسکاریکردن هەیە یان نا؟ ئایا ئەو ئەقڵانیەتەی سەردەمی رۆشنگەری هێنایە ئاراوە و لەسەر دەستی "کانت و هیگڵ" گەیشتە لوتکە، پێویستی بەوەیە رەخنەی ریشەیی لێ بگیرێت یان نا؟ ئایا پێویستە ئەقڵانیەتی مۆدێرنە جێبهێڵین رووە و ئەقڵانیەتی پۆست مۆدێرنە یان نا؟

"هاپرماس" لای خۆیەوە راست و رەوان پێمان دەڵێت: (ئەقڵانیەتی رۆشنگەری و هیچی تر نا، بەڵام دوای راستکردنەوە و پێداچونەوەیەکی ورد). ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت "هاپرماس" دژی ئەوە نییە رەخنە لە مۆدێرنە بگیرێت، بەڵام دژی ئەو رەخنە وێرانکەرەیە کە بە بیانوی ئەو هەڵە و سلبیاتانەی ئەم ئەقڵە لە ناوەوە و دەرەوەی ئەوروپادا ئەنجامیداوە، دەسکەوتە ئیجابیەکانیشی وەلاوە

دەنێت. بۆخۆم پێموایە ئەمە هەڵوێستی دروست و حەکیمانەیە و خێرو بێری بۆ گەلانی ئەوروپی و غەیرە ئەوروپیش تێدایە.

ئەقڵانیەتی خۆرئاوا گەربێتو دەستبەرداری لوتبەرزی و لەخۆبایی بوون بێت و بگەڕێتەوە سەر ئەو دۆخە هیومانستی و ئەخلاقیەی، خەسڵەتی سەرەتاکانی دروستبونی بوو لە سەر دەستی مەزنە دامەزرێنەرانی وەك "ژان ژاك رۆسۆ و ئیمانوێل کانت"، ئەوا تەواوی مرۆڤایەتی لەو کارە بەهرەمەند دەبن و رەنگە لە پای ئەمەش رۆژێك بێت ئاشتی و ئارامی و خۆشگوزەرانی، باڵ بەسەر تەواوی میللەتانی سەرگۆی زەویدا بکێشێت!!

با واز لەمە بهێنین و جارێکی تر بێینەوە لای ئەو مشتومڕە توندەی نێوان "کانت و نیچە" یاخود نێوان "هاپرماس و فۆکۆ". داخۆ دەبێت گەوهەری ئەم مشتومڕ و گفتوگۆیەی نێوان ئەم دوو ئاقارە لە کوێدا بێت؟ تۆ بڵێی ئێمە بتوانین تێیبگەین، یاخود ئەمە کارێکە لەسەر و توانای ئەقڵ و ئیدراکی ئێمەوەیە؟ چونکە ئێمە بەشەڕ و کێشەیەکی ترەوە سەرقاڵین کە هیچی لەو شەڕ و کێشەیەی ناو کلتوری خۆرئاوا کەمتر نییە، هێندە نەبێت کە شەڕی ئێمە لانی کەم بە دوو سەدە لە دوای شەڕی ئەوانەوەیە. مەبەستیشم ئەو شەڕەیە کە هەنوکە لە نێوان ئەقڵی ئسوڵی تەقلیدی و ئەقڵی مۆدێرندا لە ئارادایە.

کەواتە رەخنەگرتن لە ئەقڵ و مۆدێرنە و رۆشنگەری، چ مانایەکی هەیە بۆ ئەو میللەتانەی تا ئێستاش ئەزمونی حوکمی ئەقڵ و مۆدێرنە و رۆشنگەریان نەکردووە؟ ئایا شەڕێکی فەلسەفی لەمجۆرە کە تەواوی رۆشنبیرانی ئەوروپا و ئەمریکای بەخۆیەوە سەرقاڵکردووە، بۆ ئێمە خۆخەڵەتاندن و کات بە فیڕۆدان نییە؟ ئایا ئەمە مەترسی بۆسەر پرۆژەی رابونخوازیمان نابێت، ئەگەر بە خراپ لێی تێگەیشتین وەك زۆرجاران بە خراپ تێیگەیشتوین؟

بۆیە من لای خۆمەوە کاتێك قسە لەم مەسەلەیە دەکەم، تەواو خۆمی بۆ تەیار دەکەم و دەڵێم: (نابێت بە هەڵە لەو مەسەلانە حاڵی بین، چونکە هیچ کەس لە خۆرئاوادا نایەوێت دەستبەرداری دەسکەوتەکانی مۆدێرنە بێت و لێیان پەشیمان نییە). ئەوانەشی لە خۆرئاوا رەخنەی توندیان لە مۆدێرنە و ئەقڵانیەت دەگرت، ئێستا کەمێك دەستیان کێشاوەتەوە.. ئەوەتا خودی "میشێل فۆکۆ" دەستبەرداری ئەو رەخنە رادیکالیە بووە کە لە مۆدێرنەی دەگرت، ئەمەش بەرونی لەو لێکچەرەیدا دیارە کە لە کۆلێژدی فرانس دەربارەی تێکستە بەناوبانگەکەی "ئیمانوێل کانت" (رۆشنگەری چییە؟) پێشکەشی کرد. بۆیەکەمجار ئەو لەو وتارەیدا کە بەناوی (کانت و شۆڕش)ەوە بوو، رونیکردەوە کە ئەو دەچێتەوە سەر ئەو هێڵە فیکرییەی خاوەنی (رەخنەی ئەقڵی پەتی) بەر لە دوو سەد ساڵ لە ئێستا سەرەتاکانی دیاری کرد.. ئەم هەنگاوەی "فۆکۆ"، "هاپرماس"ی خۆشحاڵکرد و بەخاڵێکی ئیجابی دایە قەڵەم لەسەر گەشەکردنی فیکری "فۆکۆ" هەر لەبەر ئەمەش بوو کە کاتێك ئەو، لە مانگی حوزەیرانی 1984 کتوپڕ ماڵئاوایی لە ژیان کرد، "هاپرماس" بە وتارێکی غەمگین و گرنگ لاواندیەوە.

## سەرچاوە

رۆژنامەی (الشرق الاوسط)، بەرواری (13/7/2003).

## رۆمانی "دڵشاد"ی سەلیم بەرەکات لە کوورەیەکی سانسۆردا!



سەلیم بەرەکاتی بە ڕەچەڵەك کورد و بە زمانی عەرەبی نووس، لەسەر ئاستی ئەمڕۆی رووناکبیری عەرەبیدا – بە تایبەتی لە بواری نووسینی رۆمان و شیعردا – ناوێکی هەرە درەوشاوە و جێی متمانەی ئەو رووناکبیر و ئەدیبانەیە کە قەڵەمی داهێنانیان رەواجی تازەی بە ئەدەبی نوێی ئەو گەلە داوە، سەلیم هەوڵێکی گەورە و بەردەوامە لە مامەڵەکردنی نوێخوازی و بەهاوچەرخ کردنی ئەو بابەتانەی دەستیان بۆ دەبات، بابەتی هەموو رۆمانەکانی دنیای ئاڵۆز و بە ئەزموونی ژیانی نەتەوەی کوردن لە سەردەمێکدا کە سەرجەمی پرسیارەکان هاملێتیانە دەکرێن کە ئایا خۆیان سەرچاوەی ئەو هەموو نەگبەتی و کارەساتانەن یان خودایەك بەرپرسیاری چارەنووسیانە؟ لەوەدەچێت چارەنووسی رۆمانەکەی سەلیم – دڵشاد– کە لە ئەردەن ئاگری سانسۆر پەڕو باڵی سوتاندوە یەکێك بێت لە وەڵامەکانی ئەو پرسیارە. ئێمە تا ئێستا رۆمانەکەمان نەخوێندۆتەوە، بۆیە ناتوانین باسی بکەین، بەڵام لە رێگای ئەو نووسینانەوە کە لە ئەنتەرنێتدا بڵاوبوونەتەوە لە بەشێکی کێشەکە – کێشەی قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی رۆمانەکە لە ئەردەن – ئاگاداربووین. بەتایبەتی لە ڕێی نووسینێکی "نالین سلیمان"ەوە کە پێدەچێت ئەویش کورد بێت. لێرەدا هەندێك لە راکانی نالین لە بارەی مەسەلەکەوە کە بە زمانی عەرەبی نوسیویەتی دەکەینە کوردی:

"لەم دنیای سێیەمەدا کە پێی دەڵێن دنیای گەشەکردوو (کە تەنیا شێوازی سەرکوتکردن تیایدا گەشەی کردووە) حکوومەت و دەسەڵاتەکان دەستیان بەسەر هەموو بوارێکی ژیانی کولەمەرگیماندا گرتووە و خۆیان بەسەردا سەپاندوین. بەناوی پارێزگاری کردنی ئاسایشەوە گەلێك قۆرتیان لەسەر رێگادا داناوین. بەڵام تاکەی ئەم یاریکردنە بە چارەنووسی شارستانی و کلتووری گەلانەوە بەردەوام دەبێت، ئەوان لەبارەی ئازادی و فیکرو پێشکەوتن و گۆڕانەوە گەلێك دروشم بەرزدەکەنەوە، بەڵام دەستی سەرکوتکردنیان، بە هەموو شێوەیەك، بۆ کوشتنی وێنەکانی ژیان و رێگرتنە لە پێشکەوتن و گۆڕان"

پاشان نالین باس لە دنیای عەرەبی و ئەو گیانەڵا بەردەوامە دەکات کە راگەیاندنی عەرەب تیایدا دەژی و بێجگە لە هەڕەشە و سانسۆر و دروستکردنی مۆتەکەی ترس بەسەر نووسەرو داهێنەرانەوە چیتری لەدەست نایەت. ئەوەیش لە سووتاندنی کتێب و کتێبخانەکانەوە دەردەکەوێت. یەکێك لەو کتێبانەی کە بەر شەپۆلی ئەو سوتاندنە کەوتوە رۆمانی نووسەری گەورەی کورد سەلیم بەرەکاتە بە ناوی (دڵشاد، فراسخ الخلود المهجورە)یە، ئەم رۆمانە لە دەزگای عەرەبی بۆ لێکۆڵینەوە و بڵاوکردنەوە لە بەیروت چاپکراوە. بەڵام نازانین بۆ لە ئەردەن قەدەغەکراوە! نووسەر دەڵێت: (ئێمە زۆر لەسەر سەلیم بەرەکات دەزانین، ئەو نووسەر و شاعیر و رۆماننووسەی خاوەنی ئەو زمانە عەرەبیە ئەدەبیە هەرە وردەیە کە نووسەر و ئەدیب و شاعیرانی عەرەب سەری بۆ

دادەنەوێنن، بەڵام هەرگیز ئەوەمان نەزانیوە کە بۆ بەرەکات سەرچاوەی هەڕەشەی ئەمنی بێت لەسەر ئەردەن).

لە شوێنێکی تردا نالین دەڵێت: (هەموو دەزانین خەون و خولیاکانی کورد ئەنگێزەیەکی سەرەکیی نووسینی سەلیم بەرەکاتن، هەر ئەو بابەتانە زاڵن بەسەر بەرهەمەکانیدا، باشە بۆ دەبێت دەسەڵاتدارانی ئەردەن لەم ڕۆمانە بترسن، ڕەنگە پاساو بۆ یەکێك لە وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان هەبێت بۆ ئەو کارە، بەڵام ئەردەن بۆ؟)

دواجار نووسەر دەڵێت: (سووتانی ڕۆمانەکە هیچ لە گەورەیی و داهێنانی ئەم پیاوە کەم ناکاتەوە کە ئەدیبە عەرەبەکان توانای کێبڕکێ کردنی زمانەکەیان نیە کە هەموو واژەیەکی دەکاتە ئاواز و وشەکانی دەکاتە گۆمێکی خەیاڵ، هەروەها وەرگێڕانی بەرهەمەکانی بەرەکات بۆ چەندان زمانی تر بەڵگەی دەگمەنی و مەزنی ئەو کارانەیە، هەروەها سووتاندنی ئەمڕۆی ڕۆمانەکانی داننانە بە گرنگی و بایەخی ئەو کارانەی.)

—سەردەم—

## جیهان بەبێ حەمزاتۆف

دواجار ئەو شاعیرە مرد

کە قەفقاس بەوەوە دەناسرا



ڕەسوڵ حەمزاتۆف، ئەو شاعیرەی لە وڵاتە بچوکەکەی بەناوبانگتر بوو، مرد. ئەو خەڵکی "داغستان" بوو لە قەفقاس کە دەکەوێتە باشوری روسیاوە و لە جیهاندا پێی دەڵێن "داغستانی حەمزاتۆف". ئەو کوڕی زەوی و چیا و ئەو دۆڵانە بوون کە بەرەو پاکێتی و سادەیی دەیانبرد. ئەو جیهانی لە زەوی و حیکایەت و روداوەکانی وڵاتەکەیدا کورت دەکردەوە و لە هەر زەویەکی تر، زەوی وڵاتەکەی خۆی خۆشدەویست.

ڕەسوڵ حەمزاتۆف لە 8ی دیسەمبەری 1923 لە گوندی "تسادا"ی داغستان، لە خێزانی شاعیری گەورەی داغستان "حەمزە تسادا" لەدایك بووە. لە بیست ساڵیدا دەبێتە ئەندامی یەکێتی نوسەرانی روسیا و دوای تەواوکردنی خوێندن دەبێتە سەرۆکی یەکێتی نوسەرانی داغستان کە تا مردنی لەو پلەیەدا مایەوە.

حەمزاتۆف خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی "ئارانیا" تەواو دەکات، پاش ئەوەی لە پەیمانگای پەروەردەی ئاڤاری دەردەچێت، دەبێتە مامۆستا. کاری یاریدەدەری دەرهێنەر لە شانۆی ئاڤاری دەوڵەتی و پاشان سەرۆك بەش و پەیامنێری ڕۆژنامەی "بەلشەفیەکانی چیا" و نوسەر و ئامادەکاری بەرنامەی رادیۆی داغستان بە زمانی ئاڤاری، دەکات. لە نێوان ساڵانی 1945–1950 بەردەوامی بە خوێندن دەدات ئەویش لە پەیمانگای ئادابی گۆرکی لە مۆسکۆ. دوای تەواوکردنیشی دەبێتە سەرۆکی یەکێتی نوسەرانی داغستان.

حەمزاتۆف لە تەمەنی نۆ ساڵیەوە دەست بە نوسینی شیعر دەکات. پاشان لە ڕۆژنامەی "بەلشەفیکەکانی چیا" کە بە زمانی ئاڤاری دەردەچوو و لە سەر ئاستی کۆمارەکەدا بڵاو دەکرایەوە، شیعرەکانی بڵاو دەکردەوە. لە ساڵی 1943 یەکەم دیوانی بە زمانی ئاڤاری بڵاوکردەوە. بیست ساڵ بوو کە

کرا بە ئەندام لە یەکێتی نوسەرانی روسیا، لەو کاتەوە دەیان کتێب لە شیعر و ئەدەبی کۆمەڵایەتی و پەخشان بڵاو دەکاتەوە.

شیعرەکانی حەمزاتۆف لەلایەن کەسانی ناسراوەوە کراون بە ڕوسی، وەك: ئیلیاسیلفینسکی، سیرغی غورودتیسکی، سیمون لیبکین و کەسانی تر. پەیوەندی و کاری هاوبەشیشی لەگەڵ شاعیرانی تر هەبووە. بەڵام حەمزاتۆف خۆی شیعری پۆشکین، لیرمونتوف، نیکراسوف، بلوك، مایکوفسکی، یەسەنین، شیفشینکۆ و شاعیری عەرەب عەبدولعەزیز ئەلحەجە دەکاتە ئافاری.

زۆر شیعری حەمزاتۆفیش لەلایەن کەسانی زۆر ناسراوەوە کراونەتە گۆرانی و ئاوازیان بۆ دانراوە. حەمزاتۆف زۆر خەڵات و مەدالیای وەرگرتووە و نازناوی شاعیری گەل لە داغستان، پاڵەوانی کاری سۆسیالستی، خەڵاتی لینین، خەڵاتی روسیا و یەکێتی سۆڤیەت، شاعیری سەدەی بیستەم، خەڵاتی یەکێتی نوسەرانی ئاسیا و ئەفریقیا "لوتس"، خەڵاتی جەواهر لال نەهرۆ، خەڵاتی فردەوسی، کریستوبوتیفی بولگاری، هەروەها خەڵاتی شولوفوف، لیرمەنتۆف، فادییف، باتیرایا و خەڵاتی شاری تساداسای پێ بەخشراوە.

حەمزاتۆف لە زۆر رۆژنامەو گۆڤار و رێکخراوی نوسەران و ئەندامی بەخشینی خەڵات و پەرلەمانی کۆمارەکەیدا کاریکردووە.

کتێبی "داغستانی من" بۆ شانۆ دەردەهێنرێت ئەویش لەلایەن شانۆی کۆمیدی (بطر سبورغ)ەوە. زۆر فیلمی بەڵگەنامەی و تەلەفیزیۆنی لەسەر ژیان و داهێنانی حەمزاتۆف دەکرێت. لە کارەکانیەوە دوو فیلمی سینەمایی دەردەهێنرێت هەروەها بەرهەمی ئەویش دەکرێتە بالیە.

خێزانی حەمزاتۆف پێکدێت لە فاطمەی خێزانی کە لە ساڵی 2000 کۆچی دوایی دەکات، هەروەها سێ کچ و چوار کچەزا. باوکی حەمزاتۆف ساڵی 1951 و دایکی لە ساڵی 1965 دەمرن. دوو برا گەورەکەشی لە بەرەی شەڕدا دەمرن. برا بچوکەکەشی لە (ماخاتشکالا) دەژی و ئەندامی ئەکادیمیای زانستە.

حەمزاتۆف بە سادەیی و رۆحی گاڵتەو گەپ ناسرابوو. ئەو هەردەم دەیوت: سوپاس بۆ خوا کە پێم ناڵێن بلیمەت. چونکە بلیمەتەکان ئەوانەن کارێك دەکەن کە کەسانی تر ناتوانن بیکەن. ئەوەی لە خوا داوای دەکەم ئەوەیە کە ساڵێکی تر تەمەنم درێژ بکات چونکە من کاتی تەواوم نەبووە تا بە رەشنوسەکانمدا بچمەوە، هەموو ژیانیشم وەك دەستنوسێك دەبینم کە پێویستە راستی بکەمەوە و پیای بچمەوە.

خوێندنی ئەدەب لە مۆسکۆ شارەزایی کەلتوری شیعری جیهانی پێ بەخشیی و ئەمەشی تێکەڵ بە سەلیقە تایبەتیەکەی خۆی کرد بێ ئەوەی بێگەردیی ئەزموونی وڵاتەکەی، مێژوەکەی و ئەو ململانێیەی سی ساڵ دژی قەیسەرەکان درێژەی کێشا کە تیایدا فیشەکێك لای قەوقازی ئازیز تر بوو لە قومێك ئاو و پارچەیەك نان. حەمزاتۆف یەکێك بوو لەوانەی باوەڕی بە سوسیالیزم هێنا. کاتێکیش یەکێتی سۆڤیەت لەبەریەك هەڵوەشایەوەو هەرەسی هێنا، حەمزاتۆف ئاوا بەرگری لە خۆی دەکرد: "خۆ شیعرەکانم ئەندام نەبوون لە پارتی کۆمۆنیستدا".

حەمزاتۆف لەو مرۆڤانە دەچوو کە هەرگیز کۆچ ناکەن چونکە بە رۆشتنیان جیهان هاوسەنگی

نێوان چاکە و خراپەی تێکدەچێت. هەر بۆیە بوونی ئەو، ئەو ئارامیەی دەبەخشی کە هێشتا جیهان شتێك لە باشەی تیاماوە. لە وەڵامی پرسیارێکدا کە دەڵێت لە داغستاندا بیست نەتەوە بە بیست زمانی جیاوە دەژین، کەی داغستان یەك زمانی دەبێت؟

حەمزاتۆف دەڵێت: بۆچی بە دوای یەك زماندا دەگەڕێی.. ئایا ئەگەر هەموو ئەستێرەکانمان لە یەك خۆردا کۆکردەوە جیهان جوانتر دەبێت؟

شاعیرێکی مەزن مرد کە هەموو ساتێکی شیعر و خۆشەویستی جیهان بوو.

ئامادەکردنی: سەردەم

## دوا ساتەکانی محەمەد شوکری

**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانیع**



دوا نێوەڕۆی شەممە 15تشرینی دووەم نزیك 1.45دەقیقە، لاشەی نوسەری مەغریبی "محەمەد شوکری" لە ژوری 304 و لە قاتی سێیەمی خەستەخانەی سەربازی ڕبات لەرزدایگرت، لەرزێکی سوك و ئیدی ڕۆحی دەرچوو.

ڕۆژی دووشەممە 10تشرینی دووەم بەهۆی تەنگە نەفەسییەوە شکری ماندوو دیار بوو، بە زەحمەت هەناسەی دەدا، بەڵام بەئاگابوو، بۆرییەکی ئۆکسجینیان بۆ دانا و لەهەمانکاتدا لە ڕێگەی دەمارەوە خواردنیان پێدەدا، بەشێوەیەکی ئاسایی دەیخوێندەوە و لە ڕادوێیەکی بچوکەوە گوێی لە مۆسیقا و هەواڵەکان دەگرت، نەیدەتوانی لەسەر جێگاکەی هەستێت، کاتێ میوانەکانیشی دەهاتنە ژورەوە بە خەندەوە پێی دەوتن "تکاتان لێدەکەم تەنها بە دەست سڵاوبکەن".

ڕۆژی سێشەممە حاڵی وەك خۆی مایەوە بەڵام تەنگە نەفەسیەکەی زیادی کردبوو، ئارەزوشی نەدەچووە سەر خواردن، لەم ڕۆژەدا هەندێ وەرەقەی نوسی، لەو بەهاو پرنسیپانە دەدوا کە بە درێژایی ژیانی باوەڕی پێیان هەبوو، هەرگیز باوەڕی بەو بەهایانە لەق نەبوو، گەرچی تارمایی مردن بە دەوری بنمیچی ژورەکەیدا دەسوڕایەوە، کەچی ئەو لەگاڵتە و نەفرەتەکانی خۆی نەدەکەوت.

ڕۆژی چوار شەممە بەزەحمەت قسەیدەکرد و کۆکەکەشی لێی توند کردبوو، خەونی نەبوو، بگرە خەوی پچڕ پچڕ بوو، هەندێ لاپەڕەی لە کتێبێك خوێندەوە.

ڕۆژی پێنج شەممە نەشتەرگەری فراوانکردنی بۆری هەناسەدانی بۆ کرا، هەندێ وشەی لەدەم هاتەدەر، ناوناوە بۆ میوانانی دەنوسی، ئەو شەوە بەشێوەیەکی نائاسایی خەوێکی قوڵی لێکەوت.

بەیانی هەینی چوست و چالاکتر بوو، بەڵام بەتەواوی دەنگی لەدەست دابوو، ئەو ڕۆژە توانی کەمەکێك لە بەروبومی شیر بخوات و هەندێ شلەمەنیش بخواتەوە، بگرە توانی پارچەیەك لە میوەی "کاکی" بخوات کە میوەیەکی خۆشە و لە موتوربەکردنی پرتەقاڵ لەگەڵ تەماتە دێتەبەرهەم و ڕەخنەگر "عەبدولحەمید عەقار" بۆی پاککرد.

شەوی هەینی حاڵەتی تێکچوو و نەیتوانی بخەوێت، بەیانی شەممە بە خێرایی لە ژورەکەیەوە گواستیانەوە بۆ ژوری پشکنین بە ئەشیعە و بە ئامێری "ڕەنین-سکانەر"، پێش ئەوەی بچێتە ژورەکەوە دکتۆر "جەمال محاسنی" کە هونەرمەندێکی

لێوەشاوەی وێنەگرتنە و هاوڕێی محەمەد شوکریە بە پەلە هات بۆلای و لێی پرسی: ئایا حەبەکانی خەولێخستنت خواردووە؟ محاسنی لەوەدەترسا شوکری ژمارەیەکی زۆر حەبی نوستنی خواردبێت، شوکری بە ئاماژەیەك لە دەستی وەڵامی دایەوە کە دوو دانەی خواردووە، بەڵام کاتێ دکتۆر چووە ژورەکەیەوە زانی شوکری هیچ حەبێکی نەخواردووە و بگرە پاکەتی حەبەکان بەساغی ماوەتەوە، دکتۆر محاسنی بۆی دەرکەوت وەڵامی شوکری بەمانا پزیشکییەکەی واتەی لەدەستدانی توانای تەرکیزکردنە. کاتێ شوکری لە ژوری "ڕەنیین-سکانەر" هاتەدەرەوە مێشکی لە ئیش کەوتبووە، بەڵام لاشەی هەر دەجوڵا، لە دەوروبەری 10 بەیانی گەڕاندیانەوە بۆ ژورەکەی خۆی، ئەوکاتی شوکری ئەکلیکیانە مردبوو، دواتر کەوتە حاڵەتی گیانەڵڵاوە، لە 1.45دەقیقەدا بۆ دواجار جەستەی لەرزی و گیانی دەرچوو.

**سەرچاوە**

تەڵحە جوبریل/ ڕۆژنامەی ئیلاف/ چوارشەممە 19تشرینی دووەم/ 2003



## ڕۆماننووسی یۆنانی کازانتزاکی

**لە عەرەبییەوە: ساکار رووف**

کازانتزاکی وا راهاتبوو هەرکاتێك بەشێك لە کتێبێکی خۆی، شیعر، ڕۆمان، ژیاننامەی تەواودەکرد، بە هەمان ڕێك و پێکی و سادەیی منداڵێك نیشانی ئیلینی دەدا:

-لینوتشکا، تکات لێدەکەم بیخوێنەوە، پێم بڵێ ئەگەر نرخێکی هەبێ! وەك قوتابیەك لە شەرما سوور داگەڕابێت ئەوەی پێ ووت کاتێك خۆی بە ژوورەکەیدا کرد و پێشەکی کتێبی (تودا - رابا)ی بە دەستەوە بوو.

بەڵام ئەو کتێبەی کە ئیلینی هەست بە تاڵاوی دەکا سەرەڕای تێپەڕبوونی دەساڵ بەسەر بڵاوبوونەوەیدا، کتێبی (راپۆرتێك بۆ گریکۆ)یە، ئەو ژیاننامەیەی خۆی کە ماوەیەکی زۆر خەریکی نووسینی بوو، ئەو راهاتبوو نانی نیوەڕۆی نەدەخوارد تا لە کارەکەی دانەبڕێ، ئیلینی دەڵێ (هەفتەی جارێك دەچووینە شوێنێکی نزیك، ئەو هەموو ئێواران حەزی بەوە بوو چی بە ڕۆژ دەنووسی بیخوێنێتەوە) ئیلینی درێژە بە قسەکانی دەدا و دەڵێ:

-ئەو لە دوای سی ساڵیش لەسەر هەمان گومان و دڵەڕاوکێی خۆی هەر بەردەوامبوو. ئێمە ئێستا لە (ئەنتیب)داین و نیکۆس زۆر تورەیە و (راپۆرتێك بۆ گریکۆ) دەنووسێ، لەگەڵ خۆئامادەکردن بۆ گەشتەکەمان بەرەو چین. هێشتا لە نووسینی پێشەکی کتێبەکەی نەبۆوە کە بە دەنگێکی غەمگینەوە پێی ووتم (دەی چکۆلەکەم بیخوێنەوە، تکایە، بە ڕاست نازانم ئەگەر نووسینەکەم بەهایەکی هەبێ!)

(راپۆرتێك بۆ گریکۆ) دوا ماڵئاوایی نیکۆسە لەم دونیایە، ئیلینی ئەندێشەکانی ئەم گەڕیدە یۆنانییەی دەزانی، لەوەیش

دەترسا هەستی ئەو ئاوابوونەی لێ نزیک بێتەوە.

–دەی چکۆلەکەم بخوێنەوە.!

نیکۆس زۆر غەمگینانە ئەمەی ووت، پێدەچوو لە هەستێکی تاڵ و گران دەربازبووبێت و گوریسی ئەستووری پاپۆڕەکە لابرابێت و بازە یۆنانیەکە، بازی دوا ئەفسانەی یۆنانی، ئامادەی فڕین بێت، فڕین روەو (یۆتۆپیا)کانی تر کە دەکەوێتە پشت خۆرەوە.

–چکۆلەکەم بیخوێنەوە..!

کە ئیلینی دێڕە بەراییەکانی دەستپێکەکەی خوێندەوە، دایە پڕمەی گریان، دەریاوانەکە گوریسی پاپۆڕەکەی لابردوەو، دێڕەکان پڕبوون لە بۆنی مەرگ:

(کەرەستەکانم کۆدەکەمەوە: بینین، بیستن، تام، بۆن، بەرکەوتن، رۆح. ئێوارە هات و رۆژی کار تەواو بوو، ماندوو نیم، وەلێ خۆرئاوا دەبێ..) ئیلینی لە خوێندنەوە کەوت و دایە پڕمەی گریان، سەبارەت بەو چرکەساتە دەڵێ:

ئەمجارە چاوەکانی من شلوێ بوون و دەنگم خنکا: "بۆ ئەمڕۆ باس لە مەرگ دەکا؟" من بەدەم خوێندنەوەوە بیرم لەمە دەکردەوە" بۆ ئەمڕۆ بۆ یەکەمین جارە مەرگ ئەدوێنێ؟"

بەلاّم نیکۆس دەستی خستە سەرشانی و ووتی:

–دڵنیابە هاوڕێم دەساڵی تر دەژیم، ئێمە پێشتر گوتومانە کە نامرین ئەگەر ئامانجێکمان هەبێ و بمانەوێ پێی بگەین! ئیلینی دەڵێ، لە ئێوارەدا نامەیەکی بۆ بریفیلاکی هاوڕێی نووسی:

دەستپێکی کتێبی (راپۆرتێك بۆ گریکۆ)ت بۆ دەنێرم کە ئیلینی نەیتوانی تا کۆتایی بیخوێنێتەوە لەبەرئەوەی دایە پرمەی گریان، گەرچی وا چاکتر بوو خۆی لەسەر مەسەلەکە رابهێنایە، خۆشم هەروەها..

لە پاشدا نیکۆس لە نامەیەکی خۆشیئامێزدا دەنووسێ:

"–ئای کە ژیان خۆشە! چۆن بێ پەروا وەك چۆلەکەیەکی لامل سوور مەست بە بۆنی هەلۆژەی کێوی و بەو هێلانە گەرم و گوڕەش کە دوو هێلکە تیایدا دەبریسکێتەوە، گۆرانی ئەچڕێ.." با جارێ بخوێنم، ئینجا هێلکەکان لە ئامێز بگرم، باجارێ بخوێنم" بێئاگابوو لەوەی کە ئەو لەسەر داوی گرتنی باڵندە راوەستاوە..

هەمان ئەندێشە جارێکی دی، تەنانەت لە خۆشیشدا.

ئیلینی لە وەسفێکی وردی حاڵەتی ئەودا دەڵێ، بە دەیان کتێب و رۆمان ئەویان دەخنکاند بە تایبەتی داستانی ئۆدیسا، نەخشەکانی براکوژی، مەسیح دووبارە لە خاچ دەدرێ، کتێبی زوهد، زۆربای یۆنانی و هی تریش خۆیان لە ملی ئالاّندبوو، هەروەك کاتە درەنگەکان و داوی باڵندەکان، تەنانەت خەلاّتی نۆبڵ کە دواتر وەریدەگرێ هیچ لە رەفتاری ناگۆڕێ، لەبەرئەوەی گوریسی پاپۆڕەکە شل بۆتەوەو پڕشنگی خۆرئاوابوونەکەش لە دەریادا دەتەقێتەوە.

ئیلینی دەڵێ، زۆربای یۆنانی غەریبترین کەسایەتیە کە نیکۆس لە ساڵی (1917)دا لە کانە خەڵوزێکی باشوری (بیلوبونینز) نزیك دوورگەیەکی خنجیلەی جوان ناسی، نیکۆس ماوەیەك لێرە ژیا لەگەڵ زۆربای کرێکاری کانەکان کە لەوەودوا رۆڵێکی گەورە لە ژیانی ئەم فەیلەسووف و رۆماننووسە مەزنەدا دەبینێ.

### سەرچاوە

رۆژنامەی (المدی) ژمارە 13 – ساڵی 2003.

## فردریش نیچە
## (بایۆگرافیایەکی فەلسەفی)

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**



*Nietzsche, aphilosophical biography rodiger safranski*

*w.w. norton, company- newyork. London. 2003*

*p. 412*

"رۆدیگێر سافرانسکی" کە نوسەری ئەم کتێبەیە، یەکێکە لەو ئەکادمیستە مەزنانەی پسپۆڕە لە فیکری "نیچە" داو پێشتریش کتێبێکی گرنگی دەربارەی "هایدگەر" بە ناوی (هایدگەر لە نێوان چاکە و خراپەدا) بڵاوکردۆتەوە، لەگەڵ کتێبێك بە ناوی (شۆپنهاوەر و ساڵە تفت و تاڵەکانی فەلسەفە). لەم کتێبە تازەیەیدا "سافرانسکی" لە سەرەتاوە تا کۆتایی عەوداڵی ژیانی "نیچە"یە و لە هەموو قۆناغێك لە قۆناغەکانی بەرەوپێشچونی فیکری ئەودا، هەڵدەستێت بە بەستنەوەی روداوەکانی ژیانی رۆژانەی بە نوسین و بەرهەمە فەلسەفیەکانیەوە.

بەمجۆرەش دابڕان لە نێوان ژیانی فەیلەسوف و نوسینەکانیدا دروست نابێت.. ئەمەش بۆیە دەڵێین، چونکە هەندێك کات ئەوانەی ژیاننامەی فیکری فەیلەسوفەکان دەنوسننەوە، بەجۆرێك ئەو کارەدەکەن کە ئێمە پێمان وابێت ئەوانە نە ئەزمونی ژیانیان کردووە و نە ئازاریان چەشتووە و نە دڵشاد و دڵگرانیش بوون، وەکو تەواوی خەڵکانی تر. بێگومان ئەمە کارێکی باش نییە لە کاتی نوسینەوەی سەربوردەی فەیلەسوفە مەزنەکاندا، بە تایبەتی گەر ئەو فەیلەسوفانە لە ئاستی کەسێکی وەك "نیچە"دابن کە بە خوێن و مێشك و تەواوی هەست و نەستیەوە دەینوسی.. ئەی ئەوە ئەو نییە کە دەڵێت: (من مرۆڤ نیم، من رستێك دینامێتم!!). بەڵێ ئەم فەیلەسوفەی کە تەنها چل و پێنج ساڵێك بە ئاگایی ژیاو دوای ئەوە بۆ ماوەی یانزە ساڵ وەکو دێوانەیەك گوزەراندی و سەرەنجامیش لە تەمەنی پەنجا و شەش ساڵیدا کۆچی دوایکرد (1844-1900)، دینامێت بوو..

"نیچە" لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ماڵئاوایی لە ژیانکرد و پێی وابوو خەڵکی تەنها لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمدا و دوای سەد ساڵ لە مردنی، دەتوانن پەی بە فەلسەفەکەی ئەو بەرن و لێی تێبگەن. ئەو پێشبینیەشی تەواو راست دەرچوو.

هەنووکە تەواوی فەیلەسوفەکان دان بەوەدا دەنێن کە ئەو مەزنترین و قوڵترین فەیلەسوف بووە.. هەموو ئەو شتانەی پێشبینی کرد کەم تا زۆر رویاندا، لەوانە جەنگە جیهانیەکان و پاشەکشەکردنی بەهاکانی ئایینی مەسیحی لەناو کۆمەڵگە خۆرئاواییەکان و داخڵ بوون بەسەردەمی نیهلیزم. بەڵام با بزانین ئەم فەیلەسوفە ترسناکە کێیە کە زیاد لە سەدەیەکە و تا ئێستاش خەڵکی بە خۆیەوە سەرقاڵکردووە؟

"فردریش نیچە" ساڵی 1844 لە شارۆچکەی (رۆکین)ی ئەڵمانیا لە دایکبووە. باوکی قەشەیەکی پرۆتستانت مەزهەب بووە و هەروەها دایکیشی سەر بە بنەماڵەیەکی ئایینی بووە. ئەمەش مانای وایە کە هەر لە سەرەتای منداڵیەوە وەکو "ئیمانوێل کانت" لە

کەشوهەوایەکی تەواو ئایینیدا ژیاوە.. فەزای ماڵی "نیچە" پڕی بووە لە ویردو مۆجیاری ئایینی مەسیحی و پەروەردەیەکی ئەخلاقی توند و تۆڵ. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە دواتر لە تیۆلۆژیای مەسیحی سەرکوتکەر هەڵدەگەڕێتەوە. وەکو ئاشکراشە لە کتێبەکانیدا زۆر بە توندی ڕەخنە لە قەشە و پیاوانی ئایینی دەگرێت.

بەهۆی دەرد و نەخۆشی بەردەوامی باوکیەوە، هەمیشە ماڵی ئەوان کەش و هەوایەکی دڵتەنگ و خەمباری هەبووە.. چوار ساڵ دوای لەدایك بوونی "نیچە"، باوکی دەمرێت. ئەمەش کاریگەری ناخۆشی لەسەر جێدێڵێت.. باوکی لە ناکاودا نەمرد، بەڵکو دوای چەند مانگێك لە کەسیفی و دەردەداری گیانی دەرچوو.

دوای مەرگی باوکی، لەگەڵ دایکی و ئەلیزابیسی خوشکیدا رویانکردە ناومبۆرگ و لەوێ دەستی بە خوێندن کرد. ئەو خوێندنگایەی ئەو بۆی چوو پێشتر "یۆهان فێختە" تیایدا خوێندبووی. "نیچە" لەو قۆناغەی ژیانیدا حەزی بە تەنهایی و گۆشەگیری دەکرد و پرسیاری وای دەکرد کە هەرگیز بە بیری منداڵدا نایەت لەو تەمەنەدا.. بۆ نموونە پرسیاری ئەوەی دەکرد کە بۆچی هاتۆتە دنیاوە، یاخود پاساو و بەهانەی بوونی ئەو چییە لەم ژیانەدا؟

لێرەوە و لە بری گەمە و یاری و باوەشکردن بە ژیاندا، مەسەلەی بوون بوو بە کێشەی گەورەی ئەو.. ئیتر پرسیارگەلێکی دەوروژاند لەو تەمەنەدا کە خەڵك تەنها لە دوا ڕۆژەکانی عومریاندا لە خۆیانی دەکەن و بە بیریاندا دێت. ئەو پرسیارانەی ئەو دەیکردن، تەنها ئەو منداڵە دەگمەنانە دەیکەن کە لەناو ماڵی خۆیان و لە ناو خێزان و کۆمەڵگەکانیاندا هەست بە نامۆیی دەکەن. لەوانە دەکرێت ناوی هەندێکیان بێنین: "بۆدلێر، ڕامبۆ، ئەدگار ئالان پۆ، هۆڵدەرلین و... هتد".

هەر لە یەکەم ساڵی خوێندنی ئامادەیدا، بەهرەی ئەدەبی وای تێدا دەرکەوت کە جێی سەرنج بوو.. ئەوەی زیاتر جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە لە تەمەنی سیانزە ساڵیدا، کەوتە نوسینەوەی ژیاننامەی خۆی!! یەکەمین کێشەیەك لەم دنیایەدا ڕووبەڕووی بووەوە، کێشەی شەڕ و خراپەبوو.. باوکی ئەو کەسێکی نەرم و نیان بوو، ئازادی کەسی نەدەدا. ئەی کەوایە بۆچی توشی ئەو دەردە کوشندەیە بوو لە تافی لاویەتیدا (36 ساڵی) و سەری نایەوە؟ ئەی بۆچی لە بری ئەو کەسێکی بەد و شەرانگێز نەمرد؟ بۆچی کەسانی باش دەمرن و خراپەکارانیش دەژین؟

"نیچە" دوای تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی چوو بۆ (بۆن)، تا لە زانکۆی ئەوێدا درێژە بە خوێندن بدات. کە چووە زانکۆی (بۆن) لە یەك کاتدا خۆی لە کۆلێژەکانی تیۆلۆژیای ئایینی و فیلۆلۆژیا و مێژووی کۆن ناونووس کرد. کۆلێژی یەکەمیان لە دڵەراوکێی ڕۆحی و میتافیزیکی کەم دەکردەوە و دووەمیشیان فزوڵی زانستی و مەعریفی تێردەکرد. لەوێ ئاشنایەتی لەگەڵ پرۆفیسۆر "ریچێڵ"دا پەیدادەکات کە ڕۆڵێکی گرنگ لە ژیانیدا دەگێڕێت. هەر لە سەرەتاوە ئەم مامۆستا بەناوبانگە وابەستەی خوێندکارە تازەکەی دەبێت کە خاوەنی بەهرەیەکی کەم وێنە بوو.

هەرچەندە "نیچە" دڵی بە (بۆن) دەکرایەوە و حەزی بە پیاسە ڕۆمانسیەکانی سەرکەناری روباری (راین)ی دڵرفێن بوو،

بەلام كاتێك مامۆستاكەی ئەم زانكۆیەی بەجێهێشت و رویكردە زانكۆی (لایبزیك)، دەستبەرداری ئەمانە بوو كەوتە شوێن پرۆفیسۆر "ریچێل". لە (لایبزیك) دوو دیداری سەرەكی لە ژیانی ئەودا رویاندا: یەكەمان لەگەڵ فەلسەفەی "شۆپنهاوەر" و دووەمیشیان لەگەڵ مۆسیقاری بەناوبانگ "ریچارد ڤاگنەر" دابوو.

دەڵێن رۆژێكیان "نیچە" لە چەند كتێبخانەیەك سەرگەرمی گەڕان بووە بە دوای كتێبدا و لە ناكاو كتێبی (جیهان وەكو ئیرادو وێناكردن)ی "شۆپنهاوەر"ی بەرچاو دەكەوێت و زۆر سەیر ئەو كتێبە سەرنجی رادەكێشێت، ئەگەرچی لەوەو بەر نە هیچی لە ناوەرۆكی كتێبەكە زانیووە و نە ئاگاداری نوسەرەكەشی بووە.. دەستبەجێ ئەو كتێبە دەكڕێت و دەیباتەوە بۆ ماڵێ و بە درێژایی ئەو رۆژە و تا نیوەشەو خەریكی خوێندنەوەی دەبێت، وەختێك وازی لێدێنێت كە دوا لاپەڕەی دەخوێنێتەوە. ئەڵبەتە "شۆپنهاوەر" لەو كاتەدا چوار ساڵ بوو مردبوو، گەرنا ئەوا دەستبەجێ دەچوو بۆ ماڵیان و خۆی پێدەناساند. لەو كاتەوە ئیتر "نیچە" خۆی وەك قوتابیەكی "شۆپنهاوەر" كە مەزنترین فەیلەسوفی رەشبینە لە مێژووی فیكردا، حساب دەكرد.

"شۆپنهاوەر" نەفرەتی لە ژیان و لەو چركەساتە دەكرد كە تیایدا لەدایكبووە و مۆجیاری ئەوە دەخاتە بەردەست، كە چۆن خۆمان لە ژیان لابدەین و لە ژەهر و مەترسی و فریودانەكانی دووركەوینەوە.. چونكە ژیان بریتییە لە فێڵێكی گەورە و تەفرە خواردن.

دوای ئەوە و لە كۆتایی ئاهەنگێكی مۆسیقیدا، ئاشنایەتی لەگەڵ "ڤاگنەر"دا پەیدا دەكات.. بی ئەندازە بە مۆسیقای ئەو سەرسام دەبێت و لەبەر ئەوەش دەبێت بە دەروێش و هاورێی لەیەك كاتدا.. بەشێوەیەكی بەردەوام سەردانی ماڵی "ڤاگنەر" دەكات و پەیوەندیەكی رۆحی قوڵ لە نێوانیاندا دروست دەبێت.. "ڤاگنەر" لەو كاتەدا خەریكی ئەوەبوو كۆدێتایەك لە مێژوی مۆسیقای ئەڵەمانیدا بكات.. دەیویست شۆڕشێكی تەواو لەو بوارەدا بەرپا بكات، بەلام پێویستی بە بنەمایەكی فەلسەفی و میتافیزیكی هەبوو بۆ ئەوەی ئەو كارە بكات، لای ئەویش "نیچە" ئەو بلیمەتە بوو كە دەیتوانی ئەو پاشخانە فەلسەفیەی بەردەست بخات كە بۆ بەرپاكردنی شۆڕشێك لە بواری مۆسیقادا پێویستی پێی هەبوو. بەهەرحاڵ سەرسامی هەردووكیان بە "شۆپنهاوەر" زیاتر لە یەكی نزیك خستنەوە.

لەو ماوەیەدا "نیچە" ئەگەرچی تەمەنی لە خوار بیست و پێنج ساڵیەوە بوو، بەلام وەكو مامۆستایەك لە زانكۆی (بال) لە سویسرا دامەزرا. یەكەمین لێكچەری لە بەردەم ژمارەیەكی زۆری خوێندكاران و مامۆستایان و كەسە ناسراوەكانی شارەكەدا پێشكەش كرد. ناونیشانی باسەكەشی: (هۆمیرۆس و فیلۆلۆژیای كلاسیكی) بوو، واتە بینی هۆمیرۆس لە رێگای فیلۆلۆژیا و مێژووەوە.

ئامادەبووان بە رەوانبێژی و بیر و بۆچوونە قوڵەكانی ئەو مامۆستا لاوە سەرسام بوون، بەلام بێ ئاگا بوون لەوەی كە ئەو خۆی بۆ مەزنترین و قورسترین سەركێشی فەلسەفی لە مێژوودا ئامادە دەكات. دوای سێ چوار ساڵ لەوانە وتنەوە و دوای ئەوەی خەڵكی لە نیەت و حەقیقەتی بیر و بۆچونەكانی

تێگەیشتن، لێی دورکەوتنەوە و بەجێیان هێشت. ئیتر لەوە بەدوا کورسی ناو هۆڵەکان بەتاڵ و وەکو جاران خوێندکاران نەدەچوون گوێ لەوانەکانی بگرن.

لێرەوە تەنهایی ئەو گەورەتر بوو. کەس لەو سەردەمەدا نەیدەتوانی لەو سەرکێشیە ترسناکەدا هاوسەفەری بێت کە تا دوا سنورەکانی فیکر و فەلسەفاندن دەچوو. ئەو زۆر پێش سەردەم و زەمانی خۆی کەوتبوو، ئەمەش وایکرد لانی کەم هیچ کەس تێی نەگات.. هەر بۆیە بە نامۆیی ژیا و بە نامۆیش لە دنیا دەرچوو.

دوای ئەوەی لەساڵی 1872 و لە تەمەنی 28 ساڵیدا یەکەمین کتێبی خۆی (گورانی تراژیدیا)ی بڵاوکردەوە، بۆ هەموانی سەلماند کە مامۆستای هەموو مامۆستاکانە. بەڵام هاوکات بەهۆی بیروبۆچونە رادیکالیەکانیەوە کە داوای گۆڕینی کۆی سستمی خوێندنی ئەڵمانیای دەکرد، زۆر کەسی توشی شۆك کرد. ئەو هیچ شتێکی بەدڵ نەبوو، لە هیچ شتێك رازی نەبوو، بۆیە دەیوویست هەموو شتێك راماڵێت. دوای ئەوە نەخۆش کەوت و ترسا لەوەی وەکو باوکی لێبێت و وەك ئەو لە تافی لاویدا سەر بنێتەوە.. نەخۆشی ئەو سەرئێشەیەکی قورس بوو، پێدەچوو لە باوکیەوە بۆی مابووبێتەوە. پاشان چاوەکانی دایانە کزی و بەردەمی خۆی نەدەبینی. ئەمانە ناچاری کرد دەست لەکار بکێشێتەوە و زانکۆ جێبهێڵێت. ئیتر وای لێهات وەکو وێڵگەردێك روبکاتە رێگاو بانەکان: رێگا دوورەکانی سویسرا و شاخ و داخ و دۆڵ و چۆم و روبارەکانی ئەو وڵاتە، هەروەها رێگاوبانی وڵاتانی ئیتاڵیا و باشوری فەرەنسا تاقیبکاتەوە. لێرە بەدواوە ژیانی کۆمەڵایەتی "فردریش نیچە" کۆتایی دێت و ژیانی فەلسەفی دەست پێدەکات و ماوەی دەساڵ دەخایەنێت: لە ساڵی 1879 بۆ ساڵی 1889. لەو ساڵەدا و لە شاری تۆرنیۆی ئیتاڵیدا دەکەوێتە ئامێزی شێتیەوە و بەو حاڵەوە دەژی تا وەختی مردنی لە ساڵی 1900. لە ماوەی ئەم دەساڵەدا "نیچە" کتێبە سەرەکیەکانی خۆی نوسی. لەوانە: (مرۆڤانە زێدە مرۆڤانە، سپێدە، زانستی شاد، لەودیوی چاکە و خراپەوە، زەرادەشت وەهای وت).

دەربارەی "نیچە" زۆر نوسراوە و حوکم و بڕیارەی ناچونیەکیش لەسەر فەلسەفەکەی ئەو دراوە.. هەندێك بە مەرجەعی "هتلەر" و نازیزمی دەزانن و بە پێچەوانەی ئەوەشەوە هەندێکی دی پێیان وایە یەکەمین کەسە داوای یەکیەتی ئەوروپای کردووە و پێشنیازی خۆلادانی لە دەمارگیری ئەڵەمانی بەردەست خستووە.. هەندێکی تر دەربارەی ئەو دەڵێن کەسێکی دەستە بژێرخواز بووە و دژی دیموکراسی بووە.. هەندێکی تر سەر کۆنەی ئەوەی دەکەن کە مەیلێکی ئۆرستۆکراتیانەی هەبووە و بە چاوێکی نزم لە کەسانی لاواز و بێ دەسەڵاتی روانیووە.

لە راستیدا ئەستەمە بگەینە ناسینی "نیچە" بە شێوەیەکی راست و دروست.. سەرەڕای هەموو ئەوەی لە بارەیەوە نوسراوە، بەڵام بەلای ئێمەوە وەکو نهێنیەکی قوڵ و تەلیسمێکی نەشکێنراو دەمێنێتەوە. ئەو بە "دیکارت" دەچێت، بگرە زیاد لە "دیکارت"یش خۆی بە ماسك و دەمامکەوە نیشاندەدات.. بە دەگمەن نەبێت دەمامك لەسەر

رووی خۆی لانادات، بەڵام بۆچی وەها دەکات؟

لەبەر ئەوەی ژیان بۆ خۆی تەلیسماوی و ئاڵۆزە و بە ئاسانی خۆی نادات بە دەستەوە. هەندێك جار پێمان وایە جوان و قەشەنگە و پڕیەتی لە بەختەوەری و خۆشەویستی، بەڵام وەختێك كێشەیەك روودەدات رەش بین دەبین بەرامبەری و دەبێتە دوژمنێك كە ناشێت متمانەی پێبكرێت. ئەی كەواتە روی راستەقینەی ژیان كامەیە؟ ڕووە پۆزەتیڤەكەیەتی یان رووە نێگەتیڤەكەی؟

بەو پێیەی فیكری "نیچە" وێنەیەكی ژیانە، ئەوا وەكو ئەو ناچون یەكە و زیاد لە روویەكی هەیە. بەمجۆرە چەندین خوێندنەوە بۆ "نیچە" هەیە، نەك تاكە خوێندنەوەیەك.. بە تایبەتی كە ئەو بە شێوازێكی شاعیرانەی وەها دەینوسی كە نمونەی لە زمانی ئەڵمانی و بگرە لە تەواوی زمانەكانی دیكەی دنیادا نییە.

"نیچە"ش بە تەنها هەر فەیلەسوفێكی زۆر قوڵ نەبوو، بەڵكو لە هەمان كاتدا شاعیرێكی مەزن و پەخشان نوسێكی كەم وێنە بوو. سیحری گەورەی ئەم پیاوەش بە درێژایی ئەم ساڵانە لێرەدایە. دەڵێن: كتێبەكەی (زەرادەشت وەهای وت)، لاوانی ئەڵمانیا وەكو ئینجیل دەیانخوێندەوە! بەڵام جەخار، ئەمە سەروەختێك بوو كە ئەو بووە دێوانە و مردن زەفەری پێبرد و بواری ئەوەی نەبوو چێژ لە نێوبانگ و شكۆمەندی خۆی ببینێت.

### سەرچاوە

بیان الكتب، ژمارە (253)، بەرواری 2003/3/10.



## خوێندنەوەی كتێب
## سمۆئیل بیكێت.. نوسەرێكی پڕ لە گومان

**خوێندنەوەی: كامەران سوبحان**

سمۆئیل بیكێت یەكێكە لە شانۆنوس و رۆماننوس و شاعیرە هەرە دیارەكانی دونیا كە بەڕەگەز ئیرلەندی و زۆربەی ژیانی لە پاریس و لە مەنفا بەسەر برد، ئەو نەك بەسەر نوسەرانی پاریس بەڵكو بەسەر زۆرێك لە نوسەرانی ئەوروپا و ئەمەریكاوە كاریگەری جێهێشت..

بیكێت تا ئەمڕۆشی لەسەر بێت یەكێكە لە نوسەرەكانی دونیا كە وەك فەیلەسوف و بیریار ناسراوە، چونكە لە پشت تێكستەكانیەوە دونیابینی و روئیایەكی فەلسەفی قوڵ هەیە.

هەر بۆیە گەر تەنها لە بواری شانۆدا سەیركەین دەبینین بیكێت زۆرێك لە دەقەكانی بۆ سەر زمانە زیندووەكانی جیهان وەرگێڕاون و زۆر جاریش دەقێكی چەندەها جار لە وڵاتێكدا خراوەتە سەر تەختەی شانۆكان، ئەمە جگە لەو نوسینگەلە بەرفراوانەی لەسەر ژیان و بەرهەم و فەلسەفەی ئەم نوسەرە داهێنەرە نوسراوە..

یەكێك لەو كتێبانەی كە بە بڕوای ئێمە یەكێكە لە كتێبە پڕ بایەخەكانی دونیا كە بە قوڵی لەسەر تێكست و بەرهەم و ژیانی ئەم نوسەرە نوسراوە ئەو كتێبەش كتێبی (بیكێت)ە كە لە نوسینی (ناثان سكوت)ەو وەرگێڕانی (موجاهد عەبدولمنعیم)ە و لە بڵاوكراوەكانی دەزگای عەرەبی بۆ لێكۆڵینەوە و چاپكردن و تا

ئێستا و ئەم کتێبەی کە لە بەردەستی ئێمەدایە سێ چاپ کراوە..

کتێبی (بیکێت) لە دوتوێی (170) لاپەڕەدا و لە قەبارەیەکی مامناوەندیدایە و دابەشکراوە بۆ دە بەش کە هەر بەشێکیان تەرخانکراوە بۆ خستنە ڕوو و دەستنیشانکردنی رەهەندێك لە رەهەندەکانی ئەم کەڵە نوسەرە و لەگەڵ شیکارێکی زانستیانە بۆ چەند دەقێکی بیکێت کە رەنگە پێشتر رەخنەگران نەیانتوانیبێت بەم قوڵیە ئەم نوسەرە بخوێننەوە..

دواتر (سکوت) نوسەری ئەم کتێبە هێڵە گشتیەکانی تێکست لای سەموئیل بیکێت دەستنیشان دەکات و پاشتر لە ژیان و لە چرکەساتە تایبەتیەکانی (بیکێت)، هەوڵدەدات کەمەندکێشی کاتەوە بۆ ناو دونیای دەقەکانی، چونکە سەمۆئیل بیکێت بە ڕوونی لەناو زۆرێك لە دەقەکانیدا دەبینرێت، واتە تارمایی نوسەر بە درێژی بەسەر تێکستەکاندا کەوتووە، چونکە گەر (گومان) لە تێکستەکانی ئەم نوسەرەدا وەرگرین هەروەك نوسەر ئاماژەی بۆ دەکات ئەوا بیکێت پیاوێکە بەردەوام لەسەرتاپای تێکستەکانیدا پاڵەوانەکانی پڕن لە گومان، گومان.. گومان.. تا پلەی کۆتایی گومان!!

گومانەکانی (فلادیمیر و ئیستراگۆن) لە شانۆیی (چاوەڕوانی گۆدۆ)دا گومان و بێدەنگیەکانی (بیکێت)ە لە ژیانی رۆژانەدا، بە تایبەتی ئەو چرکەساتانەی کە لە کۆتایی ژیانیدا لە قاوەخانە کۆنەکەی پاریس هەیبوو، ئەو گومانانەی کە هەر لەو قاوەخانەیەوە بەرەو مەرگ بردی، ئەو گومانانەی کە بەردەوام بە چاوێکی تێڕامانەوە لە هاوڕێی شەقامەکانی پاریس دەیڕوانی، ئەو گومانانەی کە لەسەر دەریا لەو خەڵکە سادانە هەیبوو، لەو گومانانەی کە مرۆڤ هەیبوو کە ئەو پێی وابوو تا دوا هەناسەی مەرگ مرۆڤ بە گومانە لە بەرامبەری رەنگە ئەو گومانەش ناسینێکی جوانی یەکتربێت!.

(ئەو پیاوێکە پڕ لە گومان!!)

ئەم دێڕە بو بە ناسنامەیەکی دیاری (بیکێت) و دواتریش بەم شێوەیە دەقی گرت تا ئەو چرکەساتە و ئەو زستانەی کە لە پاریس بۆ دواجار چاوە تیژەکانی لێکناو بۆ یەکجاری ماڵئاوایی لەو دونیا ڕەشە کرد کە خۆی لە دەقەکانیدا وێنەی دەکێشا!!

ئەوەی لەم کتێبەدا زیاتر جەختی لەسەر دەکرێت ناسینی (بیکێت)ە وەك (رۆماننوس – شاعیر – شانۆنوس) دواتر خستنەڕووی هەندێ لەو رۆمان و شیعرانەی کە کەمتر خوێنەر بەرچاوی کەوتون، دواتر باسکردن لە رۆمانەکانی (سەمۆئیل بیکێت) کە بەڕاستی لە ئاستی داهێناندا گەر لە ریزی شانۆنامەکانیدا نەبن ئەوا کەمتر نین، لەگەڵ ئەوەی ئەم نوسەرە زیاتر وەك شانۆنوس ناسراوە نەك شاعیر و رۆماننوس. لە کاتێکدا بیکێت نۆ رۆمانی هەیە و لەگەڵ سێ کۆمەڵە شیعری درێژ، جگە لە چەندین دەستنوسی دی. لە بەناوبانگترین رۆمانەکانی بیکێت: (مۆرفی کە ساڵی 1938 نوسی، وات ساڵی 1953 نوسی، مولوی ساڵی 1951 نوسی... هتد)

رۆمانی مۆرفی یەکێکە لە شاکارە زۆر دیارەکانی بیکێت کە دوای بڵاوبونەوەی لەلایەن خوێنەرانەوە زۆر پێشوازی لێنەکراو تەنانەت دەڵێن لە پاریس تەنها چەند دانەیەکی لێفرۆشرا، هەروەك نوسەر پێی وایە کە هۆکەی بەدحاڵی بونی خوێنەرە لە دیدگای بیکێت!.

ئەم حاڵەتە تا ئەم قۆناغەش پانتاییەکی گەورەی لە بەرهەمەکانی ئەم نوسەرە داگیرکردوە، چونکە زۆر جار خوێنەری دەقەکانی بیکێت هەست بە قورسی دەکەن لە دەستەواژە و ئاماژەکانی دەق و تا دەگاتە حاڵەتی لێکنەگەیشتن تەنانەت ئەم حاڵەتەش گەیشتوەتە ئاستێك کە زۆرجار بینەرانی شانۆییەکانی بیکێت بە کەمی لە روداوەکان بگەن، هۆکاری ئەمەش بۆ چەند شتێك دەگەڕێتەوە لەوانە نەبونی هەرەمێکی تەقلیدی لە بینای شانۆنامەکانی ئەم نوسەرەدا، لەگەڵ نەبونی چیرۆکێکی دیاریکراوی شانۆنامە و دیارنەبونێکی تەقلیدی سکێچی کارەکتەرەکانی نێو شانۆنامەو تێکستەکانی..

لە بواری دراما و شانۆنامەشدا بیکێت ژمارەیەکی زۆر شانۆنامەی نوسیوە، بەلام هەروەك لە رۆمانیشدا ئاماژەمان بە چەند دانەیەکیان کرد کە زۆر دیار و ناسراون، بە هەمان شێوەش لە شانۆنامە دیارەکانی بیکێت کە بریتین لە: (لە چاوەڕوانی گۆدۆدا، کۆتایی گەمە، دوا شریتی کراب، رۆژە جوانەکان، ئەوە نیم.. هتد).

ئەوەی لەم شانۆنامانەشدا زیاتر مایەی سەرسوڕمان و جێی پرسیاری خوێنەران و بینەرانی شانۆ بوو، شانۆگەری (لە چاوەڕوانی گۆدۆ)دا بوو کە بیکێت لە ساڵی 1953دا نوسی، بەلام ئەمیش سەرەتا بە لای بینەرانەوە تا رادەیەك قورس بوو، بەلام دواتر زۆرێك لە هۆڵەکانی شانۆی پاریس ئەم شانۆییەیان نمایشکردو پاشتریش ولاتانی (بەریتانیا و ئەڵمانیا و نەرویج و ئیتالیا)ی گرتەوە.

رەنگە هۆکاری ئەم ناوبانگە زۆربون، بەلام دیارترینیان وروژاندنی پرسیارگەلێکی گرنگ و فەلسەفی قوڵ بوو لە ماهیەت و بونی ئینسان، ئەم شانۆنامەیە جارێکی تر بێ هیواییەکانی شەقامی ئەوروپی لە دوای دو جەنگی خوێناوی خەستر کردەوە و وای لە خەڵکی کرد جارێکی دی چاوەڕوانی فریادڕەس نەکەن، چونکە رەنگە ئەو فریادڕەسە تا مردن هەر نەیەت، رەنگە ئەو فریادڕەسە گۆدۆکەی (بیکێت) بێت کە (فلادیمێر و ئیستراگۆن) تا کۆتایی شانۆییەکە هەر چاوەڕوانی بون، بەلام بەداخەوە هەر نەهات!!

لە چاوپێکەوتنێکدا پرسیار لە (سەموئیل بیکێت) دەکەن و پێی دەڵێن (گۆدۆ) کێیە؟؟ ئەویش لە وەلامدا دەڵێت گەر بمزانیایە گۆدۆ کێیە ناوم دەبرد!!

هەر بۆیە ناوبانگی ئەم شانۆنامەیەی بیکێت هەموو کیشوەرەکانی دونیای بڕی و بۆ سەر زمانی زۆرێك لە گەلانی وەرگێڕاو زۆربەی هۆڵی شانۆکان ئەم شانۆنامەیەی لەسەر پێشکەشکرا، بەشێوازێك (چاوەڕوانی گۆدۆ) بوو بە ناسنامە و شوناسی بیکێت!!

رەنگە خاڵێکی دی لە دەوڵەمەندی ئەم کتێبە لەوەدابێت کە زۆر لایەن و مەودای دەق و ژیانی (بیکێت)ی لە یەکداوە و پاشتریش شیکاری وردی بۆ کردووە و دواتریش نوسەر هەڵوێستە لەسەر هێما و ئاماژەکانی ناو تێکستەکان دەکات و وەك دەزگایەکی زمانەوانی و مەعریفی شیتەڵیان دەکات..

لە باسی (نائومێدی گومان)ی بیکێتدا نوسەر دیدێکی مەعریفی هەیە بۆ ئەم حاڵەتە چونکە بیکێت لە ئەنجامی تەئەمول و تێڕامانێکی قوڵەوە گەیشتوەتە ئەو ئاستە رەشبینیەی کە سەرتاپای دەقەکانی گرتوە، رەشبینیەك کە دواجار بوو بە فەلسەفە و تێڕوانینێك کە باڵێکی

سەرەکی بوو لە ئەدەبی هاوچەرخی بیکێت لە پاریس و زۆرێك لە ولاتانی ئەوروپا، بەشێوازێك بە ئاراستەی ئیشکردنی ئەدیبە (وجودیەکان) بیکێت بوو بە ئەستێرەیەکی دیاری ئەدەبی (پوچگەرایی.. عەبەس) کە عەبەسیەکانی پاریس بونە شوێنی پەخشکەرەوەی ئەم ئەدەبە بۆ زۆربەی ولاتانی دونیا، پوچگەراکان لە دوای جەنگە ماڵوێرانکەرەکان کلاورۆژنەیەکیان نەدەبینی بۆ ژیان، بۆ شۆڕش – بۆ خۆشنودی، هەر بۆیە لەو کاتەدا و لە پاریس لە لایەن ئەدیبە ناسیۆنالیزم و چەپەکانەوە دژایەتیەکی زۆری ئەدیبە پوچگەراکان دەکرا، چونکە بە بڕوای ئەوان ئەدیبە عەبەسیەکان دەیانەوێت هەستی شۆڕش و ئینسانیەت لە ناخی خوێنەردا بکوژن!!

دەبێت ئاماژەش بەو ئەدیبە دیارانە بکەین کە لە قۆناغ و ژینگەی تردا بەشداربون لە بەرەوپێشبردنی ڕەوتی ئەدەبی پوچگەرایی لە دونیادا جگە لەوەی هەندێکیان هاوشانی بیکێت لە پاریس سەرقاڵی بلاوکردنەوەی ئەم ستایلەبون لە ئەدەبدا، ناکرێت لەگەڵ بیکێت ئاماژەش بە ناوی (یوژین یونسکۆ و ئەداموۆ و تینسی ولیامز) نەکەین، کە هەریەکەیان شان بە شانی بیکێت بە ئاڕاستەیەکی پوچگەرا دەنوسن و بیردەکەنەوە..

دەبێت ئاماژەش بە ڕەوتی ئەم شکڵە لە نوسین بدەین کە تەنها لە قۆناغ و زەمەنێکی دیاریکراودا نەبوو، بەڵکو تا هەنوکەش لە زۆرێك لە ولاتاندا ئەم ستایلە لە نوسین هەیە دەکرێت ئاماژەدان بە ناوی (هارۆڵد پنتەر) لە شانۆی ئینگلیزیدا وەك نوسەرێك کە تا هەنوکە لە ژیاندا ماوە و دیدێکی ڕەشبینانە و عەبەسیانەی هەیە بۆ ژیان و بون!!

دواتر (ناثان سکوت) لە کتێبی (بیکێت) دا هەوڵیداوە ئەم کتێبە بکاتە کلیلێکی فراوان بۆ ئاشنابوون بە دونیای نوسین و ژیان و جیهانبینی ئەم نوسەرە، کە هەوڵێکی باشە بۆ ئاشنابون بە نوسەری فەڕەنسی بە ڕەگەز ئیرلەندی (سەموئیل بیکێت).

ئەمە جگە لەوەی ئەم کتێبە هەوڵێکی دەوڵەمەند و فراوانە بۆ ئاشنابون بە ئەدەبی عەبەسی و ئەدەبی قۆناغی بیکێت لە فەڕەنسا.

## سەرچاوە


بیکیت، دانانی ناتان سکوت،
وەرگێڕانی مجاهد عەبدولمنعیم.